# ڕێگا چڕیکەکان



ابو علي الكردي



یاداشتەڕۆمانی

ئاوات قارەمانی

ڕووداوەکانی (١٩٦٣ - ١٩٩٩)

چاپی دووەم بەدەستکارییەوە
٢٠٠٩



# ڕێگا باریکەکان

رۆمانەیادداشتی

ئاوات قارەمانی

سلێمانی

ساڵی ٢٠٠٩

ناوی کتێب: ڕێگا باریکەکان

بابەت: ڕۆمانە یادداشتی ئاوات قارەمانی

دارشتنەوەو تایپ و هەڵەبڕی: سروە مەحمود عەبدولڕەحمان

دیزاین و پیاچوونەوەو زمانی چاپ: فوئاد عەبدولڕەحمان

بەرگ: ئیلین

شوێن و ساڵی چاپ: سلێمانی ٢٠٠٩

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

چاپخانە: چاپخانەی کوردستان

چاپی یەکەم: بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوکردنەوە لەوەزارەتی ڕۆشنبیری

چاپی دووەم بەدەستکارییەوە: لەبڵاوکراوەکانی خانەی ڕەهەند

نرخ: ٨٠٠٠ دینار

خانەی ڕەهەند بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەو کتێب

ناونیشان: سلێمانی - گەڕەکی شۆڕش - پشت باخی گشتی (٠٧٧٠٨٦٤٩٢١٠)

**سوپاسنامە:**

لە ناخەوە سوپاسی ئەم مرۆڤە دڵسۆزانە دەکەم، کە ئەگەر ماندوویەتییان لەگەڵ ئەم کتێبەدا نەکێشایە هەرگیز بەم ناوەڕۆکو شێوازو قەوارەیە بۆم نەدەهاتە بەرهەم:

بەڕێز سروە محمود عبدولڕەحمان خوشکەزای خۆشەویستم کە تەواوی کارە هونەرییەکانی وەك داڕشتنەوەی ئەم یادداشتە بەشێوەی ڕۆمان و تایپ، هەڵە بڕی هەردوو چاپەکەی بۆ گۆتمە ئەستۆ، بەداوای لێبووردنەوە لە چاپی یەکەم دا ئاماژە بەم ماندوبوونە نەدرابوو.

بەڕێز فوئاد عەبدولڕەحمان، کە تەوای رووی ئەدەبی‌و هونەریی چاپ‌و زمانەوانیەکەی بۆ گرتمە ئەستۆ تا گەیاندییە ئەوەی ببێتە ئەم ڕۆمانە یادداشتە.

بەڕێز عەبدوللآ کەریم مەحمود، کە دڵسۆزانەو ماندووبوونی زۆری لەگەڵمدا نیشاندا بۆ نووسینەوەی هەر وشەیەك لە بیرمەوە هاتبێتە لاپەڕەکانی ئەم کارە.

بەڕێز بەختیاری مەلا عیزەت، کە بۆ خوێندنەوەی دەستنووسەکە بەوردی ئەرك‌و ماندووبوونی بۆ کێشام.

خوشکەزای بەڕێزم سروەو چروو فاروق، کە بەوپەڕی خۆشەویستی‌و پەرۆشەوە تەقەللآیان لەگەڵمدا نواندووە تاکو ئەم بەرهەمەم بۆ بێتە چاپ.

بەڕێز کاك هاوڕێ سەنگاوی، کە ڕەزامەندیی بە چاپکەیاندنی ئەم بەرهەمەمی لە وزارەتی رۆشنبیری‌دا مۆڵەت دا.

بەڕێز کاك شێخ مەحەمەدی سۆڵە، کە ماندووبوونی نواند بۆ هاتنە بەرهەمی ئەم ڕۆمانە یادشاتەم لە بەڕێوەبەرلیەتیی گشتیی چاپ‌و بڵاوکردنەوە.

بەڕێزان سەلام فاتیح فەتاح‌و مەهدی ئەحمەد نوو کارمەندی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی چاپ‌و بڵاوکردنەوە، کە سەرپەرشتیاریی چاپ‌و نەخشەسازیی کۆمپیوتەریی ئەم بەرهەمەمیان گرتە ئەستۆ.

# یادداشتی قارەمانی

یادداشت بەرهەمێکی تۆمارکراوی بەهادارەو گرنگی مێژوویی خۆی هەیە، لەو بابەتانەدا هەزاران دیمەنی شیرین‌و تاڵی رابردووی مەرگەساتەکان دەبینین، یادداشتنووس‌و کەسانی دەوروبەری لە کات‌و شوێنی جیاوازدا وەڵامی پرسیاری سەردەمەکەی خۆیان دەدەنەوەو گرێی زۆر نهێنیی رووداوە پەنهانەکان دەکەنەوە، پرسیارو خوێندنەوەی نوێ لە بەردەم مێژوونووسان‌و خوێنەراندا دروست دەکەن. ئەو زنجیرە یادگارانەیە، کە لە تەوژم‌و تینێکی پڕ لە هەژانی تایبەتیدا ناخی نووسەرەکەیان وروژاندووە، دیمەنەکان وەك فیلمێکی سینەمایی لە کامێرای چاوو مێشکی خوێنەردا بەرجەستە دەبن. یادداشت ئەو تەمەنە زیندووەیە نە لە بیر دەچێتەوەو نە دەتوانرێ بسڕێتەوە، بۆ هەتا هەتایە نەمر دەبێ. جاران تەنیا چەند رۆژنامەنووس‌و گەڕیدەو نووسەری بێگانە، بە پێی هەل‌و مەرجە جیاجیاکان روویان لە کوردستان کردبووە، لە گەشتەکانیاندا بیرەوەرییەکانیان تۆمارکردووەو لە دووتوێی کتێبدا چاپیانکردووە، هەندێکیان وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی کوردی، گەرچی ئەو یادداشتانە بە ژیانی تایبەتی خۆیانەوە پەیوەستن، بەڵام رووناکییان خستۆتە سەر رووداوە نادیارو پەنهانەکانی رابوردوومان، لەوانە بۆ نموونە مینۆرسکی‌و مێجەر (سۆن)، بەڵام چەند مێژوونووسێکی تر بە پێی عەقڵی نەژادپەرستیی داخراوی خۆیان، مەرگەساتە پڕ لە شکۆمەندەکانی گەلەکەمانیان بە چەواشەییەوە تۆمارکردووە، لەوانە (ئەسکەندەر بەگی تورکمانی) کاتبی تایبەتی (شا عەباس)، چەند مێژوو نووسێکی بە تواناو شارەزاو ورد بووە، ئەوەندەش قەڵەمێکی ماستاوچی‌و کاسەلێسی دەرباری دەرگای (شا عەباس) بووە، خۆی لە کاری مەیدانی گەمارۆدانی (قەڵای دمدم)دا بەشداریی کردووە. لە کتێبی (عالەم ئارای عەباسی)دا کارەساتەکەی تۆمارکردووە، بەڵام تەمی گومانی لە بەردەم رووداوەکاندا دروستکردووە، کارەساتەکەی بە شێوەیەك داڕشتووە لەگەڵ بەرژەوەندیی (شا عەباس)دا یەکبگرنەوە، رووی راستییەکانی شێواندووە، مێژوویەکی چەواشەی تۆمارکردووە، بە پێچەوانەشەوە (ئیسماعیل بێشکچی) نووسەری بە تواناو پێشکەوتووخوازی تورك بە قەڵەمە برشتەکەی لە هەڵوێستێکی بێ وێنەدا، لە دەرگای عەقڵی دۆگمای شۆڤێنیەتی (تورك‌و عەرەب‌و فارس)ی داوەو داکۆکیی لە مافی مرۆڤی کورد لە کوردستاندا کردووە، دژی ئەو جینۆسایدانە وەستاوەتەوە، کە بە درێژایی مێژوو تا ئێستا بەرامبەر نەتەوەی کورد ئەنجام دراون، لەو پێناوەشدا چەندین ساڵی تەمەنی لە زیندانەکاندا بەرێ کردووە. لە نیوەی یەکەم‌و دووەمی سەدەی بیستەمدا، دەیان نووسەرو کەسێتی‌و تێکۆشەری دێرینی کورد یادداشتەکانیان تۆمارکردووە، وەك: (رەفیق حیلمی)، (ئەحمەد خواجە)، (هەژار موکریانی)،

(نەوشیروان مستەفا ئەمین)، (مەحمودی مەلا عیزەت)، (شەهید ڕێبان)، (شەهید مەحمودی مامە عەزە)، (کەریمی حیسامی)، (حەمەی فەرەج)، (حەمەی حاجی مەحمود)، (مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی)، (شەهید شاخەوان)، (مەحمود سەنگاوی)، (سەعید ناکام)، لەم چەند ساڵەی دواییدا چەندانی تر یادداشتەکانی خۆیانیان تۆمارکردووە، گەر ئەو ڕوداوانە تۆمار نەکرانایە، کەلێنێکی گەورە بە بۆشایی دەمایەوە، هەر وەك خەونێ کۆتاییان دەهات. چەندان دەستنووسی یادداشت دوای ماڵئاوایی یادداشت نووسەکان لای کەس‌و کاریان ماونەتەوەو تا ئێستا چاپ‌و بڵاونەکراونەتەوە. هەندێ یادداشت بۆ چەند مەبەستێکی تایبەتی تۆمارکراون، ڕووی ڕاستیەکانیان شێواندووەو نابەجێی متمانەی مێژوو نوسان و دەکەونە خانەی لە بیر چوونەوەوە. گەر هەر یاداشتێ بە گیان‌و هەستێکی پڕ لە ئەمانەتەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕووداوەکاندا بکا، تەواوی لایەنە باش‌و خراپەکانی ژیان وەك خۆی بخاتە ڕوو، ئەوە تۆمارێکی زیندووی نوێ دەخاتە سەر خەرمانی لاپەڕەکانی مێژوو. گەر بە زمانێکی ڕۆژنامەنووسی‌و بە گیانێکی پڕ درامییەوە بنووسرێتەوە، خوێنەر زیاتر بۆ نێو ڕووداوەکان بەکێش دەکا، خوێنەر بە پەرۆشەوە تا سەراپا یادداشتەکە نەخوێنێتەوە دەست بەرداری نابێ. زۆر لە قەڵەم‌و کەسێتیی دیارو تێکۆشەرانی دێرینی گەلەکەمان لە نێو ڕووداوەکاندا ڕۆڵیان هەبووە، لە پایزی تەمەندان، دەبووایە بوار بۆ خۆیان بڕەخسێنن، دیمەنەکانی ڕابردویان تۆمار بکەن، کەلێنێکی دیار بۆ خۆیان‌و دەوروو بەرەکەیان لە مێژووی میللەتەکەیان پڕ بکەنەوە. لەم یادداشتە پڕ سەروەرییەی کاك (ئاوات قارەمانی)دا، لە ساڵی ١٩٦٣وە تا ١٩٩٩، هەزاران دیمەنی (٣٦) ساڵی تەمەنی پڕ لە ڕەنج‌و قوربانی‌و هەناسەی بەردەوامی پێشمەرگایەتیی شۆڕشی ئەیلوول‌و شۆڕشی نوێ دەبینین، سەراپا تەمەنی هەرزەکاریی خۆی‌و هاوڕێکانی بەخشیوە بە شۆڕش‌و گەل‌و نیشتمانەکەی، شۆڕش زانکۆیەکی گەورە بووەو پەروەردەی کردون.

ئەو دەمانەی (زەعیم سدیق) لەسەر بەرنامەو نەخشەیەکی فرەوان لە سلێمانی‌و ناوچەکانی تر پڕۆسەی جینۆسایدکردنی مرۆڤی کوردی ئەنجامداوە. قارەمانی‌و هەزاران تێکۆشەر بوون بە پێشمەرگەی ئەیلوول. (ئاوات قارەمانی) بۆ ئەوەی بوونی خۆی بسەلمێنێ، لە چالاکییەکدا ڕۆڵی ئازلیەتی و لێهاتویی خۆی بۆ هاوڕێ پێشمەرگەکانی دەنوێنێ‌و دەبێتە مایەی گرنگی پێدانیان. دواتر یەکەم شەڕی خۆکوژی لە شێوەی سەرهەڵدانێکی تری پڕ لە تراژیدیادا خستۆتە ڕوو. لە سەرەتای حەفتاکاندا (قارەمانی) بە هۆی شەهیدی سەرکردە مامۆستا (جەمال تاهیر)ەوە تێکەڵ بە بیری نوێ‌و خوێندنەوەی نوێ‌و زنجیرە ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان بووە، دوای پیلانی جەزائیرو تێکشکان‌و پەرتەوازەبوونی شۆڕشی ئەیلول، ئەمان بە هەناسەیەکی پڕ لە تێڕوانینی نوێ وە، ڕوو بە ڕووی تێکشکان‌و نەهامەتییەکانی دوای هەرەس بوونەتەوە. لەو زەمەنە دژوارو ئاڵۆزانە دا خاڵە شەهاب‌و

جەعفەرو ئەنوەرو هاوڕێکانیان دەسگیر دەکرێن، ئەو سکرتێرە مەزنەو ئەو دوو سەرکردەیە لە سێدارە دەدرێنو ئەوانی تریش بۆ چەند ساڵێ زیندانی حوکم دەدرێن، هەر ئەو دەمانە (شەهاب)ی سکرتێر لە سەنگەری زینداندا دروشمی (کەم بژیو کەڵ بژی)ی کرد بە وانەیەکی نوێ، بۆ روو بەڕوو بوونەوەی زیندانو ئەشکەنجەو تەمی تێکشکانەکانی ئەو سەردەمە دژوارە. لەم یادداشتەدا بە قەد فراوانی ئاسمان پاکێتیو راستگۆیی لە ویژدانی (قارەمانی)دا دەبینین، خۆیو هاوڕێکانیو دەورو بەرەکەی بە پێی زەمەنو شوێنە جیاجیاکان خستوتە روو. هەر لە دوو ژوورە کرێ نشینە بێ نازەکەی گەڕەکی سەرشەقامەوە، کە ئەو دەمانە قیبلە نمای رێکخستنە نهێنییەکان بووە، کام تێکۆشەر لەو ماڵەدا خۆی حەشار نە داوە لە (ئەبو شەهاب)ەوە بۆ شەهید جەمالی عەلی باپیرو تاها باراویو شەهید (ئارام)ی سکرتێری کۆمەڵەو (سالار عەزیز)و دەیان تێکۆشەری تر کارەکانیان لەوێدا راپەڕاندووە. کاک (ئاوات)و (زەینەب خان)ی هاوسەریو ماڵە بچکۆلەکەیانو جگەرگۆشەکە یان چ لە شارو چ لە شاخ، هەردەم لە خزمەتی شۆڕشو پێشمەرگایەتیو رێکخستنە نهێنیەکاندا بوون لەم دیمەنانەدا رۆڵی (زەینەب خان) دەبینین، ئەو تەوارەی مایەی شکۆمەندییە بۆ خەباتی پڕ لە سەروەری شۆڕشو ژنانی کوردستان لە شارو لە شاخ.

باسی رۆڵی بێ وێنەی شەهید ئارامی لە ناو شارو لە ناو تۆڕی دەسەڵاتی ئەمنو ئیستخباراتو (گهواری)و سوپای عێراقو جاسوسەکاندا کردووە، لە ژوورە بچکۆلەکەی گەڕەکی (سەرشەقام)دا جارێکی تر زنجیرە رێکخستنەکانی بەغداو خانەقینو شارەکانی کوردستان لە (کۆمیتەی هەڵمەت)دا، بە شێوەیەکی نوێو نهێنی پارێزتر رێکخستۆتەوە، هەر ئەو دەمانە شەهید (ئارام) بە نامە پەیوەندیی بە شەهید (عەلی عەسکەری)و کاک (سالار عەزیز)ەوە هەبووە. مەفرەزە سەرەتاییەکان لەسەر سنوور بە رابەرایەتیی شەهید (ئیبراهیم عەزۆ)، لە ناوەوە یەکەم مەفرەزە لە ناوچەی هەڵەبجەوە بۆ شاخ دواتر چەندان مەفرەزەی تری وەك شەهید (جەمالی عەلی باپیر)و شەهید (ئەنوەری مەجید سوڵتان)و (مولازم ستار)و (مولازم جوامێر)و دەیان سەرکردەو فەرماندەی تر لە شارەکانەوە روویان کردە زانکۆی شۆڕش لە شاخ. هەر ئەو دەمانەش مەفرەزەیەکی نهێنی لە نێو شاردا دەستڕێژیان لە پارێزگاری سلێمانی کردو بووە هۆی دەسگیرکردنی شەهید (یاسینە رەش)و هاوڕێکانی. کاک (ئاوات)و کاک (مەلا بەختیار) روویان کردە قەرەداغو گەرمیان، کاک (مەلا بەختیار) کۆبوونەوەی بە چەند گوندێ کردووەو گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، لەو هەڵو مەرجە ناسکەدا یەکەم چالاکی قارەمانیو پێشمەرگەکانی کەمینێ بوو بۆ قافڵەیەکی سەربازی لە نێوان جادەی قەرەداغو سلێمانیدا.

قارەمانی چ لە شارو چ لە شاخ زوربەی کاتەکانی ژیانی لەگەڵ شەهید (ئارام)دا بە رێ کردووە لە شاخ ناوی نهێنی (بەکر) بووە. ئەو دەمانەی، کە شەهید (ئارام)و کاک

(ئاوات قارەمانی) سەردانی ماڵەکانیان لە نێو گوندەکان دا دەکرد، شەهید (ئارام) دەیگوت من ناوم (بەکر)ەو تازە بووم بە پێشمەرگە لای کاک (ئاوات). کەس نەیدەزانی ئەو سکرتێری کۆمەڵەیە. ئەو سەردەمانە شەهید (ئارام)و (حەمە سەعید) لە ماڵی (مەولود گوڕیانی) ڕۆژنامەی ئاڵای شۆڕشیان دەردەکرد. لەو هەلو مەرجە ئاڵۆزانەدا تۆڕی جاسوس سەراپا شارو شاخی گرتبووەوە، (زەینەب خان)ی هاوسەری کاک ئاوات نەی دەتوانی لە شارو لە شاخ بژی. لە ژوورێکی ماڵی موختاری گوندی (سەرزەل)دا خۆی حەشار دابوو، هەر ئەو سەردەمە سوپای عێراق بە هاوکاری گەلە جاش کێوماڵێکی چڕو فراوان دەکەنە سەر سەراپا قەرەداغ، شەهید (ئارام)و کاک (ئاوات)، شەوەکەی لە گوندی (فیکەیەر)ەوە چوبوونە ناو باخەکەی گوندی (گەڕەزیل)، لە بەیانیەوە تا نیوەڕۆ لەوێ مابوونەوە هیچ رووی نەدابوو، نیوەڕۆکەی ویستبوویان روو بکەنە نێو ئاوایی نان بخۆن هەمووی ٢٠٠ مەتریان مابوو بگەنە نێو ئاواییەکە، ئەو هەموو عەسکەرەیان بینیبوو، ئەوانیش بە نێو ئەو دۆڵو چەمەدا بەرەو چەمی (زایەر) رایانکردبوو. ئەزمونی ژیانی پێشمەرگایەتی پڕە لە سەدان کارەساتی پڕ لە تێڕوانین، خوێنەر دەخاتە دنیای خەونو ئەندێشەوە، چۆن پێشمەرگە لەو هەموو کەمینو ئابلۆقەو کێوماڵە چڕو فرەوانانە قوتار بووە؟ دیمەنەکانی کارەساتی شەهید (شوان)و هاوڕێکانی، کە چۆن بە نارنجۆک خۆیان ئەو مەرگە پڕ شکۆمەندیەیان هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بە دیلی دەسگیر نەکرێن. لەم بیرەوەریانەدا زۆر لە نهێنییەکانی ژیانی شەهید (ئارام)ی لە شارو لە شاخ بۆ گێڕاوینەتەوە. لەوانە تاڵترین کارەسات ٣١/ ١/١٩٧٨ی بە وردی بۆ باسکردووین، ئەو رۆژەی، کە ئەو سکرتێرە مەزنەی کۆمەڵەی تیا شەهیدکرا. ئەو هەواڵە دڵتەزێنە بووە مایەی پرسەو ماتەمین لای مەفرەزە سەرەتاییەکانو رێکخستنەکانی (ی. ن. ك)و خەڵکی گوندەکانو ئەوانەی، کە ناویانگیان بیستبوو، لەو رۆژەو تا ئێستا قارەمانی هاوڕێیو قوتابی شەهید (ئارام) هەمیشە لەگەڵ هێمنیو لەخۆبوردەییو هەڵسوکەوتە نموونەییەکانی ئەودا دەژی، بەڵێنی داوە تا دوا هەناسەی لە بیری نەکا. دوای ئەو کارەساتە (ئەبو بەکر نوری)ی ناسراو بە (ئاشتی) لە نێو گوندی (قارەمان)دا دەسگیر کراو دوای ئەشکەنجەی بێ سنوور لە زیندانی (موسڵ) لە سێدارە درا. دوای ئەوەیش مامۆستا (حەمە ئەمین) ناسراو بە (شەماڵ) لە کێو ماڵێکی چڕو بەربڵاودا لە خوار (میرپاس)ەوە شەهیدکراو رژێم بە هەلیکۆپتەر تەرمەکەی گواستەوە بۆ (کەرکوك). یەکێ لە خاڵە گرنگو جوانەکانی ئەم یادداشتە، لە نێو ئەو هەموو رووداوە پڕ لە مەرگەساتانە ئەوەیە، کە نووسەر چەند نوکتەیەکی سەرنج راکێش دەگێڕێتەوە. ئەم هونەرە کۆمیدییە، بەو تەکنیکەوە دیمەنی بیرەوەرییەکانی زیاتر زیندووتر کردووە وەك: (کەرو هۆڕ، قازو حەرەسیات، زەردە بە دەرزی کون دەبێ؟ میوان دەرکردن، موش موشکیلە، شەهیدی دۆدرمە، نهێنی شەوی عەلی کەماڵ، کڵاوەکەی حەمە سعیدو زەڕە) قارەمانی لە یادداشتەکەیدا باسی ئەو سێ هێزەی

کردووە، کە لە نێوان هەر سێ سنوری عێراق، ئێران، تورکیادا بەرەو ناوەوەی سنووری تورکیا کەوتبوونە ڕێ. لە سنوری نێوان، عێراق– ئێران – تورکیا دا ڕوو بە ڕووی گەورە ترین کارەساتی پڕ لە مەرگەسات دەبنەوە، کاک (نەوشیروان مستەفا) ئەو ڕووداوەی بە چڕو پڕی نووسیوەو بە ناوی کارەساتی هەکاری چاپو بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام ئەم چەندان دیمەنی تری ئەو مەرگەساتەی تۆمار کردووە. لە ساڵی ١٩٧٩دا کاک (ئاوات) کراوە بە نوێنەری مەکتەبی سیاسی بۆ ڕاپەڕاندنی کارە نهێنییەکانی یەکێتی لەگەڵ دۆستەکانی شاری (سەقز)و (مهاباد) بۆ دابینکردنی چەکو تەقەمەنی، تا ڕووخانی (شا)و گۆڕانکارییەکان لە ئێران. لە ساڵی ١٩٨٠دا (قارەمانی) وەك ئەندامی سەرکردایەتی سەرپەرشتیی ئەو ٩ فەرماندەییەی کردووەو پێکەوە بۆ خولێکی عەسکەری ڕوویان کردۆتە سوریاو لوبنان. لە ساڵی ١٩٨١دا کۆنفراسی یەکەمی کۆمەڵە بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ لە (کانی زەرد) بەردەوام بوو. دواتر هەرێمەکانیان گۆڕی بە تیپ. لە ساڵی ١٩٨٢دا کۆنفراسی دووەمی کۆمەڵە ئەنجام درا. لەو زەمەنە جیاجیایانەدا زنجیرەیەك ڕووداوو گۆڕانکاری بەرپا بوو، تا گەیشتنە پێکهێنانی مەڵبەندەکان.

ئەوەی مایەی تێڕامانە، کاك ئاوات بەوپەڕی پەرۆشییەوە باسی نهێنییەکانی شەهیدکردنی (جەزای عەلی کاتب)و هاوڕێکانی کردووە. هەر چەندە ئەو کارەساتە پەیوەندیی بەوەوە نییەو زۆر ئازاری ناخو ویژدانی داوە، ئەو هەڵەیە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی شەڕی خۆکوژی. ئەو بە هیچ جۆرێ بڕوای بە شەڕی براکوژی نەبووە، بڕوای بە ڕاو بۆچوونی ئازاد بووە، ئەویش لەگەڵ ڤۆڵتێردا دەڵێ: "ڕام لەگەڵ ڕات دا جیاوازە، بەڵام ئامادەم لە سەر ڕا دەربڕینت گیانی خۆم بەخت بکەم." ڕژێمی تۆتالیتاری عێراق لە گەرمەی گفتوگۆی ١٩٨٣- ١٩٨٤ دا چەند بەرنامەو نەخشەی نهێنی دانابوو، بۆ تیرۆر کردنی ئەندامانی سەرکردایەتیو فەرماندەو کادرەکانی (ی. ن. ك) هەر ئەو دەمانە کاك (ئاوات) سەرتیپی ٤٧ ی پیرەمەگروونو کەرتی شەهید (سەلاح) ڕوو دەکەنە (کانی بەردینە)و شەو لەوێ دەمێننەوە. بە هۆی جاسووسەوە ئەو هەواڵە دەگاتە (شێخ جەعفەر)ی پارێزگاری سلێمانی، ئەویش بە هۆی فرسەتی گفتوگۆوە هێزێکی گەورە لە سوپاو جاش بە هاوکاریی هەلیکۆپتەر دەنێرێتە سەر گوندەکە، بەیانیەکەی پێشمەرگەکان لە خەو هەڵدەستن، دەبینن چواردەوری گوندەکەیان لێ گیراوە، لە شەڕێکی بەرگریی نێو ئاوایییەکەدا ئەو هێزەو پیلانەکەیان تێکدەشکێنن. دواتر ڕژێم لە دوو پیلانی جیاوازدا ملازم (سەید کەریم)و (مامە ڕیشە) شەهید دەکەن. لە تۆڵەی ئەوانو هێرشو بۆردومانی گوندی (گۆپتەپە)دا، لە ١٥/ ١٩٨٥/٢دا شەڕی (دابان)و (هەلاج) ئەنجام درا. ئەم شەڕە گەورەترین سەرکەوتنی نوێ بوو بۆ ئەو سەردەمە، تەنانەت مەقەڕ فەوجەکەی (هۆمەرقەوم)یشیان گرت. دواتر باسی ئاشکرابوونی ئاڵای شۆڕشو پلینۆمی کۆمەڵەی لە بەرگەڵو کردووە. دوای ئەوەی کاك (ئاوات) لە گوندی (هۆمەرامان)دا دەنیشێو سەردانی خەڵکی گوندەکانی کردووە.

ڕۆژێ چەند هەلیکۆپتەر بۆردومانی بارەگاکەی‌و گوندەکەیان کردووە، دواتر کراوە بە سەرتیپی ٥٥ی قەرەداغ. لە بەر ئەوەی کەسێتیەکی هێمن‌و ڕووخۆش‌و دەست‌و داوێن پاك بووە، ڕێزی توانا جیاجیاکانی پێشمەرگەو فەرماندەی کەرتەکانی گرتووە، بە هەڵسوکەوتە متەوازیعانەکانی بۆتە هاوڕێی سەرجەم پێشمەرگەی تیپەکەی، لە هەموو چالاکیەکاندا لەگەڵیاندا بەشداریی شەڕەکانی کردووە، هەمیشە وەك فەرماندەیەك مایەی ڕێزو سەرنجی دەورو بەرەکەی بووە. لەو ماوە کورتەدا گۆڕانکاریی لە تیپی ٥٥ی (قەرەداغ)دا کردووە. (قارەمانی) لە دیمەنێکی تردا جوامێری‌و ورەی گەورەی پێشمەرگەو کەس‌و کاریانی خستوەتە ڕوو. شەهیدبوونی (موشیر)و (موکەرەم) ئەو دوو برایەی، کە لە دوو شەڕی جیا جیادا شەهید کران، باوکیان لە هەڵوێستێکی بێ وێنەدا وتوویەتی: "من شانازی بەوەوە دەکەم میللەتەکەم لێم ڕازییە." دواتر ئەم لاو ئەو لای قارەمانی ماچ کردووە وتوویەتی: "ڕاستە کوڕی منە، بەڵام کوڕی شۆڕشیش بووە، من سەر خۆشی لە کورد دەکەم." ئەمە لووتکە ی جوامێری‌و سەروەریی ئەو باوکەیە، کە بە هیچ شتێ گوزارشتی لێ ناکرێ. کارەساتی شەهیدکردنی هەژارو هاوڕێکانی لە گەڕەکی خەباتی سلێمانی کاردانەوەیەکی ئەوەندە کاریگەری لای سەرتیپەکەیان دروستکردووە، لە تۆڵەیاندا موعەسکەرێکی گەورەیان گرت. ئەو سەرکەوتنە بووە مایەی تێرامانی سەراپا خەڵکی شارەزوورو قەرەداغو کوردستان. لە مام جەلال‌و کاك نەوشیروان‌و دکتور فوئاد مەعسوم‌و ملازم عومەرو کاك کۆسرەت‌و مەکتەبی سیاسی‌و عەسکەری‌و مەڵبەندەکانەوە بروسکەی پیرۆزبایی بە بۆنەی ئەو سەرکەوتنەوە پێگەیشتوەو سەرکەوتنەکە بووە مایەی بەرزبوونەوەی ورەی جەماوەر. لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٦ مەڵبەندی یەك ناحیەی سەنگاویان گرت، دوای ئەوە شەڕی سێ مانگەی قەیوان ماوەت بەرپا بوو. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧دا جارێکی تر ناحیەی سەنگاویان گرتەوە، دوای ئەوە تیپی ٥٥ی قەرەداغ بە سەرپەرشتیی سەرتیپەکەیان پەلاماری ڕەبایەکەی سەیتەرەی کۆنی ڕێگای عەربەتیان داو دواتر شەڕی قادرکەرەم یان کرد، پاشان داستانی ڕزگاری بەرپا کرا، لە ماوەی دوو سەعاتدا (١٢٠) ڕەبایەو موعەسکەر گیران، لەو داستانە گەورەیەدا سەرپەستی فەرماندەی کەرتی تیپی 57ی سەگرمەو ئامۆزای کاك ئاوات شەهید دەکرێ. هەرچەندە ئەو ڕووداوە جەرگ بڕە کاری زۆری کردە سەر هەست‌و ناخی، بەڵام لە سەنگەرەکەی شاخ نەهاتە خوارەوە، تەرمەکەی بە مەفرەزەکەی خۆی دا بە ڕێ کردەوە بۆ گوندی دۆڵانی خواروی قەرەداغ. دواتر قارەمانی کرا بە لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی یەك، دوای گەڕانەوەیان لە سەرکردایەتیەوە بۆ سنووری مەڵبەندی یەك، شاخی گڵەزەردەو داراغاو دارمازەڵەی قەرەداغیان گرتەوە، دواتر زنجیرەیەك چالاکی گەورەیان ئەنجامدا وەك پەلاماری مەعەسکەری دوو دارەو شەڕی بورجەکەی دارە ڕەش‌و چالاکیەکەی چەرمەگا. لە ئەنفالی یەکدا زۆربەی هێزەکانی

مەڵبەندی یەکو سێ لە دوڵی جافایەتی سنووری سەرکردایەتیو مەڵبەندی دوو کۆبوونەوە، دوای شەڕێکی سەختو روو بەروو بونەوەی سوپای ئەنفال، کە نزیکەی سێ مانگی خایاند لە ١٩٨٨/٣/١٨ تەواوی هێزەکان کشانەوە بۆ سنوور، دواتر بۆ مەڵبەندی سێو گەرمیان، هەر ئەو دەمانە سوپای عێراق لە ئەنفالی دوو دا سنووری مەڵبەندی یەکی لە قەرەداغ گرت. ئەو کاتەی هێزەکانی مەڵبەندی یەك گەیشتنەوە گەرمیان سوپای عێراق لە ئەنفالی سێ هێرشی کردە سەر سەراپا گەرمیان، هەرچەندە هێزەکان ماندوو بوون چەند رۆژێ بەرگرییان کرد، دواتر لە سەر نەخشەو بەرنامەیەکی ورد کشانەوە بۆ قۆپیەکانی قەرەداغو بە زەحمەتێکی زۆر گەیشتنە چەمی رێزانو عەسکەرو گۆپتەپە، هەندێ لە پێشمەرگەکان روویان کردە مەڵبەندی سێ، تیپی ٥٧ی سەگرمەو ٥٩ی حەمرین مانەوە لەو کاتەدا سوپای عێراق لە ئەنفالی چواردا هێرشی کردو (زێ)ی بچووکی بەردایەوە، پێشمەرگەکان نەیانتوانی بیپەڕنەوە. هەر ئەو دەمانە قارەمانی نیازی بوو روو بکاتە بادینان، دواتر سوپای عێراق هێرشی ئەنفالی پێنجو شەشو حەوتی کردە سەر سنووری مەڵبەندی سێ، پێشمەرگەی هەر سێ مەڵبەندەکە بەرگریەکی کەم وێنەیان کرد. دواتر دوژمن لە ئەنفالی هەشت دا بادینانیان گرت. ئەو دەمانە مام جەلال لە دەرەوەی وڵات بوو، کاك نەوشیروان سەرپەرشتی هێزەکانو مەفرەزە پارتیزانەکانی دوانی ئەنفالی کرد، چەندان مەفرەزەی پارتیزان لە گەرمیانو قەرەداغو چەمی رێزانو سنووری مەڵبەندی سێو ناوچە جیاجیاکان مانەوە، چەندان مەفرەزەی تر لە سنوورەکانەوە رویان کردە ناوچە سوتما کراوەکان. کاك نەوشیروان مەڵبەندی یەکی لە سوورێنو مەڵبەندی دووی لە بلەکێو مەڵبەندی سێ ی لە ناوزەنگ دانا. ئەوکاتانە ماڵی قارەمانی لە سەقز بوو، خۆشی لە بلەکێ بوو، لە مانگی ٩ی ١٩٩٠ قارەمانیو هاوسەرو جگەر گۆشەکانی بە فڕۆکە لە ئێرانەوە گەیشتنە سوریا، لە ١٩٩٠/١٠/٢ لە سوریاوە گەیشتنە لەندەن، لە هەندەران هەواڵی شەهیدبوونی سەلاح، کاك ئاواتو هاوسەرەکەی دەهەژێنێ، ئەو پێشمەرگەیەی لە ١٩٨٤وە لەگەڵ قارەمانی دا بوو تا ئەو رۆژەی رووی کردە هەندەران.

ئەم یاداشتە پڕە لە دیمەنی وردو سەرنج راکێشەرو راستگۆیەکی ویژدانی ئەخلاقی شۆڕشگێڕانە وەڵامی تەمی گومانو ئەو پرسیارانە دەدلتەوە، کە لە ناخی خەڵکدا بە پەنهانی ماونەتەوە، یەکێکە لەو بەرهەمانەی دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ ئەو کەسانەی، کە دەیانەوێ لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی لە سەر شۆڕشی نوێ بنووسن.

عەبدوڵڵا کەریم مەحمود
٤ / ١١/ ٢٠٠٤ / سلێمانی

بیرم دێ، کە شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ بوو، عەبدولکەریم قاسم بوو بە سەرۆکی کۆماری عێراق، حیزبی شیوعیەکان لە ئارادا بوون‌و ڕۆڵیان هەبوو، دژلیەتیی پارتی دیموکراتی کوردستانیان کرد. دولتر قەومیەکان پەلاماری کوردستانیان دا. ئەو دەمە تەمەنم پانزە ساڵ بوو. بیرم لەو جیهانە ئاڵۆزە بەربڵاوەی سیاسەت دەکردەوە. بەڵام لە هاوکێشە دژوارەکانی سیاسەت نەدەگەیشتیم. تەنها ئەوە نەبێ بە هۆی هەل‌و مەرجی چەوسانەوەی نەتەوەیی‌و چینایەتی، بووم بە دەروێشی کوردایەتی، ئامادە بووم، بۆ هێنانەدیی مەسەلە ڕەواکەی گەلەکەم‌و بنبڕکردنی چەوسانەوەی چینایەتی، سەرو ماڵ‌و کەس‌و کارم لەو پێناوەدا بەخت بکەم. حەزم دەکرد کوردایەتی بکەم. لە ساڵی ١٩٦٣دا بە نهێنی پەیوەندیم بە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە کرد. ئەو دەمانە ناوچەکانی قەرەداغ‌و شارباژێڕو پێنجوێن‌و سەراپای ناوچە جیاجیاکانی کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی شۆڕشدا بوو. (زەعیم صدیق) قائد فرقە بوو لە ناوچەی سلێمانی. پیاوێکی دڕندە بوو، هێزەکەی ڕۆژێ چواردەوری سلێمانی گرت‌و هاتووچۆی تیادا قەدەغە کرد. هەر کەس لە ماڵ بچووایەتە دەرەوە، دەیان کوشت. سەربازەکانی کەوتنە پشکنینی ماڵەکان. ئەوەی تەمەنی لە دوانزە ساڵ بەرەوژوور بوایە دەیانگرت. زۆربەی گیراوەکانیان کوشت. ئێمە ئەو کاتە ماڵمان لە گەڕەکی خەبات بوو، لە پەنای مزگەوتی (بێخود) بوو، شەو پێکەوە لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی گەڕەکەکەم لە شاری سلێمانی چووینە دەرەوە بەرەو ناوچەی قەرەداغ. لەوێ ببین بە پێشمەرگە. ئەو سەردەمە ڕەئیس کەمال ئامرهێزی پێشمەرگەی قەرەداغ بوو. ملازم تایەری شێخ ڕەئووف سەر لق بوو. من لای ئەو بووم بە پێشمەرگە. لقەکەش پێکهاتبوو لە سێ پەل. من خرامە پەلی دوو، سەر پەلی ئێمە شێخ باقر بوو. من هێشتا تازە پێشمەرگە بووم، کەوتینە ڕۆیشتن بەرەو ناوچەی گەرمیان.

ئێوارەیەك بوو فەرمان درا بچین بۆ شەڕ بۆ ناحیەی قادرکەرەم، بڕیار بوو شەو تەقە لە مەرکەزی پۆلیسی ناحیەی قادرکەرەم بکەین. ئێوارە دوو دوو دابەش کراین. لە بەر ئەوەی من پێشمەرگەی تازە بووم، زۆر گەنج بووم، لەگەڵ هەر پێشمەرگەیەك دایان دەنام رازی نەدەبوو لەگەڵیدا بم. ئەوەم زۆر پێ ناخۆش بوو. دوا جار پێشمەرگەیەك ناوی واحید[1] بوو، وتی:

" – قەینا با لەگەڵ من بێ."

---

[1] - خەڵکی کەرکوك بوو. تفەنگێکی پانزەتیری پێبوو لوولەکەی ڕووت بوو، لەبەر ئەوە پێیان دەوت واحی لوولە ڕووت. گەنج بوو تەمەنی هەر بیست‌و چوار ساڵ دەبوو.

دڵم هەر تەنگ بوو، بە ڕێ کەوتین. تا گەیشتینە پشتی قادرکەرەم بە بەری بناری گلەوە. ئەو شوێنە چونکە هەردە بوو، ئێمە زوو زوو، کە سەردەکوتینە بەرزیەکە، خێرا خل دەبووینەوە. شەو چووینە سەر مەرکەزی پۆلیسەکەو بوو بە تەقە. هەرچەند ئێمە لە مەرکەزەکەوە زۆر دوور بووین، بەلاّم هەموو خۆیان دا بە عەرزدا، هەر من نەبێ، کە بە پێوە وەستابووم. ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵمدا بوو زۆری پێ وتم، کە خۆم بدەم بە عەرزدا. بە قسەم نەکرد، چونکە ئەو رووداوەی ئێوارەم لە دڵ دەرنەچوو بوو، کە کەس رازی نەبوو لەگەڵیدا بم. ئەوە زۆر دڵتەنگی کردبووم، بەلامەوە گرنگ نەبوو بکوژرامایە. ئەو شەوە یەکەم جارم بوو فیشەك بتەقێنم. شەو هەندێ فیشەکمان بە مەرکەزەکەوە نا، ئەوانیش تەقەیەکی زۆریان لێکردینو چەند گوللە هاوەنێکیشیان پێوە نان. هەر ئەو شەوە گەڕاینەوە بۆ گوندەکە. واحید منی بە لاوە زۆر ئازا بوو، لەراستیشدا ئێمە زۆر دوور بووین لە شەڕەکەوە، چونکە هیچ فیشەکێ بەلاماندا نەدەهات، جگە لە گوللە هاوەن نەبێ، نزیکمان دەکەوتەوە. واحید هەڵوێستی منی بۆ پێشمەرگەکانی ترو بۆ سەرپەلەکەمان باسکرد. دوای شەڕەکە، ماوەیەك لە گوندەکانی گەرمیانماینەوە جەولەمانکرد، دولیی گەڕاینەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ. لقەکەمان سەر بە ناوچەی قەرەداغ بوو. سەرپەلەکەمان، کە شێخ باقر[2] بوو، لەوەوە زۆری خۆش دەویستم. ماڵیان لە گوندی بەڵخە بوو لە ناوچەی قەرەداغ. جارێکیان، کە بە مۆڵەت گەڕاینەوە، منو (مەحمود)[3]ی هاورێمی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان، لەوێ بردینی بۆ راوی بزنەکێوی، بۆ شاخی زەردە، کە بە پشتی گوندەکەیانەوە بوو. ئەو بۆ خۆی راوچی بوو، باشی لێی دەزانی. پێی وتین:

" —هەر کەسێ حەیوانی راوکرد، ئەوی تر دەبێ حەیوانەکە هەڵگرێ تا ماڵەوە."

ئێمەش بەوە رازی بووین. دیاربوو ئەو شارەزای ناوچەکە بوو، دەیزانی لە کوێ نێچیر هەیە. مسۆگەر بوو لە راوەکە. ئێمەی نارد بۆ لایەکی ترو خۆیشی چوو بۆ شوێنێکی تر. ئێمە هەر بزنە کێویمان نەدی، بەلاّم ئەو دانەیەکی راو کردبوو. ئێمەش لە سەر پەیمانەکەی خۆمان بزنە کێویەکەمان دا بە کۆڵماندا و هێنامانەوە بۆ ناو دێ.

٢

لە کۆتایی مانگی شوباتی ساڵی ١٩٦٤ لە ناوچەی قەرەداغ بووین فرمانمان بۆ هات، کە هەموو هێزەکانی پێشمەرگە کۆببنەوەو بچین بۆ شەڕ بۆ گەرمیان بۆ سەر (دوز خورماتوو). هەموو هێزی قەرەداغ کۆبووەوە. پەلەکەی ئێمە بۆ ئێوارە لە گوندی

---

[2] - خەڵکی گوندی بەڵخە بوو، پێشتر پۆلیس بوو.

[3] - ژنبرامە. ئەو سەردەمەش لەبەر ئەوەی هەردووکمان خەڵکی گوندی قارەمان بووین، هاورێم بوو. ساڵێك بەر لە من بوو بوو بە پێشمەرگە.

(بنەکە)ی نزیك قادرکەرەم بوو. بە ماڵەکاندا دابەش بووین. منو خالد رەباتیو حمەئەمین رەباتی بە یەکەوە بووین بچینە ماڵێکەوە. کاك خالید سەردەستەی ئێمە بوو، خالید رەباتی لەگەڵ ژنی ماڵەکەدا کردی بە شەڕ. مانگی رەمەزانیش بوو، ژنەکە جێی نەدەکردینەوە. خالید بەژنەکەی وت:

" –حەیف نیە ئێمە خۆمان بدەینە کوشت لە سەر سەروچاوی تۆ. "

هەرچۆنێك بوو لەوێ ماینەوە، چونکە شوێنێکی تر نەبوو لێی بمێنینەوە. شەو بوو بە تەقە. چەکەکانمان دانابووو پشتوێنمان کردبووەوە. تەقە بە ئاسماندا دەکرا. ئێمە وامانزانی دەوری گوندەکە گیراوە. خالید بە خاوەن ماڵەکەی وت:

" –خاڵە بچۆرە دەرەوە بزانە چییە هەتا ئێمە خۆمان کۆ دەکەینەوە ! . "

کابرا نەیدەوێرا بچێتە دەرەوە. من لە پێش ئەواندا بە خێرایی چوومە نزیکی دەرگای ژوورەکە. دەرگاکەم کردەوەو چوومە دەرەوەو گوێم گرت، هەر خەڵك بوو هاواری دەکرد کورد رزگاری بوو. کورد رزگاری بوو. گەڕامەوە ناو ژوورەکەو وتم:

" –کاك خالید هەر خەڵکەو هاوار دەکەن دەڵێن کورد رزگاری بوو. "

چووینە دەرەوە تەماشامانکرد هەموو خەڵکی گوندەکە لە دەرەوەن. لە پێشمەرگەکانمان پرسی:

" –ئەوە چی بووە؟. "

وتیان:

" –ئەی گوێتان لە رادیۆ نیە بەیانی خوێندەوە. ؟"

ئێمە ئاگامان لە هیچ نەبوو، چووین بۆ ماڵێ رادیۆیان هەبوو، گوێمان گرت دەقی رێکەوتنەکەی دەخوێندەوە، ئەو رێکەوتنەی، کە (مەلا مستەفا)و حکومەتی عێراقی ئەو سەردەمە لە سەری رێکەوتبوون. ئێمەش زۆرمان پێ خۆش بوو. ئەو شەوە هەتا بەیانی لە خۆشیاندا خەومان لێ نەکەوت. کە رۆژ بووەوە هەموومان لە بەردەمی مزگەوتی گوندەکەدا کۆبووینەوە هەموو خەڵکی دێکەمان لێکۆبوویۆوە، بە خۆشحاڵییەوە بە رێیان کردین. رۆیشتین، چووین بۆ گوندی (ئاوباریك) لە بناری گل، کە هەموو هێزەکەمان لەوێ کۆببووەوە. کە چووینە ئەوێ، وتیان:

" –بروسکەمان بۆ هاتووە، کە بگەڕێینەوە بۆ بارەگای هێز. "

ئەو کاتە مەقەڕی هێز لە قۆپی قەرەداغ بوو، ئێمەش لە خۆشیاندا هەموو بە دەم گۆرانی وتنەوە بەرەو قەرەداغ گەڕاینەوە. لە نزیك رێگای بەینی سەنگاو قادرکەرەمدا، تووشی چوارپێنج پیاوی گوندی (دێ رەشە) بووین، هەر لە دوورەوە یەکێکیان هاواری کرد:

" –ماندوو نەبن. ! "

کە نزیك بووینەوە لە یەکتری، یەکێکیان پێی وتین:

" –ئەم شەو گوێتان لێ بوو حکومەت وتی وەرن بۆ حەقەکەتان.؟" پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو زۆر قۆشمەچی بوو، ناوی (حەمەی کەریم) بوو. وتی:

" –ئەی نەتانزانی داوای چەند (کەرو هۆڕی)[4] کرد.!"

ئەویش وتی:

" –نە بە خوا نازانم گوێم لەوەیان نەبوو، هەر ئەوەندەم گوێ لێبووە وتی وەرن بۆ حەقەکەتان."

گەڕاینەوە بەرەو قۆپی قەرەداغ سەیرمانکرد زۆربەی مەقەڕەکان چوونە ناو ناحیەی قەرەداغ. ئێمەش چووین بۆ ئەوێ. کە گەیشتین، سەیرمانکرد رەئیس کەمال زۆر بێ تاقەت بوو. بەخێرهاتنی کردین، دیار بوو زۆر بێزار بوو. ئێمەش نەماندەزانی مەسەلە چییە!.

چەند رۆژێکی پێچوو، سەیرمانکرد ناوچەو رێکخراوەکان کۆدەبوونەوە، کەوتبوونە نارەزایی دەربڕین. ئێمەش بە لامانەوە سەیر بوو. ئەوەندەمان زانی هێزێکی بەرزانی خۆی کرد بە قەرەداغ دا، (نوری مەلا حەکیم)[5] یان لەگەڵدا بوو، ئەو کاتەش ملازم تاریق چاوڕەش‌و ملازم خالید شەمسەدین‌و ملازم تایەری شێخ رەئوف هەموو لەوێ بوون، دیاربوو هەموویان لەگەڵ مەلا مستەفادا بوون دژی مەکتەبی سیاسی ئەو سەردەمە. لە ئینقلابێکی عەسکەریدا دەستیان گرت بە سەر مەقەڕی هێزدا. ملازم تاریق خۆی کرد بە ژوورەکەی رەئیس کەمال دا هێنایە دەرەوە، پێی وت:

" –برۆ."

لەگەڵ سێ پێشمەرگەی دەستەکەی بە ئوتومۆبێلێ بە رێیانکرد بەرەو ماوەت. ئەو کاتە مەکتەبی سیاسی لە ناوچەی (ماوەت) بوو. ئەویان دەرکردو (نوریی مەلا حەکیم) یان خستە شوێنی. ئەو بوو بە ئامر هێز لە قەرەداغ. دوای چەند رۆژێ کەوتنە گرتنی هەندێ لە کادرو مەسئوولەکانی حزب. دیاربوو ئەوەی لەگەڵ ئەواندا نەبووایە دەیانگرت. ئێمەش ئەوەمان بە لاوە سەیر بوو.! نەمان زانی چییە، بۆ دەیانگرن.؟

دوای ئەوەی کۆبوونەوەیەکیان پێکردین، بۆمان ئاشکرا بوو، وتیان:

" –مەلا مستەفا حەقی کوردی وەرگرتووە، ئیبراهیم ئەحمەدو ئەوان نایەڵن."

ئەو کاتە مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری حیزب بوو. وتیان:

" –ئەوان دژی رێکەوتنن نایانەوێ رێبکەوین."

هەموومان بڕوامانکرد، چونکە پێشمەرگەو خەڵك زۆر لە شەڕ بێزار بوون، خواخولیان بوو ئاشتی ببێ. دوای ماوەیەك وەها تێگەیشتین ئەوە بۆ لێدانی جەماعەتی مەکتەبی سیاسی بوو. مەلا مستەفا ناکۆکیی لەگەڵ ئیبراهیم ئەحمەد دا هەبوو.

---

[4] ١. جاران، کە گەنمو جۆ کۆدەکرایەوە لە لادێ، کەرو هۆڕی دێکەیان کۆدەکردەوە پێیان دەهێنایەوە.

[5] - نووری مەلا حەکیم خەڵکی سەرکۆی قەرەداغ بوو. ئەفسەر بوو، رایکردبوو بۆ پێشمەرگایەتی.

ئەوە بوو، (مەلا مستەفا) هێزی کۆکردەوە بۆ سەر (ماوەت)، چونکە مەکتەبی سیاسی لەوێ بوو. کە چوونە سەریان، هەموو هەڵاتن بەرەو ئێران. ئەوە بوو خەڵکو پێشمەرگە زانییان ئەوە ناکۆکیی نێوان مەلا مستەفاو مەکتەبی سیاسی یە.

دوای ئەوەی باڵی (م.س) رووبانکردە شاری (هەمەدان) لە ئێران، هەندێ پێشمەرگە لەگەڵیاندا رۆشتن. دوای ماوەیەك شەڕ لە نێوان (مەلامستەفاو حکومەتی عیراق)دا دەستی پێکردەوە. رژێم بە ماوەیەکی کەم هەموو ناوچە ئازادکراوەکانی گرتەوەو خستییەوە ژێردەستی خۆی، خەڵکیش باوەڕیان زۆر بە شۆڕش نەمابوو، چونکە شەڕی ناوخۆ کاردانەوەیەکی خراپی لە سەر خەڵك هەبوو. ئەو کاتە کورد شەڕی ناوخۆی نەدیبوو، کاریگەریی خراپی بۆ سەر خەڵك هەبوو.

لایەنگرانی حیزب (باڵی مەکتەبی سیاسی) زۆر بوون، رێکخستن زۆر بە هێز بوو. منو هەندێ لە هاوڕێکانم ئەو کاتەش، کە هەر پێشمەرگە بووین. بە نهێنی بووین بە لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسی. لەو دەمەدا من چوومە لای هاوڕێیەکم، (سەرپەل)مان بوو ناوی (عەریف مەحەمەد) بوو، خەڵکی شاری کەرکوك بوو، ئەویش بە هەموو پەلەکەیەوە بە نهێنی لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیی ئەو سەردەمە بوون.

## ٣

سەرەتای ساڵی ١٩٦٥ بوو. داوای مۆڵەتم کرد، کە بۆ ماوەیەك بڕۆمەوە بۆ لای کەسوکارم بۆ ژن هێنان. ئەو کاتە ماڵی خاڵم لە گوندی (ئاڵیاوە) بوو بەرامبەر شاری سلێمانی. دایکم خەڵکی ئەوێیە. چوومەوە لەوێ بۆ خۆم دانیشتم ژوورێکی خۆشم دروستکرد. لەوێ هەموو شتێکم تەواو کردبوو بە تەمابووم هەفتەی داهاتوو شایی ساز بکەم. مانگی چوار بوو. ڕۆژێ خۆم کرد بە ناو سلێمانی دا، بە دزییەوە چووم بۆ حەمامو سەرتاشین. چوومەوە بۆ ماڵی خۆمان. کاتی نیوەڕۆ بوو، دایکم لە ماڵەوە نەبوو، چووبوو بۆ بازاڕ. ئەوانەی لە ماڵەوە بوون زۆریان پێ وتم:

" –بۆ هاتوویتەتەوە؟!".

ئاگاداریو ئامۆژگارییان کردم لە دەرگای ماڵ نەچمە دەرەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو لە دەرەوە بوو بە تەقە. نەمزانی چی بوو.! لەوە دەترسام (منع التجول) بێ نەمدەزانی چی بکەم؟ لە پڕ چوومە دەرەوە بە نیازی ئەوەی رابکەمو روو بکەمەوە لادێ. لە دەرگای حەوشە سەرم بردە دەرەوە، تەماشامکرد پۆلیسو سەرباز لە بەردەرگا بوون، بە جارێك بیست کەس میلی تفەنگیان لێ هێنامەوە، گرتمیان. یەکسەر وتیان:

" –ئەمەیە."

قاتێ رانکو چۆغەی سورم لەبەردا بوو. (عومەری ساڵح مەنسور) تەقەی لە پۆلیسێ کردبووو رایکردبوو، وایانزانی من تەقەکەم کردووە. لە جیاتیی ئەو من گیرام، بەستیانمەوە بە دوای سەیارەکەیاندا. لەو کاتەدا دایکم هاتەوە، کە منی بینی بە دوای سەیارەکەوە بەسترابوومەوە، قیژاندیو دوایان کەوت. ئەوەم زۆر پێ ناخۆش بوو ئەو دیمەنەیم هەرگیز لە بیر ناچێتەوە. دایکم بەتەمام نەما بوو هەموو خزمان خۆیان بۆ شایی ئامادە کردبوو. شایی بوو بە شین. بردیانم بۆ مەرکەزی سەرا، لەوێ فڕێیاندامە ژوورێکی بچووکەوە. کاتێ هۆشم هاتەوە، ئەوانەی زیندان بوون لە وژوورەدا، هاتنە لامەوە، وتیان:

" –ئەوە بۆ گیراویت."

وتم:

" –نازانم .. هەر لە بەلاش گرتوومیان."

نەمدەوێرا قسە بکەم. کەسم نەدەناسی لەوانەی گیرابوون.

زۆری پێ نەچوو، هاتن بردیانم بۆ تێهەڵدانو ئەشکەنجەدان. ولیان لێکردم بێ هۆش بووم. هێنایانمەوە فڕێیاندامەوە هەمان ژوور. کە هۆشم هاتەوە، هەموو ئەو هاوڕێیانەی بە دیارمەوە بوون زۆریان پێناخۆش بوو. ژوورەکە زۆر بچووك بوو، نزیکی بیست کەسی تیا بوو، ئاودەستێکیش هەر لە نێو ژوورەکەدا بوو، پەنجەرەیەکی بچکۆلەش دەیڕوانیە سەر ئەو داڵانەی پۆلیسەکان خۆیان هاتوچۆیان تیادا دەکرد. ماوەیەك بەو شێوەیە بە ئەشکەنجەو لێدان مامەوە. دوای ماوەیەك ئەو برادەرانەم ناسی، کە لەگەڵمدا بوون لە زیندان. لەوانە (حەمەی سەید علی کارێزە، فەرەجی شیرین، بەکری حاجی فەرەج). تەنیا ئەوانەم لە یاد ماوە هەموشیان پێشمەرگە بوون. یەکتیریمان ناسی زۆر ڕێزیان لێ دەگرتم. دوایی براین بۆ سجنی گەورە. هاوڕێکانم هەموو جارێك پێیان دەوتم:

" –ئێمە بەر ئەبین، بەڵام تۆ مەگەر تەنەکەت بۆ لێبدەن ئەگینا بەرنابیت."

زۆری پێ نەچوو[66] من ئازادکرامو بەربووم. بەڵام هاوڕێکانم بەرنەبوون. من کەس‌و کارەکەم هەوڵی زۆریان بۆ دابووم. خۆشم ئیعترافم نەکردبوو هیچم بە سەردا ئیسپات نەبوو. دوای ماوەیەکی کەم ژنم هێناو لە ناو شاردا مامەوە، بەڵام ئەوەندەی نەبرد دیسانەوە چوومەوە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی. برادەرەکانم زۆریان پێ خۆشبوو چوومەوە لایان. ئەو کاتە، کە من چوومەوە دەرەوە، شەڕ گەرم بوو لەگەڵ ڕژێمی عێراق. ناحیەی قەرەداغ حکومەتی تێچووبوو. پێش گرتنم حکومەت لە قەرەداغ نەبوو. زۆری پێ نەچوو ئەندامانی باڵی مەکتەبی سیاسی لە ئێرانەوە گەڕانەوە بۆ ناو شۆڕش. زۆر لە پێشمەرگەو خەڵك زۆریان پێ خۆشبوو بۆ ئەو پێشمەرگانەی لە هەمەدانەوە

---

[66] - نزیکی سێ مانگ لەو زیندانەدا مامەوە.

گەڕابوونەوە. لەگەڵ گەڕانەوەیان زۆر شەڕی گەورەیان لەگەڵ سوپای ڕژێم کرد، بەتایبەتی لە شاخی (زۆزك‌و هەندرێن)، بەڵام لێپرسراوانی سیاسی‌و عەسکەری ئەو کاتەی ناو پارتی دیموکراتی کوردستان لە ناو کوردستان گەڕانەوەی ئەو سەرکردەو پێشمەرگانەی باڵی مەکتەبی سیاسییان زۆر پێ ناخۆش بوو، دەترسان جێیان پێ لێژ بێ. بۆیە کێشەیان بۆ دروست دەکردن. درۆیان بۆ مەلا مستەفا دەکرد، مەلا مستەفاش بڕوای پێ دەکردن. بە هۆی ئەوەوە هێزی پێشمەرگەی باڵی عەسکەری دووبارە کەوتنەوە گرتن‌و ڕاونانی ئەو کادرو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیی ئەو سەردەمەدا بوون. ئەمە لە قەرەداغەوە دەستی پێ کرد. ئەو کاتە (عەقید نوری)، کە ناسراو بوو بە (نوری کەڵەشێر) ـ ئامر هێزی قەرەداغ بوو. ئێمە، کە پێشمەرگە بووین لە لقی قەرەداغ، زوربەمان سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی بووین. ناچاریان کردین لە هێزەکەمان یاخی بین‌و چووین بۆ لای (مەلا مستەفا). سەد پێشمەرگە دەبووین. لە قەندیل بە مەلا مستەفا گەیشتین. ئەو بەرەو ماوەت دەچوو. ئەو کاتە (عەزیز ئەتروشی) لەگەڵ (مەلا مستەفا)دا بوو. لە (هەمەدان)ەوە گەڕابووەوە. کە ئێمەی بینی وتی:

" —وەرن لەگەڵم ئەتان بەم بۆ لای مەلا مستەفا."

مەلا مستەفا ئەو ڕۆژە گەیشتبووە (ئاوەکورتێ). کە ویسمان هەموو بچین بۆ لای، ڕێیان نەداین‌و وتیان:

" —تەنیا دوو سێ کەستان بچن بۆ لای."

ئێمەش نوێنەرمان نارده لای. کە لای (مەلا مستەفا) هاتنەوە زۆر پەشیمان بوون، چونکە هیچی بۆ نەکردین. وتبووی:

" —بگەڕێنەوە خۆم بروسکە ئەکەم بۆ ئامر هێزکەتان وازتان لێ بێنن."

ئێمە گەڕاینەوە بۆ قەرەداغ. لە ڕێ زۆر ناڕەزاییمان دەردەبڕی. تا چووینە گوندی (داراغا). لەوێ من چوومە ماڵی پوورم‌و لەوێوە بە نهێنی گەڕامەوە بۆ سلێمانی. ئەو کاتە ماڵمان لە گەڕەکی خەبات بوو. ئەو گەڕەکە زۆر قوڕو لیتە بوو. بە زستان کەس دەرنەدەچوو. کە چوومەوە ناو شار، زستان بوو، ئەو گەڕەکە چایخانەیەکی تیابوو بە ناوی چایخانەی (عەلی)[7]، هەموو گەنجی ئەو گەڕەکە لەوێدا ڕۆژو شەو خەریکی یاریی دۆمینە دەبوون. ئێمە چوار پێشمەرگە بووین، زۆربەی کات لەو چایخانەیەدا دادەنیشتین. یەکێکمان لە دەرەوە دادەنا ئاگادار بێ. ئەگەر ڕۆژێ باران بوولیە، گوێمان نەدەدایێ، چونکە خاوەنی چایخانەکە پیاوێکی چاك بوو. ئەو کاتە حکومەت ئەوەندە بە توانا نەبوو. لە ناو سلێمانیدا تەنها هەر پۆلیس هەبوو، ئەوانیش زۆر گوێیان نەدەدایێ، نەیان دەوێرا لە گەڕەکە میللیەکان نزیك ببنەوە. سێ مانگ لە

---

خەڵکی کرپچنەی بناری سەنگاوە، ئێستا کوڕێکی بێژەرە لە تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان.

سلێمانیدا مامەوە. ڕۆژێ هاوڕێیەکم، کە ناوی (فائق)[8] بوو، هات بۆ لام بۆ ماڵەوە. پێی وتم:

" -ئەبێ بگەڕێیتەوە بۆ دەرەوە بۆ لای برادەرانی خۆت."

وتم:

" -ئاخر ئەمگرن."

وتی:

" -ئەچم بۆ لای (عەقید نوری) پێی ئەڵێم. ئەزانم زۆر ڕێزت لێ ئەگرێ، چونکە حیزب منی ناردووە بۆ لای تۆ. ئەبێ هەموومان بگەڕێینەوە."

ئێمە ژمارەمان زۆر بوو لە ناو شار، لە حکومەتو لە شۆڕشیش قاچاغ بووین. ئەیانوت:

" -ئێوە حزبین."

ئەو کاتە (مەلایی)و (حزبی) لە ناو خەڵکیدا بووبوو بە باو. ئێمە ئەو کاتە حزبی بووین. لەبەر ئەوەی فەرمانی حزبمان بۆ هاتبوو، ناچار بووین جێبەجێی بکەین. بۆیە دووبارە گەڕامەوە بۆ دەرەوە. بۆ بارەگای هێز لە گوندی (جافەران)ی قەرەداغ. چووم بۆ لای (عەقید نوری)، دیار بوو ئەو هاوڕێیەم پێی وتبوو، کە ڕێزم لێ بگرێ. کە چوومە لای زۆر ڕێزی لێ گرتم. ڕاهاتبوو بە هەموو کەسی دەگوت کوڕم. بە منی وت:

" -کوڕم من ئێوە وەك کوڕی خۆم سەیر ئەکەم، من باوکی ئێوەم."

هەر سوێندی ئەوە بوو دەیگوت:

" -بە شەرەفی عایلەم."

وتی:

" -بچۆرەوە بۆ لقەکەی خۆت یان هەر لای خۆم بە."

منیش هەر دەمویست بچمەوە لای هاوڕێیانی خۆم. ئەو کاتە مقەڕی لق لە گوندنی (ئەوتی) بوو. خالید ڕەباتی لەوێ سەر لق بوو. هەر لقێ سێ پەل بوو. چوومەوە بۆ لای خالید ڕەباتی، کە پێشتر بە یەکەوە بووین. بەڵام، ئەو ماوەیەی، کە من لە وێ نەبووم ئەو لە سەرپەلەوە بووبوو بە سەرلق. کە چوومەوە وتی:

" -ئەم ماوەیە لە کوێ بوویت.؟"

وتم:

" -لە سلێمانی بووم."

وتی:

" -کەرمەزهەو چۆن وێراوتە لە سلێمانی بیت."

وتم:

" -لەوێ بووم."

---

[8]- شەهید بووە.

ئیتر زۆری پێ خۆش بوو، وتی:
" -ئەتەوێ لە کوێ بیت."
وتم:
" -ئەچمەوە بۆ پەلی دوو."
چونکە پێشتر هەر لەوێ بووم. سەر پەلێکمان هەبوو بە ناوی (عەریف محەمەد یوسف) زۆر کوڕی چاك بوو. زۆر ئازاش بوو. خەڵکی کەرکوك بوو. چوومەوە بۆ لای ئەو بۆ پەلی دوو. ماوەیەك مامەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو (نوری کەڵەشێر) گوازرایەوەو کەمال مفتی هات بوو بە ئامر هێز. ئەویش یەکێ بوو لەوانەی لە (هەمەدان) گەڕابووەوە. بەڵام مەلا مستەفا زۆر باوەڕی پێ بوو، کردی بە ئامر هێز. ئێمەش زۆرمان پێ خۆشبوو، چونکە بە هاوبیری خۆمانمان دەزانی. ئیتر بە ئاشکرا ئیشی حزبمان دەکرد، گوێمان بە کەس نەدەدا.
زۆری پێ نەچوو، وتیان:
" -مام جەلال‌و عەلی عەسکەری‌و عومەر دەبابەو حیلمی عەلی شەریف رایانکردووە. لە (دۆڵە رەقە) خۆیان شاردۆتەوە."
مەلا مستەفا ناردبووی بۆ گرتنیان. ئەوانیش خۆیان شاردبووەوە. ئیتر دیسانەوە بارودۆخەکە خراپ بووەوە.
ماوەیەکی پێ چوو وتیان:
" -مام جەلال‌و هاوڕێکانی لە سلێمانی خۆیان شاردۆتەوە."
رۆژێ من داوای مۆڵەتم کرد وتم:
" -ئەچم بۆ سلێمانی بۆ هەواڵ زانین."
عەریف محەمەد یوسف وتی:
" -بچۆ، بەڵام با کەس نەزانێ. ئەڵێم بە ئیش بۆ ئەو گوندانە چووە."
چەکەکەم داناو بەڕێ کەوتم بەرەو سلێمانی.کاتێ گەیشتمە گوندی (هۆمەرامان) لە بەری (بازیان)، تەماشامکرد هێزێکی گەورەی پێشمەرگە بەرەو ناوچەی قەرەداغ دەهات. چوومە گوندەکە، بینیم پڕ بوو لە پێشمەرگە. کەسیانم لێ نەدەناسی. پرسیارم کرد:
" -کێی لێیە.؟"
وتیان:
" -مام جەلال لێرەیە."
وتم:
" -لە کوێیە.؟"
وتیان:
" -وان لە ماڵی شێخ مەحەمەد."

ئەو کاتە شێخ مەحەمەد لە (هۆمەرامان) ماڵی هەبوو. بیرم کردەوەو وتم:
" –نامەم پێیە بۆ مام جەلال."
ئەگەر چی هیچم پێ نەبوو، بەڵام ناوی نهێنیم هەبوو. کە چوومە دیوەخانەکەی شێخ، تەماشامکرد مام جەلالو ژمارەیەك پیاوی تر دانیشتبوون. خۆمم پێ ناساندن، زۆریان رێز لێ گرتمو زۆریان پێ خۆش بوو. دەنگو باسو بارودۆخی ناوچەکەیان لێ پرسیم. پێم وتن:
" –زوربەی هێزی پێشمەرگەمان لەگەڵدایە."
چەند نامەیەکیان نووسی بیگەیەنم. لێم وەرگرتن. نامەیەکیان بۆ (حەمەی فەرەجی هەڵەبجەیی)[9] بوو، کە ئەو کاتە سەر لقی شارەزوور بوو. وتیان:
" –تۆ برۆ پێیان بڵێ ئەوە هاتووینو ئەو هەموو هێزەمان لەگەڵدایە."
هێزەکەی مام جەلال زۆر بوو، هەموو هێزی کاوەو رزگارییان لەگەڵدا هاتبوو. من گەڕامەوە بەرەو لای خۆمان بۆ قەرەداغ. لە رێگا گەیشتم بە رەئیس کەمالو هێزی گەرمیان. (سیامەندو ملکۆ)، کە دوو ئامر بەتالیونی گەرمیان بوون، بە هەموو پێشمەرگەکانیەوە بە دەستبەسەری لای رەئیس کەمال بوون. دیار بوو مام جەلالو هێزەکەی لە سەر داوای رەئیس کەمال پەڕیبوونەوە بەری قەرەداغ. ئێمە نەمانزانیبوو ئەوان بە پیر رەئیس کەمالەوە هاتبوون.
چووم بۆ لای رەئیس کەمال پێم وت:
" –مام جەلالو ئەوان هاتوون. وان لە پێشتانەوە."
وا دیاربوو ئەمان بە تەمابوون برۆن بۆ لای مام جەلال، بۆ هێزی رزگاری. ئیتر گەڕانەوە بۆ هێز. منیش چووم بۆ لای هاورێکانمو لە پێشەوە بارودۆخەکەم بۆ باسکردن، پێم وتن:
" –ئامادەبن، من ئەچم بۆ لقی شارەزور. ئێوەش هەر لە شوێنی خۆتان بن هەتا ئاگادارتان دەکەنەوە."
بە رێ کەوتم بەرەو شارەزوور. ئەو کاتە مەقەڕی لقی شارەزوور لە (ناوتاق) بوو. شەو گەیشتمە ئەو گوندە. هاواریان کرد:
" –کێی.؟"
وتم:
" –پێشمەرگەمو نامەی کاکە حەمەم پێیە."
کە چوومە پێشەوە، لێپرسراوی عەسکەریی لقی شارەزووری لێبوو، ناوی (عەبدوڵای مەلا عەلی)[10] بوو. زۆر برادەر بووین. ناوی لێنابووم (پەترۆڵ). وتی:

---

[9] - کاکە حەمەی فەرەج هەڵبجەیی، کە ئێستا نوێنەری مام جەلال ە بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی.

" –ما پەترۆڵ چۆنە بەم شەوە هاتووی. چی روویداوە.؟"
من بێ ئەوەی قسە بکەم، بردمە ئەو لاوەو لە پێشمەرگەکانم دوور خستەوەو بارودۆخەکەم بۆ روونکردەوە. زۆری پێ خۆش بوو وتی:
" –ئەی بۆ ئاگاداریان نەکردووین."
وتم:
" –هێشتا کەسیان ئاگادار نەکردۆتەوە، بەڵام ئامادەبن کێتان لەگەڵدا نیە ئاگاداری بن."
وتی:
"–کاکە حەمە لێرە نیە."
وتم:
" –خۆت ئاگاداربە، من ئەمشەو ئەڕۆمەوە بۆ لای برادەران."
کاتێ ئەو پەیامەم گەیاندە جێ، گەڕامەوە بەرەو قەرەداغ، مام جەلالو هێزەکەی هەموو لە بەری قەرەداغ بوون. هەموو هێزی قەرەداغ پەیوەندیی پێوە کردبوونو کەس بەرهەڵست نەبوو.

٤

هێزەکەی مام جەلال ماوەیەك لە ناوچەی قەرەداغ مایەوە تا سەرەتای ناوەڕاستی ١٩٦٦ کۆبوونەوەیان بە هەموو هێزی پێشمەرگەی ئەو ناوچەیە کرد. رایانگەیاند، کە لەگەڵ حکومەت رێکەوتوونو مفاوەزەیان کردووە. چەند رۆژێکی پێچوو مام جەلال لەگەڵ حیلمی عەلی شەریف چوون بۆ بەغداد بۆ رێکەوتن لەگەڵ حکومەت. شەوێك لە رادیۆی بەغداوە بە ناوی (مام جەلال)و (حیلمی عەلی شەریف)ەوە بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ خوێندرایەوە. خەڵکو پێشمەرگە زۆریان پێ خۆش بوو. ئەوەندەی پێ نەچوو زۆربەی هێزی پێشمەرگە لە ناوچەی سۆران پەیوەندییان پێوە کردن. لەو کاتەدا مەلا مستەفا بۆ ئەو رێککەوتنە دژیان نەوەستایەوە، زۆر ژیرانە وتی:
" –ئێمەش ئەوەمان پێ باشە."
بارو دۆخەکەی راگرت. حکومەت درۆی لەگەڵ کردن، هەر بۆ تێکدانی شۆڕش بوو نەك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد. ئەم جارەیان حکومەت زیاتر لە پارتی نزیك بوونەوە. بۆ ئەوەی شەڕەکە ببێ بە شەڕی کوردو کورد. راستیش هەر وا دەرکەوت.

[10] - لە دوای رێککەوتنی ١١ی ئازار خۆی بە تەنیا لە ماڵی برایم ئەحمەد بووە لە بەغدا، دوژمن چوونەتە سەری‌و لەناویان بردووەو سەرنوگونیان کردووەو بەداخەوە تەرمەکەشی نەدۆزرایەوە. کوڕێکیشی لەم شۆڕشەدا هەر شەهید بوو.

ئەوە بوو، بوو بە شەڕی مەلایی‌و جەلالی. بە دەیان‌و سەدان پێشمەرگەو فەرماندە لەو شەڕانەدا لە نێوان هەردوولا کوژران. ئیتر (جەلالییەکان) لە شارەکانەوە نزیك بوونەوە، چونکە (مەلاییەکان) شاخەکانیان هەبوو، ئێرانیش ئەو کاتە زیاتر پشتگیریی دەکردن بۆ ئەوەی هاوسەنگیی سیاسی‌و سەربازیی ناوچە هەرێمیەکە رابگرن‌و نەهێڵن (مەلاییەکان) لەگەڵ عێراقدا رێکبەکەون‌و شەڕەکە هەر بەردەوام بێ. ئەو ماوەیە عێراق بوواری بۆ رەخسابوو خۆی بەهێز بکات.

ئەو ماوەیەی، کە بوو بە شەڕی خۆکوژیی کورد، من لە سلێمانی دانیشتم‌و خەریکی کاری دارتاشی بووم. شەڕی نێوان مەلایی‌و جەلالی ماوەیەك بەردەوام بوو. جەلالییەکان لە ناو شارەکاندا زۆر بەهێز بووبوون، خەڵکی رۆشنفکریان لێ کۆببوونەوە، بیرو ئایدیۆلۆجیای (ماو)ی یان تیادا بڵاوببووەوە، حکومەتی عێراقیش هەستی بەوە کردبوو، ئەمانیش زۆر گوێیان لە بڕیارەکانی حکومەتی عێراقی نەدەگرت. (جەلالییەکان) کۆمەڵێ ناوچەیان لە (مەلاییەکان) داگیر کرد، وایان لێ کردن ئەوان تەنها سنوورەکانیان بەدەستەوە مابوو. جگە لەوە جیگای کۆمەڵێ خەڵکی مارکسیی ئێرانیشیان لە ناوچەکەدا کردەوە، کە لە (بەکرەجۆ) بارەگایان هەبوو. حکومەتی عێراقی هەستی کرد (جەلالیەکان) خەریکە دەبنە مەترسی. ئەوە بوو حکومەتی عێراقی بە نهێنی لە گەڵ مەلا مستەفادا رێکەوتن لە سەر بەیانی یانزەی ئازار. ئەوەش لەبەر خاتری کورد نەبوو، بەڵکو بۆ ئەوە بوو، کە شەڕی ناو شارەکان لە نێوان (جەلالی)و (مەلایی)دا دروست بێ. بەڵام باش بوو سەری نەگرت. چونکە مەلا مستەفا بەیانی لێبوردنی گشتیی دەرکرد، (جەلالی)ش بۆ ئەوەی شەڕ دروست نەبێ، لە هەموو ناوچەکان پاشەکشەیان کرد. پاشان جەلالی‌و مەلایی رێکەوتنەوەو بوونەوە بە یەك حیزب.

٥

مانگی ٨ی ساڵی ١٩٧١ بوو. مامۆستا (جەمال تاهیر) ئەندامی ناوچەی سلێمانی بوو، کە پێشتر جەلالی بوو. ئێوارەیەك یەکتریمان بینی. وتی:

" –ئەم ئێوارەیە دێم بۆ لات بۆ دوکان بە یەکەوە ئەچین بۆ پیاسە."

وتم:

" –باشە."

ئەو کاتە ئێواران باوی تووی مەلیك بوو بۆ پیاسەکردن. ماڵەکەشی هەر لە ژوور سەدەکەوە بوو[11]. بە پیاسەکردن ڕۆشتین کەوتینە گفتووگۆ کردن. مامۆستا جەمال وتی:

" -دەنگو باست چۆنە.؟"

وتم:

" -خۆم سەرقاڵ کردووە. لە دوکان ئیش ئەکەم."

وتی:

" -دنیا چۆن ئەبینیت.؟"

وتم:

" -دنیا خۆشە. ناخۆش نیە. ئەوەتا کورد بۆ خۆی حوکم ئەکا ئێوە حوکمەتن."

وتی:

" -پێت وایە ئەم گفتوگۆیە سەر ئەگرێ.؟"

وتم:

" -ئەی بۆ سەر ناگرێ."

بە دەم پیاسەکردنەوە زۆرمان قسەکرد، تا گەیشتینە ماڵەوە. ئەو کاتە مامۆستا جەمال ژنی هێنابوو کوڕو کچێکی هەبوو (کاروان‌و تریفە). لە ماڵەوە زۆر بە جدی کەوتینە وتووێژکردن. مامۆستا جەمال وتی:

" -تۆ لەو بڕوایە دایت، کە سەرکردەکانی کورد بتوانن شتێك بۆ کورد بکەن.؟"

وتم:

" -نە . بڕوا ناکەم."

وتی:

" بۆ؟"

وتم:

" -هەر ئەو دوو حیزبەیە، کە خۆمان لە ناویاندا بووین. چەند ساڵە کوڕی کوردیان لە بەینی یەکتردا داوە بە کوشت. ئیتر ئەبێ بەتەمای چی بین.؟"

وتی:

" -ئەی چی بکەین.؟"

وتم:

" -هیچ، بۆ خۆمان دانیشتووین."

وتی:

" -ئاخر دانیشتن باش نییە."

---

[11]- ئەو سەردەمە لە سلێمانیدا تەنها ئەو سەدەیە هەبوو، لە سەرووی گەرەکی برایم پاشاوە بوو.

وتم:
"–ئەی چی بکەین، ئەوەی لە تواناماندا بوو کردمان، ئەوەش ئەنجامەکەی بوو، کە بینیمان. ئەوە وتمان پارتی حیزبێکی عەشایەرە. خۆ حیزبەکەی خۆشمان هەموو رۆشنبیرن. ئەوەبوو، کە دیمان چی بوو. ئەوەش حیزبی شیوعی ئەوەیە، کە هەیە. ئیتر چی ماوە.؟"
وتی:
" –بۆ نایەی بە یەکەوە بۆ خۆمان کتێب بخوێنینەوە.؟"
وتم:
" –کتێبی چی.!؟"
وتی:
" –کتێبی شۆڕشەکانی دونیا. با بزانین ئەو گەلانەی دونیا چۆن رزگاریان بووە. من کتێبی باشم هەیە ئەگەر پێت خۆشە."
وتم:
" –باشە."
هەر ئەو شەوە بەرنامەیەکمان دانا لە ماڵی خۆیان هەفتەی دوو جار بچم. ماوەیەك بە یەکەوە بووین، رۆژێ وتی:
" –برادەرێکی ترمان دێت بۆ ئێرە."
کە هات من ئەم دەناسی، بەڵام ماوەیەك بە یەکەوە بووین بە ناوی (بەختیار)[12]. ماوەیەك هەر سەرقاڵی خوێندنەوە بووم، زۆرم پێ خۆش بوو، بابەتی کتێبەکانیش ئەوانەی (ماو تسی تۆنگ)و کتێبەکانی (مونیر شەفیق)و هەندێ کتێبی مارکسیو بەشی پێنجەمی کتێبەکەی (مام جەلال) بە ناوی (کورد بەرەو کوێ)، کە لە (بەیرووت) دەریکردبوو. ماوەیەك هەر وا ماینەوە. رۆژێك بە مامۆستا جەمالم وت:
" –باشە تۆ ئەڵێیت هەر کتێب خوێندنەوەیە. ئەگەر وایە من بۆچی هەموو جارێ بێم بۆ ئێرە. ئەگەر تاقەتم بوو هەر لە ماڵەوە کتێب ئەخوێنمەوە."
وتی:
" –بە یەکەوە باشە، بۆ خۆمان موناقەشەی ئەکەین."
دوایی وتم:
" –من پێم باشە حیزبێکمان هەبێ، ئەگینا چی بکەین.؟"
وتی:
" –نابێ، بۆ خۆمان جارێ هەر کتێب دەخوێنینەوە، با لە دونیا تێ بگەین."

---

[12] - بۆ دوایی وازی لە کۆمەڵە هێناو رێبازی (عیراقچێتی)ی پێرەو کرد.

ماوەیەکی تری پێ چوو، چەند برادەرێکی ترمان دۆزییەوە. ئەوانیشم هێنا، زۆریان هاوڕێ‌و خزم بوون. زۆرم بە خۆمەوە تووشکرد. ئەو کاتەش نەماندەتوانی لەگەڵ کەسێ قسە بکەین هەتا بە تەواوی لێی دڵنیا نەبووینایە. مامۆستا جەمال، کە زانی من زۆر جدیم، زۆری پێ خۆش بوو. لە ماوەیەکی کەمدا دوو حەلقەی سەقافیم لە خەڵکی باش بۆ کۆکردەوە. ئێوارەیەك کۆبوونەوەکانی تەواوکرد وتی:

" -تۆ جارێ مەڕۆ. لای برادەران بڵێ من جارێ نایەم."

لەبەر ئەوەی منی جیاکردبۆوە لەوان، برادەرەکانی تر هەموو ڕۆشتن. من مامەوە. وتی:

" -با پێت بڵێم! ئێمە ڕێکخستنێکمان دروستکردووە بە ناوی کۆمەڵەی مارکسیی لینینی، گۆشکراو بە بیرو باوەڕی (ماو تسی تۆنگ)، ناومان (کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان)ە.

ماوەیەك هەر بە پەیوەندی لەگەڵ مامۆستا جەمال بووم. پاشان ماوەیەکیش لەگەڵ (ئاسۆی شێخ نوری) بە یەکەوە کۆدەبووینەوە. ئەو کاتە کۆمەڵە لیژنەیەکی دروستکرد بە ناوی (لیژنەی سەدامی)، (عومەری سەی علی) لێپرسراوی بوو، من لەو لیژنەیەدا بووم. هەموو دەمانچەمان پێ بوو، بڕیار بوو ئەو کارانە بکەین، کە کۆمەڵە پێویستی پێ بوو.

زۆری پێ نەچوو، ڕۆژێ هەواڵمان پێ گەیشت، کە پاراستن (عومەری سەی عەلی)یان فڕاندووە. ئەو کاتە کاك عومەر مامۆستا بوو لە بازیان. هەر زوو زانیمان، کە پاراستن بردوویانە بۆ ناوچەی (چوارتا)، چونکە زۆر لە هاوڕێیانی خۆمان لە ناو پارتیدا بوون، تا دوای ماوەیەك ئازادیانکرد.

## ٦

لە ساڵی ١٩٧٤دا شەڕ لە نێوان (حکومەتی عێراق)و (پ.د.ك)دا هەڵگیرسایەوە. زۆربەی هاوڕێیانی کۆمەڵە چوونە دەرەوە، بە تایبەتی سەرکردایەتیی کۆمەڵە. پێیان ڕاگەیاندم، کە نابێ بچمە دەرەوە. منیش ڕازی بووم.

ئاسۆی شێخ نوری ئەویش لە ناو شاردا مایەوە. سلێمانی چۆڵ بووبوو ماوەیەك حکومەتیشی تیا نەمابوو. زۆری پێ نەچوو حکومەتی عێراق هاتەوە سلێمانی‌و لە ناو شارو دەسەڵاتی دامەزرایەوە. ڕۆژێکیان ئاسۆی شێخ نوری هات بۆ ماڵەوە بۆ لام، وتی:

" –کاك ئاوات، کاك عومەری سەی عەلی جوابی ناردووە بۆمان، کە بچین بۆ لای. وا لە گوندی (ژاڵە)یە، نزیك سلێمانییە."
ئەو کاتەش سەیارە نەدەبوو لە شار بچێتە دەرەوە. چونکە قەدەغە بوو لە لایەن رژێمەوەو تەقەی لێدەکرا. دەبوو هەر بە پێ بچووینایەتە دەرەوە. بە پێ بە یەکەوە چووین بۆ (ژاڵە). عومەری سەی عەلی لە ماڵێکی گوندەکە بوو، پێشمەرگەو خەڵکی زۆری لابوو. هەر لە خۆمەوە کەوتمە رەخنە لە لێپرسراوانی (پ.د.ك). دوای ئەوە، کە هاتینە دەرەوە (عومەری سەی عەلی) وتی:
" –کوڕی خوا ئەوە تۆ لە ناو ئەو هەموو خەڵکەدا ئەو قسانەت بۆ کرد، تۆ نازانی ئەوانە کێ بوون، ئەوانە هەموو جەماعەتی (فەتاح ئاغا) بوون.!؟"
منیش وتم:
" –جا با جەماعەتی ئەو بن، من ئێستا ئەڕۆمەوە بۆ سلێمانی تۆش ئارەزوی خۆتە."
دوای ماوەیەك وتووێژکردن، منو ئاسۆی شێخ نووری گەڕاینەوە بۆ سلێمانی. ماوەیەکی پێ چوو، شەوێك بە بێ ترس هەندێ نوسراوو دروشمی کۆمەڵەمان بە دووکانو ماڵەکاندا لە ناو شاردا بڵاوکردەوە. بەیانی، کە رۆژ بووەوە چووین سەیرمانکرد بزانین لێکراوەنەتەوە یان نا. بزانین تێڕوانینی خەڵك چۆنە لە سەری. بەیانی خەڵك بینیبوویان تووشی تێڕامان ببوون، بە لایانەوە سەیر بوو! ناوی هیچ حیزبێکی پێوە نەبوو. هێنی پارتی نەبوونو دژی حکومەتیش بوون. ئەو کاتەش حیزبی شیوعی لەگەڵ حکومەت لە جەبهەدا بوو.

## ٧

ئیشو کارەکانی کۆمەڵە زۆر بە باشی دەرۆیشتن. ساڵی بە سەردا تێپەڕیبوو. رێکەوتننامەی عێراقو ئێران لە جەزائیر مۆر کرا. ئەوە بوو شۆڕش ئەو کارەساتەی راگەیاند، کە پێی دەوترا (ئاش بەتاڵ)، لە هەمان کاتدا وڵاتی (ڤێتنام)یش ئیعلانی سەرکەوتنی خۆی کرد بە سەر گەورەترین هێزدا، کە ئەمریکا بوو. هەر لەو کاتەدا ئێمە وەك کۆمەڵە وتمان:
" –ئێستا هەلە، کە برادەرانی ئێمە نەگەڕێنەوە ناو شارو بەڵکو لە شاخ بمێننەوەو بەرگری بکەن. ئێمەش لە ناو شاردا چیمان پێ کرا دەیکەین."
هەموو رێکخستنەکانمان ئاگادرکردەوە، کە هاوڕێیانی خۆمان نایەنەوەو بەرگری دەکەن. زۆر لە هاوڕێیانی ناو شارەکانیش خۆیان ئامادەکرد، کە بچنە دەرەوە. بەڵام کاتێکمان زانی هاوڕێیانمان لە پێش خەڵکەوە لە شاخەوە گەڕانەوە ناو شار. بیانوویان

هەبوو، پێیان ڕاگەیاندین، کە لەو بارودۆخەدا بەرگری ناکرێ، چونکە هێزی پێشمەرگە هەمووی تێکشکاوە، دەبێ خۆمان لە سەرەتاوە دەست پێبکەینەوە.
بە گەڕانەوەی ئەو هاوڕێیانەی دەرەوە بارودۆخی ناوەوەی کۆمەڵە تێك چوو، چونکە هەندێکیان لە لایەن ڕژێمەوە ناسرا بوون، جگە لەوە هەر کۆمەڵە خویشی هەندێ لە هاوڕێیانیان دەرکردبوو، ئەو دەرکراوانە دەنگێکی گەورەیان دروست کردبوو، ئەوەش ڕۆڵی هەبوو بۆ تێکدانی ناو ریزەکانی کۆمەڵە.
دوای ئەوە زۆری پێ نەچوو گرتن دەستی پێکرد. ئاسۆی شێخ نوری گیرا. لە دوای ئەویش هەندێکی تریش گیران. ماوەیەکی پێ چوو لە بەغداد شەهید (ئەنوەر زۆراب)[١٣] یش گیرا. ئیتر بارودۆخی کۆمەڵە بە تەواوی خراپ بوو، دیاربوو سەرکردایەتیی ئەو کاتەی کۆمەڵە (شەهابی شێخ نووری)و ئەو هاوڕێیانی تر لە ناو خۆیاندا کۆبوونەوەیان کردبوو، گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی، کە دەبێ هەموو بچنە دەرەوەی وڵات بۆ ئەوەی مەترسی لە سەر کۆمەڵە نەمێنێ. هەر شارەی برادەرێکیان بۆ سەرپەرشتیاری ڕێکخستن دانابوو، خۆشیان بەرەو ئێران ڕۆیشتن. ئەوانەی چوونە ئێران شێخ شەهابو شێخ جەعفەرو فەرەیدون عەبدولقادرو عومەری سەی عەلیو عەلی بچکۆل بوون. دوو هاوڕێیان جێ مابوو، ئەرسەلان بایزو ئاوات عەبدولغەفور بوون. دوا جار ئەم دوانەش بە ڕێ کران بۆ لای ئەوان، گوایا لەوێوە دەچن بۆ سوریا بۆ لای (مام جەلال). ئەو هاوڕێیەی بە ڕێی کردن (عوسمانی نانەوا) بوو، کە لێپرسراوی کۆمەڵە بوو لە ناو شاری سلێمانی. جارێك هات بۆ لای من وتی:
" –هەموویان دەرچوون."
من پێم باش نەبوو، زۆرمان قسە لەسەر کرد، کە ئەو ڕۆیشتنە کارێکی خراپە، نەدەبوایە سەرکردایەتی حیزبێ هەمووی بڕواتو حیزبەکە بەجێ بهێڵنو بچن بۆ ئێران. ئەو کاتە سەردەمی (محەمەد ڕەزا شا) بوو. عوسمان وتی:
" –ئەو ڕۆیشتنە باشە، چونکە ئەوان بۆ ماوەیەکی کاتی ڕۆیشتوون، گوایە لەوێ کۆببنەوەو ئەوجا بگەڕێنەوە بۆ ناو کوردستانی عێراقو دووبارە دەست بکەنەوە بە شۆڕش."
ئەوانەی ڕۆیشتبوون ماوەیەك دەنگیان نەبوو. دوای ئەوە هەواڵمان بۆ هات، کە هەموویان لە لایەن ئێرانەوە دەستگیر کراون. لەوێ ماوەیەك لە شاری (سەقز) بەندکرابوون. دوایی بە بەندکراوی لە شاری (مەریوان)ەوە هێنایاننەوە بۆ (پێنجوێن)و درانە دەستی حکومەتی عێراق.

---

[13]- ئەو سەردەمە ئەندامی سەرکردایەتی بوو لە کۆمەڵە. کرێکاریی دەکرد لە بەغدا. بە نهێنیش هەڵقەی پەیوەندی بوو لە نێوان مام جەلالو موعارەزەی عەرەب لە بەغدا. لە گەڵ شەهید شەهابو جەعفەردا ئیعدام کرا.

ماوەیەکی پێچوو. ڕۆژێکیان عوسمانی نانەوا کەسێکی هێنا بۆ لام وتی:
" -ئەم برادەرە لای تۆ ئەبێ بۆ ماوەیەك."
وتم:
" -باشە بەخێربێت."
ئەو کەسەش (ئەبو شەهاب) بوو. ماوەی چل ڕۆژێ لای من مایەوە. ئەو ماوەیەمان بە گفتوگۆو قسەی خۆش بردە سەر. ڕۆژێ (ئەبو شەهاب) وتی:
" -تۆ شارەزای ناوچەی قەرەداغیت؟"
وتم:
" -بەڵێ."
وتی:
" -جێگای چەند کەس ئەبێتەوە.؟"
وتم:
" -ناوچەی قەرەداغ زۆر گەورەیە، بەڵام خۆ ئێستا هەموو گوندێ دەزگای بەعسی لێیە. ناتوانی بچیت بۆ گوندێ ئەگەر نەزانن کێیت!."
وتی:
" -ئەگەر بتوانین هەندێ چەك پەیدا بکەین وەك (ئاڕ بی جی)و چەکی تر."
وتم:
" -زۆر باشە، ئەو کاتە ئەتوانین بچین بۆ قەرەداغیش. هەرچەندێ بێت جێگا ئەبێتەوە."
ئێمە لەم گفتوگۆیەدا بووین، کە چۆن بتوانین چەك پەیدا بکەین بۆ شەڕ، لەو کاتەدا (زەینەب) وتی:
" -خوا بکات بێوەی بن."
منیش وتم:
" -ئێمە باسی (ئاڕ.بی.جی) ئەکەین تۆش باسی بێوەیی ئەکەیت."
ڕۆژێکی تر (ئەبو شەهاب) وتی:
" -من ئەڕۆم، ڕەنگە زۆرم پێ نەچێت بگەڕێمەوە."
چەند ڕۆژێکی پێ چوو، (ئەبو شەهاب) هەر نەگەڕایەوە.
بەیانییەکیان چووم بۆ دارتاشخانەکەم، لە ڕاستەبازاڕی حەوزە وشکەکە بوو، (ئیبراهیم حەسەن) هات بۆ لام وتی:

" –ئەوە چی ئەکەیت لە دوکان.؟"
وتم:
" –بۆ.؟"
وتی:
" –ئەی نەتزانیوە عوسمان گیراوە لەگەڵ چەند برادەرێکی تردا.؟"
وتم:
" –بە راستە.؟"
وتی:
" –بە خوا بە راستمە .. برۆ خۆت بشارەوە."
(ئیبراهیم حەسەن) ئەیزانی منو عوسمان ماوەیەك لەوەوبەر هەر بە یەکەوە بووین.
وتم:
" –جا من بۆچی خۆم بشارمەوە، بڕواناکەم ئەو هیچ لە سەر کەس بدرکێنێ."
ماوەیەکی پێ چوو هیچ رووی نەدا. بارودۆخی رێکخستن زۆر خراپ بوو، زوو زوو گوێم لێدەبوو دەیانوت:
" –ئەم شەو چەندین کەس گیراون."
زۆر ناخۆش بوو، کەس نەمابوو سەرپەرشتیی رێکخستن بکا، هەموو شانەکان لە یەك پچڕا بوون. بە هەواڵی تەسلیمکردنەوەی شێخ شەهابو ئەوان بە حکومەتی عێراقی، بە یەکجاری پشتمان شکا. هەر زۆر ناخۆش بوو، وتمان:
" –تازە تەواو."
ئەو کاتەش (ئیبراهیم خەلیل)[14]، کەسێ بوو لە کۆمەڵە دەریانکردبوو. کەس نەما بوو لە رێکخستن، هەموو لە یەك دابڕابوون. کەسێکی تریش هەبوو قوتابیی زانکۆی سلێمانی بوو، ناوی (ئیبراهیم حەسەن) بوو، ئەو کاتە لەگەڵ کۆمەڵە بوو، چالاکیی نەمابوو، بەڵام زۆربەی هاوڕێیانی کۆمەڵەی دەناسی بە تایبەتی لە ناو زانکۆی سلێمانیدا. زمانێکی زۆر لوسی هەبوو. لەگەڵ ئیبراهیم خەلیل دا یەکیان گرتبوو. ئەویش خەڵکی زۆر دەناسی، زۆربەی رۆژ دەهات بۆ لای منو (شوان)و (دکتۆر ساجید) پڕوپاگەندەی بڵاودەکردەوە. هەر باسی ئەوەی دەکرد، کە کۆمەڵە تەواو بووەو نەماوە. ئێمەش گوێمان لێ نەدەگرت. رۆژێکیان هات بۆ لامان سەیر دەکەین بەیانێکی بۆ هێناوین بە ناوی (رەنجدەران) وتی:
" –ئەمە تازە دەرچووە .. بیخوێننەوە."
کە خوێندمانەوە هەموو جوێنو قسەی نابەجێ بوو بۆ سەر سەرکردایەتیی کۆمەڵە. گوێمان پێ نەدا. ئێمە ئەو کاتە بۆ خۆمان بە یەکەوە کۆدەبووینەوە. ئەو هاوڕێیانەی

---

14- موزەمید بوو لە سلێمانی. ساڵی ١٩٧٧ شەهید بوو.

پەیوەندییان بە منەوە هەبوو هەمیشە کۆبوونەوەم لەگەڵدا دەکردن. لەگەڵ (شوان)[15] یش یەکترمان هەر دەناسی. من خەتێکی رێکخستنم لابوو بەردەوام کۆبوونەوەم لەگەڵ دەکردن، یارمەتیم کۆ دەکردەوە، دەمدا بە خێزانی ئەو هاوڕێیانەی بارودۆخی ژیانیان باش نەبوو. زۆر جار ئیبراهیم حەسەن دەهات بۆ لام نووسراوەکانی خۆیانی بۆ دەهێنام دەیوت:

" –سەیری بکە."

لە بەر ئەوەی بڕوام بەوان نەبوو، لە وەڵامدا دەموت:

" –من وازم هێناوە، چونکە هیچ ناکرێت، حیزبی بەعسیش زۆر دڕندەیە."

ڕۆژێك شوان وتی:

" –برادەرێك هاتووە بۆ لام ئێستا پێی ڕاگەیاندم، کە دەستکراوەتەوە بە ڕێکخستنەوەی شانەکانی کۆمەڵە لە ناو شاردا."

ئەو هەواڵەم زۆر پێ خۆش بوو، کە چالاکی ڕێکخستن دەستی پێ کردۆتەوە، هەر لە ڕێگەی (شوان)ەوە پەیوەندییان بە منیشەوە کردەوە. ڕۆژێ ئەوەندەم زانی شوان، جەمالی عەلی باپیری هێنا بۆ ماڵی ئێمە وتی:

" –ئەمە کاك جەمالی عەلی باپیرە خۆی شاردۆتەوە. با لە ماڵی ئێوە بێت."

وتم:

" –باشە."

خۆشمان لە خانویەکدا بووین، جگە لە ماڵی ئێمە ماڵێکی تریشی تیابوو هەردوو لامان کرێچیی ئەو ماڵە بووین. بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بوو، دەبوایە ئەوان بە هیچ نەزانن، چونکە نەیان دەزانی من خەریکی چیمو چی دەکەم. زۆر خەڵك دەهات بۆ ماڵمان، ئەوان هەر وایان دەزانی هاوڕێی خۆمنو بۆ سەردان دێن. دوو ژوورمان هەبوو، خۆمان لە یەك ژووردا بووین ئەوی تر هی میوان بوو. جەمالی عەلی باپیر لەو ژوورەدا بوو، دەبوایە هەر بە شەو بهاتایەتە دەرەوە بۆ ئەوەی ئەو ماڵە نەیبینن. (زەینەب)ی ژنم بە ڕۆژ دەچوو بۆ ماڵی باوکی هەتا ئێوارە، کە من دەهاتمەوە ئەویش دەگەڕایەوە. جەمالی عەلی باپیر دەرگاکەی لە سەر خۆی دادەخست. ئێوارەیەکیان هاتمەوە جەمالی عەلی باپیر بە پێکەنینەوە هاتە بەردەممو وتی:

" –وەرە شتێکت بۆ بگێڕمەوە."

وتم:

" –چی بووە.؟"

وتی:

---

[15] - شوان عملی، کە ژنبرای کاك نەوشیروان مستەفایە، لە مانگی ٩ی ساڵی ١٩٧٧ لە گوندی قازانقایە لەگەڵ پێنج هاوڕیی تریدا شەهید بوون.

" –ئەمڕۆ، کە زەینەب خان چووە دەرەوە، خێرا ئەو ژنەی ماڵتان هات و پەلاماری دەرگاکەی منی دا .. بۆی نەکرایەوە. چووە ژوورەکەی خۆتان هەموو ماڵەکەی دا بەسەر یەکدا. بۆ شت ئەگەڕا. من لە کونی دەرگاکەوە سەیرم ئەکرد. دەمانچەکەی منی دەرهێنا، ترسام بیبا، بەڵام باش بوو داینایەوە. ئیتر برنج و ڕۆن و شەکرو هەرچییەکی دەست کەوت بردی."

منیش دەستمکرد بە پێکەنین وتم:

" –قەینا گوێ مەدەرێ. هەر دەمانچەکەی تۆ نەبات، ئیتر چی ئەبات با بیبات."

دوای ئەوە دەمانچەکەمان بردە ژوورەکەی خۆی. ئەم ژنە هەموو ڕۆژ ئەمە کاری بوو. ئەوە نەبێ فەقیر حاڵیش بن. نەفسیەتی وابوو. ئێمەش قەد لە ڕوومان نەدەدا. جەمالی عەلی باپیر وەزعی زۆر ناخۆش بوو، چونکە نەیدەوێرا بێتە دەرەوە، لە بەر ئەو ماڵە. هەتا ڕۆژێکیان میزی کردبووە ناو پێڵاوەکانی خۆیەوە. منیش ناچار تەنەکەیەکم دایێ بۆ میزکردن. جارجار (ئاشتی)ی کچم دەیویست بچێتە ئەو ژوورە، ئەو کاتە تەمەنی دوو ساڵ بوو، کە جەمالی دەبینی لە ترسا دەی زریکاند، چونکە نەیدەزانی کەسێ لەو ژوورەدایە. هیوای کوڕیشم تەمەنی پێنج ساڵ بوو، گەورەتر بوو فامی دەکرد، دەیزانی. هەمیشە دەچووە لای، ئەوەندە گوێی لەو گرتبوو، ئەوەندە باسی بیرو باوەڕی (ماو تسی تۆنگ)ی بەرگوێ کەوتبوو، هەر پەڕە کاغەزێکی بدیایە دەیوت:

" –ئەوە بیرو باوەڕی ماوسیتۆنگە."

زیرەك بوو، دەیزانی ئەوانە خۆیان شاردۆتەوە. جاری وا بوو، کە ئەو ماڵە دەرۆشتنە دەرەوە، جەمال دەهاتە دەرەوە. لەو کاتەدا لە دەرگا بدرایە، هاوارمان دەکرد:

" –هیوا .. بڕۆ ئەو دەرگایە بکەرەوە."

نەدەچوو بیکاتەوە. چاوەڕێی دەکرد تا جەمال دەچووە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی لەو دیوەوە دادەخست، ئەوجا دەرگای دەکردەوە. برادەرانی خۆمان دەهاتن لێیان دەپرسی:

" –هیوا ئەو ژوورە کێی لێیە.؟"

دەی وت:

" –بە خوا کەسی لێ نییە."

دەیان وت:

" –باشە ئەچین سەیر ئەکەین."

دەی وت:

" –دایکم کلیلەکەی ونکردووە بۆمان ناکرێتەوە."

جەمال سێ مانگ لە ماڵی ئێمەدا مایەوە. لە دوایین ڕۆژدا (تەها باراوی) هات بۆ ماڵی ئێمە. یەك جانتای هێنا زۆر گەورە بوو لەوێ دایناو خۆی ڕۆشت. جەمال وتی:

" –با بزانین تەها چی پێچاوەتەوە بۆ پێشمەرگایەتی."

چونکە ئەویش خۆی ئامادەکرد بوو بۆ پێشمەرگایەتی. کە سەیرمانکرد هەر سەرمان سوڕما! ئەوەندەی شت پێچابۆوە بە دوو زەلام هەڵنەدەگیرا. ئیتر شتی زۆر سەیری تیابوو، من هەر لە بیرم نەماوە. بەشی یەك ماڵ شتی پێ بوو. ئەو شەوە تا بەیانی منو جەمال هەر بەو شتانەی تەها باراوی پێکەنین. خۆ پێکەنینەکەی جەمال هەر زۆر خۆش بوو.

ژیانمان لە مەترسی دابوو. لە بەر ئەوەی زۆر قەرەباڵغ بووین ناچار بووم ماڵەکەم ئیزن دا. باش بوو ڕۆشتن، خۆشمان ئازاد بووین. نەك هەر ئەو هاوڕێیانەی، کە دەهاتن، چونکە ماڵی ئێمە وەك مقەڕی لێهاتبوو.

جەمالی عەلی باپیر ڕۆیشت، کە ڕۆیشت زۆر بۆی بێ تاقەت بووم، چونکە هەموو شەوێ هەتا نیوە شەو بە یەکەوە دادەنیشتین.

چەند ڕۆژێکی پێ چوو، لە شەوێکدا شوان دوو کەسی هێنا بۆ لام من نەمدەناسین. ئەو دوو کەسە شەهید ئارامو فوئادی حاجی مەجید میسری بوون. خۆ شوان نەی دەتوانی کەس بەرێت بۆ ماڵی خۆیان، چونکە دایکی ڕازی نەبوو. تەنانەت کۆبوونەوەی خۆیشی هەر لە ماڵی ئێمە دەکرد، چونکە ئێمە وەك یەك ماڵ بووین. گەر کەسیش لە ماڵ نەبوایە، خۆی کلیلی ماڵی ئێمەی پێ بوو. ئارامو فوئاد میسری ماوەیەك بوو بە موختەفی پێکەوە لە ماڵی ئێمەدا بوون. دیاربوو فوئاد بێتاقەت بوو، کاری بەو چەشنە بەو نەدەکرا، پەشیمان بوو، هەر بۆڵەبۆڵی بوو. ڕۆژێ ئارام پێی وت:

" –کاکە گیان دوو ڕێگا هەیە بۆ خۆت هەڵی بژێرە. یان بڕۆ بۆ بەغداد لەوێوە بچۆ بۆ دەرەوەی وڵات. یان ئەتنێرینە لای مەفرەزەکانی دەرەوە بە تەماین لەم فەترەیە دەست پێبکەین بە ناردنە دەرەوەیان. تۆش بڕۆ بۆ شاخ. بیر لەم دوو ڕێیە بکەرەوە."

من لەگەڵیاندا دانیشتبووم، سێ قۆڵی بووین. فوئاد ئەقڵی ڕێگای دووەمی نەدەبڕی. زیرەکیش بوو، خۆی تووش نەدەکرد. یەکەمی هەڵبژارد، بەڵام لای ئێمە وای نەوت. بە (ئارام)ی وت:

" –ئەڕۆم بیری لێ ئەکەمەوە دوایی ئاگادارتان ئەکەمەوە.!"

هەر ئەوە بوو. کە لای ئێمە ڕۆیی، چوو بۆ بەغداد. زیادی برای ئەو کاتە لەگەڵ (شێخ ستار) بوو. لە حزبێکدا بوو بە ناوی حزبی شۆڕشگێڕان، کە سەر بە حزبی بەعس بوو. شێخ ستار ئەو دەمە پیاوی بەعس بوو. سکرتێری ئەو حزبی شۆڕشگێڕانە بوو، زیادیش یەکێك بوو لە سەرکردەکانیان. فوئاد، کە گەیشتبووە سەیتەرەکەی بەغداد ئەوان بە فێڵ چەند هاوڕێیەکی خۆیان ناردبوو بۆ سەیتەرەکە دایان گرتبوو لە بەر چاوی نەفەرەکانو بردبوویان بۆ مقەڕی (شێخ ستار). ئیتر هەواڵمان بۆ هات، کە فوئاد لە ڕێی بەغداد گیراوە. بەڵام ئێمە زانیمان، کە وانییە. گوێمان نەدایێ. دوای ئەوە پاش ماوەیەك ڕۆژێك لە بازاڕدا دیم لە دووکانێکدا دانیشتبوو لە بەر حەوزە وشکەکە، ویستم

قسەی لەگەڵ بکەم، رووی کرد بەو لاوە. ئیتر منیش گوێم نەدایێ. هاتمەوە بۆ (ئارام)م گێڕایەوە وتم:

" –ئەمڕۆ (فوئاد)م دیوە رووی کردووە بەو لاوە. وتی:

" –ئەوە لەرووی نەهاتووە قسەت لەگەڵ بکات."

ماوەیەکی پێ چوو رۆژێ فوئاد هەواڵی بۆ ئارام نارد، کە لە ماڵی ئێمە نەمێنێ، چونکە خەڵك زۆر دێ بۆ لای. با بچێتە ماڵێکی تر. (ئارام)یش لە وەڵام دا وتی:

" –زۆر سوپاس. خۆی وازمان لێ بێنێت. لە من نەترسێت."

ئەو کاتە یەك ماڵی ترمان نەبوو هەتا ئارام بچێت بۆ ئەوێ. ئەگەر بۆ ماوەیەکیش بوایە دەمانگواستەوە، لە بەر ئەو بارودۆخەی، کە لە ئارادا بوو. شوێن نەبوو. لەو رۆژانی سەختو ناهەمواریپەدا کەسێ نەبوو بۆ رۆژێ ئارام لە ماڵەکەی خۆیدا حەشار بدا.

ئەو سەردەمە هەر هاوڕێیەکمان، کە لە لایەن رژێمی بەعسەوە فرمانی گرتنی بۆ دەردەچوو، شوێنێك نەبوو خۆی تیادا حەشار بدا. ئەو رۆژانە ماڵی ئێمە مقەڕێکی نهێنی سەرکردلیەتیی کۆمەڵە بوو، رۆژانە چەندین هاوڕێ بۆ لای ئارام دەهاتن. من بۆ خۆشم دەترسام لەو هەموو خەڵکەی، کە بە شەوو بە رۆژ دەهاتن. بەڵام ئەوەی باش بوو ماڵەکەمان لە جێگایەکی زۆر باشدا بوو لە گەڕەکی (سەرشەقام)، کەوتبووینە کۆڵانێکی باریکەوە لە سەرووی مزگەوتی مەلا حوسێن. ماڵی ئێمە دیار نەبوو، زۆر جێگایەکی باشمان هەبوو، دەتوت ئەو ماڵە هەر بۆ ئەو بارودۆخە کراوە. گەر هەر کەسێ بهاتایە بۆ ماڵمان، چونکە لە پێچێکدا بوو، دیار نەدەما بۆ کوێ دەچێ. خەڵکێکی زۆریش هاتووچۆی پیادا دەکرد. ئارام کارەکانی زۆر بە باشی بە رێوە دەچوو، چونکە رۆژانە هەموو هاوڕێکان دەهاتن بۆ لای. کێی بویستایە دەهات بۆ لای. زۆر سەربەست بوو لە ماڵی ئێمەدا، کەس نەبوو ناڕەزایی دەربڕێ. (زەینەب)ی ژنم لە خۆم زیاتر رێزی بۆ هاوڕێکانم دادەنا. زۆری ئازاییەتییەکە لەوەوە بوو، ئەو نەبوایە من نەمدەتوانی بەو شێوەیە کار بکەم. خۆ ئەو لە رێکخستندا نەبوو، بەڵام هەر لە بەر رێزی من ئەو هەموو ماندوبوونەی قبوڵ دەکرد، روو بە رووی ئەو هەموو مەترسیە بۆ سەر خۆیو ماڵو منداڵو مێردەکەی بووەوە. بەعس زۆر دڕندەبوو. بێتوو رۆژێ ئاشکرا بووینایە، هەر بە ماڵو منداڵەوە دەیان سووتاندین. لە سەر ئەو هەموو مەترسییەوە هەر بە رووخۆشیەوە رێزی لە هەمووان دەگرت. وازمان لە ژیانی خۆمانو ماڵو منداڵو باوكو دایكو کەسو کارمان هێنا. هەموومان خستە ئەو پێناوەوە.

## ٩

بە هۆی ئەوەی، کە شەهید ئارام لە ماڵی ئێمە بوو کۆبوونەوەی کۆمیتەکان هەموو هەر لە وێ دەکران. خۆی سەرپەرشتیی کۆمیتەی هەرێمەکانی دەکرد. ئەو سەردەمە ئازاد هەورامی لێپرسراوی کۆمیتەی کەرکوك بوو، (حیکمەت)، کە نازناوەکەی لەلامان (مەلا بەختیار) بوو لێپرسراوی کۆمیتەی بەغدادو خانەقین بوو، بەڵام دڵنیا نیم بەغدادو خانەقین یەك کۆمیتە بوون یان جیاواز بوو، سالار عەزیز لێپرسراوی کۆمیتەی سلێمانی بوو، عەبدولڕەزاق لێپرسراوی کۆمیتەی هەولێر بوو. عەبدولڕەزاق جارجار بۆ کۆبونەوەکان نەدەهات، ناڕازی بوو، چونکە کاریگەریی هاوڕێیانی ناو زیندانی لە سەر بوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی زۆر قارەمان بوو. بە راستی ئارام نەبوایە کۆمەڵە داری بە سەر بەردەوە نەمابوو، هەمووی هەڵوەشابوو، کەس پەیوەندی بەکەسەوە نەمابوو. ئەو قارەمانە رۆشنبیرە گەورەترین رۆڵی دیارو لێهاتوانەی لە رێکخستنەوەی ریزەکانی کۆمەڵەدا هەبوو. ئەو سەردەمە ئەو رۆڵی سەرکردەی دەبینی، بە راستی بە کردەوە سەرکردە بوو. سەرکردەی کۆمەڵەو یەکێتیی ئەو کاتە ئەو بوو. ئەو سەردەمە لە دوای سالار عەزیز مەلا بەختیار بوو بە مەسئولی کۆمیتەی سلێمانی. من لە کۆمیتە نەبووم. ئەو ماوەیەی ئارام لەوێ بوو، کارەکان هەر من جێبەجێم دەکردن، لە ماڵی ئێمەش زیاتر هیچ شوێنێکی تر نەبوو. ئیتر من بووم بە ئەندامی (کۆمیتەی هەڵمەت). کۆمیتەی هەڵمەت یەکێ بوو لە کۆمیتە هەرە چالاکەکانی کۆمەڵە، سەرپەرشتیی هەموو کۆمیتەکانی تری دەکرد. ئارام بۆ خۆی دەچووە شانەکانی خوارەوە، کێشەکانی چارەسەر دەکرد. ئەو کاتە کۆمیتەی سلێمانی ناوی (کۆمیتەی هەڵمەت) بوو. (پێنج) کەس بووین، ئەندامەکانی بریتی بوون لە: مەلا بەختیار لێپرسراوی کۆمیتەکە بوو، منو دلێری سەید مەجیدو ئیبراهیم ئەحمەد وێنەگر بوو، بە ناوی بەختیارو ئازادی مەلاو شوان. ئارام وای لێهاتبوو، ئەگەر کەسیش لەوێ نەبوایە، خۆی کلیلی پێ بوو. هەر کەس بهاتایە بۆ لای لە کونی دەرگاکەوە دەیبینی. ئەگەر بۆ لای خۆی بهاتایە دەرگای بۆ دەکردەوە. ئەگەر نەشی ناسیایە گوێی نەدەدایێ. بەو شێوەیە لە کەرکوكو هەولێرو بەغدادو خانەقینو لە هەموو ناوچەکانی ترەوە دەهاتن بۆ ئەوێ. وا شارەزا بوو بوون، هەر لایەکیان بیانویستایە بێن بۆ لای، وەك چۆن بچن بۆ بارەگا، ئاوا دەهاتن بۆ ئەوێ.

لەو کاتەدا، کە خەریکی رێکخستنی مەفرەزەکان بووین، نامیلکەی (پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان) لەگەڵ (پەیڕەوی دامەزراندنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگایەتی) گەیشتە بەردەستمان. نامیلکەکان بە زمانی عەرەبی بوون. ئارام گۆڕینی بۆ زمانی کوردی. بە پێی ئەو نامیلکەی پەیڕەوە دەبوو مەفرەزەیەك دروست بکرێ، کە پێکبێ لە ئامر مەفرەزەو رابەرێکی سیاسی. ئەگەر بشکرێ بە پێی توانا دکتۆرێکیان لەگەڵدابێ. مەفرەزەکە ژمارەیان لە (پێنج) کەس کەمتر نەبێ‌و لە (پانزە) کەس زیاتر نەبێ. بە پێی ئەو پەیڕەوە دەبوو پێشمەرگە هۆشیاربن، زۆر دەست پاك‌و داوێن پاك‌و رەوشت بەرزبن، دەبوو خۆیان بە خزمەتکاری خەڵك بزانن. لەگەڵ دوژمنیش دەبوو زۆر توندوتیژبن. هەردوو نامیلکەی پەیڕەوی ناوخۆی یەکێتی‌و پەیڕەوی مەفرەزە سەرەتاییەکان ئامادەکرابوون بۆ چاپ. بەڵام تەنیا پێویستیمان بە ئامێرێکی (رۆنیۆ) هەبوو تا پێی راکێشین، کە ئەو کاتە نەمانبوو. من دەمزانی، کاتی خۆی ئامێرێکی (رۆنیۆ)مان هەبوو لای هاوڕێیەك بوو پێشتر زیندانی کرابوو لە بەغداد.

ئارام وتی:

" -مەگەر خۆت بچیت بۆ لایان‌و وەریبگریتەوە، چونکە بە ئێمەی نادەن‌و پێمان ناڵێن لە کوێیە."

وتم:

"باشە."

چووم بۆ بەغداد بۆ لای عومەری سەی عەلی‌و عوسمانی نانەواو ئاسۆی شێخ نوری. ئامێری رۆنیۆکە لای عوسمان بوو. ئەو دەمە شێخ شەهاب‌و هاوڕێکانی لە زیندانی بەغدا بوون. من، کە چووم بۆ بەغدا، هەر ئەو سێ کەسەم دی، کە باسم کردن. دانیشتم لەگەڵیانداو زۆرمان وتووێژ دەربارەی بارودۆخی کۆمەڵە کرد. من باسی کەسایەتی‌و لێهاتوویی (ئارام)م بۆ کردن، کە چەند دەوری گرنگ‌و باشی هەیە بۆ کۆمەڵە. وتم:

" -ئەگەر ئەو نەبولیە کۆمەڵە هەر نەمابوو. !"

وتیان:

" -مادام تۆیان لەگەڵ بی زۆرمان پێ خۆشە."

شوێنی ئامێرەکەیان پێ وتم. عومەری سەی عەلی شوێنی هەندێ چەکیشی پێ وتم، لە ناوچەی بەرزنجە، کە لای کێ دلیناوە. کاتی خۆی دوای کارەساتی هەرەسی شۆڕشی (ئەیلوول)، لەگەڵ (ئاسۆی شێخ نووری)ش هەندێ چەك هەبوون، کە من بۆ خۆم سندوقێکم بۆ دروستکردبوون‌و شاردبوومنەوە. پێم وت:

" -ئەی ئەو چەکانە لای کێن.؟"

پێی وتم لای کێیە. بەڵام وا دەرکەوت ئەو کەسە بۆ خۆی فرۆشتبوونی. دوای ئەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی. هەموو شتەکانم بۆ (ئارام) باسکرد. زۆری پێ خۆش بوو. ئینجا عەودالّی ئەوە بووم ئۆتۆمبیلێك پەیدا بکەم، ئامێری رۆنیۆکەی پێ بگوێزینەوە.
لەگەڵ شوان چووین بۆ بازاڕ وتی:
" –وەرە ئەچین بۆ لای (حەمە عەلی)ی خاڵم. ئەو (تەکسی)ی پێیە ئەیبەین. خۆ ئەگەر نەشیەت قسە ناکات."

وتم:
" –باشە."

ناچار بووین (حەمە عەلی)مان بردو چووین، ئامێرەکە لە ماڵێك بوو لە گەڕەکی خانووە قوڕەکان. ناونیشانم دایەو چووین. ئەویش خواخوای بوو لە کۆڵی بێتەوە. لە چاڵێ دەرمهێنا، کاتی خۆی من خۆم سندوقێ وەهام بۆ دروست کردبوو هیچ شتێك کاری تێ نەدەکرد. کە دەرم هێنایەوە هیچی لێ نەهاتبوو، بەڵام زۆر قورس بووبوو. هێنامەوە بۆ ماڵی خۆمان. ئامێرێکی چاپیشی لێبوو ئەو کاتە سالارو سوارە ئەحمەد چاپیان لە سەر دەکرد. بە راستی ئەو کاتە سوارە زۆر چالاك بوو، بە پاسکیلێکەوە زۆربەی چالاکییەکانی جێبەجێ دەکرد، زۆر وریا بوو. ماوەی دوو هەفتە سەرقاڵی ئەو کارە بوون. هەموو نوسراوەکانیان چاپکرد. رۆژانە هەر خەریکی ئەوە بوون. سوارە زیاتر کارەکانی دەرەوەی دەکرد، دەچوو کاغەزو حیبرو ئەوەی پێویست بوایە بە پاسکیل دەی هێنا. هەر چۆنێك بوو کارەکان تەواو بوون، هەموومان جیاکردنەوە، هەر شارەو بەشی خۆیمان پێگەیاندن. هینی پێشمەرگەش بە جیا، چونکە بەتەمابووین مەفرزە سەرەتاییەکان بنێرینە دەرەوە. لەو هاورێیانەی رووبانکردە شاخ، سالار عەزیزو ئازاد هەورامی لوانەبوون، کە چونە شاخ. هاورێیانی دەرەوەش هەر پەلەیان بوو دەست پێبکەین، چونکە ئەوانیش هەموو شتیان ئامادە کردبوو. لە سوریاوە پەیوەندی لە نێوان مام جەلال‌و کاك(ئارام)دا هەبوو. ئارام نامەی مام جەلالی پیشاندام. زۆر جار بۆ زۆر شت پرسیاری لە من دەکرد، دەیوت:
" –تۆ تەجروبەت هەیە لە پێشمەرگایەتی."

زۆر بڕوای بە من هەبوو، رای وەردەگرتم. بە راستی زۆر زیرەك بوو، زوو خەڵکی دەناسی، یەك جار کەسێکی بدیایە، دەیزانی چییەو چیی لەباردایە. هەر لەو کاتەدا بەیانییەکی زوو بوو، لە خەو هەڵنەستابووین، کارەکانیش هەموو تەواو نەبووبوون، دابەش نەکرابوون، هەموویمان لە یەك ژووردا هەڵچنی بوو. لە دەرگا درا. (زەینەب)ی خێزانم چوو دەرگاکەی کردەوە، منو ئارام‌و سالار لە هەیوانەکەدا نوستبووین. گوێم لێبوو خوشکێکی (زەینەب) بوو، نەمزانی بەو بەیانییە زووە بۆ چی هاتووە! زەینەبیش هەموو رۆژەکە لە ماڵەوە بوو، خواردنی دروست دەکرد. ئەو کاتە هەر دوو منداڵمان هەبوون هیواو ئاشتی. زەینەب ئێواران هەر دوو منداڵەکەی هەڵدەگرت‌و

دەچوو بۆ ماڵی باوکی. باش بوو ماڵی باوکی زۆر دوور نەبوو هەر پەنجا مەتر لە ماڵی خۆمانەوە دوور بوو. کە لە دەرگاکە درا، من بە ئاگا بووم، گوێم لێبوو بە (زەینەب)ی وت:

" -دز ماڵێکیان بڕیوەو شتەکانیان لەو لای ماڵی ئێوەوە فڕێدلوە."

ئیتر ئەو هاتە ژوورەوە. دەیزانی من خەریکی چیم، چونکە ڕۆژانە دەیبینی ئەو هەموو خەڵکە دەهاتن و دەچوون. زەینەب هات وتی:

" -هەڵسە ئەوە ماڵێکیان بڕیوەو شتەکانیان لە کەلاوەکەی لای ماڵی خۆماندا فڕێ داوە."

کە چووم سەیرمکرد ڕاستە، بە پەلە هاتمەوە، ئارام و سالارم هەڵساند، وتم:

" -هەڵسن با بڕۆین."

وتیان:

" -بۆ    چی بووە.؟"

کە بۆم باس کردن، ئارام وتی:

" -سەیرە بە دوای دزدا بگەڕێن، ئێمە بگرن.!"

لەو کاتەدا ماڵی (شوان)یش هەر دراوسێی خۆمان بوون. نەمزانی زەینەب لە کوێوە هەندێ شتی فڕاندبوو بۆ ئەوێ. بۆ (شوان)یشی باسکردبوو. ئەو (ڕۆنیۆ) گەورەیەی نابوو بە سەر شانییەوە دەیویست بیبات بۆ ماڵی باوکی. هەر نازانم چۆن بۆی هەڵگیرا بوو! ئارام وتی:

" -ئەوە تۆ چی ئەکەیت، بە خوا ئێستا هەر دراوسێکان شکاتمان لێ ئەکەن ئەڵێن ئێمە خۆمان دیمان شتەکانیان گواستەوە.!؟"

ڕاستیشی دەکرد. زەینەب ئامێرەکەی دانایەوە. وتم:

" -هەستن با خۆمان بڕۆین. ئەگەر هەر شتێك بوو، با ئێوە دەرچن."

بە (زەینەب)م وت:

" -ئێمە دەچین بۆ فلانە شوێن، ئەگەر هیچ نەبوو، وەرە بە دواماندا ئەگەر گیران ئەوە ئێوە تیا ئەچن."

لە بەرئەوەی زۆرخەتەر بوو، لەوە دەترساین ماڵەکان بپشکنن بۆ شتی ماڵەکە بگەڕێن و بکەون بە سەر ئەو هەموو شتەدا. ئێمە ڕۆیشتین بۆ ماڵی (مەحمودی کاکاو) لە سەرشەقام. ماڵی خوشکم بوو، مەحمود خۆشی هەر ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو. نیوەڕۆ زەینەب هات وتی:

" -پۆلیس هات و هەموو شتە دزراوەکانی کۆکردەوە و ڕۆشتن."

باش بوو چووینەوە بۆ ماڵەوە هیچ رووی نەدابوو.

بیر لەوە کرایەوە، کە چۆن مەفرەزە بنێرینە دەرەوە. مام جەلال‌و هاوڕێیانی دەرەوە مەفرەزەکانیان بە سەرکردلیەتیی (ئیبراهیم عەزۆ) ناردبوو. نامەیان ناردبوو بۆ ناوەوە، کە ئەوان (ئیبراهیم عەزۆ)یان لەگەڵ چەند کەسێکدا، ناردووە بۆ ئەوەی ئێمەش لە ناوەوە پەیوەندییان پێوە بکەین. ناوی هاوڕێیەکیان هێنابوو لە (بادینان)، کە لە رێگەی ئەوەوە بتوانین بیانبینین. پێم وابوو یەکەم جار (ئازادی سەگرمەمان) نارد بۆ لای ئەو کەسە. ئەو کەسە هەر ئاگای لە هیچ نەبوو، چونکە هیچی بە دەست نەگەیشتبوو. یەك دوو جار هەوڵدرا بێ سود بوو. (ئیبراهیم عەزۆ)و هاوڕێکانی هەموو شەهید کرابوون‌و هەر نەگەیشتبوونە ئەوەی پەیوەندیمان پێوە بکەن. لە ناوەوە دیسانەوە هاوڕێیەکمان ناردەوە بۆ دەرەوە بۆ لای مام جەلال. مام جەلال نامەی ناردبوو، کە پەیوەندی بە چەند کەسێکەوە بکەن، لە نامەکەیدا ناوی بردبوون. بە هەر حاڵ، لە ناوەوە چالاکیی چەکداریمان دەست پێ کرا.

یەکەم مەفرەزە لە ناوچەی هەڵەبجە، پێکهاتبوو لە: شێخ عەلی (خولە کەشکۆڵ)، عەلی شیعە، شەوکەتی حاجی موشیر، حامیدی حاجی غالی، دکتۆر رەزا، محەمەدی حاجی مەحمودو فاتیح.

شێخ عەلی (خولە کەشکۆڵ) لێپرسراوی سیاسیی مەفرەزەکە بوو، عەلی شیعە لێپرسراوی عەسکەری بوو. ئەوانەی مەفرەزەکەیان پێکهێنا هەر خۆیان چەکیان بۆ خۆیان پەیداکردبوو. ئەو دەمانە چەك زۆر کەم بوو، پارەش نەبوو. حیزبی بەعس دوای هەرەس هەموو چەکەکانی کۆکردبووەوە. زۆر بە سەختی‌و دژواری چەك پەیدا دەکرا. ئەگەر یەك فیشەك بە هەر کەسێ بگیرایە، یەکسەر لە سێدارە دەدرا. لە بەرئەوە چەك هەر نەمابوو. مەفرەزەی دووەم لە ناوچەی سلێمانی بوو، کە جەمالی عەلی باپیر پێکی هێنا. سێیەم مەفرەزە ئەوەی ئەنوەری مەجید سوڵتان بوو. دوای ئەو مولازم ستار. پاشان مولازم جوامێر، بەڵام دواتر گەڕایەوە بۆ ناو سلێمانی، چونکە چەکەکانیان دەستنەکەوتبوو.

مەفرەزەی تر یەك بە دوای یەك نێردرانە دەرەوە، بریتی بوون لە (مولازم تایەری عەلی والی بەگ) لەگەڵ خزمەکانیدا. ئەوانەی، کە لە سەرەتاوە لەگەڵی چوونە، ئەمانە بوون: ئەنوەری سەعید بەگو بەختیاری برای، رەئوف بەگ، رۆستەمی برای. هەروەها عوسمانی قادر منەوەر. ئەمانە هەموویان پەیوەندییان بە (عەلی عەسکەری)یەوە بوو. لە ناوچەی کۆیەشەوە دکتۆر خالید لەگەڵ سەعدی گچکەو سەی کاکەو عومەر دەبابە. لە ناوچەی رانیەو قەڵادزەشەوە ئاغاکانی میرلودەلی، حاجی حاجی ئیبراهیم‌و رەسوڵ مەمەند. وەك لە یادم مابێ سالار عەزیزو جەمالی عەلی باپیر بە رێ کران‌و ئازاد بردنی بۆ (خەمزە) بۆ ماڵی دوو هاوڕێمان، کە خەڵکی ئەو گوندە بوون: حامیدو ئیسماعیل،

هەردوو کۆمەڵە بوون‌و زۆر دڵسۆز بوون. تاکو کۆبوونەوە لەگەڵ هاوڕێیانی تریاندا، کە بڕیاربوو لە شار بچنە دەرەوە بە موختەفیێتی هەر لەو دووماڵەدا مانەوە.

## ١٢

ڕۆژێ شێخ محەمەدی باخ، کە نازناوەکەی (شەماڵ) بوو هات بۆ ماڵی خۆمان، نامەیەکی لە (عەلی عەسکەری)یەوە پێبوو بۆ (ئارام). (ئارام) لەگەڵی چوو بۆ ماڵێ نازانم لە کوێ بوو، کە هاتەوە وتی:

" –عەلی عەسکەری بوو، ئەیەوێت بچێتە دەرەوە، هەر خۆی نییە زۆرن، جارێ هەر خۆی ئەڕوات دوایی خۆی جوابیان بۆ ئەنێرێت، کە بڕۆن. ئەڵێ ئێمە چەند برادەرێکین کۆبووینەتەوە ناوی هیچ ڕێکخستنێکمان نیە، هەر یەکمان گرتووە، هەتا ئەچینە دەرەوە. جارێ من بە پشتی ئێوە ئەچمە دەرەوە، چونکە ئێوە کۆمەڵەن. ئەزانم ڕێکخستنێکی باشن. من لەگەڵ کاک (شەهاب)و ئەوان کاتی خۆی قسەم کردووە. ئێستا ئەوان لە زینداندان. ئێستاش من هەر خۆم‌و دەمانچەیەکم."

دیاربوو (ئارام) ڕەوانەی گوندی (شەدەڵە)ی کردبوو. کاک شێخ محەمەدی باخ (شەماڵ) لەگەڵیدا چووبوو، کە بیگەیەنێتە لای کاک (سالار عەزیز)و هاوڕێکانی. لەو کاتەشدا (فەقێ ئیسماعیل) یاخی بووبوو لە گوندی (یاخیان) بوو.

(ئارام) ڕۆژێ پێی ڕاگەیاندم وتی:

" –ئەبێ بچیت بۆ لای فەقێ ئیسماعیل. سەرەتا بچۆ بۆ (هەڵەدن) بۆ لای (عەبدولقادری حاجی)، برادەری خۆمانە، پێی ڕابگەیەنە، کە لەمەودوا برادەرانی خۆمان دێن بۆ لات، ماوەیەك لەوێ ئەبن تا بە تەواوی کۆئەبنەوە ئەوجا خۆیان ئاشکرا ئەکەن. ئەو ئەتبات بۆ لای فەقێ ئیسماعیل ئەو ئەزانێت لە کوێیە."

ئەو کاتە وەرزی هاوین بوو، ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو، منیش لە سلێمانییەوە دەرچووم‌و کەوتمە ڕێ، ئەشارەزا بووم، سوارەی ئەحمەدی بەلەدیە هات لەگەڵم. دوای نیوەڕۆ بوو بە یەکەوە ڕۆیشتین. ئەو کاتە پیکابێ هەبوو ڕۆژی جارێ دەچوو بۆ (شەدەڵە)، ئیتر نازانم هینی ئەوێ بوو یان هەر بە سەفەر دەچوو. چووین سوار بووین هەتا چووینە شەدەڵە. لە ڕێگا چایخانەیەکی لێبوو لە وێ وەستا. پیکابەکە پڕ بوو لە خەڵکی ئەو گوندانەی سەر ڕێگای شەدەڵە. من‌و (سوارە)ش هەر لەو چایخانەی سەر ڕێگایە لەگەڵ خەڵکەکە لە پیکابەکە دابەزین، بە شاخەکەدا سەرکەوتین بەرەو (سەرگەڵو)و چووینە (هەڵەدن).

لە ڕاستیدا من پێشتر (عەبدولقادری حاجی هەڵەدنی)م نەدی بوو، پرسیارمکرد وتیان:

" –ئەوە ماڵەکەیانە."

چووینەماڵەوە. خۆی لە ماڵ نەبوو وتیان:
" -چووە بۆ ناو ئاوایی."
چوون بەدوایدا بانگی بکەنەوە. چەند دوکانێ لە بەردەم ئاواییەکەدا هەبوو، هەموو پیاوی گوندەکە لە بەر ئەو چەند دوکانە وەستابوون، ئەویش لەوێ بوو. کە هاتەوە بە خێرهاتنی کردین. لە دووکانەکان دوورمخستەوەو بردمە پەنایەکەوەو پێم وت:
" -من (ژیلوان)م. هاتووم بۆ لات."
(ژیلوان) ئەو ناوە نهێنیەبوو، کە لە نێوان رێکخستنی شارو (عبدالقادری حاجی هەڵەدنی)دا بوو.
عەبدولقادری حاجی هەڵەدنی زۆر بەخێرهاتنی لێکردین. ئێمەی بردەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئێوارە نانمان خوارد. من پێم وت:
" -فەقێ ئیسماعیل ئەناسی؟"
وتی:
" -بەڵێ .. بۆ چیتە؟"
من باسی خۆمانو ئیشو کارەکانمانم بۆ کرد، کە ئیتر خەباتی چەکداری دەست پێ دەکات. من پێم وت:
" -برادەران دێن بۆ لای جەنابت .. دەوری پانزە کەسن. کاك سالار عەزیز مەسئولی کۆمەڵەیە. کاك جەمالی عەلی باپیرەو کاك عەلی عەسکەرییو هەندێ برادەری تریشن."
ئەو زۆری پێ خۆش بوو وتی:
" -بۆ ئەوە ئەچیت بۆ لای فەقێ ئیسماعیل؟"
وتم:
" -بەڵێ. ئەڵێن لە حکومەت یاخی بووە، ئەمەوێ بچم قسەی لەگەڵدا بکەم."
ئەویش زۆری پێ باش بوو وتی:
" -وا لە گوندی (سێ دەر). ئەبێ هەر ئەم شەو برۆین ئەگینا بەیانی هەر لەو دۆڵەدا لە تینوودا ئەخنکێین."
منیش پێم خۆش بوو. بۆ ئەوەی بەیانی هەر لەوێوە بگەڕێمەوە بۆ سلێمانی. شەو بە رێ کەوتین. (سوارە) لەگەڵم نەهات، وتم:
" -تۆ بۆ خۆت لێرەبەو بەیانی بە رێی خۆتدا بگەڕێرەوە."
هەر بەو شەوە بە رێ کەوتین. باش بوو مانگە شەو بوو. ئەوەندەش دوور بوو هەر زۆر ماندوو بووم. جوتێ پێڵاوی پاژنە بەرزم لەپێدا بوو. هەر بە رێوە بووین تا بۆ بەیانی گەیشتینە (سێ دەر). ماڵی فەقێ ئیسماعیل لە ناو گوندەکەدا لە خواری هەموو ماڵەکانەوە بوو. هەر لە شاخەکەوە چووینە خوارەوە. تەماشامانکرد فەقێ ئیسماعیل لە بن دارێکدا دانیشتبوو، دەرپێیەکی سپیی لەپێدا بوو، خەریکی توتن لێدان بوو. شریتی دەکرد. دوو ژنی هەبوو. منی نەدەناسی. عەبدولقادری هەڵەدنیو کوڕێکی

ترمان لەگەڵ بوو ناوی سەلیم بوو، کوڕێکی گەنج بوو. ئەویش خەڵکی هەڵەدن بوو. شەو لەگەڵمان بوو ئەویش هەر لە ریزی یەکێتی بوو. پاشان لەگەڵ فەقێ ئیسماعیل دا کەوتینە گفتوگۆ، باسی ژیانی خۆیم لێ پرسی، کە وەزعی چۆنەو لەوێ چۆن دەژی؟.
لە وەڵامدا وتی:
" -دەبێ ژیانی من چۆن بێ، وەزعی خەڵکی لادێ ئەبێ چۆن بێ. ئەوەیە، کە ئەیبینی."
ئیتر عەبدولقادری هەڵەدنی پێی وت:
" -ئەم برادەرە لە سلێمانییەوە هاتووە بۆ لای جەنابت. ئێمەش لەگەڵ ئەو هاتووین‌و ئەیەوێت هەندێ قسەت لەگەڵ بکات. خۆتان دائەنیشن یان ئێمەش ئاساییە.؟"
وتم:
" -بە نسبەت منەوە ئاساییە."
ئەویش وتی:
" -منیش بە هەمان شێوە."
پاشان وتی:
" -فەرموو بەخێر بێیت."
هەستاین چووینە بن دارێکی تر. زۆرم قسە بۆ کرد. باسی خۆمانم بۆ کرد. باسی دەوری عەشیرەتی (جاف)م بۆ کرد لە شۆڕشی کورددا. بە هەرحاڵ، زۆر هەوڵمداو باسی شۆڕشی پێشووم بۆ کردو ئەو نەکەسەیەی، کە بە سەریدا هات‌و حیزبی بەعس چیی بە کورد دەکا. وتی:
" -راستە وایە."
وتم:
" -با ئەو مژدەیەت بدەمێ، ئەوە شۆڕش دەست پێئەکاتەوە. بۆ ئەوەش هاتووم بۆ لای بەڕێزت، تۆ وەك پیاوێکی قارەمان سەرت بۆ حیزبی بەعس شۆڕنەکردووە، حزب زۆر بە رێزەوە ستایشی هەڵوێستی جەنابت دەکات." زۆرم قسە بۆ کرد. دوای ئەو هەموو قسەیە، لە وەڵامدا وتی:
" -من زۆر سوپاسی حزب ئەکەم، کە جەنابتی ناردووە بۆ لای من. زۆر بڕواشم هەیە بەوەی، کە ئێوە ئەمجارە کورد رزگار ئەکەن، چونکە هەمووتان خەڵکی گەنج‌و خوێندەوارن."
ئیتر نازانم چۆن باسی ئەوەی کردو چۆن دەیزانی وا باسی دەکرد. لە خۆم زیاتر وەسفی کردین. ئەوجا وتی:
" -زۆر بە داخەوە. دوو رۆژ پێشتر بهاتیتایە، چونکە دوێنێ برادەرێکی (پ. د.ك) هات بۆ لام. نامەی کاك (ئدریس بەرزانی)ی بۆ هێناوم، لەگەڵ هەندێ بەیاندا. منیش وەعدم دایە، کە لەگەڵیاندا بم. بەس من زۆر بڕوام بە ئێوە هەیە، کە کورد رزگار ئەکەن. خۆ

تۆ بۆ خۆت ئەزانیت، کە ئێمە عەشایەرین. بەڵێنماندا ناتوانین پەشیمان ببینەوە، بەڵام وەعد بێت بە برادەرانتان رابگەیەنە، کە هاتنە ئەم ناوچەیە، من خۆم هەموو یارمەتییەکیان ئەدەم. ناتوانم لەگەڵ ئێوەبم، تازە عەیبە پەشیمان ببمەوە."
وتم:
" -ئەوەش هەر کوردایەتییە، هیوادارم هەر وا دڵسۆزبیت بۆ کورد."
دیار بوو (پ.د.ك) هەر بەسەریان نەکردبووەوە بە نامە، بەڵکو یارمەتیی مادیشیان دابوو. ئێمەش یەك پوولمان نەبوو بیدەین بە خەڵك. دەبوایە پارەیان بدایە، ئەوسا دەیانتوانی لەگەڵ ئێمەبن. بە هەرحاڵ ئەو هەموو ماندوبوونەم بێ سوود بوو. لای نیوەڕۆ بوو، نانمان خوارد، من وتم:
" -ئەبێت بڕۆم."
ڕێگایەکیان نیشاندام وتیان:
" -هەر بەم دۆڵەدا بڕۆرە خوارەوە، ئەچیتە سەر ئاوەکەی دوکان، لەوێ بەلەم هەیە ئەتبات بۆ دوکان."
دۆڵەکە دۆڵی (سێ دەر) بوو دەچووەوە سەر ئاوەکەی دوکان..
وتم:
" -زۆر چاکە."
من بە ڕێکەوتمو ئەویش ڕۆشتەوە بە ڕێی خۆیدا. من چووم بەرەو (کانی هەنجیر)، لەوێ یەك بەلەم لە کەناری ئاوەکە وەستا بوو وتم:
" -ئەچیت بۆ دوکان.؟"
وتی:
" -بەڵێ."
سوار بووم. بە منەوە سێ نەفەر بووین، کە چوومە بەلەمەکەوە، زۆر ترسام، چونکە ئەوە یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا سواری بەلەم ببم. نازانم بە چەند کاتژمێر گەیشتینە ناو دوکان، لەوێوە سواری ئۆتۆمبیلێك بووم بەرەو سلێمانی. کە گەڕامەوە بۆ سلێمانی گەشتەکەم بۆ ئارام باسکرد، کە چۆن بووەو ئەو کەسە چۆن پیاوێك بوو. هەواڵمان نارد بۆ لای عەلی عەسکەریو سالار عەزیزو جەمالی عەلی باپیر، کە بچن بۆماڵی عەبدولقادر هەڵەدنی. ناوی نهێنیمان بۆ ناردن. ئەوانیش هەموو کۆبوونەوەو چوون بۆ ماڵی عەبدولقادر هەڵەدنی، ماوەی دە ڕۆژ بە نهێنی لەوێ مانەوە، ئەوجا خۆیان ئاشکراکرد[١٦]. دوای ئەو ماوەیە هاوڕێیانمان خۆیان ئاشکرا کردو گەشتیان لە

---

٢- کاك (ئەوشیروان مستەفا) لە کتێبەکەی دا بە ناوی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناو زەنگ) باسی ئەوەی کردووە، کە کاتی خۆی گوایە شەهید (عەلی عەسکەری) چووە لەگەڵ (فەقێ ئیسماعیل) دا قسەی کردووە، بەڵام ئەوە وانەبووە. لە وانەیە ئەو بە هەڵە پێی ڕاگەیاندرابێت، چونکە ئەو کاتەی، کە من چووم بۆ لای فەقێ ئیسماعیل، شەهید عەلی عەسکەری هەر خۆی ئاشکرا نەکردبوو. مەگەر ئەو کاتەی، کە هەموو پێشمەرگە بوبێتین قسەی لەگەڵ کردبێ. من

ناوچەکەدا دەکرد. ئیتر لە ناو خەڵکیدا بڵاوبووەوە، کە پێشمەرگە پەیدا بۆتەوە. هەر کەسێکیش بیویستایە دەمان ناردە دەرەوە.

١٣

ئێوارەیەك کاتێکم زانی (ئەبو شەهاب)[١٧] خۆی کرد بە ژووردا، (ئارام)ی لێبوو، نەمدەزانی چۆن پێی بڵێم، کە لە ماڵی خۆمان جێمان نییە، چونکە کاتی خۆی لە ماڵی خۆمان بوو. چارم نەبوو، بردم بۆ ماڵی (عاسیمە)ی خوشکم ماوەیەك لەوێ مایەوە، هەتا ناردمە دەرەوە. لەپاش ئەوە، ڕۆژێ چووم بۆ بازاڕ جلو بەرگم بۆ (ئەبو شەهاب)و (حەمە سەعید) بکڕم. هەردووکیان بە یەکەوە چوونە دەرەوە. کە چووم پێڵاو بۆ حەمە سەعید بکڕم، پێڵاو نەبوو بە پێی بکا. هەر لەو ماوەیەدا هاوڕێیانی تریشمان چوونە دەرەوە، لەوانە: زیرۆ، سەلاح چاوشین، شێخ محەمەدی باخ (شەماڵ)، مامۆستا حەمە ئەمین هەر ناسراو بە (شەماڵ)، حسین ناسراو بە (شێرکۆ)، ملازم عومەر. ئیتر لە دوای ئەوانەوە زۆر لە هاوڕێیانی تریش چوونە دەرەوە. باش بوو ئەو کاتەش ئەوەی خۆی شاردبۆوە، ناردمانە دەرەوەو کێشەی حەشاردانو جێگامان بۆ خۆشاردنەوە نەما. ئەو کاتە هەر ئارام لە ناو شاردا مابووەوە، ئەویش خەریکی ئیشوکارەکانی ڕێکخستن بوو. ئەو دەمە ئێمە لە کۆمیتەی هەڵمەت بووین، مەلا بەختیار سەرپەرشتیی دەکردین. کۆبوونەوەمان هەر لە ماڵی خۆمان دەکرد. ئارام لەوێ بوو. منو بەکری حاجی سەفەرو وەستا ئەنوەری برایو شێخ عەلیو هاوڕێیەکی تر بە ناوی (حامی) خەڵکی گوندی (خەمزە) بوو، کە مەلا بەختیار کۆبوونەوەکانی پێ دەکردین. ئەو کاتە (وەستا ئەنوەر) سەرپەرشتیی ڕێکخستنی هەڵەبجەی دەکرد. بەکری حاجی سەفەر سەرپەرشتیی ڕێکخستنی پێنجوێنی دەکرد. منیش لە ناو کۆمیتەی هەڵمەت.

١٤

ئەو کاتە سالار عەزیزو عەلی عەسکەری، هەر ئیشو کارێکیان بۆ ناو شار ببوایە، دەچوون بۆ ماڵی عەبدولقادری هەڵەدن. نامەیان دەنووسیو دەیاندا بە غەریب هەڵەدنی

پێش ئەوەی خەباتی چەکداری دەست پێ بکاتەوە، من چووم بۆ لای. ئەو برادەرانەی، کە ناوم بردوون، ئاگایان لێ بەو شاهیدن.

[17] - ئیحسان کەرکوکی، ژنبرای شێخ ستارە.

کوڕی عەبدولقادر هەڵەدنی. ئەو کاتە تەمەنی هەر چواردە ساڵێ دەبوو. دەهات بۆ ماڵی ئێمە. من زۆر دەترسام، چونکە زۆر منداڵ بوو. جارجار کوڕێکیشی لەگەڵدا بوو لە تەمەنی خۆی. نازانم ئەو ناوی چی بوو. بە راستی زۆر ئازاو چالاك بوو. بەو منداڵییەی هەفتەی دوو جار دەهات. جاری وا بوو شتمان بۆ هاوڕێیان پیایدا دەنارد، دەچووم ئوتومبێلی تایبەتی بۆ بگرم، ئەو نەیدەهێشت دەیوت:

" –بە سەیارەکەی شەدەڵە ئەی بەم."

منیش زۆر دەترسام لەوەی بەو سەیارەیە ئاشکرا ببێت بەو شتانەوە. کەچی ئەو دەیوت:

" –بۆ ئەو پارەیە دەدەیت بە سەیارە هەر بەوە ئەڕۆم."

بە راستی کوڕی وا زیرەكو ئازام نەدیبوو. دواییش ئەو پارتیزانە لێهاتووە دڵسۆزو قارەمانەی لێ دەرچوو، هەموو خەڵك دەیناسێ.

ئەو کاتە (عەلی عەسکەری)ش هەر لە رێی منەوە نامەی بۆ هاوڕێکانی خۆی دەنارد، بە تایبەتی نامەی بۆ (جەمال ئاغا)، دەنارد، کە لێپرسراوی رێکخستنی سلێمانی بوو. ئەویش هەر پەیوەندیی بە منەوە هەبوو. کاك ئارام ماوەیەکی تر مایەوە لە سلێمانی بۆ بەرێوەبردنی ئیشوکارەکانی رێکخستن. ئیتر هاوڕێیانی شارەکانی تر دەهاتن بۆ ماڵەوە بۆ لای. لە ژوورێکدا بوو. (ئاشتی)ی کچم پێی گرتبوو. جارجار، کە نامە دەهات، نامەکەمان دەدایە دەیبرد بۆی. ئارام دەیوت:

" –ئەمە تەتەری ماڵەوەیە."

ئارام، کە ئیشەکانی تەولو بوو، ئەویش چووە دەرەوە بۆ لای سالار عەزیزو عەلی عەسکەری. بەڵام دیار بوو ئەو کاتە سالارو عەلی عەسکەری بەینیان باش نەبوو، چونکە عەلی عەسکەری هەر نامەی دەنارد بۆ ئارام دەیوت:

" –زوو وەرە دەرەوە."

ئەوجا ئەویش چووە دەرەوە. مەلا بەختیار هەر لە شاردا مایەوە. ئەو کاتە مەلا بەختیار سەرپەرشتیی کۆمیتەکانی دەکردو هەر ئەو بە رێوەی دەبردن. بێجگە لە مەلا بەختیار (پێنج) کەسی تر بووین، کە ئەمانە بوون: ئازادی مەلا بە ناوی (شاهۆ)، شوان، ئیبراهیم رەسام بە ناوی بەختیار، دلێری سەی مەجی بە ناوی ئەکرەم، خۆشم عومەر بە ناوی ئاوات قارەمانی. ئەو کاتە بە ناوی (باوکی قالە) نامەیان بۆ دەنووسیم. هەموو کارەکانی دەرەوەو ناوەوە هەر ئێمە بووین. ئەو کۆمیتەیەی ئێمە زۆر چالاك بوو، بۆیە هەر ناوی کۆمیتەی هەڵمەت بوو. هەر ئەو کاتە پێشمەرگەی ناوشارمان هەبوو. من خۆم سەرپەرشتیم دەکردن.

## ١٥

له ٢١/ ١٩٧٦/١١ (شەهاب)و (جەعفەر)و ( ئەنوەر) لەسێدارە دران. ئەو کارەساتە دڵتەزێنە زۆر ناخۆش بوو. پاشان تەرمەکانیان لە بەغداوە هێنرانەوە بۆ کوردستان. تەرمی (شەهید شەهاب) هێنرایەوە بۆ شاری سلێمانی. ئەو ڕۆژەی تەرمەکەیمان بە ڕێکرد بۆ گۆڕستان، خۆپیشاندانێکی بێدەنگ بوو. بە هەزاران خەڵك، شەپۆل، شەپۆل، بە دوای تەرمەکەی (شەهید شەهاب)ەوە بوون. بە شەقامەکانی سلێمانیدا بە پیکابێ بردمان بۆ گۆڕستانی گردی سەیوان لەوێ بە خاکمان سپارد. مەلا بەختیار لە پاڵ تەرمەکەدا سوار بووبوو. دوایی زۆر ڕەخنەمان لێ گرت، وتمان:

" -تۆ بۆ چوویتە پاڵ تەرمەکە. تۆ نە هاوڕێو نەخزمی ئەویت. ئەوەی تۆ کردت باش نەبوو. ئەو هەموو ئەمنو ئیستخباراتە مراقەبەیان دەکردین." مەلابەختیار گەنجێکی زۆر چالاك بوو، بەڵام زۆر پەلەی دەکرد لەوەی زوو دەربکەوێ. ئەوەش زۆر خراپ بوو بۆ ئەو هەلو مەرجە دژوارو ناسکە، چونکە حیزبی بەعس زۆر بە توندی موراقەبەی دەکرد. بە بەردەوامی لەگەڵ هاوڕێیاندا مشتوومڕی بوو، هەر ئیشێك بوایە، دەبوو خۆی تێ هەڵقورتاندایە، ئێمەش دەمانوت:

" -بۆ خۆت خراپە، ئەگەر ئیشێك پەیوەندیی بە تۆوە نەبێ تۆ بۆ بناسن."

ئەو کاتە ئەو سەرپەرشتیی هەموو ڕێکخستنەکانی ناو شاری دەکرد. وەزعەکە زۆر خەتەر بوو، بەڵام گوێی نەدەدایە.

## ١٦

لە بەر ئەوەی ڕۆژانە ڕێکخستنەکان لە شارەکانو لە دەرەوە، لە مەفرەزەکانەوە لە هەموو لایەکەوە دەهاتن بۆ ماڵەوە، من نەمدەتوانی ئیش بکەم، وازم لە هەموو کاروبار هێنابوو، چونکە بۆم نەدەکرا.

ئەو کاتە (ملازم جوامێر)و (مامۆستا محەمەد ئەمین پۆلا)، لەگەڵ هاوڕێیەکی تردا ناوی (فەرهاد) بوو ناردمن بۆ ماڵی (ئەحمەد)ی خزمی خۆم لە گوندی (قارەمان) لە قەرەداغ. ئەحمەد هەر لە ساڵی ١٩٧٣وە ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو. ئەو سیانە لەوێ خۆیان حەشاردا. سێ هاوڕێی تریشمان هەبوو لە گوندی (تلەزەیت)، هەواڵمان لە ڕێگەی (مامۆستا ئەحمەد)ەوە بۆ ئەوانەش نارد، کە بچن بۆ لایان ببن بە پێشمەرگە. وتیان باشەو ڕازی بوون. هەر سێکیان ژنیان نەهێنابوو، ناوەکانیان (حسین)و (عەبدوڵلا)و (سلێمان) بوو، پێشمەرگەی دێرین بوون، زۆر شارەزای ناوچەکە بوون. بەوانەوە ژمارەی کەسەکان بوو بە شەش کەس. هەرچەند فەرهاد لە نێویاندا ناکۆك

بوو، لەگەڵیاندا نەدەگونجا، بەڵام ماوەیەك بە ئیختیفایی لە گوندەکە لای (ئەحمەد) مانەوە هەتا سێ کەسەکەی تر چوون بۆ لایان. ئیتر ئەوان بردنیاننە دەرەوە. هەر بە شەو دەچوونە گوندەکانو بە ڕۆژ خۆیان دەشاردەوە.

(ملازم جوامێر) پیاوێکی زۆر عەسکەری بوو. وەك چۆن پێشتر لە سوپادا بوو هەروواش ڕەفتاری دەکرد. زۆر وشك بوو لە قسەکردندا. بەڵام زۆر پیاوێکی ڕەوشت جوانو قارەمان بوو. وەزعیان باش نەبوو، پێشمەرگەکانی تر کێشەیان هەبوو لەگەڵیدا. جارێك چووم بۆ لایان بۆ ئەوەی بزانم کێشەکەیان چییە؟ هەر دەیانوت:

" -ملازم جوامێر وا ئەزانێت ئێمە عەسکەرین، مامەڵەی عەسکەریمان لەگەڵدا دەکات."

زیاتر هەر بە شەو دەچوونە دەرەوە. زۆر لێی ناڕازی بوون. دیسان جارێکی تر منو مەلا بەختیار چووین بۆ لایان بۆ گوندی قارەمان. ئەوجارە نەمانبینین. یەك شەو لە گوندەکەماینەوە. بەیانی زوو گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، کە هاتینەوە چەند نامەیەکی (ئارام)مان بۆ هاتبوو. یەکێك لە نامەکان بۆ من بوو، تیایدا نووسیبووی:

" (-ئەوە یەك مەفرەزەمان بۆ ناردوون، بۆ ئەوەی لە پێش چلەی شەهید شەهابو هاوڕێکانیدا چالاکییەکیی گەورە ئەنجام بدەن. ئەگەر بتوانن ئەو چالاکییە لە نادیی فەرمانبەران ئەنجام بدەن، چونکە زانیاریمان بە دەست گەیشتووە، کە مەسئولینی بەعس شەوان لەوێ دادەنیشن.)"

ئەو کاتە مەسئولینی حیزبی بەعس شەوانە دەچوونە ئەوێ بەتایبەتی شەوی هەینی. شەش پێشمەرگەیان ناردبوو بە شەش کلاشنکۆفەوە. زۆر موشکیلە بوون. من نەمدەناسین. یەك دانەیانم دەناسی ئەویش زۆر موشکیلە بوو. لە ماڵێك دایان نابوون نزیکی ماڵی خۆمان. (ئارام) لە نامەکەدا نووسیبووی:

(" -بچۆ بۆ لای جەمال ئاغا، ئەو سەیارەتان بۆ پەیدا ئەکات.")

بەڵام نامەکە (عەلی عەسکەری)ش ئیمزای کردبوو. دیار بوو ڕەئی هەردووکیان بوو، کە دەبێت ئەو ئیشە ئەنجام بدرێت. نامەیان بۆ مەلا بەختیاریش ناردبوو. لەگەڵ مەلا بەختیاردا دانیشتین تا پلانێك دانێین چۆن ئەم ئیشە بکەین. کێشەی جێگاشمان هەبوو. ئەو شەش پێشمەرگەیە لە خۆیانەوە چووبونە ئەو ماڵە. نازانم ماڵەکە ناسیاوی کامیان بوو. دەبولیە بچووینایە جێگامان بۆ پەیدا بکردنایە. بە مەلا بەختیارم وت:

" -من نایەم بۆ لایان. با من نەناسن، نەشیەن بۆ ماڵی ئێمە. تۆ خۆت بچۆ ماڵێکیان بۆ پەیدا بکە."

وا بزانم پێشتر لەگەڵ دلێری سەی مەجی بردبوونیان بۆ ماڵێك. دوایی بردبوونیان بۆ ماڵی هاوڕێیەك لە گەڕەکی جوولەکان بەناوی (تەهای حەمە ڕەش) هاوڕێی کۆمەڵەبوو. ئەوەی ئەوان داوایانکردبوو زۆر زەحمەت بوو. زۆر تاقیباتمان کرد ڕێیەك نەبوو. ئەوانیش نەدەهاتنە ئەو شوێنەی، کە دیاری کرابوو بۆ چالاکیەکە. ئەوانەی دەچوونە

نادی فەرمانبەران پلەو پایەیەکی وایان نەبوو لە ناو حیزبی بەعس دا، بۆیە خۆمان بڕیارماندا تەقە لە موحافزی سلێمانی بکەین. چووم بۆ لای (جەمال ئاغا)، نامەکەی (عەلی عەسکەری)م بۆ برد، لەگەڵ نامەیەکی تری (ئارام). نامەیەکیان بۆ ئەویش نووسیبوو، کە ئەو سەیارەیەکمان بۆ پەیدا بکا. زۆرمان گفتوگۆ بە یەکەوە کرد. (جەمال ئاغا) وتی:

" –باشە، کاک ئارام بۆ دوای قسەی عەلی عەسکەری کەوتووە؟ ئەوە چۆن ئەکرێت من سەیارە تان لە کوێ بۆ پەیدا بکەم؟ بۆ ئەوە گاڵتەی منداڵانەیە؟ سەیارە پەیدا ناکرێت. چۆن شتی وا ئەکرێت لە سلێمانی دا؟ کاک ئارام بۆ چۆتە سەر قسەی عەلی عەسکەری؟ ئێوەش خۆتان بێ عەقڵ مەکەن. ئەوە ناکرێت. من سەیارەم پێ پەیدا ناکرێت."

بە هەر حاڵ، سەیارە نەبوو. بە سەیارەش نەبوایە ئەو کارە نەدەکرا. لە (جەمال ئاغا)ش نائومێد بووین. ڕۆژێ مەلا بەختیارو دلێری سەی مەجی بە یەکەوە هاتن بۆ ماڵەوە. مەلا بەختیار وتی:

" –کاک ئاوات هەر چۆنێك بێت ئەبێ ئەم شەو سەیارەیەك پەیدا بکەیت، چونکە زۆر زەرورین."

منیش کەسم شك نەدەبرد سەیارەی هەبێ. مەلا بەختیار لەگەڵ دلێری سەی مەجی چووبوون تەکسیەکیان بردبوو بۆ ئەو ماڵە تا پێشمەرگەکانی پێ بگوێزنەوە بۆ ماڵێکی تر. لەم لای ماڵەکە ئوتۆمبیلەکەیان وەستاندبوو، بەڵام شۆفێرەکە نەی زانیوە بۆ چییە!؟ وای زانیبوو هەر نەفەری ئاساین، کە پێشمەرگەکانیان بانگ کردبووە دەرەوە، هەموو بە کڵاشنکۆفەوە هاتبوونە دەرەوە. کابرا چاوی پێیان کەوتبوو، کە هەموو چەکدارن، یەکسەر پێی پێوە نابوو بۆی دەرچووبوو، بێ ئەوەی هەر بەمان بڵێت من ناتوانم. یەکسەر ڕایکردبوو. بۆیە بە پەلە هاتن بۆ لای من. منیش برادەرێکم هەبوو دراوسێمان بوو. پێم بوتایە بۆ ماڵەکەشی نەی دەوت نابێت. ناوی (غەفوری کوێخا کەریم) بوو. بە (غەفورە شەل) ناسرا بوو. کاتی خۆشی پێشمەرگە بوو. بریندار ببوو. جێبێکی ئەمریکی هەبوو زۆر کۆن بوو. لە جێبە بچوکەکان بوو. چووم لە دەرگامدا. سەیرمکرد ماڵیان پڕ بوو لە میوان. من میوانەکانم نەدەناسی. بانگم کردە دەرەوە وتم:

" –ئەو جێبەمان ئەوێت بۆ چەند سەعاتێك."

وتی:

" –بە خوا تۆ خۆت سەیرکە چەند میوانمان هەیە، خۆم ناتوانم بێم، بەڵام ئەوە سیوچەکەیە خۆت ئەی بەیت بیبە. بۆ بەیانی سەیارەکەم بۆ بهێنەرەوە ئیشم هەیە."

وتم:

" –باشە."

سەیارە پەیدا بوو. ئینجا کێشەی ئەوەمان هەبوو کێ لێی بخوڕێت. ئێمە شۆفێریمان نەدەزانی. ماڵی هاوڕێکەم لە سەرشەقام بوو. باش بوو جادە کە لێژ بوو. مەلا بەختیار چووە ناوی‌و سوکانەکەی گرت‌و خستیە بۆش. من‌و (دلێری سەی مەجی)ش پاڵمان پێوەنا. هەر بە پاڵ، هەرچۆنێ بوو دوورمان خستەوە لە ماڵەکە. هەتا نیوەی ڕێ لەگەڵیاندا بە پاڵ بردم‌و خۆم گەڕامەوە. دلێرو مەلا بەختیار ئوتۆمبێلەکەیان بەرەو چۆڵی برد. باش بوو لە ناو پێشمەرگەکاندا شۆفێرێکی تیابوو، خۆیان لەوێوە بردبوویان، لەو سەریشەوە هاوڕێیەکی شۆفێریان پەیداکردبوو. جێبەکەی هێنابووەوە. ماوەیەك پێشمەرگەکان مانەوە. لە نێو خۆیاندا تێکچووبوون. چوارمان ناردەوە بۆ دەرەوە. دوانیان مایەوە. دوانەکە سۆران‌و فاخر بوون، کە چالاکیەکەیان ئەنجامدا. کات ژمێر هەشتی بەیانی مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٧٦، کە پارێزگاری سلێمانی چووبوو بۆ سەرا، لە سەر جادەی (مەولەوی) تەقەی لێکرا. بە خەستی بریندارببوو، نەمرد. ئەو چالاکییە لەو کاتەدا لە ناوجەرگەی شاردا دەنگێکی زۆری دایەوە، زۆر بە سەرکەوتوویی ئەنجامدرا. ئەوە زۆر باش بوو. ئەوانیش بە سەلامەتی دەرچوون‌و گەڕانەوە بۆ دەرەوە، لەگەڵ ئەو سایەق تەکسییەی، کە دەربازیکردن لە دوای ئەنجامدانی چالاکیەکە، ناوی (عەبدوڵڵای خورشە) بوو، هەر لەگەڵ ئەواندا چووە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی.

وەستا ئەنوەر لێپرسراوی ناوچەی هەڵەبجە بوو. زوو زوو دەهات بۆ سلێمانی بۆ لامان دەیوت:

" -برادەرانی لای خۆیان بەینیان باش نییە. ناکۆکن لە نێوان یەکتردا."

یەك دوو جار چووبوو بۆلایان، زۆر پیاوێکی ئاقڵ بوو، زۆر دڵسۆزو قارەمان بوو.

بارودۆخمان باش بوو، ڕێکخستن بە هێز ببوو چەند چالاکییەکی تریش لە ناو سلێمانیدا ئەنجام درا، خەڵك زۆر بڕوای پەیدا کردبووەوە بە کوردایەتی‌و شۆڕش. لە شاخیش مەفرەزەی پێشمەرگە لە ناوچەکاندا ئاشکرا ببوون، حکومەت زۆر شپرزە بووبوو. بە تایبەتی بەو چالاکییانەی ناو شار. هیچ بەڵگەیەکیشیان دەست نەدەکەوت.

## ١٧

دلێری سەی مەجی‌و (زەینەب)ی خێزانم هەمیشە لەگەڵ یەکتر شەڕیان بوو. جارجار دلێر لە پڕ لە دەرگای دەداو عەلاگەیەك فیشەك، یان کلاشنکۆف‌و دەمانجەی دەهێناو دەیدایە دەستی زەینەب. هەر لە دەرەوە نیوەی دەڕشت. (زەینەب)یش دەیوت:

" -هیچ نەبێت بیهێنەرە ئەم دیوی دەرگاکەوە با خەڵك نەیبینێت."

ڕۆژێکیان ئیشم بە دلێر بوو. چووم بۆ ئەو دائیرەیەی، کە کاری لێ دەکرد. لە بەڕێوەبەرایەتیی شارەوانیی سلێمانی بوو. خۆی ناوی (ئەکرەم) بوو. لەو کاتەدا خەیاڵم لای خۆم نەبوو، لەپڕ خۆم کرد بە ژوورەکەیدا، ناوە نەهێنیەکەیم وت، وتم:

" –کاك دلێر لێرەیە.؟"

تۆزێك ورد بوونەوە وتیان:

" –دلێر ناو لای ئێمە نییە."

منیش خۆم تێك نەداو هاتمە دەرەوە. تۆزێکی پێچوو دیسان گەڕامەوە بۆ دائیرەکە، ئەم جارە وتم:

" –کاك ئەکرەم لێرەیە.؟"

لە وەڵامدا وتیان:

" –رەنگە تۆ باشتر بزانیت لە کوێیە."

وتم:

" –بۆ.؟"

وتیان:

" –ئێمەش نازانین نایبینین."

## ١٨

لە ناو شاردا مەفرەزەیەکمان هەبوو زۆر چالاك بوو، زۆر چالاکانە کاریان دەکرد. (یاسینە رەش) ئەو کاتە فەرمانبەر بوو لە زانکۆی سلێمانی، لە بەشی عەمادەی تەلەبە بوو، ژوورێکی هەبوو لە بەشی ناوخۆیی قوتابییانی زانکۆ لە سەر شەقامی کاوە. منیش لە ژوورەکەی ئەودا دانیشتبووم. لەگەڵ هەندێ کەسی تر، کە لەوێ ئیشیان دەکرد. هەر بە رێکەوت هەڵسام چووم بۆ توالێت. کاتێکم زانی، بوو بە دەنگە دەنگ. هەر لە توالێتەکەوە سەرم هێنایە دەرەوە، سەیرمکرد هەموو راڕەوەکە پڕبووە لە ئیستخبارات. منیش چوومەوە ناو توالێتەکەوە، پێنج خولەکێك چاوەڕێمکرد. دوای ئەوە هاتمە دەرەوە پرسیم، وتم:

" –ئەوە چی بوو.؟"

وتیان:

" –نازانین، ئەمن بوون چوونە ژورەکەی کاك یاسینو هەموویان بردن."

منیش خۆم دەمزانی چییە. بە پەلە رۆیشتم بۆ ماڵی (جەماله رەش)، کە چووم مەلا بەختیار لەوێ بوو، پێم وت:

" –ئەوا یاسین گیراوە."

وتی:

" –بەڕاستە.؟"

وتم:

" –بەڵێ."

وتی:

" –مەچۆرەوە بەو ناوەدا."

منیش یەك سەر (تەكسی) یەكم گرت‌و چووم بۆ ماڵی یاسین. خێزانەكەی لە ماڵ بوو، پێم وت:

" –چی لە ماڵەوەیە بمدەرێ.؟"

وتی:

" –بە خوا هیچی لێ نییە."

وتم:

" –دەمانچەیەكی لێیە بم دەرێ، خۆم داوەمەتێ، ئێوارە هێناویتیەوە."

وتی:

" –بە خوا هیچی نەهێناوەتەوە."

من دەمزانی لێیەتی. ژنەكە حەپەسابوو.پێم وت:

" –یاسین گیراوە، چی لێیە با بیبەم.

وتی:

" –بە خوا هیچی لێ نییە."

منیش زانیم ئێستا دێن بۆ ماڵەكەی. بە پەلە خۆم بە هەموو ماڵەكەدا گەڕام. یەك دەفتەرم دۆزییەوە، ناوی (٢٠) كەسی تیا بوو. ئەوەم هەڵگرت‌و چەند فیشەكێكم دۆزییەوە، بەڵام دەمانچەكەم بۆ نەدۆزرایەوە. پێش ئەوەی بڕۆم پێم وت:

" –ئێستا دێن بۆ ماڵەوە، چی لێیە لایبە."

بە پەلە ڕۆشتم چوومەوە بۆ ماڵەوە. لە ڕێگا (شوان)و (ئازادی مەلا)م بینی پەشۆكابوون، وتیان:

" –ئۆخەی ئەوە تۆی.؟"

وتم:

" –بۆ چی.؟"

وتیان:

" –كوڕە خەبەریان بۆ هێناوین، كە تۆ گیراویت، ئیتر هەموو پشتمان شكا."

وتم:

" –نەگیراوم، بەڵام بە ڕێكەوت دەرچووم. ئەبێت خۆم بشارمەوە، چونكە یاسین گیراوە ئێوەش بڕۆن لەگەڵ من مەیەن ئاگاتان لە خۆتان بێت."

چوومەوە بۆماڵەوە سەیردەکەم هەموو گەڕەك لە ماڵی ئێمە کۆبوونەتەوە. گریان و خۆ کوشتنە، لەپڕ خۆمکرد بە ژووردا، هەموو پەلاماریاندام، وتیان:

" —ئۆخەی ئەوە بەربوویت.؟"

منیش هەر خۆم هەڵە دەکرد، وتم:

" —گرتنی چی؟ بۆ چی من ئەگیرێم.؟"

وتیان:

" —وەڵا هاتوون بۆ ماڵەوە، وتیان کاك عومەر گیراوە."

وتم:

" —بابە منی فەقیر بۆچی ئەگرن.؟"

دڵیشم لە سەر سەد لێی دەدا. خوا خوام بوو زوو برۆم. (زەینەب)م بانگکردە ژوورەوە، وتم:

" —نەگیراوم، بەڵام ئەبێت راکەم، ئەگینا ئەگیرێم. با زوو برۆین."

بە پەلە بردم بۆ بازاڕ. لەوێوە چووین بۆ دائیرەکەی یاسین. لە ژوورەکەیدا دۆڵابێکی هەبوو دوو کلیلی هەبوو. یەکێکیان لای خۆی بوو، ئەوی تریان لای من بوو. دۆڵابەکەیم کردەوە، دەمانچەیەك و هەندێ رۆمانە و فیشەکی تیا بوو، دام بە زەینەب وتم:

" —برۆ بیبە بۆ ماڵێك دوایی بیدە بە شوان و ئازاد."

ئەویش بردبووی بۆ ماڵی باوکی دایینابوو. بە (شوان)ی وتبوو:

" —ئەگەر شتێك روویدا شتەکان وان لە ماڵی باوکم."

ئەمن چووبوون بۆ ماڵی یاسین. دەمانچەکەیان دۆزیبووەوە، بردبوویان. دوایی چووم بۆ لای هاوڕێیەك لەوانەی، کە لەگەڵ (یاسین)دا گیرابوون، لە هەمان دائیرە بوو. ئەو هیچی لەسەر نەبوو، هەر دوای نیوەڕۆ بەریاندابوو. وتم:

" —ئەوە بۆ گیران؟ ئەی کاك یاسین کوا.؟"

وتی:

" —وەڵا نازانم چی بوو! ئەی تۆ چیت لێ هات.؟"

وتم:

" —من چووم بۆ توالێت، کاتێ هاتمە دەرەوە کەس نەمابوو."

وتی:

" —وەڵا هەموومانیان گرت بردینیان بۆ (ئیستخبارات) لەوێ گوێم لە دەنگێك بوو وتی:

" —(مو هژا) دیاربوو ئەو کەسە بوو، کە ئیخبارییەکەی کردبوو. هێنایان منیان نیشاندا، وتی ئەوە نییە. لەو کاتەدا گوێم لێبوو تەلەفۆنیان بۆ (فەرهاد) ناوێك کرد."

خۆم هەر گومانم لەو بوو، چونکە پێش ئەوەی ئەو رووداوە روو بدا، یاسین بە منی وت:

" —برادەرێکمان چووە بە فەرهادی وتووە وەرە ئیشمان لەگەڵدا بکە."

وتبووی:

" —زۆر باشە. هاوڕێی بوو نەی زانیبوو، کە بووە بە ئیستخبارات. ئەوەبوو هەر هەموویانی بە گرتدا لەگەڵ هاوڕێکەی خۆشی، کە ناوی نەسرەدین بوو. "

بە (زەینەب)م وت:

" —من ئەچم بۆ ماڵی ئەو برادەرە. ئەگەر هاتن بۆ ماڵەوە بڵێ دوو رۆژە چووە بۆ بەغدا. دوایی وەرە پێم بڵێ. "

وتی:

" —باشە. "

ئەمویست بەعس بخەڵەتێنم. رۆیشتم بۆ ماڵەکە، ئێوارە بوو. ئەوەندەم زانی مەحمودی کاکاو —ژن برام بوو— هات بۆ ماڵەکە وتی:

" —ئەوە چی ئەکەیت لێرە. ؟"

وتم:

" —بۆ. ؟"

وتی:

" —هیچ نازانیت. ؟"

وتم:

" —چی بزانم. ؟"

وتی:

" —بە دواتا ئەگەڕێن. "

وتم:

" —کێ بە دوامدا ئەگەڕێت. ؟"

وتی:

" —ئیستخبارات. "

وتم:

" —چۆن ئەزانیت. ؟"

وتی:

" —ئێستا دوو برادەرم بینی وتیان: فلان کەس خزمتانە لەکوێیە؟ لە بەیانیەوە ئێمەیان بانگکردووە وتوویانە لەکوێیە؟ ئێمەش وتمان: تەنیا برادەرمانە بەس نازانین لەکوێیە. "

پێم وت:

" —برۆ بە پەلە بە زەینەب بڵێ رابکاتو منداڵەکان دەربکات. "

ئەو بە پەلە رۆیشت سەیارەی پێ بوو، چووبوو پێی وتبوو هەر ئێستا رابکەن. ئەوانیش هەر بە پێی پەتی رایانکردبوو. چێشتی بۆ منداڵەکان لێنابوو. هەر بە سەر ئاگرەکەوە بە جێی هێشتبوو. هەر لە ماڵ چووبونە دەرەوە، لە هەموو لایەکەوە دەوری

کۆلانەکەیان گرتبوو. چووبوونە ماڵەوە سەیر دەکەن کەس لەوێ نییەو خواردنیش لە سەر ئاگر دانرابوو. دوای ئەوە چووبوون بۆ ماڵی خەزورم وتبوویان:
" -کوا کچەکەتان.؟"
خەسووم وتبووی:
" -بە خوا یەك مانگە هەر نەهاتوون بە ئێرەدا."
وتبوویان:
" -ئیمڕۆ دوو جار هاتوون بۆ ماڵتان."
ڕاستیشیان دەکرد. دیاربوو موراقەبەی منیان کردبوو بێمەوە. هەر لە بەیانییەوە نەچوومەوە ماڵەوە. پێش ئەوەی ئیستخبارات لە دەرگا بدا، ئەو شتانەی زەینەب لەوێ دلینابوون، ئەحمەدی برای هەمووی هەلگرتبوو، ئەوشیووی ماڵی باوکی کەلاوە بوو، زستان بوو، بەفریش دەباری، کە ئەوان لە دەرگایان دابوو، هەموو شتەکانی فڕێ دابووە کەلاوەکەوە. کە بۆیان دەرکەوتبوو لەوێ نین، هەواڵی ماڵی باوکی منیان پرسیبوو وتبوویان:
" -ماڵی باوکی لە کوێیە."
بە (ئەحمەد)ی ژنبرامیان وتبوو:
" -وەرە لەگەڵمان."
ئەویش وتبووی:
" -نازانم."
وتبوویان:
" -زاواکانە نازانی ماڵی باوکی لە کوێیە.؟"
بە زۆر پێش خۆیان دابوو. چووبوون بۆ ماڵی باوکم. ئەوانیش بێ خەبەر ئاگایان لە هیچ نەبوو. لەوێ باوکو دایکمیان گرتبوو. کوڕەکەی ژن برامیان بەردابوو. منیش چووم بۆ ماڵی جەمال، کە بە (جەماڵە ڕەش) ناسرا بوو، پێم وت:
" -ئیتر نۆبەی ئێوەیە من بشارنەوە."
زۆر پەشۆکابووم. ئاگام لەوە نەمابوو ئایا خێزانەکەم دەرچووە یان گیراون، چونکە ئەو کاتە بچوونایەتە سەر هەر ماڵێ ژنو منداڵو باوکو دایك، یان خوشکو برا لە سەر ماڵ بوونایە دەیانگرتن. جەمال نەیوێرا لە ماڵی خۆیان بمهێڵێتەوە، بردمی بۆ ماڵی خزمێکی خۆی. ئەو شەوە هەتا بەیانی نەنوستم، زۆر شپرزە بووم. ناخۆشترین شەو بوو لە ژیانمدا. هەرچۆنێ بوو ڕۆژم کردەوە. بەیانی بە (جەمال)م وت:
" -بڕۆ بزانە چی ڕوویداوە، هەواڵێکم بۆ بهێنەوە."
ڕۆیشت ماوەیەکی پێ چوو. هاتەوە وتی:
" -ئەم شەو دارو بەردی ماڵەکەتیان داوە بە سەر یەکدا."
وتم:

" –كوره تۆ باسی ماڵم بۆ مەکە، منداڵەکانم.؟"

وتی:

" –شوکور منداڵەکانت دەرچوون نەگیراون."

وتم:

" –دڵنیایت.؟"

وتی:

" –دڵنیابە رایان کردووە. هەر بە پێی پەتی. زوو دەرچوون نەگینا ئەگیران. هەر ئەوان لە دەرگاکە دەرچوون، ئەمن‌و ئیستخبارات گەیشتبوونە سەریان، بەڵام بە داخەوە دایك‌و باوكت گیراون."

بۆ منداڵەکان زۆرم پێ خۆش بوو نەگیرا بوون، چونکە زەینەب دوو منداڵی پێ بوو سکیشی هەبوو. وەزعی زۆر خراپ بوو. بۆ دایك‌و باوکم زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەڵام وتم دایك‌و باوکم چی لێ دەکەن. نە منداڵیان پێیەو هەر دووکیشیان پیر بوون. هەر بەریان دەدەن.

## ١٩

بە هەواڵی رزگاربوونی ژنەکەم‌و منداڵەکانم هیچم لە دڵدا نەما. ناردم بە شوێن (مەلا بەختیار)دا. (ناهی خان) خزمی جەمال ژنێکی زۆر زیرەك‌و وریا بوو، هەر بە پەلە چوو بۆ بازاڕ جامانەو گۆرەوی‌و پێڵاوی بۆ کڕیم‌و بۆی هێنامەوە. مەلا بەختیار هات. وتم:

" –ئەم شەو ئەڕۆم."

وتی:

" –باشە، خۆشم لەگەڵتا دێم."

وتم:

" –باشە وەرە."

شەوی ٢٠–٢١/ ١٢ /١٩٧٦ بە یەکەوە بە رێکەوتین بەرەو قەرەداغ. من شارەزا بووم. گەیشتینە گوندی (جێشانە) لە مزگەوتی گوندەکەدا لێی نووستین هەتا بەیانی. کە رۆژ بووەوە چووینە ماڵێ نانمان خوارد. پاشان بە رێکەوتین بەرەو گوندی (سەرزەل)، کە گەیشتینە ئەوێ سەیرمانکرد هاوڕێیانی خۆمان هەموو لەوێ بوون. زۆر خۆشحاڵ بووین، کە ئەوانمان بینی. بەفرێکی زۆریش باریبوو. ئەو ئێوارەیە لەوێ نانمان خوارد. بە رێکەوتینەوە بەرەو گوندی (تەنگی سەر)، کە چووینە گوندەکەوە، خەڵکەکەیمان

کۆکردەوە. مەلا بەختیار قسەی بۆ خەڵکەکە کرد. زۆر بەلامەوە سەیر بوو!، چونکە ئەو لەگەڵ من هاتبوو بمگەیەنێتە دەرەوەو خۆی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، کەچی زۆری حەز لێبوو کۆبوونەوە بە خەڵکەکە بکا. لەپاش ئەوە دەچووینە هەر ئێیەك، مەلا بەختیار خێرا کۆبوونەوەیەکی بە خەڵکەکە دەکرد. ئەو شەوە کۆبوونەوەمان بە خەڵکی سێ دێ کرد. دەمەو بەیان گەیشتینە گوندی (گۆشان)، چووینە ماڵی (مەحمودی رۆستەم). رەئیس عەشرەت بوو. لەوێ ماینەوە. کوڕێك لەگەڵماندا هاتە دەرەوە ناوی (عوسمان) بوو، فەرمانبەر بوو لە زانکۆی سلێمانی. ئەویش هاوڕێی یاسین بوو، کە یاسین گیرا ئەویش ترسابوو لەگەڵ من هاتە دەرەوە. زۆرم پێ وت:

" —کاکە گیان پێشمەرگایەتی بە تۆ ناکرێت."

بەڵام هەر لەگەڵماندا هات.

کە لە ماڵی مەحمود رۆستەم دانیشتبووین، لە پڕ عوسمان رووی کردە کاك مەحمودو وتی:

" —ئا خاڵە باوە تۆزێ ئاومان بدەرێ."

جەماعەت هەموو دەستیانکرد بە پێکەنین. عوسمان خۆی حەپەسا بوو!، کە ئەوان بۆ چی دەستیانکرد بە پێکەنین. منیش وتم:

" —ئەوە رەئیس عەشرەتە، تۆش ئەڵێی بە منداڵ ئەڵێیت خاڵە باوە. جارێکی تر ئەگەر یەکێك لە خۆت گەورەتر بوو وا مەڵێ."

ئیتر هەر لەوەوە بە عوسمانیان دەوت (خاڵە باوە).

شەو رۆیشتین بەرەو گەرمیان. مەلا بەختیار کۆبوونەوەی بە خەڵکی گوندەکان دەکرد.

نزیکی بیست رۆژ بە یەکەوە بووین. کۆبوونەیەکیشی بە هاوڕێیان کرد، پێی وتن:

" —کاك ئاوات مەسئولی ئێوەیە."

چونکە ئەو کاتە من ئەندامی کۆمیتەی هەڵمەت بووم. رۆژێ چووینە ماڵی (مام ساڵح) لە گوندی (گۆڕی ئەسپ)، هاوڕێیەکمان هەبوو ناوی (مەلا ئەحمەد) بوو، خەڵکی گوندی (مەسۆیی) بوو، سەر بە ناحیەی قەرەداغ. لە سلێمانی کرێکاری دائیرەی ئیشغال بوو. زوو ناردمانە دەرەوە. یارمەتیمان دەدا وەك کادری کۆمەڵە. لە گوندەکان بە ناوی جامبازی حەیوانەوە ئیشی دەکرد. حەیوانی دەکڕی‌و دەیفرۆشت. (مام ساڵح) ئەو کاتە لە رێکخستندا بوو. بەیانی لە ماڵی ئەوان نان‌و چامان خوارد. هاوڕێیەکمان بۆ مەلا بەختیار پەیدا کرد بۆ ئەوەی لە گەڵی بچێت بۆ سەر جادەی کەلار ــ دەربەندیخان. لە وێوە بڕواتەوە بۆ سلێمانی. ئەومان بە رێکردو خۆمان کەوتینە جەولەکردن بە گوندەکاندا. ئەو کاتە هەشت کەس بووین. من یەك دەمانچەم پێ بوو لە سلێمانیەوە لەگەڵ خۆمدا هێنابووم. شەماڵ چەکی پێ نەبوو. وابزانم پێنج پارچە چەکمان هەبوو، هەموو کۆن‌و ژەنگاوی بوون. لەو پێنج چەکەش یەکێکیان هینی (حەمەی تەلە) بوو، کە نازناوی (شاهۆ) بوو.

مەلا بەختیار، کە ڕۆشتەوە پێم وت:
" —لە دەنگوباسی ڕێکخستنوماڵەوەمان ئاگادارم بکەرەوە."
چونکە هەر ئەو شەوەی، کە رامکردبوو، نە ئاگام لە ماڵو منداڵ بوو چییان بە سەر هاتووە، نە وەزعی ئەو هاوڕێیانەی شاریش، کە گیرا بوون. نەمان دەزانی لە یاسین زیاتر کێی تر گیراوە. ئەو کاتە هەر ئاگامان لە یاسین بوو ئەویش کۆمەڵێك برادەری لەگەڵ بوو. برادەرێکی تریشمان لەگەڵ بوو بە ناوی (عەبدوڵلای ئایش) کرێکار بوو لە کارگەی جگەرە. زۆر کوڕی چاك بوو. کاتی خۆی ئەوم دەنارد بۆ لای (یاسین). هەواڵم بۆ ناردبوو، کە یاسین گیراوە دەبێ رابکا.

٢٠

ماوەیەکی پێچوو ڕۆژێك هاوڕێیەکمان هات بۆ لام نامەیەکی دامێ، کردمەوە نامەی مەلا بەختیار بوو، کە خوێندمەوە بۆی نووسیبووم، دەڵێت:
" —(ماڵی خۆتان نازانم لە کوێن، بەڵام دڵنیابە، کە نەگیراون لە ماڵی خزمەکانی خۆتان خۆیان شاردۆتەوە. برادەران هەموو پەرتەوازە بوون، هەر نازانم چۆنیان بدۆزمەوە. لە بەرئەوەی کاك جەماله رەش رایکردووە، بەرەو دۆڵی جافایەتی ڕۆیشتوون، چوون بۆ لای کاك ئارامو کاك سالار عەزیز. عەبدوڵلای ئایش گیراوەو لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بووە. من خەریکی ئەوەم برادەران بدۆزمەوە. دوایی لە باروودۆخ ئاگادارتان دەکەمەوە.)" ئەوانەی گیرابوون: یاسینە رەش، ئیسماعیل قاسم (سمە قاسم)، نەسرەدین، سەلاح مەجیدو دووانی تر بوون. نەمدەزانی ئەوانە بۆ چی گیرا بوون، کە نامەکەم خوێندەوە وەختەبوو شێت بم، بە تایبەتی بۆ شەهیدبوونی (عەبدوڵلای ئایش). ئەو هەواڵە زۆر ئازاریدام، چونکە زۆرم خۆشدەویست. ئەوەندە چالاك بوو بە تەنیا ئیشی دە کەسی بۆ ئێمە دەکرد. پێش ئەوەی بگیرێ، جوابم بۆ نارد، کە خۆی بشارێتەوە. خۆم گومانم لەو کەسە هەبوو، کە ناردبووم بچێت ئاگاداری بکاتەوە. وتم نەچووە، بەڵام دوایی تاقیبم کرد پێی راگەیاندبوو، کە رابکا، بەڵام ئەو وتبووی:
" —بە خوا سور بزانم لە سێدارە ئەدرێم راناکەم، چونکە ماڵی ئاواتم دی باوكو دایکیان چی لێ کردووە. من ناڕۆم با خۆم بگرن لە بری منداڵەکانم."
هەر لە کارگەکەی تیایدا کاری دەکرد، هاوڕێیەکی خۆمان پێی وتبوو:
" —بڕۆ .. هاتوون بۆ ئێرە بە دواتا .. ئەتگرن."
ئەویش وتبووی:
" —ناڕۆم."
خۆی چووبوو بۆ لای بەڕێوەبەری کارگەکە وتبووی:
" —کێ هاتووە بە دوامدا."

پێی وتبوو:
" – ئەمن هاتوون، بزانە چییان ئەوێت."
خۆی چووبوو بۆ دائیرەی ئەمن لەوێ گیرابوو. یاسین ناوی منی دابوو، کە من مەسئولی ئەوان بووم.
(سمە قاسم)یش خۆی چووبوو بۆ دائیرەی ئەمن، چونکە ژنەکەیان گرتبوو. خۆی تەسلیم کردبوو، بۆ ئەوەی ژنەکەی بەربدەن. (حەمەی مام عەلی) پێشمەرگەی ناو شاربوو لەگەڵ یاسین، ئەو رایکردبوو. ئەو کاتە هاورێی ئێمە بوو. ئەوانەی گیرابوون هەموویان لە سێدارە دران. بە راستی زۆر ناخۆش بوو. دەمزانی کێ ئەو زیانە گەورەیەی لێداین، بەڵام هەمووی هەڵەی یاسینە رەش خۆشی بوو. زۆرم پێ دەوت:
" –کاکە گیان وا نابێت. لە خۆتەوە قسە لەگەڵ خەڵك مەکە. تۆ نازانی ئەو خەڵکە چییە.؟"
ئەو کاتە حەمەی مام عەلی چایخانەی هەبوو. دایم لە چایخانەکەدا بە ئاشکرا قسەیان دەکرد. من خۆم دەپاراست. نەم دەویست (یاسین)یش بمناسێ. هەر شەهید عەبدوڵڵای ئایشم دەنارد بۆ لای. ئەویش خەتای مەلا بەختیار بوو وتی:
" –با خۆت بناسێت باشترە، ئیتر هەر خۆت پەیوەندی پێوە بکە."
ئەگینا ئەو نەیدەزانی چی دەکەم. یەکتریمان هەر دەناسی. وەك رێکخستن نەیدەزانی من خەریکی چیم. خۆی کورێکی زۆر چالاكو دڵسۆزبوو.

٢١

بیست رۆژ گەشتمان لە ناوچەکانی گەرمیانو قەرەداغ کرد، رۆژێ بە هاورێیانم وت:
" –من هەندێك ئیشم هەیە، ماوەی یەك هەفتەم پێ دەچێت."
جێگام بۆ دیاری کردن، کە لە کوێ یەك بگرینەوە. بە تەنیا رۆیشتم، کەسم لەگەڵ خۆمدا نەبرد. بۆ خۆم هەموو ناوچەکە شارەزا بووم، لە زۆربەی گوندەکانیش خزمو ناسیاوم هەبوو. چووم بۆ گوندی (داراغا) بۆ ئەوەی هەواڵێکی منداڵەکانو دایكو باوکم بزانم. شەو بوو، چووم بۆ ئەوەی کەس نەمبینێ، لەوێ هەواڵم دەستکەوت، وتیان:
" –منداڵەکانت لێرە بوون .. چوون بۆ (ئاڵیاوە)."
ئاڵیاوە گوندێکە بەرامبەر شاری سلێمانی لە بەردەم گڵەزەردەدایە. هەمووی ماڵە خزم بوون. ماڵی خوشکێکم، کە لە من گەورەتربوو، هەر لەوێ بوو، مێردەکەشی پورزام بوو، چووبوون بۆ ئەوێ. لەوێ نەمامەوە، چووم بۆ گوندی ئاڵیاوە، لەوێ بوون. زۆر خۆش بوو، کە لە دوای دوو مانگ دابڕان بەو شێوەیە چاوم پێیان کەوتەوە. زەینەب بۆی باسکردم چۆن رایان کردووە، وتی:

" —بە پێی پەتی رامانکرد، هەر نەمان پەرژا پێڵاو لە پێ بکەین. زۆر بە ڕێکەوت دەرچووین، هەر (ئاشتی)م کردە باوەشو (هیوا)شم راکێشا بە دوای خۆمدا، نەنەهات، دەستی کردبوو بە گریان، ئەیوت بیرو باوەڕەکەی (ماوسیتونگ) بە جێ ماوە."

وتی:

" —ئەو شەوە چووینە ماڵی پورە حەمدی، بۆ بەیانی مامت بردینی بۆ گوندی داراغا، پورت لە ماڵو منداڵی خۆی دەترسا، بە هۆی ئێمەوە بگیرێن. بۆڵە بۆڵی دەکرد، ئێمش هەستاین چووین بۆ گوندی ئاڵیاوە بۆ ماڵی حاجی رەمەزان."

حاجی رەمەزان مێردی خوشکم بوو، لەوێ مابوونەوە. خوشکەکەم زۆر ترسابوو بێن بیانگرن، لە بەر ئەوەی ئەو گوندە زۆر لە سلێمانیەوە نزیك بوو. من خۆم نیشانی کەس نەدەدا، هەر ماڵی خوشکم دەیانزانی. بەیانیەك (زەینەب)م ناردەوە بۆ سلێمانی بۆ لای هاوڕێیان، وتم:

" —بچۆ بزانە چۆنن. (شوانە) ببینە بزانە دەنگوباسیان چیەو هەواڵی منیان پێ بگەیەنەو بڵێ ئەو منی ناردووە بۆ لاتان. هەروەها پێی بڵێ جێگایەکتان بۆ بدۆزێتەوە لە (کەرکوك) یان لە (هەولێر)."

لەبەر ئەوەی ئەو کاتە لادێ زۆر مەترسیی لە سەربوو. هەر کەسێك بچوایە بۆ هەر گوندێ دەبوایە موختاری گوندەکە ئاگاداریی حکومەت بکا، چونکە هەموو موختارەکان مووچەیان لە حکومەت وەردەگرت. رۆڵی جاسوسیان دەبینی. هەندێکیشیان باش بوون. لە بەرئەوە ژنو منداڵەکانم نەیاندەتوانی لە لادێ بژین. حکومەتیش زۆر مەبەستی بوو بیانگرێ. زۆر ئاقیبی دەکردن، چونکە ماڵمان وەك مەقەڕ وابوو لە شار. کە ئەمنەکان چووبوونە ئەوێ، ئەوەندەی شت تیابوو، بە لایانەوە سەیربوو، کە ئەم هەموو شتە لە ماڵماندا هەبووە.! ئیتر منیان بۆ نەگیرابوو، دەیانویست ئەو بگرن. وتم هەر چۆنێ بێ شار باشترە، چونکە ژن لە شار دەتوانێ خۆی بشارێتەوە، بەڵام لە لادێیەکدا چۆن دەتوانێ خۆی بشارێتەوە.!

شوانە زۆری پێ خۆش بوو، کە هەواڵی منی زانی بوو. نامەیەکی بۆ ناردم. لە نامەکەدا نووسیبووی:

" —(وەزعی خۆمان ئێستا باشە، بەڵام، کە ماڵی ئێوە نەماوە وەزعی رێکخستن زۆر خراپ بووە. ئێستا وەك هەتیومان لێ هاتووە، نە شوێنمان ماوە نە جێ. بە بێ ئێوە زۆر ناخۆش بووە. زەینەب خان بنێرەوە ئەیبەم بۆ کەرکوك یان بۆ هەولێر، لە ماڵی برادەران جێگایان بۆ ئەکەمەوە. خۆ هەموو رێکخستن قەرزاری ئێوەیە، بە تایبەتی زەینەب خان)."

(زەینەب)م لە (ئاڵیاوە)وە ناردەوە بۆ سلێمانیو خۆشم گەڕامەوە بۆ لای هاوڕێیان.
کە چوومەوە، کەوتینەوە گەشتکردن. کۆبوونەوەمان بە خەڵکی گوندەکان دەکرد. باسی شۆڕشی نوێمان بۆ خەڵکی دەکرد. لە کۆتایی قسەکانماندا دەمانوت:
" -کێ پرسیاری هەیە.؟"
دەیانوت:
" -هەرچییەکن بە خێر بێن."
هەر ولیان دەزانی مەفرەزەی حکومەتینو بە درۆ ئەو قسانە دەکەین.
رۆژێ لەگەڵ (مامۆستا حەمە ئەمین)، کە بە (شەماڵ) ناسرابوو، چووینەوە بۆ سلێمانی. من هەندێ کاروباری رێکخستنم هەبوو. مامۆستا حەمە ئەمین وتی:
" -منیش دێم لەگەڵت."
وتم:
" -زۆر باشە."
بە یەکەوە رۆشتین چووینە گوندی (داراغا). لەوێ نانی ئێوارەمان خواردو بەرەو سلێمانی بە رێکەوتین. لە رێگا بیرمان لەوە دەکردەوە بچینە ماڵی کێ، چونکە ئەو هاوڕێیانەی، کە من دەمناسین، ماڵیان نەبوو. مامۆستا حەمە ئەمین وتی:
" -من کوڕێکی خوشکەزام هەیە ماڵیان لە سەرچنارە .. ئەچین بۆ ئەوێ، بەڵام نازانم ئەوێرێت جێمان بکاتەوە یان نا.!"
منیش وتم:
" -بە خوا خۆ منیش خزمم زۆرە، بەس لەو بڕوایەدا نیم کەس بوێرێت جێمان بکاتەوە، بەڵام ماڵی کوڕێکی پورزام هەیە ئەچین بۆ ئەوێ. لە پێشا تاقی ئەکەینەوە. خۆ دیارە ئەگەر روویان خۆش بوو، لەوێ ئەمێنینەوە. ئەگەر دەمو چاویان دا بە یەکدا، ئەوە ئەڕۆین بۆ ماڵی خوشکەزاکەی تۆ، ئەویش تاقی ئەکەینەوە."
ئەمە هەر بە رێوە ئەم تەگبیرانەمان دەکرد.
کە گەیشتینە ناو شار، خۆمان بە گەڕەکی (جولەکان)دا کرد. چووینە ماڵی برادەرێکی خۆمان ناوی (تەهای حەمە رەش) بوو. ناردمان بە دوای (ئازاد حەمە غەریب)دا. ئازاد هات بۆ لامان، پێم وت:
" -کاک ئازاد ئەتوانیت سەیارەیەکمان بۆ پەیدا بکەیت، بمانبەیت بۆ ماڵی کاک غەفور.؟
وتی:
" -بەڵێ .. باشە."

چوو سەیارەیەکی بۆ هێناین. دیاربوو خاوەنەکەی هاوڕێی خۆمان بوو. بردینی بۆ ماڵەکە. هەر لە دوورەوە دابەزین، بە پێ چووین بۆ ئەوێ. لە دەرگامان دا، منداڵێکیان هات دەرگاکەی لێ کردینەوە. ماڵەکەیان دوو دەرگای هەبوو. ئێمە لە دەرگای گەراجەکەوە چووینە ژوورەوە. قەرەباڵغ بوو، دیاربوو میوانیان هەبوو. ئێمە نەچووینە ئەوێ. هەر یەکسەر خۆمانکرد بە چێشت خانەکەیاندا. کە چوومە ژوورەوە، ژن و منداڵەکانی پەلاماری منیان داو باوەشیانکرد بە ملم دا. زۆریان پێ خۆش بوو. هەروەها چیپیان بۆ من کرد، بۆ مامۆستا حەمە ئەمین زیاتر کرا. (غەفور)یان بانگ کرد بۆ لامان. غەفور زیاد لە پێویست رێزی لێگرتین، وتی:

" —هەڵسن با بچین بۆ ژووری میوان، ئەوانەش هەموو برادەری خۆمن، کوڕی باشن."

وتم:

" —ئێمە نایەین. تۆ وەزع لە خۆت تێك مەدە، هەر مەڵێ کێیە."

من زۆر دەترسام ئەو تووشی شتێك ببێ بە هۆی ئێمەوە. ئەو چووەوە بۆ لای میوانەکانی. ئێمەش لە لای ژن و منداڵەکانی دانیشتین. زۆریان پێ خۆش بوو. نانیان بۆ هێناین خواردمان، بە لامانەوە زۆر خۆش بوو، چونکە دەمێك بوو نانی وامان نەخواردبوو. غەفور، کە میوانەکانی رۆیشتن، هاتەوە بۆ لامان. زیاد لە سنوور پێی خۆش بوو. شەو درەنگ بوو، من لە خۆمەوە وتم:

" —کاك شەماڵ نەڕۆین. ؟"

وتی:

" —ئارەزووی تۆیە."

غەفور وتی:

" —بۆ کوێ ئەچن. ؟"

وتم:

" —ئەچین بۆ ماڵێکی تر."

وتی:

" —بۆ چی ئەچن، ئیشتان هەیە لەو ماڵە. ؟"

وتم:

" —نەوەڵڵا، بەس ئەچین بۆ ئەوێ. ؟"

وتی:

" —بۆ لە ماڵی ئێمە ئەترسن. ؟"

وتم:

" —کاك غەفور لەبەر ئێوە، نەوەك تووشی شتێك بن بە هۆی ئێمەوە، چونکە ئێمە بەلاین بۆ ئێوە. تووش ئەبن."

وتی:

" -گویٚ بگرە، ئەگەر لە بەر من ئەڕۆن تووش نەبم ئەوە ئیهانەی من ئەکەن. ئەگەر لە سەر تۆ خۆمو ماڵو منداڵم لە سێدارە بدرێن، ئەو کاتە خۆم بە سەربەرز ئەزانم. ئەگەر لە خۆشتان ئەترسنو لە ئێمە دڵنیانین ئەوە زۆرتان لیٚ ناکەم بۆ کویٚ ئەڵێن خۆم ئەتان بەم. ئەگینا ئەبیٚ هەر لێرەبن. هەر کەسێکیشتان ئەوێت خۆم ئەچم بۆتان دێنم. بە ئارەزووی خۆشتان بنون، ئەم ناوە زۆر ئارامە."

ماوەی دە ڕۆژمان ویست لەویٚ ماینەوە. کێمان بویستایە بە ڕۆژ بۆیان دەهێناین. (مەلا بەختیار)یش لە سلێمانی بوو. ناردم بە دوایدا. هات بۆ لام، پێم وت:

" -من ئەمەوێت بچم بۆ لای کاك ئارام."

وتی:

" -بۆ ئەچیت؟ کاك ئارام نامەی ناردووە، زۆر ئەحواڵت ئەپرسێتو زۆری پیٚ ناخۆش بوو، کە تۆ ئاشکرا بوویت. زۆر خۆش حاڵە لەوەی نەگیراویت. دایاننراویت بۆ ناوچەی قەرەداغ. ئەبیٚ تۆ لەویٚ بیت. کراویت بە لێپرسراوی عەسکەریو سیاسیی ناوچەی قەرەداغو گەرمیان. کاك ئارام ئەڵێت لەو باشترمان دەست ناکەوێت بۆ ئەویٚ. لە بەرئەوە ئەبێت هەر لەویٚ بیت."

منیش زۆرم پیٚ ناخۆش بوو بۆ ئەو ناوچەیە. فەرمانیان دابوو، نەمدەتوانی بڵێم ناچم.

وتم:

" -باشە. مادام فەرمانە ئەچمەوە بۆ ئەویٚ."

مەلا بەختیار وتی:

" -مولازم جوامێر بنێرەوە بۆ سلێمانی. ئەی نێرم بۆ لای کاك ئارام دلوایان کردووە."

ئیتر بە رەسمی بووم بە لێپرسراوی سیاسیو عەسکەریی هەموو ناوچەی قەرەداغو گەرمیان.

(شەماڵ) زۆری پیٚ خۆش بوو، وتی:

" -بە خوا تۆ نەهاتیتایە، منیش نەئەچوومەوە."

ئارامو مەلا بەختیار دەیانویست مولازم جوامێر بگەڕێننەوە بۆ سلێمانی، چونکە هاوڕێکانی، کە لەگەڵیدابوون، کەسیان لەگەڵی تەباو کۆك نەبوون. من نەمدەزانی بۆ؟ جوامێر زۆر کوڕێکی باش بوو، زۆر بێدەنگ بوو، بەڵام نەیدەزانی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوڕێیانیو خەڵکیدا بکا. کوردییەکەشی باش نەبوو. لەبەر ئەوە بڕیار درا من زوو بگەڕێمەوە بۆ لای هاوڕێیان.

شەو هاتن بە دواماندا بردینیان بۆ ماڵیٚ، لە پەنا دائیرەی ئەمندا، لە گەڕەکی شۆڕش. نەمزانی ماڵی کیٚ بوو. کە چووینە ئەویٚ، تەماشامانکرد پڕبوو لە هاوڕێی تر. هەموو هاوڕێی خۆمان بوون. زۆر سەیربوو بە لاماوە! سوارەو تەها باراویو خەباتو کاوە، ئەمانە هەموو لەویٚ بوون. توومەس تەها باراویو سوارەو کاوە، هاتبوون بۆ تەسلیم بوونەوە. ئەو سیانە تەسلیم بوونەوە لە ناو شار. پێشتر لە دۆڵی جافایەتی بوون لای

ئارام. هەموو کادری کۆمەڵە بوون. زۆرم پێ خۆش بوو، کە چاوم پێیان کەوتەوە، چونکە بەر لەوە بچمە دەرەوە هەموویانم دەناسی. بە تایبەتی سوارە. قەرەباڵخ بووین. کاتێکم زانی (مەلا بەختیار)یش هات. نازانم (دلێری سەی مەجی)یش لەوێ بوو یان نا. دڵنیا نیم، بەڵام ئەو هاوڕێیانەی، کە باسم کردن، لەوێ بوون. لەوێ ماینەوە. لە پڕ لای ماڵەکەوە لەولامانەوە بوو بە تەقە، وتمان:

" -ئەوە چییە.؟"

ماڵەکە وتیان:

" -دوێنێ شەو ئەو گەڕەکەی ئەو دیومانیان پشکنیوە. لەوانەیە ئەم شەو ئەم گەڕەکەی ئێمە بپشکنن."

هەر زۆر بە جدی بوو، لەوە نەدەچوو بزانێ ئێمە چین. هەر وای دەزانی میوانی ئاساییین. نەیدەزانی هەموومان پێشمەرگەین. زۆر ناخۆش بوو. من زۆر ترسام لەوەی بێنە سەرمان. هەر لە پەنا دائیرەی ئەمندا بووین. کوڕێکی ماڵەکە سەرخۆش بوو، هەر لە خۆیەوە دەرگاکانی دەدا بە یەکدا، وەك تۆپ دەنگی دەهات. ئێمەش هەموو خەریك بوو زیرەمان دەکرد. ئەویش ئاگای هەر لە دنیا نەبوو، بەڵام کوڕێکی تریان هەبوو زۆر ئاقڵ بوو. ئەو خێرا چوو مێزێکی هێنا داینا، کورسیی لە دەور کۆکردەوە، هەر یەکەو پەرداخێکی بۆ داناین و یەك بوتڵ ویسکیشی لە سەر مێزەکە دانا، وتی:

" -ئەگەر هاتنە ژوورەوە هەر کەسە تۆزێ بدات لە دەمی با وابزانن بۆ مەشروب خواردنەوە کۆبووینەتەوە."

بیرکردنەوەیەکی باش بوو، بەڵام گەر ئەمنەکان بهاتنایەتە سەرمان سوودی نەدەگەیاند، هەموو دەگیراین. بەڵام چارەسەر هەر ئەوەبوو. هیچ چارێکی تر نەبوو. باش بوو ئەمنەکان نەهاتن. ئەو شەوەشمان ڕۆژ کردەوە. بۆ بەیانی ئەوانەی لەێ بوون، هەموو ڕۆیشتن. هەر منو شەماڵو خەبات لەوێ ماینەوە. نیوەڕۆ بوو، لە ژوورێکدا بووین. کاتێکمان زانی منداڵی گەڕەك کۆبوونەوە، لە پەنا پەنجەرەی ئەو ژوورە قاوو قیژیان بوو. منیش تۆزێکی پەردەکەم لابرد، سەیرمکرد شتێك دانرابوو لە پەنا ستارەی سەربانی قوتابخانەکەوە. لە تەنیشتی ئەو ماڵە، بەرامبەر پەنجەرەکەی ئێمەبوو. شتەکە گوێنویەکی درابوو بە سەریدا، پێچرابووەوە، بەڵام تۆزێکی دەرکەوتبوو. چووم بە کوڕی خاوەن ماڵەکەم وت:

" -وەرە بزانە ئەمە چیە ئەو هەموو منداڵەی لێ کۆبۆتەوە.؟"

چوو سەیری کرد، هاتەوە وتی:

" -ئەی قوڕ بە سەرم، وەڵڵا ئەوە ئامێری چاپە لەوێدا شاردوومەتەوە، بۆ چی وا دەرکەوتووە.؟"

چوو منداڵەکانی بە زۆر دوورخستەوە. منداڵەکان هەر دەگەڕانەوە، دەیانوت:

" -خاڵە ئەوە چییە.؟"

باش بوو، هەر چۆنێ بوو دووری خستنەوە. وتم:
" -بە خوا تازە لەم ماڵەدا بە سەلامەتی دەرناچین."
باش بوو، شەو برازایەکی سالار عەزیز هات بە دواماندا. ناوی سەلاح عەبدوڵلا بوو، بردینی بۆ ماڵی برایەکی شەماڵ. لەو ماڵە رزگارمان بوو. یەك شەو لە ماڵی براکەی شەماڵماینەوە. شەوی دوایی ناردمان تاکسیەکیان بۆ هێنایین، وتمان:
" -هەر دوور بیوەستێنن، نەیهێنن بۆ ماڵەوە، چونکە خوا ئەزانێت خاوەن تاکسیەکە چۆنە، باشە یان نا."
تاکسیەکەیان هێنایە نزیك ماڵەکە. ئێمە چووین بۆ لای تاکسیەکە، کە سوار بووین، سەیری شۆفێرەکەمکرد سەرو چاوی لە ئەمن دەچوو. هەر لێمان وورد دەبۆوە. وتی:
" -بۆ کوێ ئەچن.؟"
من وتم:
" -بۆ سەرشەقام."
بەلام دەمانچەیەکم پێ بوو، وتم ئەگەر بەرەو ئەمن چوو، یەك فیشەك دەنێم بە سەرییەوەو رادەکەین. باش بوو بردینی بۆ سەرشەقام. هەر دەرۆیشتین‌و پرسیاری دەکرد، دەیوت:
" -بۆ کوێ دەچن.؟"
منیش هەر پێم دەوت:
" -برۆ."
دیاربوو ئەویش دەترسا. رۆیشتین هەتا گەیشتینە قەسابخانەکەی سلێمانی زۆر لە خوار شارەوەبوو. لەوێ دابەزین‌و بە پەلە رۆیشتین بەرەو دەرەوە. شەو بوو، نەدەترساین. ئەو شەوە چووینە گوندی داراغا، لە ماڵی پوورم ماینەوە هەتا بەیانی. بەیانی بە رێ کەوتین بۆ قەرەداغ. چووین هاورێیانمان دۆزییەوە. شەوەکەی لە گوندی دوکان بووین. بۆ رۆژی دوایی بەرەو گوندی (کەڵۆش) رۆیشتین چووینە سەر ئاوەکەی (دێوانە). لەوێ کۆبوونەوەیەکمان ساز کرد. نامەکەی (مەلا بەختیار)م دا بە (ملازم جوامێر)، خوێندیەوە. دیاربوو خۆشی پێی خۆش بوو، کە برِوا. هەر لەوێ چەکەکەی دایە دەستم‌و خواحافیزی لێ کردین، بەرەو سلێمانی کەوتە رێ. ئێمەش چووین بۆ گوندی کەڵۆش. لە رێ چەکەکەی (مولازم جوامێر)م دا بە یەکێ لەوانەی، کە بێچەك بوون. ئەو شەوە من لەوێ نەخۆش کەوتم گورچیلەم بەردی تیابوو. تەندروستیم زۆر خراپ بوو. هەتا بەیانی لە تاو ئازار دەتلامەوە. هەموو ولیان دەزانی دەمرم، بەلام ئەوە یەکەم جارم نەبوو. چەندین جار وام لێهاتبوو لە سلێمانی بە پەلە دەیان بردم بۆ نەخۆشخانە. رۆژ بۆوە من هەر وەك خۆم وابووم. بە برادەرانم وت:
" -ئێوە برۆن من بە جێ بێڵن."

چونکە مەترسیمان لە سەر بوو، نەدەبوو زۆر لە گوندەکاندا بمێنینەوە. پێشم وتن بەرەو کوێ بڕۆن، بۆ ئەوەی شوێنەکانیان بزانم. دوایی بیان دۆزمەوە. لە ماڵی (حاجی ئەحمەد کەڵۆش) بووین. برادەرێکی یاریدەدەری پزیشکیمان هەبوو ناوی (ئاسۆ) بوو، خۆی ناوی (جەلال)[18] بوو. زۆر کوڕێکی باش‌و زۆر زیرەك بوو. خەڵکی (کەرکوك) بوو. من‌و ئەو دوو بە دوو ماینەوە. هاوڕێیانی تر هەموو ڕۆیشتن. ئێمەش دوو ڕۆژ ماینەوە، ئەوجا تەندروستیم باش بووو چووینەوەو هاوڕێیانمان دۆزییەوە.

## ٢٣

ماوەیەکی زۆر لەگەڵ پێشمەرگەکان بە یەکەوە بووین. زۆر بێ چەکیش بووین. ژمارەیەك لە پێشمەرگەکانمان هەر چەکیان نەبوو. خۆشم هەر یەك دەمانچەم پێ بوو. مانگی دووی ساڵی ١٩٧٧ بوو. بیرم کردەوە وتم دەبێ بیر لە چالاکییەکی عەسکەری بکەینەوە. لە لایەکەوە بۆ ئەوەی ئیتر دۆست‌و دوژمن بماننناسن، لە لایەکی تریشەوە بۆ چەك پەیدا کردن. ئەو کاتە قەرەداغ یەك فەوجی عەسکەری لێ بوو. ڕۆژانە کاروانێکی سەربازی دەچوو بۆ سلێمانی، ئێواران دەگەڕایەوە. بیرم لەوە کردەوە، کە تاقیبی بکەم. جادەیەکی تازەیان لێ دەدا لە سلێمانیەوە بۆ ناحیەی قەرەداغ، لە سەرچاوەی (تلەزەیت)ەوە خەریکی ئەوە بوون. بە باشم زانی لەوێدا بۆسەیەك دابنێین بۆ ئەو کاروانەی، کە ئازووقە دێنێ. لە گوندی (شەمە) بووین، هاتین بەرەو گوندی (وێلەکەی سەرو). ئەو گوندە لە بن شاخەکەدایە. لەوێ نانی نیوەڕۆمان خوارد، پێنج پێشمەرگەم جیاکردەوە، بە خۆمەوە بووین بە (شەش). بە (شەماڵ)م وت:

" -کاك شەماڵ .. تۆ لەگەڵ پێشمەرگەکان بە، بڕۆن بۆ (میریاسی سەرو)."

ئەو گوندە لە ناو شاخەکەدا بوو، لە شاخی (سولیاوە)وە نزیك بوو. وتم:

"- ئەگەر شەو نەهاتینەوە، ئێوە بڕۆن بۆ دەوری گوندی (دەلوجە) لەو ناوەدا خۆتان حەشار بدەن."

دوای نیوەڕۆبوو ئێمە بە ڕێکەوتین بەرەو شاخی (سولیاوە) بۆ ئەو شوێنەی ئێستا بورجەکەی لێیە. ئەو کاتە گردێکی زۆر بەرز بوو هیچی لێ نەبوو، ڕەبایەی لێ نەبوو. حکومەت بۆ خۆی ئازاد بوو. چووینە سەر ئەو گردە. سەیری جادەکەم کرد شۆفڵ‌و بیلدۆزەر ئیشیان لێ دەکرد. چاوم لێ بوو عەسکەریان بە دیارەوەبوو. دیاربوو حیمایەیان دەکردن. کات خەریکبوو درەنگی دەکرد. دەوری دوو کات ژمێر ڕۆژی مابوو. وتم:

---

[18] لە هەکاری شەهید بوو.

" -با بڕۆین بۆ سەر جادەکە کەمینێك دابنێین، بەڵکو هەندێك خەڵکی سەر بە حکومەت بگرین."
وتیان:
" -باشە."
ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵم بوون ئەمانە بوون: یەکەمیان (مەلا ئەحمەد) خەڵکی گوندی مەسۆیی بوو، کادر بوو. زۆر هاوڕێم بوو. پێشتر دەمناسی، بە یەکەوە پێشمەرگە بووین. زۆر ئازابوو، نازناوی (گەرمیانی) بوو. دووەمیان (گۆران) بوو. سێهەم (مەولود گوڕبازی)و چوارەم (حەمەی تەلە)و پێنجەم (عەبدوڵڵا سور) بوو. ئەویش هاوڕێی گۆران بوو. دامەزرایین. مەولود گوڕبازو گۆرانم ناردە سەر بەرزییەکەی پشتی (دارە رەش) بۆ ئەوەی چاویان لەو دیویش بێ، کە دەکەوێتە رووی سلێمانی. هەرچی بێ پێم بڵێن. عەبدوڵڵاشمان نارد بۆ پشتی سەرچاوەی (تلەزەیت) لە سەر گردێکی زۆر بەرز دەیروانی بە سەر رووی قەرەداغ دا. خۆمو مەلا ئەحمەدو حەمەی تەلە چووینە سەر جادەکە. لە ناو دۆڵێکدا بوو. مەلا ئەحمەد هەر لە کاتی پێشمەرگایەتییەوە هاوڕێی خۆم بوو. هەر دووکیان پێشمەرگەی کۆن بوون. بروام پێیان هەبوو. چووینە سەر جادەکە، دوو پیکاب لە قەرەداغەوە هات. عەبدوڵڵا هاواریکرد وتی:
" -کاك ئاوات .. دوو سەیارە هات پڕە لە خەڵك."
منیش وتم:
" -لە سەر جادەکە لاچن هەتا دێن، با بزانین چین؟ ئەوەك لە دوورەوە بمانبینن. ئەگەر خەڵکی سەر بە رژێمی تیابێ ئەگەڕێنەوە."
هەر یەکە چووینە بن دەوەنێك بۆ ئەوەی دیار نەبین. سەیارەکان هاتنە پێشەوە هەموو کرێکاربوون دەچوونەوە بۆ سلێمانی. کرێکاری دائیرەی (ڕێگاوبان) بوون، لە جادەکە ئیشیان دەکرد. وتم:
" -مەلا ئەحمەد تۆ دەستیان لێ راگرە، ئێمەش هەر دووکمان ئاگامان لێت ئەبێت. تۆ قسەیان بۆ بکە رێبازی شۆڕشیان بۆ باس بکە، بەس زۆر قسە نەکەیت، هەر پێنج دەقە باشە. دوای ئەوە با برۆن."
لە بەر ئەوەی بە دیوی دارە رەشدا کەمینی عەسکەری لێ بوو، کە کیلۆ مەترێکیش لێمانەوە دوور نەبوو. (قەرەداغ)یش فەوجی عەسکەری لێ بوو، دەیانتوانی بە چارەکێك بگەنە ئەو شوێنە. ئێمەش خۆمان لە سەر جادەکەین. مەلا ئەحمەد تۆزێ باسی شۆڕشی نوێی بۆ کردن. وا بزانم هەر بڕواشیان نەکرد ئێمە چین. شتی وایان نەبیستبوو. ئەوانمان مۆڵەتداو رۆیشتن. پێنج دەقەی پێ نەچوو، دەنگی سەیارە لە سلێمانییەوە هات. بە دیوی گوندی (دارە ڕەش)دا. هاوارمکرد بۆ مەولودو گۆران وتم:
" -ئەوە چییە هات.؟"

ئێمەش هەر لە سەر جادەکەین وەستاوین. پێش ئەوەی وەڵامی ئێمە بدەنەوە، پێشی زیلێك دەرکەوت. ئەوان، کە پێشی زیلەکەیان بینی هەستان، جادەکەیان بە جێ هێشت بەرەو شاخەکە. هاوارمکرد:

" -هەڵمەستن، خۆتان مت بکەن با نەتانبینن."

دوو (ئیڤا)ی عەسکەری بوون. هاتن بە دیوی ئێمەدا. ئێمە هەر یەك لە قەراغی جادەکە خۆماندا بە زەوی دا. فریا نەکەوتین دوور بکەوینەوە. باش بوو چاویان پێمان نەکەوت. بە حەمەی تەلەو مەلا ئەحمەدم وت:

" -کەس تەقە نەکات هەتا خۆم تەقە نەکەم."

یەکەم زیل ژمارەیەکی کەمی لە سەرباز تیابوو. زەخیرەی تیا بوو. دووەم زیل پڕبوو لە سەرباز. یەکەم تێ پەڕی تەقەم نەکرد. دووەم گەیشت تەقەمان لێ کرد. عەبدوڵڵا تەقەی لەوی تر کرد، کە لە پێشەوە بوو، ئەویش وەستا، چونکە نزیکبووین، ئەوان بۆ شاخەکە تەقەیان دەکرد بەر ئێمە نەدەکەوت، بەڵام ئێمە بە ئارەزووی خۆمان لێمان دان. شەڕەکە سێ چارەکی خایاند. زۆریان لێ کوژرا. دوانیان چووبوونە بن پێچکەی زیلەکەوە، لە ئێمەوە دەر نەدەکەوتن هەر تەقەیان دەکرد. منیش سڵم لەوە دەکردەوە، وتم:

" -ئێستا هەر هیچ نەبێ ئەو عەسکەرانەی ئەودیومان بۆ دێن."

کەسیش لە سەرەوە نەمابوو. باش بوو هەردووکیان دەستیان بەرزکردەوە تەسلیم بوون. دلوامان لێکردن دوورکەونەوە لە سەیارەکە. وتم:

" -کەس نەچێتە سەریان جارێ هەتا دوور نەکەونەوە."

وتم:

" -نەك درۆ بکەن لە پڕ یەکێکیان تەقەمان لێ بکات، چونکە شتی وا زۆر رووی داوە."

چووینە سەر زیلەکان، بە پەلە هەشت کلاشنکۆف و یەك دووربین و یەك دەمانچەمان دەست کەوت. دەمانچەکە زۆر تازەو جوان بوو. دەمانچەی وام پێشتر نەدیبوو. هەشت کلاشنکۆفەکە لە جۆری (میزەللی) بوون. هەر ئەوەمان دەست کەوت. زۆری تری تیابوو. ئێمە پەلەمان بوو، کاتمان بە دەستەوە نەبوو، ئێمەش کەم بووین، دەمانویست بە سەلامەتی دەرچین. زۆر مەترسیمان لە سەر بوو، لەوە دەترساین هێز بگات بە فریایان. نزیکەی سی سەرباز دەبوون. هەشتیان بریندار بوون. ئەوانی تر دیل و کوژراو بوون. ساغەکانمان تۆزێك دوور خستەوە. دوو (نائب زابت)یان تیا بوو. دوانی تریان رائید بوون. نازانم ئەو دوو رائیدە چییان دەکرد لەگەڵ ئەواندا.! هێنامانن تۆزێ قسەمان بۆ کردن. مەلا ئەحمەد عەرەبییەکەی باش بوو، وتم:

" -تۆزێ قسەیان بۆ بکە."

ئەوانیش جوێنیان دەدا بە (ئەحمەد حسن بەکرو سەدام حسێن). ئیتر بەرمان دان گەڕانەوە بۆ لای سەیارەکانیان و بریندارەکانیان. ئێمەش بە پەلە دوورکەوتینەوە بۆ

شوێنێکی باش. دنیا تاریکی کردبوو. چووینەوە بەرەو گوندی (میریاسی سەرو) بۆ لای جەماعەت. ئیتر لە خۆشیدا نەماندەزانی چی بکەین. ئەو هەموو چەکەمان گرتبوو، خۆشمان بە سەلامەتی گەڕاینەوە. وامان دەزانی کوردمان رزگار کردووە. کە نزیك بووینەوە حەرەسەکە تێی خوڕین، وتمان:

" –خۆمانین. "

هات بۆ لامان، کە ئەو هەموو چەکەی بینی، لە خۆشیدا پەلاماری داین ئەم لاو لای ماچ کردین، هاواریکرد بۆ شەماڵو هاوڕێکانی تر. هەموو لە خۆشیاندا نەیاندەزانی چی بکەن.! ئەوە یەکەم چالاکی بوو لە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، کە لە ناوچەی قەرەداغو گەرمیاندا بکرێ. چووین نانمان خوارد، وتم:

" –با بڕۆین دوورکەوینەوە لەم ناوە. بەیانی رۆژ بووەوە هەلیکۆپتەر دەگاتە سەرمان. "

هەر ئەو شەوە پەڕینەوە بۆ بەری شاخی (دەلوجە). منو شەماڵ لە ماڵی هاوڕێیەك بووین ناوی (محەمەد) بوو. لەوێ دانیشتبووین، هێشتا چامان نەخواردبووەوە، لە پڕ سەللەیەك کلاشنکۆف تەقی. محەمەد وتی:

" –ماڵتان بە قوڕگیرێت دەورتان گیرا. "

ئێمەش بە پەلە رامانکردە دەرەوە. سەیرمکرد هەموو هاوڕێیان لە بەردەمی مزگەوتەکەدا کۆبوونەتەوە، بەڵام شڵەژاون. وتم:

" –ئەوە چی بوو.؟"

وتیان:

" –فیشەك لە دەستی ئەو برادەرە دەرچووە. "

وتم:

" –خۆ کەسی نەکوشتووە.؟"

وتیان:

" –نەوەڵڵا. بەڵام بەر دەستی حەمەی تەلە کەوتووە. "

کە چووم، حەمەی تەلە دەستی ببو بە خرخاڵ. یەك سەللە بەر دەستی کەوتبوو، دووسێ پەنجەی شۆڕببوونەوە، بەڵام حەمە هەر بە خەیاڵیدا نەدەهات. باش بوو (دکتۆر ئاسۆ)مان لەگەڵ بوو تیماریی بۆ کرد. پاشان رۆیشتین بەرەو گەرمیان. بۆ ئەوەی ماوەیەك خۆمان دوور بخەینەوە. حەمەو دکتۆر ئاسۆو پێشمەرگەیەکی خزمی حەمەم بە یەکەوە دانا، بۆ خۆیان بە موختەفی جێ گۆڕکێ بکەن لە ماڵە رێکخستنەکانی دۆستی خۆمان. دۆستی زۆرمان هەبوو. خۆشمان رۆیشتین بەرەو گەرمیان.

ئەو چالاکییە دەنگێکی زۆر گەورەی دایەوە لە هەموو ناوچەکەدا. هەتا لە سلێمانیش زۆر چالاکیەکی گرنگ بوو. ئیتر بۆ هەر گوندێك دەچووین خەڵکی بەرەوپیرمان دەهاتن.

پێش ئەوە لێمان دەترسان، وایان دەزانی پیاوی حکومەتین. دوای ئەوە خەڵك ناسینی. وردە وردە زۆر بووین، چەکمان لە خۆمان زیاتربوو.

٢٤

ماوەیەکی پێ چوو (تەحسین شاوەیس) لە لایەن (پ.د.ك)ەوە نێردرابوو بۆ گەرمیان. ژمارەیان هەشت کەس بوو، بەلاّم من نەمدیبوون. یەکجار شەماڵ لەگەڵیان دانیشتبوو. بە ناوی پارتی ئەو کاتە (قیادە موئەقەتە) بوون. منیش چەند جارێ هەواڵم بۆ نارد، دەموت:

" -حەز ئەکەم رۆژێك یەکتر ببینین."

ئەو هەر دەیوت:

" -باشە."

بەلاّم قەت خۆی لە ئێمە نزیك نەدەخستەوە. نازانم بۆ چی؟ دەترسا یان نیازی خراپ بوو. من هەر بە راستی دەمویست یەکتر ببینین، بۆ ئەوەی جار جار پێکەوە گەشت بکەین، یان ئەگەر توانیمان بچین بە یەکەوە بۆسە دابنێین، بەلاّم ئەو هەر نەهات. منیش هەر نەمدی.

٢٥

لە گەرمیان بووین، گەڕاینەوە بۆ دیوی قەرەداغ. دوای نیوەڕۆ بوو لە پشت گوندی (سێوسێنان) بووین، سەیرمکرد حەوت چەکدار هاتن بۆ ناو گوندەکە. بە دووربین سەیرمکرد، کەسم لێ نەدەناسین. هاوڕێیانی تریش نەیانناسین. وتمان:

" -رەنگە ئەوانە جەماعەتی تەحسین شاوەیس بن."

چونکە پێشمەرگە لەو ناوە نەبوو لە ئێمە زیاتر. دوو پێشمەرگەم نارد بۆ لایان، یەکێکیان مەولود گوڕبازی بوو. وتم:

" -بزانن ئەوانە کێن.؟"

کە چووبوون لێیان پرسی بوون. لە وەلاّمدا وتبوویان:

" -ئێمە کۆمەڵەین. بە دوای کاك ئاوات دا دەگەڕێین."
خۆی پێ ناساندبوون وتبووی:
" -من (سیروان)م."
ئەوانیش وتبوویان:
" -باشە، ئێمە جەماعەتی ئەوینو خۆشی لێرەیە."
کە هاتن، ئێمەش چووین بەرەوپیریان. تەنها (بێستون)م ناسی.کەرکوکی بوو. لە شاری کەرکوکەوە، پێش چوونە دەرەوەم دەهات بۆ ماڵمان لە سلێمانی. چاومان بە یەکتر کەوت، ئەملاو لای یەکمان ماچکرد. حەوت پێشمەرگەبوون: سیروان تاڵەبانی، مامۆستا شێرکۆ، مام ڕۆستەم، کاك فاخر، بێستون بوون. ناوی ئەوانی ترم لە یاد نییە.
لەگەڵ بێستون کەوتینە قسەکردن، وتم:
" -کەی راتکردووە.؟"
وتی:
" -کورە ماڵت بە قوڕگیرێ، وەختبوو لە ماڵی ئێوە بگیرێم. چووم بۆ ماڵەوە، وەك جاران لە دەرگامدا، کەس نەبوو. منیش هەر وەستابووم. ژنێك هات لەوێوە وتی ئەوە تۆ چیت دەوێ، راکە مەوەستە. سەرت دێشێ؟ هەر ئەوەندەی وتو من رامکرد. یەکسەر چووم بۆ کەرکوك، وتم بە خوا گیراون. دوایی هاتمەوە تاقیبمانکرد، وتیان نەگیراون رایانکردووە. کاك ئاواتیش لە ناوچەی قەرەداغە. زۆرم پێ خۆش بوو ئەم جارەش یەکمان بینیەوە."
ئەوە زۆر خۆش بوو بە لامەوە. هەموو کۆمەڵە بوون. ئێمەش ئەو کاتە هەر کۆمەڵە بووین. کۆبوونەوەشمان هەر بە ناوی کۆمەڵەوە دەکرد. بووین بە هێزێکی باش. بە ئارەزووی خۆمان گەشتمان بە بێ ترس لە ناوچەی قەرەداغدا دەکرد. رۆژێ سیروان وتی:
" -من ئەمەوێت سەردانێکی گەرمیان بکەم. ئەچم بۆ دەوری (قادرکەرەم) هەندێك ناسیاویشم لەو ناوە هەیە."
وتم:
" -باشە."
مەفرەزەیەکی باشم بۆ جیاکردەوە لە وانەی خۆی. مام ڕۆستەمو ئەوانەی لەگەڵ سیروان بوون. کاك بێستونو ئەوان لای من مانەوە نەچوون. ئەوان رۆشتن بەرەو گەرمیان. چەند رۆژێکیان پێ چوو. رۆژێك سەیرمکرد دوو پێشمەرگە پەیدا بوون. وتم:
" -ئەوە بۆ هاتوونەتەوە.؟"
وتیان:
" -لە یەك دابڕاوین."
وتم:" -بۆ چی لە یەك دابڕاون.؟"

وتیان:
" -شەو لە گوندەکە بووین، کۆبوونەوەمان بە خەڵکی گوندەکە ئەکرد لە پڕ دەنگی دەبابەو سەیارە هات. بە پەلە چووین بە کاك (سیروان)مان وت هێزی حکومەت هات. هەموو رامانکرد بەرەو دەرەوەی گوندەکە. نازانین جەماعەت چییان لێهات. دێ بە دێ گەڕاینەوە بۆ قەرەداغ."
منیش زۆرم قسە پێ وتن. بڕواشم پێ نەکردن، چونکە هەردووکیان خەڵکی سلێمانی بوون. وتم:
" -دیارە گەرمیانیان زۆر لا ناخۆش بووە، بە فێڵ خۆیان دزیوەتەوە. با چاوەڕوان بکەین بزانین چی دەبێت.!"
یەك دوو رۆژی پێ چوو، هەموو یەك یەك و دوو دوو هاتنەوە. سیروان دوایین کەس بوو، کە هاتەوە. بۆی گێڕامەوە، کە چیان بە سەر هاتووە. لە ئاوایی (شێخ حەمید) بوون، کۆبوونەوەی بە خەڵکی گوندەکە کردبوو. گوندەکەش رێکخراوی رژێمی بەعسی تیابوو. چووبوون جەیشی شەعبییان بۆ هێنابوون. ئەمانیش، کە زانیبویان، هەر کەس بۆ خۆی لە گوندەکە رایکردبوو. مام رۆستەم و ئەوان دەیانوت:
" -کاك سیروان ئێمەی جێ هێشتووە."
ئەویش دەیوت:
" -کەس لە سەر من نەوەستاوە."
باش بوو هەموو بە سەلامەتی گەڕابوونەوە. ئەوە گرنگ بوو. ماوەیەك ماینەوە. کاك فاخرو مام رۆستەم وتیان:
" ئێمە دێینە لای تۆ، لەگەڵ کاك سیروان ناڕۆینەوە."
منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو. ئەوان لەگەڵ سیروان هاتبوون، ئێستا دێنە لای من. سیروان لەبەر ئەوەی کۆمەڵەبوو، زۆرم خۆش دەویست. دڵسۆزی کۆمەڵەبوو. کۆمەڵەمان زۆر لا پیرۆز بوو. وتم:
" -جارێ بوەستن، خۆ هەر بەیەکەوەین."

## ٢٦

مانگی چواری ساڵی ١٩٧٧ بوو، لە گوندی (بەڵخە) بووین. بەیانییەك هەواڵمان بۆ هات وتیان:
" -هێزێکی زۆر لە شارباژێڕەوە هاتووە."
سەیرمانکرد لە گوندی (کەلۆش)ەوە پێشمەرگە ریز بووە بەرەو گوندی (مەسۆیی) دێن. گوندی مەسۆیی بەرامبەر گوندی بەڵخەیە. پێشمەرگەکان زۆر بوون. هاوڕێیەکم لە گوندەکەوە نارد وتم:

" —بزانە ئەو هێزە هی کێ یە.؟"
هاتەوە پێی وتم:
" —مەسئولەکەیان ناوی کاك (سالار)ە. پرسیاری تۆشی لێکردم. وتم ئەو ناردوومی، ئەویش وا لەو دێیەی ئەو بەرەوەیە."
هاتن بۆ لای ئێمە. هەر لەو ڕۆژەدا، هەواڵیان هێنا، وتیان:
" —(مەلا مەحمود)[١٩] رایکردووە، خۆیو چوار کەسی تر بە چەکەوە هاتوون بۆ لای تۆ دەیانەوێت تۆ ببینن."
بە هەرحاڵ، ناردم ئەوانیش بێن. لە دێیەکی تر بوون. سالار عەزیز نزیك بووەوەو منیش بەرەوپیری چووم، سەیرمکرد ئەو زۆر بە ساردییەوە وەڵامم دەدات‌ەوە. هەر وەك ئەوەی یەکەم جار بێ یەکمان بینیبێت. زۆرم پێ ناخۆش بوو، بەڵام گوێم نەدایێ. (ئەنوەری مەجید سوڵتان)و (محەمەد مۆریاسی)و (عوسمانی قادر منەوەر)و چەند پێشمەرگەیەکی تریشی لەگەڵدا بوو. زۆری پێ نەچوو مەلا مەحمودو هاوڕێکانییان هێنا. خۆیو دوو برایو دوو کەسی تریش بوون. مەلا مەحمود لێپرسراویان بوو. لە دەربەندیخان دادەنیشتن. منو سالار عەزیز لەگەڵی دانیشتین، پێمان وت:
" —چۆن هاتیتە دەرەوە.؟"
وتی:
" —لەگەڵ مەسئولی (مونەزەمەی بەعس) شەڕمان بووە. زۆرم جنێو پێ داوە، ئیتر هاتوومەتە دەرەوە."
وتمان:
" —ئەی ناڕۆیتەوە.؟"
وتی:
" —نەخێر، بەڵام لەوانەیە (صەدام) خۆی جوابم بۆ بنێرێت."
وتمان:
" —جا تۆ (صەدام) چۆن ئەناسیت.؟"
وتی:
" —ئەوە ژمارەی تەلەفۆنی مەکتەبی صەدامم پێیە."
زۆر قسە زانو زمان لوس بوو. زۆر قسەی کرد وتی:
" —من ئەتوانم بە ماوەیەکی کەم یەك هێزی گەورە دروست بکەم. من خەڵکم زۆرە."
بۆ شەوەکەی چووینە گوندی (بەلەك جاپ) سالار عەزیز وتی:
" —کاك ئاوات ئەمە زۆر خەتەرە چەکی پێیە.؟"
بانگم کردنو چەکەکانم لێ وەرگرتن. (مەلا مەحمود)مان بانگکرد پێمان وت:

---

٢- مەلا مەحمود کاتی خۆی شیوعی بووە. دوایی بووە بە بەعسی. زۆر دەستی لای حیزبی بەعس دەڕۆیشت. دیار بوو کاتی خۆی نهینی حیزبی شیوعی زۆر دابوو بە بەعس.

" –ڕاستمان پێ بڵێ چۆن هاتوویتو ئەتەوێت چی بکەیت.؟"

وتی:

" –بڕوام پێ بکەن، هەر خۆم هاتوومەتە دەرەوە. ئەوەی پێم وتن هەر وا بووە، عاجز بووم."

سالار وتی:

" –درۆ ئەکات."

مام ڕۆستەمو (سیروان)م بانگکرد وتم:

" –بیبەن بۆ ئەو لای دێیەکەوە بیترسێنن، بەڵکو ئیعتراف بکات."

خۆشمان هەموو لە مزگەوتەکە بووین، براکانیشی لای خۆمان بوون، بەبێ چەك. کاتێکمان زانی بوو بە تەقە. ڕامانکردە دەرەوە بزانین چی ڕوویداوە؟ ئێمە لەوە ترساین کوشتبێتیان، چونکە نەمانوت بیکوژن. وتمان وای لێ بکەن بەڵکو ڕاستی بڵێت. پێم ناخۆش بوو لێی بدەن. زۆر دژی لێدان بووم. هەرگیز لە کەسم نەداوە. ئەگەر جارێك لە خەڵکم دابێ زۆر پەشیمان بووم. مام ڕۆستەمو سیروان هاتنەوە بە دەستی خاڵی، وتیان:

" –خۆی لە دەستمان ڕاپسکانو ڕایکرد. ئەو هەموو تەقەیەمان لێ کرد بەری نەکەوت."

بڕوام نەدەکرد ڕاست بکەن. وتم کوشتوویانە. پێم وتن:

" –بە ڕاستتانە.؟"

وتیان:

" –بە خوا ڕایکردووە لە دەستمان."

بەو شەوە کەوتینە ئەو ناوە بە دوایدا نەماندۆزییەوە. شەو زۆر تاریك بوو، بارانیش دەباری. دوو براکەی دەستیانکرد بە گریان، وایان دەزانی کوشتوویانە. هاتم پێم وتن:

" –ئێوە لە جیاتی ئەو ئەکوژین."

ئینجا زانییان ڕای کردووە. هەر ئەو شەوە، گەیشتبووە ناحیەی قەرەداغ. حکومەت گرتبووی، بڕوایان پێ نەکردبوو، کە ڕایکردووە. گیرا.[20]

دوای ئەوە لەگەڵ ئەو هێزەدا ماوەیەك بە یەکەوە گەشتمان کرد. هەندێ پێشمەرگەی خۆمان دابوو بەوان بۆ شارەزایی لە ناوچەکەدا. دابەش ببوین، چونکە ئەوان زۆر بوون. هەمە جۆرە خەڵکیان لەگەڵ بوو، دەتوت چێشتی مجەورن. پێشمەرگەکانی ئێمەش هەموو خەڵکی ڕێکخستن بوون. زۆر ڕێکخراو بوون، هەموشیان خەڵکی خوێندەوارو کۆمەڵە بوونو زۆربەیان لە شارەوە هاتبوون. ئەگەر یەکێکیان لەگەڵ ئەوی تریان

---

[20] ماوەیەکی زۆر لە زیندان بوو. دواجار حوکمی ئیعدامی درا. وەسیەتی کردبوو وەک شەهیدی کۆمەڵە حسابی بۆ بکەن. وەسیەتەکەی قبوڵ کرا. کراوە بە شەهیدی کۆمەڵە. لە هەوڵەکانی خۆماندا ناوی هەیە وەک شەهیدی یەکێتی.

ناخۆشیان بووایە، یان قسەیان بە یەکتر بووتایە، دەبوولیە کۆبوونەوەمان بکردایە بۆ ڕێکخستنەوەیان.
سالار عەزیزو هێزەکەی ماوەیەك لەلامان مانەوە. پاشان وتیان:
" -ئێمە ئەپەڕینەوە."
وتم:
" -باشە."
خۆم لەگەڵیان ڕۆیشتم هەتا گوندی (داری کەلی). لەوێشەوە نەفەرم بۆ گرتن تا لە جادە بیانپەڕێنێتەوە. ئەوان ڕۆیشتن، ئێمەش گەڕاینەوە بەرەو گوندی (سەرزەل). شەو لەوێ بووین. ئەوەندەم زانی پێشمەرگەیەکی شەهیدیان هێنا لەگەڵ بریندارێك
وتم:
" -ئەوە لە کوێ شەهید بووە.؟"
وام زانی کەوتوونەتە کەمینەوە. وتیان:
" -لە گوندی (تەپە ڕەش) وامان لێهاتووە."
وتم:
" -بۆ واتان لێ هاتووە.؟"
وتی:
" -چووینە سەر ماڵێك بۆ تەرەکتۆر. خاوەن ماڵ نەیوێرا، ترسا دەرگاکەی لێ نەکردینەوە. کاك سالار وتی بچن بە شەق دەرگاکەی بشکێنن خۆیی‌و تراکتۆرەکەی بێنن. پێشمەرگەکەش چوو. ئەویش تەقەیکرد. ئەو پێشمەرگەیەی شەهید کردو ئەمیشی بریندار کرد. دوایی مەلای دێکە چوو هێنایە دەرەوە."
دیاربوو کابرا دوژمندار بوو، نەی وێرابوو دەرگاکە بکاتەوە. ناوی (عوسمانی ئۆکل) بوو. پێشمەرگەکان بردبوویان لەگەڵ خۆیان بۆ دۆڵی جافایەتی، بەڵام لەوێش لە دەستیان رایکردبوو، کە هاتبووەوە، ببوو بە جاش. ئێمەش هەر ئەو شەوە، تەرمی شەهیدەکەمان ناشت لە گوندی سەرزەل، خۆمان ڕۆیشتین. زانیمان بەیانی حکومەت ئینزال بۆ ئەو ناوە دەکا. بەیانی ئەو ناوەیان هەموو گرتبوو. هەلیکۆپتەر هەتا گوندی (سەرزەل)یش هاتن. باش بوو گۆڕی شەهیدەکەیان نەدۆزییەوە. ئەگەر بیاندۆزیایەتەوە دەریان دەهێنایەوە.
ئەنوەری مەجید سوڵتان لەگەڵ هێزەکەدا نەچوو. لە بەری قەرەداغ لەگەڵ کەرتەکەی، کە ژمارەیان پانزە بوون، مانەوە.

زۆر بێتاقەت بووم بۆ منداڵەکانم. ماوەیەك بوو هەواڵیانم نەدەزانی. هەر دەیانوت وان لە هەولێر. بیستبووم کوڕمان بووە. رۆژێك بە دزییەوە چوومەوە بۆ سلێمانی. شەو خۆم کردەوە بە سلێمانیدا. چوومە ماڵی ئەمینی پورزام. ناردم بە دوای شوانو ئازادی مەلادا. ئەو کاتە ئازاد ببوو بە لێپرسراوی کۆمیتەی سلێمانی. هاتن بۆ لام وتم:

" –حاڵو ئەحواڵتان چۆنە.؟

دیاربوو زۆر باش بوون. چونکە مەلا بەختیاریان لە کۆڵ ببووەوە، چونکە هەمیشە لە نێوان یەکدا نارێك بوون. ئەو چوو بۆ ناوچەی هەولێر. دوایی لێمپرسین:

" –ماڵەوەمان چۆنن.؟"

ئازاد وتی:

" –من دوێنێ لایان بووم باشن، بەڵام باجی زەینەب زۆر بێ تاقەتە ئەیوت ئەبێ بمبەیتەوە. منیش خۆم لێشاردۆتەوە، پێم وت دێمەوە بۆ لات، وتم با جواب بۆ خۆت بنێرم بزانم ئەڵێیت چی؟ ئەوە باش بوو خۆت هاتیتەوە."

ئەو شەوە هەر لەو ماڵە کاك ئازاد لای من مایەوە. بەیانی زوو پێم وت:

" –برۆ بیان هێنەرەوە بۆ ئەم ماڵە دایان بنێ. ئەیانبمە دەرەوە خۆم سبەی شەو ئەڕۆمەوە لەوێ نەفەرێك ئەنێرم بە دوایاندا."

ئەو بەیانی زوو رۆیشت بۆ هەولێر. منیش هەتا شەو لەوێ بووم، شەوێ بە سەیارەی ئەو کوڕەی پورزام رۆیشتم وتم:

" –بمبە بۆ ماڵی ئەو برادەرە."

لەو کاتەشدا جەماله رەش هاتبۆوە بۆ سلێمانی، وتبوی منیش دێم بۆ ناوچەی قەرەداغ. پێیان وتبوو زۆر باشە کاك ئاوات لێرەیە لەگەڵ ئەو بڕۆرە دەرەوە. زۆری پێ خۆش بوو، وتبوی زۆر باشە. ئەویش هاتبوو بۆ ماڵی کاك ئازادی سەگرمە. چوم بۆ ئەوێ کاك جەمالیش لەوێ بوو. گەیشتمە ئەوێ دانیشتم، ئەوەندەم زانی زەینەبو منداڵەکانم خۆیانکرد بە ژووردا. تۆزێك لایان دانیشتم وتم:

" –ئەنێرم بە دواتاندا خۆتان ئامادە بکەن."

هیوای کوڕم لە کۆڵم نەدەبۆوە، دەیوت دێم. بە زەحمەتێکی زۆر لە دەستی رزگارم بوو. لەگەڵ کاك جەماله رەش گەڕاینەوە بۆ قەرەداغ. سێ رۆژم پێ چوو هاتینەوە بۆ لای جەماعەت لە گوندی سەرزەل. لەوێ برادەرێکی خۆمانم نارد بە دوای خێزانەکەمدا. چوو هێنانی. لەوێ جێم بۆ پەیداکردن. هەر چاوەڕێ بووم بێن بۆ ئەوێ. دوای نیوەڕۆ بوو لە نزیك دێکە بووین مەولود گوڕبازم نارد بۆ ناو دێ وتم:

" –بچۆ بزانە هاتوون.؟"

مەولود تۆزێکی پێچوو، هاتەوە سەیرمکرد، هیوای لەگەڵ بوو. ئەو کاتە تەمەنی (٥)ساڵ بوو. هاتە پێشەوە ئێمەی بینی هەموو بە چەکەوە، حەپەسا زۆر سەیر بوو بە لایەوە! وای دەزانی هەر (ئەمن) چەکی پێیە. ئەوەندەش لە ئەمن ترسابوو، هەر جوڵابۆوە پێیان وتبو:

" –دانیشە نەوەك ئەمن بێت بمانگرێت."

پێشمەرگەکان وەستا بوون. لە هیوام پرسی وتم:

" –هیوا ئەمانە چین.؟"

وتی:

" –هەموو ئەمنن."

وتم:

" –ئەی من.؟"

وتی:

" –تۆ پۆلیسیت."

چونکە منیش هەر چەکم پێبوو. ئێوارە چووینەوە بۆ ناو دێ. لە ماڵێك بووین، لە بەرنەوەی منداڵەکانم هاتبوون، هەموو خەڵکی دێکە هاتبوون بۆ لامان. رەنگە (٣٠) نەفەری لێبووبێت. لە سەربانی ماڵەکە دانیشتبووین. برادەرێکی دێکە لە هیوای پرسی وتی:

" –هیوا لەم خەڵکانەی، کە دانیشتون کێ ئەمنە.؟"

هەر سەیری خەڵکی دێکەی کرد، روویکردە موختاری دێکە وتی:

" –ئەوە ئەمنە."

یەکەم جاری بوو ئەو خەڵکە ببینێ. هەموو دلیانە قاقای پێکەنین. موختاری دێکە رەنگی زەردبوو. وتیان ئەوە ئەگەر یەکی نەزانێت، ئەڵێت پێیان وتووە. هەموو بە لایانەوە سەیربوو! هەر لە خۆیەوە ئەو پیاوەی کرد بە ئەمن. راستە موختار بوو، بەڵام پیاوێکی باش بوو. ئەو شەوە بردمن بۆ گوڕباز لە وێ دامنان، لە ژوورێکی بچوکی ماڵی مەولود گوڕبازی. گوڕباز دێیەکی بچووك و زۆر باش بوو. خەڵکەکەی زۆر باش بوون. ترسم لێیان نەبوو، وەك بنکەیەکی خۆمان وابوو. لەوێ بە جێم هێشتن.

زۆری پێ نەچوو، رۆژێك دوو پێشمەرگەم لە بەری قەرەداغ بەجێمابوون، دواکەوتبوون، بڕیاربوو بێنەوە. رۆژێ ئەوەندەم زانی (ئارام)و (ملازم عومەر) لەگەڵ (عومەری ئاوەکەڵەیی) هاتن. زۆرم پێ خۆش بوو، کە ئارامم بینییەوە. زۆر دەمێك بوو یەکترمان نەدی بوو. (ملازم عومەر)م نەدەناسی، تەنها مامۆستا (عومەری ئاوەکەڵەیی)م دەناسی. ماوەیەك بە یەکەوە بووین، بە لامەوە زۆر خۆش بوو. دوو حەیوانم کڕیو لەگەڵ پێشمەرگەکان بردمان لە پشتی گوندی (گوڕپان)ەوە لێمان نا. ئاوێکی زۆر خۆشی لێبوو. لەوێ ئارام وتی:

" –ئێوە چەند پێشمەرگەن.؟"
ئەو کاتە نزیکەی (٥٠) پێشمەرگە بووین. وتی:
" –بیانکە بە سێ مەفرەزەوە."
وتم:
" –وازی لێ بێنە با هەر یەك مەفرەزە بێ باشترە. بۆ خۆمان هەر بە یەکەوە ئەبین."
وتی:
" –نابێ، ئەبێ ببن بە (کەرت)، ناوی بنێن کەرت."
وتم:
" –ئەی بۆ هەر مەفرەزە نەبین.؟"
وتی:
" –ئەبێ تەشکیلات بکەن."
هێزەکەمان کرد بە سێ مەفرەزەوە. یەکەمیان (گۆران) بوو بە ئامر مەفرەزە بۆ بەری قەرەداغ. دووەمیان (سیروان) بۆ گەرمیان. سێیەم (فاخر) بوو، (مام رۆستەم) جێگری (فاخر) بوو. بەو جۆرە هەر کەس چوون بۆ ئەو جێگایەی بۆیان دیاری کرابوو. خۆشم سەرپەرشتی هەموویم دەکردن.
چەند هەفتەیەکی پێچوو، مەفرەزەکان وتیان دەپەڕینەوە بۆ ئەو بەر، بۆ بەری گەرمیان و قەرەداغ. ئارام وتی:
" –ئاوات خۆت وەرە لەگەڵمان."
" –وتم باشە."
کە پێشمەرگەکانی ئێمەی دی، زۆری پێ خۆش بوو وتی:
" –بە راستی ئێوە پێشمەرگەن."
کە دەچووینە هەر دێیەك و دەیبینی خەڵکانی ئێمەیان چەند خۆشدەوێ، زۆری پێ خۆش دەبوو. ناوچەکە لە پێشمەرگەی خۆمان زیاتری تیا نەبوو. کەس نەی دەوێرا بێتە بەری لای ئێمە، چونکە شەوو رۆژ حکومەت هێرشی بۆ دەکرد. جارێ (عەزە لاڵ) پێشمەرگەیەکی هێزی سۆشیالیست بوو، هاتبوو بۆ ناوچەی بازیان، پارەی لە هەندێ خەڵك سەندبوو، چووین لە بازیان چەکمانکرد. هەر چەند هاواریکرد وتی:
" –من کاك عەلی عەسکەری ناردوومی."
وتم:
" –من لێرە مەسئولم، کەس ناتوانێت لێرە پارە لە خەڵك بسەنێت."
چەکمانکردو بە بێ چەك ناردمانەوە بۆ دۆڵی جافایەتی.

ئێوارەیەکی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٧٧، لەگەڵ ئارام‌و ملازم عومەر چووینە گوندی (جێشانە) لە نزیکی سلێمانی، لەوێ نانمان خواردو لەوێوە ڕۆشتین بەرەو (قلیاسان)، گەیشتینە (کانە بەردەکان). لەوێ ملازم عومەر خۆی دا بە زەویدا وتی:

" -با لێرە بین هەتا بەیانی."

زۆرم پێ سەیر بوو! ئەو شوێنە بەرامبەری سەرچنار بوو. پێم وت:

" -کاك عومەر چۆن لێرە بین؟ بەیانی هەموومان هەر بە دەست ئەگرن. چۆن تۆ وا ئەڵێیت.؟"

وتی:

" -ئێوە بڕۆن من هەر خۆم لێرە ئەبم، بەیانی دێم بە دواتاندا."

زۆرم پێ ناخۆش بوو. ناچار چووم بە ئارامم وت:

" -ئەمە کوڕە چاکەکەیە، کە جەنابت یەك مانگە بۆ منی وەسف ئەکەیت. وا لێرە مانی گرتووە، ئەڵێت من نایەم. ناتوانم بڕۆم."

شەهید ئارام وتی:

" -بە خوا نەخۆشە ئەگینا وا نەبوو."

ناچار چووین پاڕاینەوە هەڵمانساندو بردمان. چووینە گوندی (هەنارانی سەرو). بەیانی لەگەڵ ئارام‌و مولازم عومەر چووینە ماڵێ، لەوێ بە (مولازم عومەر)م وت:

" -تو خوا کاك عومەر ئەم شەو بۆ وات کرد."

دەستی کرد بە پێکەنین وتی:

" -بە خوا خەتای تۆ بوو، ئەگینا بۆ خۆمان لەوێ ئەخەوتین هەتا بەیانی، گەلابەکان ئەهاتن بۆ بەرد. زۆربەی شۆفێری گەلابەکان ئەناسم، پێمان ئەوتن، (کەباب)یان بۆ ئەهێناین، بەلام تۆ نەتهێشت."

وتم:

" -تو خوا ئەوە بە راستتە.؟"

وتی:

" -بە خوا، بۆ چی.؟"

وتم:

" -بۆ نان‌و کەبابێك هەموومانت بە گرتن ئەدا."

ڕۆشتین بەرەو گوندی (چۆخ ماخ)، ئەو کاتەش (خاڵە شێخ صدیق) لەوێ بوو، کادرێکی قسە خۆش بوو. ئێوارە چووینە ماڵی ئەوان نانمان خوارد. بە ڕۆژ خەتەر بوو. دەیانوت زۆربەی ڕۆژ هەلیکۆپتەر لە پشتی دێکەوە ئینزال دەکات. ئاوێك هەبوو لە بنارەکە، چووینە ئەوێ. هاوڕێ جەبارو دلێری سەی مەجی‌و حەمە سەعی‌و سالار عەزیزی لێ بوو. هەموو هاوڕێکانم لەو ناوە بوون.

ڕۆژێکیان، سەیرمکرد ئازادی سەگرتەو شوان گەیشتنە چۆخماخ. زۆر سەیر بوو بەلامەوە! ئەم لاو ئەولای یەکمان ماچکرد، وتم:

" –ئەوە بۆ هاتوون.؟"

وتیان:

" –(ئیبراهیم حەسەن) گیراوەو هەموو برادەرانی بە گرت داوە. ئێمەش بە ڕێکەوت دەرچووین نەگیراوین."

زۆرم پێ ناخۆش بوو، وتم:

" –لەو برادەرانەی خۆمان کێ گیراوە.؟"

وتی:

" –جا کێ نەگیراوە، (شاهۆ)[٢١]ش گیراوە."

هەروەها وتی:

" –(زەینەدین)یش گیراوە لەگەڵ (ئەحمەد)ی ژنبرات."

ناوی زۆر کەسی تری پێ وتم، کە گیرا بوون. هەموو هاوڕێیانی خۆمان بوون. وتم:

" –جا کێ ماوە.؟"

وتی:

" –ئەوەی بۆ ڕۆژێك هەر موناقەشەی کردبێت لەگەڵیدا بە گرتی داوە"

ئیبراهیم حەسەن هەر کەسێکی ناسیبوو بە گرتی دابوو. خۆی ماڵ بە ماڵ لەگەڵ ئەمن و ئیستخباراتدا گەڕابوو. یەك نەفەری خۆیانی نەهێشتبووەوە. هەموویانی بە گرت دابوو. هەر کۆمەڵەیەکیشی ناسیبێ، لەگەڵ چەند خزمێکی خۆیدا هەمووی بەگرت دابوو. ئازادی مەلا، واتە (شاهۆ) خۆی مەسئولی ڕێکخستنەکانی ناو شاربوو، مرۆڤێکی زۆر قارەمان بوو.

ڕۆژێ، هەر لەو ناوە، لە ناوچەی دۆڵی جافەتی، کوڕێکی گەنجیان بە بەندکراوی هێنا، وتیان ئەمە سۆرانی شەهید کردووە. بۆم دەرکەوت، کە برای خۆیشی بوو. زۆر بەلامەوە ناخۆش بوو. (سۆران)یش لە ئازاترین پێشمەرگەکان بوو، چالاکیێ زۆری لە ناو شاردا کردبوو، یەکێ بوو لەو گەنجانەی، کە لە ناو شاردا کاری زۆری بۆ پێشمەرگە ئەنجام دابوو. لە دوای تەقەکردن لە موحافزی سلێمانی، ئەم لەگەڵ پێشمەرگەیەکی تردا بە ناوی (فاخر)[٢٢]، کە خەڵکی کەرکوك بوو، ئەو برایەی، کە گرتمان چووبوو لە

---

21 - شاهۆ ئازادی مەلا بوو.

22 - ئێستاش ماوە لە کەرکوک دانیشتووەو کەسیش نایناسێ.

دواوه یەك ڕێژنە گوللەی کلاشینکۆفی پێوه نابوو کوشتبووی. گوایا لە داخا شەهیدی کردووه، چونکە بۆتە هۆی ناڕەحەتیی خێزانەکەی، هەموویان لە سەر ئەو گیرابوون بۆیە براکەی کوشتووه. ئەو ڕۆژه ئێمە لەوێ بووین، کۆبونەوەیەکمان کرد. بڕیاری کوشتنی درا. ئەو ڕودلوەم بە لاوه ناخۆش بوو. قەد لە یادم ناچێت. وا بە ئاسانی برا برا بکوژێت لە سەر براکەی خۆی بکوژرێتەوه. ئیتر ئێمە بە جێمان هێشت بۆ (شێخ صدیق)و (دلێری سەی مەجی)و (هاوڕێ جەبار)، کە تەرمەکەی بنێژن.

پاش ئەو ڕووداوه سالار عەزیز ڕۆیشت، ئازاد حەمە غەریب لەگەڵیدا نەچوو. ئارام بە ئازادی وت:

" —بۆ لەگەڵ کاك سالار ناچیت. ؟"

ئازاد وتی:

" —ناچم."

ئارام وتی:

" —لەگەڵ ملازم عومەر بڕۆ."

ئازاد لەگەڵ ئەویش نەچوو. ئارام زۆری پێ ناخۆش بوو. ئازاد وتی:

" —من لەگەڵ خۆت ئەبم."

وتی:

" —من کەسم ناوێت."

منیش وتم:

" —کاك ئارام من کاك ئازادو شوانە ئەبەم بۆ لای خۆمان."

وتی:

" —کەیفی خۆتە."

من زۆرم پێ خۆش بوو هەردووکیان بێن بۆ قەرەداغ، چونکە هەردووکیان کۆمەڵە بوون و زۆر هاوڕێم بوون. خواخوام بوو بێن بۆ لای ئێمە. بڕیارماندا بێن. دوای نیوەڕۆ لەگەڵ ئارام و مولازم عومەر، بەرەو گوندی (قزلەر) بە ڕێ کەوتین. (جەماله ڕەش)و (مامۆستا نەریمان)[23] یشمان لەگەڵ بوو، زۆر شارەزا بوو، لە ڕۆیشتندا زۆر خێرا بوو.

ئارام پێی وتم:

" —وەرە لەگەڵم بەتەمام سەردانێکی (عومەری حەمە عەلی) بکەم. دوایی ئێوه بۆ خۆتان بگەڕێنەوه."

وتم:

" —باشە."

---

23 - خۆی ناوی مامۆستا عوسمان بوو.

به چیای (پیرەمەگروون)دا هەڵگەڕاین تا گەیشتینە گوندی (زێوێ). لەوێ چووین بۆ شەخسو سەیرانگاکەی پشتی گوندەکە.
(مولازم عومەر) بە (مامۆستا نەریمان)ی وت:
" -بچۆ لە ناو دێکە دووسێ مریشکو برنجو ڕۆن بکڕەو بیهێنەرەوە، بۆ خۆمان لێی ئەنێین."
ئەو شوێنە قاپو قاچاغی لێبوو. هەر لەوێ دایان نابوو بۆ ئەو کەسانەی، کە دەچوون بۆ زیارەتی ئەو شەخسە. (مامۆستا نەریمان) ڕۆیشت. بەڵام، کە هاتەوە هیچی نەهێنابوو، وتی:
" -نییە."
ملازم عومەر چوو بە گژیا وتی:
" -راست ناکەیت، ئێستا خۆم ئەچم."
خۆی چوو، دوو پێشمەرگەشی لەگەڵ خۆیدا برد. زۆری پێنەچوو هاتەوە هەموو شتێکی هێنابوو، وتی:
" -ئەی بۆ هەبوو."
نیوەڕۆ خۆی هەمووی لێنا، خواردمان. دەمەو ئێوارە منو ئارامو مولازم عومەرو جەماله رەش سێ پێشمەرگەمان لەگەڵ خۆمان برد. بە پێشمەرگەکانی ترم وت:
" -ئێوە بۆ خۆتان لەم ناوەبن هەتا دێمەوە."
مامۆستا نەریمان شارەزای ڕێگاکە بوو. ڕۆیشتین بەرەو گوندی (چەرمەگا)، لە ڕێگا وتم:
" - دیارە ئێمە زۆرین. ئەگەر چووینە ئەوێ، لەوانەیە عومەری حەمە عەلی بڵێت زۆر خەڵك هاتوچۆم ئەکەنو خەتەرەو بڵێ با هەر ئارام، یان دوو کەستان بە ڕۆژ لێرە بن. ئەوانی ترمان بنێرێ بۆ جێگایەکی تر. عومەری حەمە عەلی ئەگەر وای وت، قبوڵی ناکەین. یان ئەبێت هەموومان بە یەکەوەبین، یان ئەڕۆین. کاك ئارام بە جێ ناهێڵین."
ئەوە بوو بە بڕیارمان. هەر لە شاخەکە چووینە خوارەوە، لە پێدەشتەکەدا مولازم عومەر دەستی کرد بە بۆڵە بۆڵ، وتی:
" -نایەم، ناتوانم بڕۆم تینوومە."
وتم: " -کورە باوکت چاك بڕۆ."
بەڵام ئەو هەر خۆی خستبووە دواوەو جنێوی بە نەریمان دەدا، دەیوت:
" -خەتای ئەوە، ئەگینا نەدەچووین بۆ لای عومەر."
بە هەرحاڵێك بوو گەیاندمانە چەرمەگا، چووینە ماڵی عومەر، کارەبای تیابوو، ماڵێکی خۆش بوو. دانیشتین نانمان خوارد، پشووماندا. عومەری حەمە عەلی وتی:

" –کاك ئارام ئێرە بە ڕۆژ زۆر خەتەرە. خەڵکێکی زۆر هاتوچۆم ئەکات لە بەر خۆتان، با هەر خۆتو کاك عومەر لێرە بن. باقی برادەران با بچن بۆ گوندی قازان[24]. ئیتر نابێت کاك ئارام هیچ بڵێت."

مولازم عومەر وا دیار بوو دەیویست رازی بێ، سەری نا بە عەرزەکەوە. هەرچەند من سەیرمکرد، ویستم بە ئیشارەت پێی بڵێم، کە بە قسەکەی رازی نەبێو بڵێ یان هەموومان لێرە دەبین، یان دەڕۆین، بەڵام ئەو هەر سەری هەڵنەبڕی، چونکە خۆی تیادا بوو بۆ مانەوە. تا ئەو کاتە (عومەری حەمە عەلی) منی نەدەناسی. بەڵام دوایی مامۆستا نەریمان پێی وتبوو، کە من کێم. ئیتر چارمان نەبوو، کاك ئارامو مولازم عومەرمان لە چەرمەگا بەجێهێشتو بەو شەوە ڕۆیشتین. زۆریش ماندوو بووین، (مامۆستا نەریمان)یش بە ناو دەغڵی گەنمو جۆدا دەی بردین. جەمالە ڕەش هەر لە ڕێگا جنێوی بە نەریمان دەدا. هەر دەیوت:

" –ئەم سەگبابە جاسووسە."

منیش پێم وت:

" –کاك جەمال عەیبە، بەس جنێو بدە. گوناحە ئەو بڵێ چی.؟"

ئەیوت:

" –تۆ نایناسی. ئەوە زۆر سەگبابە."

بە دەم جنێودانەوە گەیشتینە گوندی (قازان). نەریمان هەر نقەی نەکردو بڵێ بۆ جنێو بە من دەدەی. دەتوت هەر لەگەڵ ئەویشی نییە. کە چووینە ناو دێی (قازان)، مامۆستا نەریمان بردینی بۆ ماڵێ. لە دەرگای داو چووینە ژوورێ. ماڵەکە دیوەخانێکیان هەبوو لە دەرەوەی ماڵەکەبوو. چووینە ئەوێ. چامان خواردەوە، نەریمان وتی:

" –لە پشتی دێکەوە یەك ئەشکەوتی زۆر گەورەی لێ یە، ئەتانبەم بۆ ئەوێ. خۆم نانو ئاوتان بۆ ئەهێنم. هەتا ئێوارە لەوێ بن لە بەر ئەوی دێکە جێگای مەترسییە."

ئیتر زوو زوو دەیوت:

" –ئەڕۆین درەنگە."

جەمالە ڕەش پێی وتم:

" –کاك ئاوات، ئەم سەگبابە ئەمانبات بۆ ئەو شاخەو خۆی دێتەوە بۆ ئاوایی. ئێمە چی بکەین لەو شاخە. لەوانەیە هەر خۆشی ئیخباریمان بکات."

منیش وتم:

" –کوڕە کاك جەمال ئێوە ئەڵێن کادری کۆمەڵەیە."

وتی:

" –بە خوا من بە گومانم. هەر لەگەڵ حوکمەت دایە."

---

[24] - بەرامبەری چەرمەگابوو.

وتم:
" –ئەی تۆ ئەڵێیت چی بکەین.؟"
وتی:
" –من ئێستا بەم ژنە ئەڵێم، ئێمە ئەتوانین ئەمڕۆ لە ماڵی ئێوە بین هەتا ئێوارە؟ خۆ ئەگەر لە گەوڕیشدا بێت لەو شاخە باشترە."
بە نەریمانمان وت:
" –بەو ژنە بڵێ هیلاکین ناتوانین بڕۆین بۆ ئەو شاخە. با لێرە بین هەتا ئێوارە."
وتی:
" –بابە چۆن ئەبێت. بەخوا ناتوانێت، چونکە زۆر خەتەرە."
بەڵام پیاوی ماڵەکە ناسیاوی عومەری حەمە عەلی بوو، لە ماڵ نەبوو. تەنها ژنەکە خۆی لە ماڵ بوو. ئەو ژنە شاژن بوو. دیاربوو زۆر دەوڵەمەند بوون. جەماله رەش وتی:
" –خوشکێ، ئێمە بەڕاستی زۆر هیلاکین، لە پێ کەوتووین. ئەگەر مەجال ئەبێت، ئەمڕۆ لێرە بین هەتا ئێوارە. لە گەوڕیشدا بێت قەیناکە."
وتی:
" –جا بەقوربان بۆچی لە گەوڕا؟ ئێوە ئەتوانن هەتا ئێوارە نەیەنە دەرەوە؟ چونکە بە ڕۆژ نابێت کەس بتان بینێت."
وتمان:
" –هەتا شەویش نایەینە دەرەوە."
وتی:
" –باشە بەقوربانتانبم."
ڕۆیشت کلیلێکی هێنا وتی:
" –نەریمان بچۆ دەرگای دیوەخانەکە بکەرەوە، بۆ خۆتان لەوێ بن. بەس نابێت هاتوچۆ بکەن."
وتمان:
" –خوشکێ تۆ ئیتر هەر مەیەرەوە بەو ناوەدا. نیوەڕۆش مەیە، نان ناخۆین."
وتی:
" –چۆن ئەبێت!؟ نیوەڕۆ خۆم نانتان بۆ ئێنم."
وتمان:
" –نان ناخۆین!"
چووینە دیوەخانەکە زۆر خۆش بوو، پڕبوو لە فەرش. بۆ خۆمان لێی نوستین. بۆ نیوەڕۆش ژنەکە هات، وتی:
" –نانتان بۆ بێنم؟."
وتمان:

" –نه ، هیچ ناخۆین."
نەریمانیش هەر لەگەڵ خۆمان بوو. نەمان هێشت ئەو بچێتە دەرەوە. هەتا ئێوارە بۆ خۆمان حەساینەوە. ئێوارە وتیان:
" –وەرنە دەرەوە."
چووین، نانیان بۆ هێناین، نانمان خوارد. پیاوەکە هاتەوە. دیاربوو لە شاربوو. زۆر بە خێرهاتنی کردین. چوو بە گژ ژنەکەیدا، وتی:
" –ئەوە بۆ حەیوانێکت سەر نەبڕیوە.؟"
ژنەکە وتی:
" –هەر خۆم لە ماڵ بووم، بۆم سەر نەئەبڕا. خۆ ئەمانیش ئێستا هەڵساون، نانی نیوەڕۆشیان نەخواردووە."
دوای نان خواردن، بە ڕێ کەوتینەوە بۆ چەرمەگا، گەیشتینەوە ماڵی عومەری حەمە عەلی. زۆر دلوای لێبوردنی کرد، کە وەزعەکە وابووە، بۆیە ئێمەی نارد بۆ ئەو دێیە. تەماشامکرد مولازم عومەر زەوقی هەیە. دیار بوو خۆی شتبووو خواردنی باشی خواردبوو. زۆر بە کەیف بوو. پێم وت:
" –باشە ئێمە چیمان وت لە ڕێگا.؟"
وتی:
" –خوا خوام بوو تۆ سەیرم نەکەیت، بۆیە سەرم دانەواند. یەعنی هەر ئاگام لەوە نەبووە چیمان وتووە."
دیاربوو بۆڵە بۆڵەکەی ڕێگای شەوی پێشووی هەر بۆ ئەوەبوو، کە لەوێ بمێنێتەوە. ئیتر عومەری حەمە عەلی دوو کلاشینکۆفی بە دیاری دا بە ئارام. سەیارەیەکی بۆ گرتین هەتا چووینەوە گوندی (زێوێ) بۆ لای هاوڕێیان. ئارامو ملازم عومەر گەڕانەوە بۆ دۆڵی جافایەتی. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ قەرەداغ. (شوان)م لەگەڵ خۆم بردو (ئازاد)یش لەگەڵ (ئارام)دا مایەوە. ئارام وتی:
" –دولیی ئەی نێرمەوە بۆ لای خۆت."
چوومەوە بۆ قەرەداغو لەوێوە چووم بۆ گەشت بەرەو گەرمیان.

## ٣٠

ئێوارەیەکی هاوین بوو، ڕوومانکردە سەر جادەی دەربەندیخان–کەلار بۆ ئەوەی بۆسەیەك دابنێینو دەستکەوتێکمان ببێ. لە خوار گوندی (دەرەدۆین) ەوە دامەزراین.

لە لۆفەکانی (قەترە) زۆر دانیشتین هەر هیچ نەبوو. زۆرمان تینووبوو. منو (مام ڕۆستەم) بە یەکەوە بووین وتم:
" –ڕۆستەم هەر سەیارەیەك هات دەستی لیّ رابگرە، ئەگەر دەبابەش بوو هەر رایگرە، بزانین ئاوی پێیە؟."
هەردووکمان لە سەر جادەکە وەستا بووین، لە پڕ ناقیلەیەك هات. ئەوەندە بە خێرایی دەرچوو، هەر خەریك بوو هەردووکمان بکا بە ژێرەوە. فریای هیچ نەکەوتین. هاوڕێیانی تریش هەموو لە سەر جادەکە دامەزرا بوون، ئەوانیش فریا نەکەوتن. لە بریی ئارپیجیو چەکی گەورەش، تەنها نارنجۆکێکمان پێبوو. هەر حەپەساین! دیاربوو ئەویش لە ترسا باڵی گرتبوو. دوای ئەوە زۆر دانیشتین، هیچ نەبوو. گەڕاینەوە بۆ گوندی دەرەدۆین – گوندەکەی حەمەی تەلە بوو–. بەیانی هەواڵمان زانی. شەو (ئامر لیوای ناوچەی پێوان) لە دەربەند بووە بۆ خواردنەوە. ئیتر جارێکی تر بۆی دانیشتینەوە نەهات، چونکە زانیبووی، کە بۆی دانیشتووین. ئەو ماوەیە هەر لەو ناوە مامەوە دوایی گەڕامەوە بۆ ناوچەی بازیان، سەیرمکرد ئارام گەڕاوەتەوە. عەلی ئامەخانو جەمالە رەشو حەمە سەعیدو ئازادو مامۆستا نەریمانی لەگەڵ بوو. دیاربوو بڕیاری دابوو هەر لای ئێمە بمێنێتەوە. ئەو دەمانە برادەرانیش لە هەندەرانەوە گەڕابوونەوە. نەوشیراون مستەفا لە سووریاو مام جەلال لە ئەورووپاوە گەڕابوونەوە. سالارعەزیزو مولازم عومەرو عەلی عەسکەریو دکتۆرخالیدو مەلا بەختیاریش، هەر یەکەیان هێزیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو بەرەو لای ئەوان ڕۆیشتبوون. (ئارام)یش بۆ لای ئێمە هاتبوو. ئیتر نازانم ئارام نامەی بۆ ئەوان ناردبوو یان نا، بەڵام ماوەیەکی پێ چوو ئارام لە (گوڕپان)ەوە نامەیەکی بۆ نووسین، بە (مامۆستا نەریمان)دا بۆی ناردن. ئەوانیش نامەیان بۆ ناردەوە. من (ئارام)م بردبوو بۆ گوندی (گوڕپان) لە ماڵی مەولود گوڕپاز دامنا. خەڵکی دێکە زۆر خەڵکێکی چاك بوون. ئارامو حەمە سەعید لەوێدا خەریکی دەرکردنی ڕۆژنامەی (ئاڵای شۆڕش) بوون. ئەو کاتە هیچ ئامرازێ نەبوو پێی دەربکەن. نازانم چی بوو پێیان دەردەکرد. مەولود گوڕپازم لا دانا. ئەو زۆر شارەزای ناوچەکە بوو. بۆ ئەوەی ئەگەر هەر کاتێ هێرش بکرێتە سەر ناوچەکە حەشاریان بدا. هەر ڕۆژ نارۆژێ ڕژێمی بەعس بە هەلیکۆپتەرو مەشات کێوماڵی چڕوپڕی سەراپا ناوچەکەی دەکرد. جاری وا هەبوو یەك هەفتە هەموو ناوچەکەی دەگرت. گوندەکانو کانیو ئاوەکانی دەگرت. من بۆ خۆم زۆر شارەزای ناوچەکە بووم. هەر حکومەت نیازی کێوماڵی ببوایە، بە خێرایی هەواڵیان بۆ دەناردم، ئێمەش دەهاتین بۆ نزیك جادەکان خۆمان دەشاردەوە، چونکە ئەوان قەت گومانیان بۆ ئەو شوێنانە نەدەچوو. سوپای عێراق هێندە هێرشی هێنابوو، ئێمە دەمانزانی ڕوو لە کوێ دەکەنو بۆ کوێ دەچن. ئەو کاتەش (جاش) تەنها (تەحسین شاوەیس)و (قالە فەرەج) بوون، پارتی بوونو تازە ببوون بە جاش، مەفرەزەیەکی

(یەکێتی)یان – کە بە سەرپەرشتیی (حەمە غەفور)و هاوڕێکانی بوو – بە شێوەیەکی زۆر نامەردانەو دڕندانە لە ناوچەی (چەمی ڕێزان)و (ئاخ جەلەر)دا شەهید کردبوو.
قالە فەرەج هاتبوو بۆ ناوچەی گەرمیان بۆ لای تەحسین، لەوێ یەکیان گرتبوو. کە چووبوو بۆ لای تەحسین شاوەیس، ئەویش بردبووی‌و چووبوونەوە بۆ لای حەمە غەفورو هاوڕێکانی ماوەیەك بە یەکەوە جەولە بکەن. بە تۆبە حەرەسیاتیان دەگرت. ئەو کاتەش دەبووایە بە ڕۆژو بە شەو حەرەسیاتیان بگرتایە. ڕۆژێ بە حەمە غەفور دەڵێن:
" –ئێوە بچن بخەون، ئێمە دەبین بە حەرەس."
ئەوانیش نازانن، ئاگایان لەوە نییە، کە ئەمە پیلانە. ماوەیەك هەر وایان کردبوو. زۆر دڵنیا ببوون لێیان. دەچن دەخەون. لە پڕ ئەمان دەچنە سەریان، لە خەودا هەموویان دەکوژن. جیهازیان پێ دەبێت یەکسەر پەیوەندی بە هێزی حوکمەتەوە دەکەن. بە هەلیکۆپتەر دەگەنە سەریان، هەموو تەرمەکان دەبەنەوە بۆ کەرکوك. خۆشیان بوون بەو جاشانەی، کە هەموو کورد نەفرەت لە کردەوە کانیان دەکەن.

۳۱

گوندی (گوڕپان) وەك بنکەیەك بوو. هەموو خەڵکی گوندەکەش باش بوون. ئارام خۆشی زۆر ڕەفتاری چاك بوو، بە جۆرێ لەگەڵ خەڵکی دێکەدا ڕێك کەوتبوو، کە گەورەو بچوکی زیاد لە سنور ڕێزیان لێ دەگرت. زۆر ڕووخۆش بوو، کەسێکی زۆر کۆمەڵایەتی بوو. ئەو کاتە کەس نەیدەزانی ئەو کەسە کێیەو چییە؟ کە بە یەکەوە دەچووین بۆ ماڵان، دەیوت:
" –من تازە هاتوم بۆ پێشمەرگایەتی. پێشمەرگەی کاك ئاوات."
منیش، بۆ ئەوەی خەڵك نەزانێ، ئەو کێیە، هیچم نەدەوت. جاری وا هەبوو خەڵکی گوندەکە دەهاتنە لامەوە دەیانوت:
" –کاك ئاوات تۆ ئەم پێشمەرگەیە چییە دایمە لەگەڵ خۆتدایە؟ بۆ پێشمەرگەیەکی باش لەگەڵ خۆت ناگێڕیت؟."
منیش دەموت:
" –زۆر پێشمەرگەیەکی چاکە."
ئارام ئەوەندە سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕبوو، من هەرگیز ناتوانم وەسفی هەموو ئەو شتە باشانەی بکەم، کە تیایدا بوو لە جوامێری‌و دڵسۆزی‌و وەفاداری بەرامبەر بە هاوڕێیانی خۆی‌و خەڵکی. بە ڕاستی کۆمەڵە بوو. دوای دەرکردنی ڕۆژنامەکەیان، بە یەکەوە جەولەمان دەکرد. لە بەر قسەخۆشیی ئەو، هەر نەمدەزانی چۆن کاتەکە

دەڕۆیشت. زۆر یەکترمان خۆش دەویست، خۆشەویستییەك لە سنووری برایەتیو کەسوکاری دەرچووبوو. لە هەموو کۆڕو کۆبونەوەیەکدا، باسی منی بە نموونە بۆ هاوڕێیان دەهێنایەوە، دەیوت:

" –گەر ڕۆژێك ئەم شۆڕشە سەرکەوێت. ئەبێت ماڵو منداڵی کاك ئاوات وەك هێمای پیرۆزترین خێزانی کورد دیاری بکرێت، چونکە کۆمەڵەو کورد لە سەر ماڵی ئەوان دروست بۆتەوە. بە تایبەتی زەینەب خان. حەقە ناوەکەی کۆمەڵە بێت. ئەبێت ئەو ماڵە بکرێت بە شوێنێك لە شوێنە پیرۆزەکانی کۆمەڵە، وەك مۆزەخانەیەك خەڵك بچێت بۆ سەیری. وەك ئەو شوێنانەی، کە کاتی خۆی (لینین)و حیزبی شیوعیی ڕوسیا بە نهێنی کاریان تیا ئەکرد."[25]

٣٢

(ئەنوەری مەجید سوڵتان) ئەو کاتە لە ناوچەی بازیان ئامرکەرت بوو. ماوەیەك لای ئێمە مایەوە، حەزی لەوە بوو لە خەڵك بدات. دەچووە هەر گوندێ، یان موختاری گوندەکە، یان یەکێکی گوندەکەی لە حەوزی ئاو هەڵدەکێشا. زۆر پیاوێکی تووڕەبوو، بەڵام زۆر دڵسۆزو پاك بوو. کە دەچوومە هەر دێیەك، دەبوولیە من دڵنەوایی ئەوانەم بکردایە، کە کاك ئەنوەر لێیدابوون. چەند جار پێم وت:

" –کاك ئەنوەر ئەوە خراپە. تۆ بۆ چی لەو خەڵکە ئەدەیت، ئەو خەڵکە زۆر فەقیرن، زۆر دڵسۆزن. ئێمە ئەو خەڵکە ئەناسین. ئەوانو ئێمە تەواوکەری یەکترین."

دەیوت:

" –نا ئەوانە هەموو پیاوی بەعسن."

زۆر ناخۆشی کردبوو. ئەو بە میوانیش هاتبوو بۆ ناوچەی قەرەداغ. (١٥) پێشمەرگەی لەگەڵ بوو، پێش ئەوەی بێتە ناوچەی قەرەداغ، پێشمەرگەکانی لای، هەر هەموویان چەکیان دانابوو، هەموو چەکەکانی کۆکردبۆوە لای جەماله ڕەش دانابوو، ڕۆشتبوونەوە. هەر خۆیو یەك پێشمەرگە مابوونەوە، ئەویش (نەجمەدین هۆنەرێنی) بوو. جەماله ڕەش زۆر هاوڕێی بوو. هەر ئەویش هێنابوویە ناو ڕێکخستنەوە. جەمال چەکەکانی دابوو بە دووسێ کەسی تر، کە تازە ببوون بە پێشمەرگە. من بە (جەمال)م وت:

---

25 – ئەوە رای ئەو بوو. ئەگەر ئەو برادەرانەی ئێستا ماونو لە شەهید ئارامەوە نزیک بوون، ئەگەر ویژدانیان هەبێت هەموو ئەو راستییە دەزانن. خۆ ئەوانەش شەهید بوون، ئارە ناگەڕێنەوە تا پەنجە بکەن بە چاوی ئەوانەی، کە بێ ویژدانو رابردوی خۆیان لە بیر کردووە. خۆشترین رۆژانی ژیانم ئەو رۆژانە بوون، کە لەگەڵ شەهید ئارامدا بردومەتە سەر. ئێستاش قسە خۆشەکانی هەر لە گوێم دا دەزرنگێتەوە.

" –تۆ چۆن بڕوا بەوانە ئەکەیت.؟"
وتی:
" –هەموو کوڕی باشن. قابیلە چی ئەکەن؟ ئەی چەکەکانی کاك ئەنوەر چی لێبکەم.؟"
وتم:
" –کەیفی خۆتە."
لەو پێشمەرگە تازانە دوانیان برابوون، خەڵکی (بەکرەجۆ) بوون.

٣٣

شەوێك چووین بۆ ناوچەی بازیان، چووینە گوندی (داری کەلی)، لەوێ دامەزراین بۆ نان خواردن وتمان:
" –هەر کەسێك نانی خوارد، زوو بێتە دەرەوە بۆ بەردەمی مزگەوتەکە."
منو ئارام چووینە ماڵێك نانمان خوارد. زوو هاتینە دەرەوە بۆ بەردەمی مزگەوتەکە، کە سەیرمانکرد هەموو پێشمەرگەکان هاتوونەتە دەرەوە، هەر ئەو دوو برایە، کە خەڵکی (بەکرەجۆ) بوون، دیار نەبوون. هەر چاوەڕێمانکردن دیار نەبوون. دوو پێشمەرگەم نارد بۆ ئەو ماڵەی لێی بوون، کە چوو بوون، خاوەنی ماڵەکە وتبوویان ئەوان هەر زوو ڕۆیشتوون. هەرچی گەڕاین دیار نەبوون. زانیم ڕۆیشتوون تەسلیم بوونەتەوە. ئینجا ناچار بووین بە پەلە ئەو ناوچەیە چۆڵ بکەین. لەوە دەترساین بەیانی حکومەت بە هەلیکۆپتەر ئینزالمان بۆ بکات. ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر بە ڕێوە بووین، بۆ ئەوەی دوور بکەوینەوە. وتم:
" –کاك جەمال پێم نەوتی هەر لە خۆتەوە بۆ ئەوانە وەرئەگریت. ئەوانە جاش بوون. ئەو دوو چەکەشیان بردەوە."
سێ ڕۆژی پێچوو، لە شارەوە نامەیەکم بۆ هات. تیایدا هاتبوو:
((ئەو دوو برایە خەڵکی بەکرەجۆن، ڕژێم پارەیەکی باشی داونەتێ بۆ ئەوەی تۆ بکوژن. تکایە وریای خۆت بە. ئەمەش شێوەو ڕەنگو ڕوخساریانە..))
ئەو کاتەی نامەکەم بە دەست گەیشت، ئەوان ڕۆیشتبوونەوە. ئارام وتی:

" —ئەگەر شۆڕش نەبێت، تۆ ئەوەندە موهیم ئەبوویت لای حکومەت.؟"
وتم:
" —خوا بیبڕێ ئەو موهیمیە."
وتی:
" —بە خوا گەر هەردوکمانیان بکوشتایە پارەیەکی باشیان وەرئەگرت."
وتم:
" —بە خوا وا بڕوات هەر ئەمان کوژن."
بە راستی ئەو سەردەمە خەڵك زۆر لێمان دەترسان. ئەگینا هەر زوو دەیان کوشتین.

٣٤

ئازاد حەمە غەریب لەگەڵ ئارام هاتبۆوە بۆ لای ئێمە. ئازادم کرد بە (رابەر سیاسی)ی ئەو مەفرەزەیەی، کە لەگەڵ خۆم بوون. فاخرو مام رۆستەمو شوان، هەر لەگەڵ ئەو مەفرەزەیە بوون. شوان هەرچەند بە تەمەن منداڵ بوو، تەجروبەی پێشمەرگایەتی‌و ناو لادێی نەبوو، بەڵام دڵسۆز بوو، لە رووی فکرییەوە زۆر کوڕێکی زیرەك بوو. بۆ ماوەیەك لەگەڵ مەفرەزەکەی (گۆران)دا دامنابوو. بۆ ئەوەی بۆ خۆی فێری ژیانی پێشمەرگایەتی بێ‌و لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پێشمەگانەش لە رووی رۆشنبیرییەوە پەروەردە بکا، کە لەگەڵمان بوون. خۆشی زۆر دڵی بەوە خۆش بوو، پێشمەرگەکانیش زۆریان خۆش دەویست. سەبارەت بە (ئازاد)یش، وتم با لەگەڵ ئەو مەفرەزەیەدا بێ، بۆ ئەوەی ئەو مەفرەزەیە لە رووی فکرییەوە پەروەردە بکا، چونکە ئازاد لە شاردا کۆمەڵەو خوێندەواریش بوو. کە هاتە دەرەوە قوتابیی پەیمانگا بوو. لە شۆڕشی پێشووشدا پێشمەرگایەتیی کردبوو. حەزیشم دەکرد لە خۆمەوە نزیك بێ. بە راستی خۆشم دەویست. زۆر کوڕێکی باش بوو. کۆبوونەوەیەکم بە مەفرەزەکە کردو وتم:
" —ئیتر ئێوە بڕۆن."
خۆشم روومکردە بەری قەرەداغ بۆ لای گۆران‌و سیراون. مەولود گوڕبازو پێشمەرگەیەکم برد لەگەڵ خۆم. (ئارام)یش لەگەڵ جەمالە رەش‌و عەلی ئامە خان‌و مامۆستا عەزیزو سێ هاوڕێی تر، هاتبوون بۆ لای ئێمە، لە دەوری گوندی گوڕباز بوون. لەوێ دوو هەفتەمان پێچوو، پاشان گەڕامەوە بۆ بەری بازیان. پێش ئەوەی بگەڕێمەوە

گوندی (باخان) لە دوورەوە سەیرمکرد، (فاخر)م بینی بە تەنیا بەرەوڕووی ئێمە دێ.
زۆر ترسام. لە دڵی خۆمدا وتم:
" –چی بووە وا فاخر بە تەنیا هاتۆتەوە بۆ لای ئێمە. ! ؟"
کە گەیشتە لامان، سڵاوی لێکردین.
وتم:
" –ها فاخر چی بووە. ؟"
وتی:
" –وەڵڵا هیچ نەبووە، هەر بۆ لای تۆ هاتووم."
کەوتینە ڕێ پێم وت:
" –چییە. ؟"
وتی:
" –وەڵڵا هیچ، بەس من ئامر مەفرەزەیی ناکەم، هەر لەگەڵ خۆت ئەبم."
وتم:
" –ئاخر چی بووە. ؟"
وتی:
" –لەگەڵ کاك ئازاد ناتوانم ئیش بکەم."
وتم:
" –بچۆرەوە بۆ مەفرەزەکەت."
وتی:
" – من ئامر مەفرەزەیی ناکەم، کاك ئازاد خۆی بکە بە ئامر مەفرەزە."

٣٥

ئەو ماوەیە ژنو منداڵەکانم بردبوو بۆ گوندی (سەرزەل). بە نهێنی لە ماڵی (حاجی جەلال)ی موختاری گوندی (سەرزەل) بوون. لە ژوورێکی تاریکدا خۆیان حەشار دابوو، دەبووایە بە ڕۆژیش چرا هەڵکرلیە، چونکە چاوت لە هیچ نەدەبوو. بە دزیی پێشمەرگەو بە دزیی خەڵکی گوندەکەوە لەو ماڵە بوون، چونکە، ئەگەر ئەو کاتە هەندێ پێشمەرگە بیانزانیایە ماڵی ئێمە لە کوێیە، دەرۆیشتنەوەو بە گرتیان دەدان. خەڵکی گوندەکەش بیانزانیایە، هەر ئیخبارییان دەکردن. حاڵم زۆر بە دەستیانەوە خراپ بوو. هەر ماوەیەکو دەمگواستنەوە بۆ جێگایەك. ماوە بە ماوە هەر ئەوەندەم دەزانی هێزی حکومەت شەو چواردەوری گوندی سەرزەلیان دەگرت. دەیانوت ماڵو منداڵەکەی ئاوات لێرەیە. موختار بە دەست ماڵو منداڵی منەوە دامابوو. هەزار سوێندو تەلاقی دەخواردو دەیوت ئەوە ماڵو منداڵی ئاوات نییە. بەلام ژنو منداڵەکانم هەر لە ماڵی

ئەویش بوون. گوندەکەیان کۆدەکردەوە، ژن‌و پیاو بە جیا. نەیان دەناسین. زەینەب هەر وەك ئەوان جلوبەرگی لە بەر دەکردو لە ماڵی موختار کاری دەکرد. جارێکیان ئەفسەرەکە بە موختارەکەی وتبوو:

" –پێمان راگەیاندراوە، کە ماڵو منداڵەکەی قارەمانی لێرەیە. مووختارەکەش پێی وتبوو:

" –باشە سەیرکە، ئەوە هەموو خەڵکی ئاواییەکەیە. ئەی ئەو لە کوێیە.؟"

شەوی وا هەبوو ژن‌و منداڵەکانم لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی تر دەبرد. ئاشتی کچمم بە سەر پشتی وڵاخێکەوە دادەبەستو نەشدەبوایە بگریایە. چونکە هەر بگریایە یەکسەر ئاشکرا دەبووین. زۆر بەزەیم پێیاندا دەهاتەوە. لەو هەموو جێگایەی کوردستاندا جێیان نەدەبۆوە. وەك ئاگر وابوون بۆ هەر جێیەك دەچوون دەریان دەکردن دەیانوت:

" –ئێوە خەتەرن ئێمەش تووش ئەکەن بە خۆتانەوە."

دایك‌و باوکیشم هەر لە زیندانی (سەماوە)دا بوون. کەسوکارم چووبوون بۆ سەردانیان دەیانوت هەر ئاوات خۆش بێت، ئێمە چی لێ ئەکەن با بیکەن.[٢٦]

## ٣٦

نیوەڕۆیەکی مانگی ئابی ساڵی ١٩٧٧ بوو، دنیا زۆر گەرم بوو. لە گوندی (گوڕیان) دانیشتبووین، لە پڕ باوکی (مەولود گوڕیان) هات، وتی:

" –کاك ئاوات، ئەو پیاوە بۆ لای تۆ هاتووە."

وتم:

" –کوا با بێت."

کە هات، وتی:

---

26 - بۆ ماوەی دوو ساڵو نیو لە سەر من زیندانی کران.

" –کاك ئاوات، دوژمن له گوندی (باڕۆیی) دەوری مەفرەزەیەکتانی داوە. من بە ڕاکردن هاتووم پێتان بڵێم."

ئەو کاتە منو ئارامو مامۆستا عەزیزو جەماله ڕەشو هاوڕێ بووین. هەر ئەو کاتە (عەبدولڕەحمان قەرەداغی)یش هاتبوو بۆ دەرەوە، بیروبۆچونی (عێراقی) هەبوو، واتە عێراقچێتیی دەکرد. لەبەر ئەوەی هاوڕێی خۆم بوو، لای ئێمەبوو. (مامۆستا حەمە ئەمین)[27] و پێشمەرگەیەکی ترمان لەگەڵدا بوو، ناوی فەهمی بوو. ئەویش هات. هەر بە پەلە منو هاوڕێ بە شاخی پشتی داری کەلی دا سەرکەوتین، مامۆستا عەزیزیش بە دواماندا هات. گەرمای نیوەڕۆ بوو، زۆر ناخۆش بوو. منو هاوڕێ زۆر لە پێشەوە بووین. بە (هاوڕێ)م وت:

" –تۆ زوو سەرکەوە، گوێت لە تەقە بوو یەك فیشەك بتەقێنە."

وتی:

" –باشە."

ئەو زۆر لە پێش منەوە بوو، گەنجتر بوو. مامۆستا عەزیزو هاوڕێیانی تر زۆر لە دواوە بوون. ئارامو چەند پێشمەرگەیەکمان لە گوڕباز بە جێ هێشت، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆین، ئارام وتی:

" –من خەمی (ڕێبوار)مە. زۆر ئەجولێ، لەوانەیە شەهید ببێ."

پێشمەرگەیەکمان هەبوو ناوی (ڕێبوار) بوو، زۆر کوڕێکی چاك بوو، قوتابی بوو.

من بۆ خۆشم هەر ئەو بۆچونەم هەبوو. زۆر پێشمەرگەیەکی سەلار بوو. هەموو خۆشمان دەویست.

(هاوڕێ) گەیشتە سەر شاخ، فیشەکێکی تەقاند. زانیم شەڕەو بەردەوامە، دڵم خۆش بوو، چونکە گومانم هەبوو دەترسام تەقە نەمابێ‌و هاوڕێکانمان دەوریان گیرابێ‌و هەموویان کوژرابن‌و دەسگیر کرابن. بێ هیوا نەبووم. من چوومە سەرەوە، لە پشتی (داری کەلی)یەوە گوێم لە تەقە نەبوو. خێرا، سەرەو خوار بوو، بە باشی ڕامدەکرد بۆ ناو گوندەکە. کە گەیشتمە ناو ماڵەکان، ڕیزێك تەقە لە خوار (باڕۆیی)ەوە کرا. (مام ڕۆستەم)و (ئازاد)م بینی لە پاڵ بەردێکی گەورەدا بوون، بەرامبەریان دارشەخسێ بوو، دەورەکەی کەڵەکە بەرد بوو وەك ڕەبایە. کە گەیشتمە لایان، مام ڕۆستەم ناوچەوانی تۆزێك برینداربوو. برینەکەی هیچ مەترسیی نەبوو. پێشمەرگەیەکی تر فیشەکێ دابووی لە قاچی. ئەو زۆر بریندار ببوو. ئەو کوڕەی، کە ئێمە ترسمان لێی بوو شەهید بووبوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو. پێمان خۆش بوو هاوڕێکانی ترمان سەلامەت بوون، چونکە ئێمە بە تەمای کەسیان نەمابووین. لەو کاتەدا بۆیان باسکردم، کە ڕووداوەکە چۆن بووە. وتیان:

---

27 - ناسراو بە شەماڵ.

" -لەو کاتەی، کە (هاوڕێ) هات، ئاگامان لێ بوو بۆ دواوە تەقەیکرد، ئێمە ئەژنۆمان شکا، وتمان دواوەمان لێ گیراوە. نەمانزانی ئێوەن، چونکە بەتەمای کەس نەبووین بە هاوارمانەوە بێ. لەو کاتەدا بیرمان کردەوە چۆن خۆمان دەرباز بکەین. ئەوان فرسەتیان هێنا رایانکرد، چونکە لە سەر شاخەکەوە تەقەکرا."

وتیان: " -ئێمە دەوری ئەوانمان گرتبوو، نەك ئەوان دەوری ئێمە بگرن. جاشەکان وان لەو کەڵەکە بەردەدا."

هەر واش دەرکەوت. کە چووینە سەر کەڵەکە بەردەکە، (سێ) جاشی تیا کوژرا بوو. مام رۆستەم وتی:

" -من بۆ خۆم چاوم لێ بوو دانەیەکیان رایکرد بۆ ناو ئەو تەماتەیە، دڵنیام دەرنەچووە."

ئێمەش ریزمانگرت بە تەماتەکەدا. منو شەماڵو هاوڕێو جەمالە رەش. کاتێکمان زانی جاشەکە هەر هەستاو یەك ریز فیشەکی کلاشینکۆفی پێوە نایین. لە دووری دوو مەترەوە هەستاو رایکرد. هەر نازانم چۆن نەیکوشتین؟ بەرمان نەکەوت. هاوڕێ مەخزەنێکی حەفتاو پێنجی پێ بوو، یەك ریز تەقەی دوورو درێژی لێکرد، جاشەکە بە دەما کەوت. چووینە سەری‌و سەیرمکرد. من نەمناسی، وتم:

" -هەویەو شتەکانی لە گیرفان دەربێنن."

فەهمی هەڵیگێڕایەوە لەر پشت، وتی:

" -ئای کاك ئاوات خۆ ئەمە (فەرهادی مەلا رەزا) یە."

وتم:

" -مەعلوم ئەوە؟"

وتی:

" -بەڵێ، من زۆر باش ئەیناسم."

یەکسەر (عەبدوڵلای ئایش)و (یاسینە رەش)و هاوڕێکانم هاتەوە یاد، کە ئەو بەگرتی دابوون. لەو کاتەدا وام دەزانی کورد رزگاری بووە. شتەکانیان دەرهێنا، دەمانچەیەك‌و کلاشینکۆفێکی پێ بوو، هەروەها راپۆرتی جۆراوجۆری بۆ ئیستخبارات نووسیبوو لە سەر ناوچەکەو لە سەر ژن‌و منداڵی ئەو پێشمەرگانەی، کە لە لانێکان دەژیان‌و لەگەڵمان بوون. ئەوانەی بۆ (شێرکۆ)ی برای نووسی بوو، بۆی وەربگێڕێتە سەر زمانی عەرەبی‌و ئەوجا بیدا بە ئیستخبارات. ئەو کاتە بۆمان دەرکەوت، کە (شێرکۆ) مەسئولی هەموو کوردەکان بوو لە ئیستخبارات. کاریان بۆ ئەوان دەکرد[٢٨]. ئیتر بۆمان دەرکەوت

---

٤- کاك نەوشیروان لە کتێبەکەیدا نووسیوێتی، کە گوایە (فەرهادی مەلا رەزا) جوابی ناردووە بە (فازیل)دا، کە حکومەت هجووم ئەکا. ئەوە وانییە، کاك نەوشیروان بە هەڵە ناوی بردووە. ئەو کاتەی، کە باسی ئەوە دەکا فەرهاد زۆر دەمێك بوو بە سزای گەل‌و شۆڕش گەیشتبوو. تۆڵەی شەهیدەکانی لێ سەندرابۆوە. رەنگە ئەوەی ئەو باسی دەکات (نەژاد)ی برای بووبێت جوابی بۆ کاك نەوشیروان ناردبێت. خۆ ئەوانە هەموویان خائین بوون.

ئەوەی لە ناویاندا دەرچووبووو دەرباز بووبوو (عوسمانی تۆکل) بوو. جاشەکانی تر هەموو کوژرابوون. ئێمەش بریندارێکو شەهیدێکمان هێنا بۆ گوندی سەرزەل، لەوێ شەهیدەکەمان بە خاك سپاردو خۆشمان گەڕاینەوە بۆ گوندی (خاوێ).

دواتر ناردم بە دوای ئارامو هاوڕێکانی تردا. دوو ڕۆژ لەو ناوە بووین. فیشەکو شتی وامان پێ نەمابوو. لەو ناوەش فیشەکمان نەبوو. تەنها لە بەری قەرەداغ هەمانبوو. بە پەلە (مەولود)م نارد بچێ فیشەك بێنێ. خۆشمان دەشاردەوە، بۆ ئەوەی تووشی هیچ نەبین. شەو لە گوندی (هەرگێنە) بووین، خەبەرم بۆ هات، کە گوندەکانی (خاوێ)و (قازان قایە)و (مێولّی)و ئەو بنارەی (سەگرمە) هەمووی بە جاشەکانی (قالە فەرەج)و (تەحسین شاوەیس) گیراوە. بیرم کردەوە دەبێ خۆمان بپارێزین، بۆ ئەوەی تووشی هیچ شەڕێ نەبین. بە بێ فیشەك هیچمان پێ ناکرێ. وتمان وا باشە ئێمە فێڵیان لێ بکەین. شەو ڕۆشتین بەرەو گوندی (فیکەیەرە) هەر ئەو شەوە چووینە بەردەمی دارستانەکەی گوندی (گەڕەزیل) بۆ ئەوەی بزانین بەیانی چی ڕوو دەدات. لەو ناوە ماینەوە هەتا نیوەڕۆ هیچ نەبوو. ئەو کاتەش ئەگەر هەتا نیوەڕۆ ئینزالی هەلیکۆپتەر نەبوایە، دەچووینەوە گوندەکان. نیوەڕۆ بوو، ئاگامان لە هیچ نەبوو وتمان:

" –هیچ نیە با بڕۆین لە گەڕەزیل نانێك بخۆین."

بە ڕێ کەوتین بەرەو ناو دێ. شەخسێك لە پشتی دێکەوە بوو زۆر دارستان بوو، ئێمەش بە بەردەمی گردەکە ڕۆشتین. لە بەر ئەوەی ڕێگاکە دەیدا بە بەردەمی ئەو گردەدا. کاك حەمە سەعید لە پێشەوە بوو، من لە دوای ئەوەوە بوم. شەهید ئارام لە دوای منەوە بوو. هەموو ریزمان بەستبوو بۆ ناو دێ. هەمووی دووسەد مەترێکمان مابوو بگەینە دێکە، سەیرمانکرد لە بەردەمیماڵەکاندا کۆمەڵ کۆمەڵ بۆر دەچوونەوە. وتم:

" –حەمە سەعید بوەستە ئەوانە چین.؟"

کاك حەمە سەعید وتی:

" –مردوت مرێ ئەوە هەموو عەسکەرە."

دەستم هەڵبڕی بۆ برادەران، کە بۆ دواوە بگەڕێنەوە. باش بوو ناو دۆڵو چەم بوو. بە ڕاکردن ڕامانکرد بەرەو چەمی (زایەر) زۆر قوڵ بوو. ئاویشی لێ بوو. خۆمان گەیاندە ئەوێ. ئاومان خواردەوە، تۆزێك ئیسراحەتمانکرد، ئینجا بە خۆمان پێدەکەنین، ئەگەر تۆزێکی تر بچوینایەتە گوندەکەوە، چیمان بە سەر دەهات، چۆن دەبووین بە پۆڕی خورلو. وتیان:

" –چی بکەین.؟"

وتم:

" –با هەر بەو چەمەدا بەرەو شاخی (گڵەزەردە) بڕۆین، دیارە ئەم شەو هەموو گوندەکان گیراوە."

چووینە پشتی (کانی ڕۆشنایی) دارستان بوو. زۆر بێ شکبوو، نەئاوی لێ بوو، نەئاوەدانی. قەت حکومەت بۆی نەدەچوو. لە وێشەوە چاومان لە هەموو ناوچەکەبوو. کە چووینە ئەوێ سەیرمانکرد، ئەو شوێنەی، کە شەو لێی خەوتبووین، پشتی ئەوێ هەمووی عەسکەر بوو. ئەو گردەی، کە خۆمان بە بەردەمیا ڕۆشتبووین، هەر هەمووی جەیش بوو. هەر بە لامانەوە سەیربوو چۆن ئێمەیان نەدیوە!؟ خۆیان دەنگیان نەکردووە یان ئێمەیان نەبینیوە؟ بڕوامان نەدەکرد. سەربازەکان ئەوەندە ماندوو بوون، هەموو خەوتبوون، هەر ئاگایان لە خۆشیان نەبووە. هەر ئێمەشیان نەدیووە. ئەوانەی دەورو بەری دێکەش هەموو خەوتبوون. شەو لە قەرەداغەوە بە پێ هاتبوون بۆ ئەوەی کەس نەزانێت. ئێمە هەر بە ڕێکەوت دەرچووین، چونکە فیشەکمان پێ نەبوو. ئەوەی پێشمان بوو زۆر کەم بوو. بێتوو تووشیان بووینایە هەر بە دەست دەگیراین. ڕۆژ ئاوابوو. سەیرمانکرد لەو گوندانەی، کە ئەوانی لێیە، لە هەموو جێگایەك ئاگریان کردۆتەوە. ئەو جا زانیمان، کە ئێمە چەند لە مەترسی دایین. هەر پشتی ئەو شوێنەی ئێمەی لێ بووین، هەمووی عەسکەر بوو. سەیرمانکرد ئەو گوندەی، کە خۆمان لێوەی نزیکین، هیچی لێ نییە. ئەویش گوندی (کانی ڕۆشنایی) بوو. کانی ڕۆشنای خۆی دەبوو ناوی (کانی تاریك) بوایە. شەش حەوت ماڵ بوون. ناخۆشترین گوندبوو. خەڵکەکەشی زۆر هەژار بوون. ئێوارە خۆمانکرد بە وێ دا ئیسراحەتمانکرد. وتمان:

" -ئەوە گەڕەزیل عەسکەری لێ یە.؟"

وتیان:

لە شەوەوە هاتوون دەوری دێکەیان گرتووە."

گوندی (گەڕەزیل) و (باخی سەرو) و (تیمار) و هەردوو (دۆلان) و (هۆمەرامان) و هەموو دێکانی بناری خاوێو (قازان قایە) هەموویان گرتبوو. باش بوو ئەو جارە لێی دەرباز بووین. ئینجا خەمی کاك مەولودمان بوو، لەوێوە هاتبێتەوەو گیرابێت. باش بوو، ڕۆژی دوایی هەلیکۆپتەر گەیشتو هەموو جەیشەکە گەڕانەوە. کاك مەولودیش بە سەلامەتی هاتەوە، فیشەکی هێنا بوو بۆمان. دوای ئەوە ئێمە چووین بۆ گوندی (گەڕەزیل) بۆ خەڵکی گوندەکەمان گێڕایەوە، کە چۆن خەریك بووە بگەینە ناو ماڵەکان، ئەوجا زانیومانە جەیشی لێیە. زۆریان چاویان لێمان بوو، وایان زانیبوو جاشی خۆیانین. دەیانوت:

" -هەر بە ڕاستی ئەوە ئێوە بوون.؟"

زۆریان بە لاوە سەیر بوو، کە چۆن پێیان نەزانیووین.!

رژێم بە ناوی سەر ژمێری ساڵی ١٩٧٧وە، هێرشێکی بەرفرەوانی کردە سەر ناوچەی قەرەداغ. هەموو گوندەکانی داگیرکرد. کێوماڵەکە، بۆ ماوەی یەك هەفتە بەردەوام بوو. ڕۆژانە بە دەیان هەلیکۆپتەر سەربازی بۆ سەر کانیو ئاوەکانو شوێنە سەختەکان دەگواستەوە. دەوری هەموو گوندەکانیشی دەگرت. پێش ئەوە ئێمە هەواڵمان بۆ هاتبوو. هەموو هێزەکانمان دابەشکردبوو بە سەر ناوچەکەدا، کە چۆن خۆیان بشارنەوە. ئێمەش لەگەڵ ئارامو ئەو هاوڕێیانەی لەگەڵ خۆم بوون، چووین بۆ دەوری گوندی (تیمار). جێگایەك هەبوو زۆر دارستان بوو، لە پاڵ جادەی قەرەداغ. ئەو جادەیەی، کە لە گوندی (گڵەزەردە) وە هاتبوو بۆ قەرەداغ. زۆر بێ شك بوو. چووین بۆ ئەوێ. هەموو شەوێ (مەولود گوڕپانێ)مان دەنارد بۆ ناو دێکە، نانو ئاوی بۆ دەهێناین. بە ڕۆژیش سەیری ئەو هەموو هەلیکۆپتەرەمان دەکرد، کە هاتو چۆیان دەکرد. ئەو کاتە ماڵو منداڵەکەم لە گوندی (سەرزەل) بوون. هەلیکۆپتەر زۆر دەچوو بۆ ئەوێ لەوێشەوە هەڵدەستایەوە. (ئارام)یش گاڵتەی لەگەڵ دەکردم، هەر هەلیکۆپتەرێك لەوێوە دەهات بە سەرخۆماندا دەڕۆیشت زۆر بە نزمی دەهات. ئەوەندە نزم بوو گەڵای دارەکانی دەجووڵانەوە. دەیوت:

" –ئەرەوەڵا ئەوە باجی زەینەب بوو لەو هەلیکۆپتەرە دا."

منیش دەموت:

" –جا چییە با بیگرن، بۆ خۆم ژنێکی تر دێنمەوە."

دەیوت:

" –بە ڕاستە؟ بە خوا لە سەر زەینەب خان ڕەمیت ئەکەین. خۆ ئەزانم بە ڕاستە.؟"

دەموت:

" –ئەی بۆ چی خۆ ئەزانم بیگرن لە سێدارەی ئەدەن. ئەوەندە لە شار خەڵك هاتۆتە ماڵمان ئەڵێن ژنەکەی لە خۆی مەسئولتر بووە."

خۆ بگیرایە قەد ڕزگاری نەدەبوو. هەفتەکە تەواو بوو. هەر ئەو ڕۆژە جەیشەکە ئینسحابیانکرد. بۆ شەوەکەی ناردمان کۆبوونەوەمان بە زۆربەی خەڵکی گوندەکان کرد. پێمان وتن:

" –بەیانیش بچن بۆ قەرەداغ بڵێن ئەمشەو پێشمەرگە هاتوون کۆیان کردووینەتەوە."

بەیانی لە چەندین گوندەوە دەچوون دەیانوت ئەمشەو پێشمەرگە هاتووە. ئەوە حکومەتی سەرسامکردبوو، چونکە ئەوان یەك هەفتەیە هەموو ناوچەکەیان داگیر کردووە. بە گوندو شاخو کانیو ئاوەکانیەوە. ئێمەیان بۆ نەدۆزرایەوە. بەوە زۆر بێزار دەبوون. دوای ئەوە ئێمەش کەوتینەوە جەولەکردن بە ناوچەکەدا.

ماوەیەك بوو لەگەڵ مەفرەزەکانی تردا دابڕابووین دەمویست بچم بۆ لایان کۆبوونەوەیەکیان پێ بکەم، بزانم وەزعیان چۆنە. ئێمە بە بەردەوامی کۆبوونەوەمان لەگەڵ پێشمەرگەو مەسئولەکان هەبوو. ماوەیەك لە بەر ئارام نەمدەتوانی وەك جاران بە بەردەوامی لەگەڵ ئەوان بە یەکەوە بین. ئەو زۆر لەگەڵ خۆیدا گلی دەدامەوە. بە زۆری لە ناوچەی بازیان دەمایەوە، بە تایبەتی لە گوندی (گوڕپان)، چونکە ئەوێ وەك بنکە وابوو، دووریش بوو لە دەسەڵاتی حکومەتەوە.
ڕۆژێ دوای نیوەڕۆ کۆبوونەوەمان لە (قازان قایە) هەبوو، لە ناو باخێکدا بووین، ئارام قسەی بۆ دەکردین. مامۆستا عەزیز لە پەنامندابوو. دەمی نا بە پەناگوێمەوە وتی:
" —کاك ئاوات ئەزانی بیرم لە شتێکی باش کردۆتەوە. !"
منیش زۆر بە جدی وەرمگرت، وتم:
" —چییە. ؟"
وتی:
" —بۆ سێ قاز نەکڕین بۆ مەفرەزەکان. ؟"
منیش وامزانی بۆ خواردن دەڵێت، وتم:
" —جا سێ قاز چۆن بەشی ئەو هەموو پێشمەرگەیە ئەکات. ؟"
وتی:
" —خۆ من بۆ سەربڕین ناڵێم."
وتم:
" —ئەی بۆ چی. ؟"
وتی:
" —کورە بۆ حەرەسیات، ئەزانی چەند زیرەکو وریان. ئیتر پێویست بە کەس ناکات حەرەسیات بیگرێ."
منیش بە راستی خۆم پێ نەگیرا، دەستمکرد بە پێکەنین. ئارام وای زانی بە قسەی ئەو پێدەکەنم، وتم:
" —ئەزانی بە چی پێئەکەنم. ؟"
وتی:
" —بە چی. ؟"
وتم:
" —بە مامۆستا عەزیز. شتێکی تازەی پارتیزانی دۆزیوەتەوە، ئەڵێت هەر مەفرەزەی قازێکی بۆ بکڕە بۆ حەرەسیات. زۆر وریان هەرچی ببینن ئەقیرێنن."
هەموو دەستیانکرد بە پێکەنین. مامۆستا عەزیز خۆی ناوی (محێدین) بوو هەر پێمان دەوت (محی).
ئارام وتی:

" –جا بۆ بە قسەی ناکەیت، شوکور هۆشیارە (محی) تێدەگات دونیا خەرافاتە[29].
مامۆستا عەزیز زۆر دەنگی بەرزبوو وتی:
" –جا بۆ کاک ئەبوبەکر خراپم وتووە.؟"
–شەهید ئاراممان ناو نابوو (ئەبو بەکر)– ئەویش وتی:
" –جا کێ وتویەتی خراپە، زۆر باشە. کاک ئاوات بەقسەی بکە."
مامۆستا عەزیز زۆر تەمەڵ بوو. تەمەڵی وام قەت نەدیبوو. ئەو کاتەش دەبوولیە بە شەوو بە رۆژ هەموو حەرەسیاتمان بگرتایە. مامۆستا عەزیزیش زۆر رقی لە حەرەسیات بوو. نەی دەتوانی هەڵسێت. تووش بووبوو، ئەگینا ئەوو پێشمەرگایەتییان نەوتبوو. بە تایبەتی پێشمەرگایەتیی ئەو کاتەش مردن بوو. ئێمەش یاسایەکمان دانابوو، کە بە رێگادا دەڕۆیشتین، دەبووایە دوور بووینایە لە یەکەوە. لە بەرئەوەی لە پڕ هەلیکۆپتەر دەهات، دەبووایە خۆمان بدەین بە عەرزدا بۆ ئەوەی ئەگەر تەقەی لێ کردین، یەکێك بەرکەوێ، نەك سیان چوارێ. جاری وا هەبوو پێشمەرگەکان بۆ ئەوەی لەگەڵ یەکتر قسە بکەن، لە بیریان دەچوو، کە دەبێ بەینیان هەبێ. بە یەکەوە دەڕۆیشتن. ئێمەش سزامان دەدان بەوەی دوو سەعات حەرەسی زیاد بگرن لە حەرەسیاتەکەی خۆیان.
مامۆستا عەزیز دەچوو مراقەبەی دەکردن لە ریزەکەدا، کێ موخالیف بووایە یەکسەر هاواری دەکرد:
" –کاک ئاوات ئەوە فلان پێشمەرگە ریزەکەی تێك داوە. ئەبێت حەرەسیاتەکەی من بگرێت."
دەموت:
" –باشە."
مامۆستا عەزیز زۆر کوڕێکی قسە خۆش بوو. بە داخەوە لە ناو سلێمانیدا گیراو لە سێدارە درا. ژنەکەی زۆر خۆش دەویست. نەی دەتوانی بێ ئەو بژی، زوو زوو دەچووەوە بۆ ناو شار. هاوڕێیانمان هەمیشە رەخنەیان لێ دەگرت، بەڵام بێ سود بوو، گوێی لێ نەبوو.

٣٨

رۆژێك بە کاک (ئارام)م وت:
" –کاک ئارام من ئەچم بۆ لای ئەو برادەرانەی تر، بۆ بەری قەرەداغ."

---

29- دێرە شیعرێکی شاعیری پایە بەرز ( مەحوی ) یە ، شەهید ئارام وەك تەعلیقێك بە مامۆستا عەزیزی ووت .

وتی:
" -ئەی بۆ نانێریت بە دوایاندا بێن بۆ ئەمبەر، لێرە لە (بەری بازیان) کۆبونەوەیان لەگەڵ بکە. منیش دێم بۆ ئەوەی چاوم پێیان بکەوێت.؟"
وتم:
" -باشە."
ناردم بە دوای گۆران[30] و سیروان تالەبانی[31] دا. ئەو کاتە ئەوان لەو بەربوون. سیروان لە گەرمیان‌و گۆرانیش لە بەری قەرەداغ بوو. کوڕێکمان هەبوو ناوی (یوسف) بوو بە (هێرش) ناسراوبوو، برازای کاك شەماڵ بوو. دامان نابوو لە بەری قەرەداغ وەك کادر. هەر ئەو کاتە هاوڕێیان کۆببوونەوە، کە بێن بۆ لای ئێمە. وتم:
" -با هێرش نەیەت ئەو بمێنێتەوە بۆ دەنگوباسی ناوچەکە."
ئەویش (حەمەی تەلە)ی لەگەڵ خۆیدا هێشتبووەوە. هاوڕێیان بە ڕێ کەوتبوون بەرەو لای ئێمە لە (قۆپی حەمەی هەواس)، کە دەکەوێتە پشتی گوندی (بەڵخە)وە. پێشمەرگەیەکی سیروان دوا کەوتبوو بەجێ مابوو. جاشەکانی (قالە)و (تەحسین) لە دیوی گەرمیانەوە هاتبوون بە دیوی قەرەداغدا، تووشی ئەو پێشمەرگەیە بووبوون‌و دەستگیریان کردبوو. ئەویش گوتبووی:
" -من خۆم دزیوەتەوە لێیان بۆ ئەوەی تەسلیم ببمەوە، ئەوە تووشی ئێوە بووم."
پێی وتبوون:
" -ئەی جەماعەت لە کوێن."
ئەویش وتبووی:
" -کاك ئاوات جوابی بۆ ناردوون بۆ بەری بازیان."
دێ بە دێ دوایان کەوتبوون. ئێمە لە گوندی (مێوڵی) بووین. شەو پێشمەرگەیەکیان نارد بۆ لام، وتی:
" -برادەران وان لە (هەڕگێنە) ئەمشەو. بەیانی دێن بۆ قازان قایە."
وتمان:
" -زۆر باشە، خۆشمان بەیانی ئەچین بۆ ئەوێ."
بەیانی بە ڕێکەوتین بەرەو گوندی (قازان قایە). ئێمە هەرگیز بەیانیان نەدەچووینە ناو گوندەکان. لە دوای نیوەڕۆوە دەچووین بۆ ئەوەی، ئەگەر تووش بووین، لە بەیانییەوە تووش نەبین. پێش نیوەڕۆ بوو، ئێمە لە بەینی گوندی (مێوڵی)و (قازان قایە)دا بووین. دارو شەخسێکی لێ بوو زۆر چڕو دارستان بوو. لەوێ دانیشتین بۆ ئەوەی درەنگ بکا، ئەوجا بڕۆین بۆ گوندەکە. کاتێکمان زانی لە ناو گوندەکەدا بوو بە تەقە. ئەمان دەزانی

---

[30] - ئەو سەردەمە فەرماندەی مەفرەزە بوو لە قەرەداغ.

[31] - فەرماندەی مەفرەزە بوو لە گەرمیان.

چی روویداوه؟ به دووربین سەیرمانکرد، هەر چەکدار بوو لە دێکەوە بەرەو لای ئێمە رادەکەن. لە پشتی دێکەوە گردێکی لێ بوو، چاومان لێ بوو بە گردەکەدا سەرکەوتن. دیاریوو لە سیروان دەچوو. هاوارمان لێ کرد:

" -کاک سیروان ... گۆران."

کەس وەلآمی نەبوو. نەماندەزانی چی بکەین؟! تازە یەك رەشاشی برنەوی کۆنیان بۆ هێنا بووین، زۆر قورس بوو. دوو فیشەکی دەتەقاندو دەوەستا. مام رۆستەم وتی:

" -ئەم رەشاشە بۆ من."

هەر مام رۆستەم بۆی هەڵدەگیرا. مام رۆستەم دووسێ فیشەکی تەقاندو وەستا. ئیتر تەقەی نەکرد. هەر هەڵیگرتو دای بە عەرزەکەدا. دەنگی زۆر زل بوو، وتی:

" -بابە چەکەکەی خۆم بدەنەوە."

ئەوەندەمان زانی پێشمەرگەیەکی خۆمان بە راکردن بەرەو لامان هاتەوە، کە هاتە پێشەوە (ئاشتی)[32] بوو. وتم:

" -ئەوە چییە.؟"

وتی:

" -(کاک سیروان)و (کاک گۆران)ن."

وتم:

" -ئەی چی بووە.؟"

وتی:

" -ئێمە لە ناو دێکەدا بووین، پێشمەرگەکان زۆریان خەریکی خۆشتنو جل شتن بوون. من لەگەڵ کاک سیروانو حەسەن خاوێی لە ماڵی شێخ محەمەد بووین دانیشتبووین، لە پڕ بوو بە تەقە. ئیتر نەمانزانی چییە؟! رامانکرد. من بەرەو لای ئێوە رامکرد، کاک سیروان بەرەو خاوێ رایکرد. جاشەکان دوامان کەوتن. مەلا ئەحمەد لەگەڵ من بوو، لە پاڵ ئەو گردەدا بەرکەوت، شەهید بووە، چونکە لێیاندا، گل بۆوە. بڕوا ناکەم مابێت. ئیتر کەس ئاگای لە کەس نەما."

کە زانیمان ناو دێکە هاوڕێیانی خۆمانی تیا نەماوە، وتمان هێرش بکەین بۆ ناو دێکە. لەوەدا بووین، (سیروان)یش لە پشتمانەوە هاتە خوارەوە. لە سێ لاوە هێرشمان برد بۆ ناو دێکە. پێش ئەوەی هێرش دەست پێ بکەین، دەنگی گرمەیەکی زۆر گەورە لە پێشمانەوە هات. بەردەممان شیو بوو، تەقینەوەکە لەو چەمەدا روویدا. من وامزانی هاوەنی جاشەکانە گرتیانە بەردەمی ئێمە. زۆر لە ئێمەوە نزیك بوو، کە هێرشمان بۆ کرد، ئەوان رایانکرد. ئێمەش دوایان کەوتین. لە دێکە دەرچووین بەرەو گوندی (هۆمەرامان). بینیمانن رایاندەکرد بەرەو لای قەرەداغ. کە چووینە ناو گوندەکە وتمان:

---

[32]- ناوی خۆی بەکر بوو.

" –تەرەکتۆرێك بگرن با دوایان کەوین."
خەڵکی دێکە وتیان:
" –جاشەکان وتوویانە شەش پێشمەرگەمان کوشتووە لەو چاڵەدا، بچن جەنازەکانیان بێننەوە."
کەوایان وت، وتم:
" –با بچین بزانین راستە.؟"
من لە پێشەوە چوومە سەر نووان. شوانەو پێشمەرگەیەکی تر بوون، هەر دووکیان بە یەکەوە بوون، کەوتبوون بە سەریەکدا، لەتو پەت بووبوون. بە گوللە شەهید نەبووبوون، بە رومانە خۆیان خۆیان کوشتبوو. پاشان چوومە سەر نوانی تر لە سەرووی ئەوانەوە بوون. هەر شەهید بووبوون، ناویان (عەبدوللا)و (سمکۆ) بوو. ئەوانیش خۆیان کوشتبوو رومانەیان تەقاندبۆوە بە خۆیاندا. دیاربوو شوانە پێی وتبوون با خۆمان بکوژین بۆ ئەوەی نەگیرێین. ئەو روداوە ئەوەندە ناخۆش بوو هەر جاشمان بیر چۆوە. نەمان دەزانی چی بکەین. تازە ئەو هەموو هاورێ چاکانە شەهید بووبوون. نوانی تریش بە گوللە شەهید بووبوون، (مەلا ئەحمەد حەمە ئەمین)ی مەسۆیی‌و پێشمەرگەیەکی تر. یەك پێشمەرگەی کەشمان بە دیل گیرابوو ناوی (عەزین) بوو، سەرشەقامی بوو، کوڕی پیرێژنێك بوو. دوایی ئەویش لە سێدارە درا. ئیتر نەمدەزانی لە خەم‌و خەفەتدا چی بکەم؟ بە تایبەتی بۆ شوانەو مەلا ئەحمەد. ئەوەندە هاورێ بووین قەد نێوانی براش وا نەبوو. مەلا ئەحمەدی مەسۆیی لە شۆڕشی پێشووش دا هەر هاورێم بوو. شوانەش هەر وەك برا بووین لە دایك‌و باوكێك. ئەوانی تریش پێشمەرگەی زۆر قارەمان بوون. هەموویان کۆمەڵە بوون. شوان رۆشنبیرێکی زۆر زیرەك‌و دڵسۆز بوو. تەرمەکانمان بردەوە بۆ دێکە. بە خەڵکی دێکەمان وت:
" –بە یەکەوە بیاننێژن."
ئەوانیش هەر شەشیان بە یەکەوە لە گوندی (قازان قایە) بە خاکیان سپاردن. دوای ئەوە خۆمان گەیاندە گوندی (مێوڵی). ئەو شەوە لە داخا نەمدەزانی چی بکەم؟ هەتا ماوەیەك هەر حەپەسابووم. هەر لێکم دەدایەوە، باشە من ئیتر چی بکەم؟ چۆن تازە دەتوانم تۆڵەی ئەو برادەرانە بکەمەوە؟ خەریك بوو تێکدەچووم. ئارام دڵخۆشی دەدامەوە. رەنگە ئەو کاتە، گەر ئەو لەوێ نەبووایە، من تێکچووبوومایە. ئەو هەر ورەی بەرز دەکردمەوە، دەیوت:
" –شۆڕش ئەوەیە. هەموومان هەر ئەبێت وەك هاورێکانمان شەهید ببین. ئەوە دڵسۆزییە بۆ هاورێکانمان، نەك خەفەت خواردن."
هەر دوای ئەو شەهیدانە، خەبەریان بۆ هێنام. وتیان:
" –(هێرش)و (حەمەی تەلە) لە دەربەندیخان تەسلیم بوونەتەوە. من بۆ حەمەی تەلە بروام نەدەکرد بەراورد لەگەڵ هێرش، کە کادرێك بوو. حەمەی تەلە لە ئاشبەتاڵەکەدا

تەسلیم نەبوویۆوە، هەر بەو شاخەوە بوو. هەر بە تەنیا یاخی بوو لە حکومەت. ئیستا چۆن ئەڕواتەوە!؟ بەلام هەردووکیان لە ناوچەکە بە جێ مابوون. دوایی بۆمان دەرکەوت، کە ئەو هەواڵە راست بوو. تەسلیم ببوونەوە. چووبونەوە بۆ دەربەندیخان. دوای مانگێك حەمەی تەلە هاتەوە[33]، پێم وت:

" –تۆ چۆن رۆیشتیتەوە؟ تۆ لە کاتی ئاشبەتاڵدا نەچوویتەوە، هەر بە تەنیا بەو شاخەوە بوویت، کەچی ئێستا ئێمە هاتووینەتە شاخ لەگەڵ تۆداین، تۆش رۆیشتوویتەتەوە بۆ لای حکومەت؟."

وتی:

" –وازم لێ بێنە، کادری ئێوە منی رووخاند."

وتم:

" –بۆ.؟"

وتی:

" –هێرش لێی پرسیم حەمەی تەلە ئاخر شاخی (زەردە)[34]بە دەرزی کون ئەبێت؟."

وتم:

" –شاخی زەردە چۆن بە دەرزی کون ئەبێت.؟"

وتی:

" –دەبا پێت بڵێم، حکومەتی عێراقی وەك شاخی زەردە وایە. ئێمەش بە دەرزی کونی ئەکەین. ئەوەی ئێمە ئەیکەین وەك ئەوە وایە."

وتم:

" –ئەی چار چی یە.؟"

وتی:

وەرە با برۆینەوە. تازە ئەوانیش نایەنەوە بۆ ئەم ناوچانە. لەوانەیە بپەڕنەوە بۆ بەری شارباژێڕ."

منیش وتم دیارە ئەم کادرە، ئەزانێت. ئەو بڕواتەوە من بە تەنیا چی بکەم؟ ئیتر وتم باشە."

منیش پێم وت:

" –ئەی بۆ هاتیتەوە.؟"

وتی:

" –کە چوومەوە خۆم تەسلیم کردەوە (ئامر لیوا) بانگی کردم، چووم بۆ لای، کە چوومە ژوورەوە وتی:

---

[33] - یوسف هەر نەگەڕایەوەو ئیتر پێشمەرگایەتیی نەکردو بوومەوە بە قوتابیی زانکۆ.

[34] - شاخی زەردە : لە زنجیرە چیاکانی قۆپی قەرەداغە .

" –تۆ حەمەی تەلەی.؟"

وتم: بەڵێ."

کەچی هەتا توانی تفێکی کردە ناوچاوانم وتی:

" –ئا ئەمە بوو لە ئێمەیان کردبوو بە شێر."

دەریکردمە دەرەوە. بە خۆم وت:

" –حەمەی تەلە چیت بە خۆت کرد. من لە دەرەوە ئەوەندە پێشمەرگەیەکی سەنگینو بەڕێز بووم ئێستاش چیم بە خۆمکرد. دوایی بیرم لەوە کردەوە،کە چۆن وەرم بگرنەوە.؟"

ئیتر بووەوە بە پێشمەرگە.[٣٥]

٣٩

هەر لە هاوینی ساڵی ١٩٧٧دا بوو، ئەو کاتە ئارام لای ئێمە بوو، فازیلی مەلا مەحمودو سامی شۆڕشو یەکێکی تریش بە ناوی حەمە کەریمو عەرەبێکیش ماوەیەك هەر لەگەڵ ئێمەدا بوون بە ناوی حیزبی شیوعی عێراقی (قیادە مەرکەزی) یەوە کاریان دەکرد. ڕۆژانە هەر خەریکی موناقەشە بوون لەگەڵ شەهید ئارام، بەڵام فازیل زوو زوو ون دەبوو، ئەمان دەزانی بۆ کوێ دەچێ. ڕۆژێك هاوڕێیەکی خۆمان وتی:

" –هەموو جارێك ئەچێتەوە بۆ سلێمانی."

ئیتر برادەرەکانی لای ئێمە بە جێ دەهێشت. ئەوانیش هەر خەریکی تێکدانی برادەرەکانی ئێمە بوون. یەکێکیان بە ناوی (رەئیس عەبدوڵلا) کوڕێکی گەنج بوو لێی نەدەهات ناوی رەئیس بێت. خۆی ناوی (خەبات) بوو. ئەو موناقەشەی زۆری لەگەڵ من دەکرد دەیوت:

" –حەقە کۆمەڵەش ئیتر واز لە کوردستانی بێنێت، ناوی خۆی بگۆڕێت ببێت بە (رێکخراوێکی عێراقی)، چونکە کرێکاری کوردو عەرەب هەر یەکەو جیاوازی نییە."

منیش زۆر گوێم لێ نەدەگرت. ماوەیەکی پێ چوو هەموویان ون بوون. نامەیەکیان نوسی بوو دەڵێت:

" –(فازیل بۆ ماوەیەك بە ئیش ئەڕوات)."

---

[35] - حەمەی تەلە خەڵکی گوندی دەرە دۆین بوو لە خوار دەربەندیخان. نەخوێندەوار بوو، بەڵام لە سەردەمی خەباتدا کرا بە ئامر مەفرەزە. ڕۆژێ لە ناوچەی گەرمیان خەڵکی کۆکرببووەوە قسەیان بۆ بکا لەبارەی شۆڕشی نوێوە, لەبەر ئەوەی نەخوێندەوار بوو هەر ئەوەی زانیبوو بڵێ خەڵکەکە هەر وەك ئەوەی کاك سیروان وتی ئەگەر یارمەتیمان بدەن ماڵتان ئاوا بێ. چەند جارێ لە شەڕدا بریندار بوو، بەڵام لە دوای راپەڕین بەهۆی کارەساتی وەرگەڕنی ئوتومبێل شەهید بوو.

ئەو کاتە عەبدولڕەحمان قەرەداغیش لەگەڵ ئەوان ڕۆیشت. ئەو هەر خۆی بوو خەباتیش وتی:

" -ئەچم سەرێکی سلێمانی ئەدەم."

شەهید ئارامیش ئیزنی دا. دیار بوو بڕیاریان دابوو بچن بۆ دەرەوەی وڵات. دوای ماوەیەك، ڕۆژێ خەبات نامەیەکی بۆ شەهید ئارام نارد. هەندێکی ئەو نامەیەم لە یادە، کە خوێندیەوە وتی:

" -سەیری نامەکەی خەبات بکە بزانە چی نووسیوە."

کە خوێندمەوە بۆ شەهید ئارامی نووسیبوو دەڵێت:

" -(ئەگەر تۆ کۆمەڵە ئەگۆڕیت بە ڕێکخراوێکی عێراقی سەرانسەری، ئەوا دێمەوە. ئەگەر هەرواش بمێنێتەوە، ئەوە نایەمەوە، لەوانەیە بڕۆم بۆ دەرەوە)."

شەهید ئارام وتی:

" -گوێ لەم بیانووە بگرە، وا ئەزانێت کۆمەڵە دیوارە بۆیەکەی بگۆڕم بە ڕەنگێکی تر. بڕۆ هەر مەیەرەوە با لە دوای تۆ گورگ بمانخوات."

ئەوەبوو هەموویان ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی وڵات. سامی شۆڕش چووەوە تەسلیم بۆوە بە حکومەتی عێراقی. عەرەبەکەش گیراو لە سێدارە درا.

٤٠

سەلاح چاوشین لەگەڵ سالار عەزیز بەینیان تێکچوو بوو. سەلاح لە دۆڵی جافایەتییەوە هات بۆ لای ئارام هەر خۆی بە تەنیا بوو. ڕۆژێ کوڕێ هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی بۆ لای ئێمە، من نەمکرد بە پێشمەرگە، چونکە وەرەقەی ڕێکخستنی پێ نەبوو. سەلاح چاوشین لای خۆی کردی بە پێشمەرگەو چەکەکەی خۆی دایە. خۆی دەمانچەیەکی پێ بوو. کوڕێکی تریش پۆلیس بوو رایکرد بوو. ئەویش چوە لای کاك سەلاح‌و بوو بە پێشمەرگە. بوون بە دوان. پۆلیسەکە خۆی چەکی پێ بوو. ڕۆژێك هەردووکیانی نارد بۆ سلێمانی بۆ سەر کەسێك، گوایە لای کاك سەلاح پێشمەرگەبووەو تەسلیم بۆتەوە چەکەکەشی بردووە. ناردبوونی پارەی چەکەکەی لێ وەربگرنەوە. ئەوەیان، کە کاك سەلاح چەکەکەی خۆی دابوویە، پێشتر لە شار لەگەڵ پۆلیسێکدا شەڕی ببوو،

پۆلیسەکە لێی دابوو. ئەمیش هەر بۆ ئەوە هاتبووە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، حەقی خۆی لەو پۆلیسە بکاتەوە. کە چووبۆوە بۆ سلێمانی بە هاوڕێکەی وتبوو:
" -من زەلامێك ئەناسم زۆر خراپە با بچینە سەری."
چووبونە سەر ماڵەکە. ئەم خۆی چووبووە ژورەوە، هاوڕێکەشی لە سەر بانەوە. پیاوەکە لە حەمام دەبێت دەی کوژێت، بەڵام ژنەکەی پەلاماری دابوو گرتبووی هەر چیەکی کردبوو بەری نەدابوو. هاوڕێکەی دووسێ فیشەکی نابوو بە ژنەکەوە، هەر بەری نەدابوو. لەو کاتەدا (قوات خاصە) گەیشتبوونە سەریان. هاوڕێکەی رایکردبوو. ئەویش گیراو لە سێدارە درا. بە راستی ئەو ژنە زۆر ئازا بوو، حەقی مێردەکەی سەندبوو. (سەلاح) بۆ خۆی بێ چەك مایەوە. ئەو کاتەش چەك زۆر کەم بوو. (ئارام) زۆر بۆڵە بۆڵی کرد بە سەریا، بەڵام بێ سود بوو. زۆری پێ نەچوو (شەماڵ) هاتبوو بۆ لای من. وتم:
" -کاك ئارام با کاك شەماڵ بکەین بە ئامرکەرت لێرە."
ئەویش پێی باش بوو. کۆبونەوەیەکمانکرد بە ئامرمەفرەزەکان، شەماڵمان بە فەرماندەی کەرت دانا. شەهید سیروان پێی خۆش نەبوو. من کاك شەماڵم پێ باشتر بوو بۆ ئیشوکاری عەسکەری. شەهید سیروان زۆر دڵسۆز بوو. لە کاری عەسکەری دا زۆر باش نەبوو. من زۆر پشت گیریم لێ دەکرد. کاتی خۆی هەر من بە زۆر کردم بە ئامرمەفرەزە. پێشمەرگە لێی رازی نەبوو. شەهید ئارامیش هەر رای نەبوو بۆ ئیشوکاری عەسکەری. ئەو دەیوت:
" -با کادر بێت باشترە."
بەڵام خۆی هەر حەزی لە کاری عەسکەری دەکرد. ئەوە بوو دوایی گۆڕانێکی زۆری بە سەردا هات بوویەو فەرماندە زۆر سەرکەوتووە. دوایی بوو بە ئامرهەرێم.

## ٤١

ساڵی ١٩٧٧ بوو. رۆژێ لەگەڵ ئارام لە ماڵی موختاری گوندی گوڕباز دانیشتبووین. لە پڕ مامۆستا نەریمان خۆیکرد بە ژووردا. زۆر بەلامەوە سەیربوو! ئەمە لە کوێوە هاتو چۆن زانی ئێمە لێرەین!؟ نامەی کاك (نەوشیروان) ی پێ بوو، وتی:
" -(مفاوەزاتە) خۆم لەوێ بووم عەلی عەسکەریو ملازم عومەر چووبوون بۆ بەغداد بۆ گفتووگۆ."
منیش وتم:

" –مامۆستا نەریمان ئەمەت لە کوێوە هێنا، مفاوەزاتی چی؟ ئێمە چین تا حکومەت مفاوەزاتمان لەگەڵ بکات.؟"

وتی:

" –بە خوا بە راستمە، لە ڕێگەی (شێخ محەمەدی لۆلان)ەوە پەیوەندییان کردووە بە (مام جەلال)ەوە بۆ گفتوگۆ."

کە وای وت تۆزێ بڕوامکرد. دوایی دەرکەوت راست بوو. لە بەغداد نەبوو لە کەرکوک بوو. نەگەیشتبوونە ئەنجام. عەلی عەسکەرییان بە هەلیکۆپتەر گەیاندبووە هەمان جێ، کە لێوەی رۆیشتبوون. ئەویش ناوچەی لۆلان بوو. ماوەی (٢٤) کاتژمێریان بۆ دانابوو، کە لەو شوێنە نەمێنێت. دوای ئەوە هەر چییەکیان بە سەر بێ خۆیان بەرپرسیار دەبن. دوایی مامۆستا نەریمان چەند نامەیەکی برادەرانی سەرکردایەتی پێ بوو، دای پێمان.

مامۆستا نەریمان بۆی باسکردین وتی:

" –ئێستا هەر کۆمەڵەو بزووتنەوە نییە. مام جەلال ڕێکخستنی خۆی هەیە بە ناوی (خەتی گشتی) یەوە."

ئێمە ئەوەمان نەبیستبوو. دیار بوو ئەوە هەبوو بۆ ئەو کەسانە بوو، کە بێ لایەن بوون. نەکۆمەڵە بوون، نە بزووتنەوە. بە ناوی (خەتی گشتی)ەوە لە ناو یەکێتیدا کۆبووبونەوە. لەو کۆبونەوەیەدا بڕیار درابوو تەشکیلات بکرێت بەم شێوەیە:

مام جەلال سکرتێری گشتی یەکێتی، عەلی عەسکەری مەسئوولی مەکتەبی عەسکەری، ئارام مەسئوولی ڕێکخستنەکانی یەکێتی، سالار عەزیزو رەسوڵ مەمەند لێپرسراوی پەیوەندییەکانی دەرەوەبن. برادەرانی سەرکردایەتیش دابەشکرابوون بۆ هەرێمەکان بەم شێوەیە:

کاک نەوشیروان مستەفا بۆ شارباژێر، ملازم عومەر بۆ قەرەداغ، دوایی وتیان ملازم عومەر نەهات (سەید کەریم) دەستنیشانکرابوو، دوایی ئەویش نەهات، بەڵام شەهید ئارام ئەو تەشکیلاتەی پێ خراپ نەبوو. لە دوای نەمانی خۆی باس لەوە دەکرا، کە گوایە ئەو دژی ئەو تەشکیلاتە بووە، یان ئەو تەشکیلاتەی پێ خۆش نەبووە. من دەڵێم ئەوە هەمووی بوختانە، شەهید ئارام زۆری پێ خۆش بوو. زۆر دڵخۆش بوو بە هاتنەوەی مام جەلال و کاک نەوشیروان. دلیم دەیوت:

" –ئیتر نەجاتمان ئەبێت لەوکێشانەی خۆمان، ئەو برادەرانە زۆر بە توانان."

بە تایبەتی زۆر ستایشی کاک نەوشیروانی بۆ من دەکرد. هاتنەوەکەی ئەوان دواکەوت کاک نەوشیروانو ملازم عومەر نامەیەکیان بۆ ئارام ناردبوو. لە دۆڵی جافایەتیەوە گەڕابوونەوە بۆ خوارەوە بۆ ناوچەی سلێمانی. مستەفا چاورەش نامەیەکی بۆ من ناردبوو. من کاک مستەفام نەدەناسی، وتم:

" –ئەم کاک مستەفا چاورەشە کێیە من نای ناسم.؟"

مامۆستا (حەمە ئەمین) شەماڵ، وتی:

" –کاک مستەفا چاورەش لە دەرەوە بووە، دیارە هاتۆتەوە. خۆی قیادەی مەرکەزی بوو. زۆر کوڕێکی باشە."

لە نامەکەی کاک نەوشیرواندا هاتبوو، دەڵێت:

" –(هەندێ چەکمان بۆ قەرەداغ هێناوە. خەڵك بنێرن با بیبەن)."

ژمارەی چەکەکان (١٥) کلاشنکۆف بوون لەگەڵ یەك (ئارپیجی). منیش هەندی پێشمەرگەم بۆ نارد بیهێنن. هەر لە نامەکەدا، کە بۆ ئارامی نووسیبوو، وتبووی:

" –(ئێمە دوای ئیشوکارەکانمان دێین سەردانی لای ئێوە دەکەین. ئەگەر هەتا ١٩٧٨/٢/١٥ نەهاتین، تۆ وەرە بۆ لای ئێمە)."

نامەکەیم هەر لە بیرە. بە ئارامم وت:

" –بۆ ناچیت بۆ لای کاك نەوشیروان.؟"

وتی:

" –جارێ، ئێستا ئەو خەریکی رێکخستنی هەرێمەکەیەتی. با ئیشەکانی تەواو بێت بە یەکەوە ئەچین، یان با ئەوان بێن. بڕیارە دوای (١٥)ی مانگ بێن. تۆش دەورو تەسلیم لەگەڵ کاك عومەر بکە، بە یەکەوە ئەڕۆین. تۆش وەزعی قاچت خراپە. لەوێشەوە ئەچین بۆ سەرکردایەتی بە یەکەوە سەردانێکی دەرەوە دەکەین. ئەتبەم بۆ ئەڵمانیا ئەو وڵاتە زۆر پسپۆڕن بۆ چارەسەرکردنی رۆماتیزمو ئەو جۆرە نەخۆشیانە. یەکەم وڵاتن لەو بوارەدا."

منیش زۆرم پێ خۆش بوو. شەوو رۆژ خەوم پێوە دەبینی، چونکە وەزعی قاچم زۆر خراپ بوو، نەمدەتوانی بڕۆم. قەت ئەورووپاشم نەدیبوو. ماوەیەکیش بوو ئەو ژیانە ناخۆشەی پێشمەرگایەتی ماندووی کردبووم. وتم زۆر خۆشە لەم وەزعەوە بۆ ئەورووپا لەگەڵ کاك ئارامیش. ئەوە خۆشترین رۆژم بوو. بە سەعات ئەمژمارد، کە ١٥ی مانگ دێو ئەڕۆین.

٤٢

لە ٣١ی ١ی ١٩٧٨ ،لە گوندی گوڕباز بووین، بەیانیەك كاك ئارام پێی وتم:

" –ئەوە بۆ سەردانێکی منداڵەکانت ناکەیت.؟"

وتم:

" –چی یان لێ بکەم؟ با هەر نەچم باشترە. با خەڵك شك نەکات لە کوێن. با زۆر هاتووچۆیان نەکەم، تا بە هۆی ماڵو منداڵەوە کەمینێکمان بۆ دانەنێن."

چونکە مانگی دوو جار بە لایەنی کەمەوە، شەو دەوری ئەو گوندەیان دەگرت بۆ ماڵی ئێمە دەگەڕان. خەڵکی گوندەکە دەیانشاردنەوە دەیانوت لێرە نین. ماڵی هەموویان ئاوابێ زۆر خەڵکێکی باش بوون. بەیانی بوو نانمان خوارد، ئارام وتی:

" –با بڕۆین سەردانێکیان بکەین. تۆ زۆر بێ رەحمی بزانین چۆنن. "

وتم:

" –با نەچین، چونکە مەترسی هەیە، نەوەك تووش ببین کەسمان لەگەڵ نییە. "

وتی:

" –جا کەسمان بۆچی یە؟ ئەی خۆمان چین. ؟"

کردی بە گاڵتە وتی:

" –من بە تەنیا بۆ یەك فەوج عەسکەر. "

وتم:

" –مادام وایە منیش بۆ (ئیحتیات).

لە سەر ئەوە شتێکی خۆی بۆ گێڕامەوە وتی:

" –ئەوە جارێك کاك عەلی عەسکەری پێی وتم:

" –کاك ئارام تۆ ئەبێت زۆر وریای خۆت بیت، ئەوە ئێرانیش دوژمنتە جگە لە عێراق[٣٦]. "

وتم:

" –کاك عەلی من حیمایەی زۆر بە هێزم هەیە. "

وتی:

" –کامە حیمایەکانتە. ؟"

وتم:

" –ئەوە نیە حیمایەی بە قوەتم هەیە؟ (کەریمی دادە مەنە) بۆ ئێرانو (فازیلی شەفیق)یش بۆ عێراق. هەر ئەو دوانەشم بەسە. "

بەیانی بە رێکەوتین بەرەو گوندی (تەنگی سەر) گوندی تەنگی سەروو گوندی گوڕپاز بە پێ سەعاتو نیوێك دەبێ. ئەو رۆژە چووین بە دووربین سەیری ناوچەکەمان کرد. دنیایەکی زۆر بێدەنگ بوو. هەلیکۆپتەر بە ئاسمانەوە نەبوو. کەشو هەواش خۆش بوو. هەر بە دەم قسەی خۆشەوە دەرۆیشتین. بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی تەنگی سەر. هەر لە قەراغ گوندەکەوە تووشی ئەو ماڵە بووین. خوڵکیان کردین هەر بە زۆر وتیان:

" –بۆ بە ئێمە رازی نابن. ؟"

---

٧- لە ١٩٧٧ دا رۆژنامەیەکی ئێرانی لە بارەی شەهید ئارامەوە نووسی بووی دەڵێت: بزوتنەوەی ئەم جارەی کورد رێکخستنێکی مارکسی تیایە، ئارام ناوێك مەسئولێتی.

من قەت نەچووبوومە ئەو ماڵە. دەمناسین ماڵێکی باش‌و زۆر رێکو پێك بوون. ئیتر ئارام وتی:

" -با بچین، چونکە پێیان خۆشە، نان‌و چایەك ئەخۆین."

چووینە ماڵیان، نانیان دەکرد. وتمان:

" -ناوەشکێنە ئەخۆین."

وتیان:

" -بە سەر چاو."

نان‌و چامان خواردو حەساینەوە. ئارام هەر لە خۆیەوە بە ماڵەکەی وت:

" -هەر ئەم ژوورەتان هەیە.؟"

وتیان:

" -نەوەڵا ژورێکی تریشمان هەیە."

وتی:

" -کاك ئاوات تۆ ئەم شەو بچۆ سەردانێکی منداڵەکانت بکە، بەیانی وەرەوە بۆ لای من."

وتم:

" -ئەوە بە راستە.؟"

وتی:

" -ئا، تۆ بچۆرەوە بۆ لایان، من لێرە ئەبم. بۆچی من بێم؟"

وتم:

بە خوا منیش ناچمەوە. تۆ منت هێناوە ئەگینا من ناچم بۆ ئەوێ."

وتی:

" -هەر ئەبێ بچیت."

وتم:

" -بە خوا تۆ نابێت بە تەنیا لێرە بیت، یان ئەبێت تۆش بێیت، یان منیش ناڕۆم."

زۆر ئینکاریم لەگەڵ کرد، بەڵام بێ سوود بوو. کردی بە گاڵتە وتی:

" -مەرکەزیەتە، من مەسئولی تۆم ئەبێت بە قسەم بکەیت."

منیش کردم بە گاڵتە وتم:

" -بۆ ئەوە من ئەنێریت بۆ سەرزەل بۆ ئەوەی بگیرێم؟ بمگرن ئەڵێم خۆ هەر من پێشمەرگە نیم، پێشمەرگەیەکی تریشم لە گەڵدایە ئەیان هێنم بۆ ئێرە."

وتی:

" -وەڵا خۆ زۆر باشە، منیش هەر وا ئەکەم."

پێم وت:

" -کاك ئارام مادەم تۆ هەر ئینکاری ئەکەیت، بە مەرجێك بە جێت دێڵم."

ئەوە ماڵەکەش هەر لەگەڵمان دانیشتوون. وتی:
" –چی یە.؟"
وتم:
" –مادەم هەر ئەمێنیتەوە، نا بێت لە ژوورەوە بچیتە دەرەوە. کەس نەت بینێت."
لە بەر ئەوەی، کە چووینە دێکە، کەس ئێمەی نەدی لەو ماڵە زیاتر. وتی:
" –باشە، تۆش وا برۆ کەس نەت بینێت، چونکە تۆش ببینن ئەزانن منیشت لەگەڵ بووم."
وتم:
" –کاکە لە من مەترسە، من کەس نا مبینێ."
بە ماڵەکەم وت:
" –ئەوە بە پشتی ئێوە بە جێی دێڵم."
وتیان:
" –خەمت نەبێت هەموو دێکە ببێت بە عەسکەر، نایەڵین هیچی لێبێت، چونکە جێگامان زۆرە بۆ خۆشاردنەوە."
کە چوومە دەرەوە، بە ناو گوندەکەدا نەرۆیشتم، بۆ ئەوەی کەس نەمبینێ. بە شاخەکەدا رۆیشتم. بەینی گوندی تەنگی سەرو گوندی سەرزەل نیو کاتژمێر دەبێ، بەڵام لە یەکەوە دیارنین. گوندی سەرزەل لە ناو شاخەکەدایە. هەر ئەوەندە گەیشتمە ناو دێ، چوومە ماڵەوە. خۆم نەکردبۆوە، لە پڕ برادەرێك ناوی (حاجی مەجید)[37] بوو زۆر پیاوێکی باش بوو، لە سەربانەکەوە بانگی (زەینەب)ی کرد وتی:
" –براژن کاك ئاوات نەهاتۆتەوە.؟"
منیش پێڵاوەکانم لە پێ دانەکەندبوو، یەکسەر خۆم چوومە دەرەوە وتم:
" –کاك حاجی فەرموو، وەڵا ئەوە هێشتا خۆم نەکردۆتەوە."
وتی:
" –زۆر سوپاس بە خوا نایەم، بەڵام تۆزێ وریای خۆت بە. لە گوندی تەنگی سەر هەندێ تەقە کرا."
وتم:
" –کەی.؟"
وتی:
" –ئێستا."
وتم:
" –زۆر بوو.؟"

[37]- هەر خەڵکی گوندەکە بوو.

وتی:
" –وەڵڵا رەنگە (١٠٠) فیشەکێ تەقی بێت."
کە وای وت، هەر بە پەلە گەڕامەوە بەرەو گوندی تەنگی سەر. حاجی مەجیدیش، کە بینیمی، وای زانی من لە بەر خۆم ڕۆیشتوم. وتی:
" –کاك ئاوات بەرەو گوندی (قەلا سوورە) بڕۆ، چونکە لە گوندی تەنگی سەر تەقەکە کراوە. بۆ بەرەو ئەوێ ئەڕۆیت.؟"
هاوارمکرد وتم:
" –کاك ئارامم لەگەڵ بوو لەوێ بەجێ ماوە، بۆیە ئەچم بۆ ئەوێ. ئەگەر هەر شتێك روویدا ئاگاتان لە منداڵەکان بێت."
وتی:
" –تۆ وریای خۆت بە، خەمی منداڵت نەبێت."
رامکرد بەرەو تەنگی سەر. هێشتا نەگەیشتبوومە گوندی تەنگی سەر، هەلیکۆپتەر پەیدابوو. من هەر رامدەکرد. لە تەنگی سەر دەنگی تەقە نەدەهات. تەقە نەمابوو. گوندەکە زۆر بێ دەنگ بوو. چوار هەلیکۆپتەر هەر دەسووڕایەوە، ڕوویان نەدەکردە سەرزەل. ڕۆژیش بوو. کە لە سەرزەل دەردەچیت بەرەو تەنگی سەر، دەربەندێکی قووڵە. هێشتا لە ناو دەربەندەکەدا بووم، هەلیکۆپتەر هاتە سەر ئەو دەربەندەی، کە منی لێبووم. بینیمیان، بەلام نەیانزانی من پێشمەرگەم. لەپڕ دایانگرتمەوە، خۆمم کرد بە ناو دوو تاشە بەرددا خۆم شاردەوە. ئیتر نەمتوانی بڕۆم، دەرفەتیان نەدام هەتا ڕۆژ تاریکی کرد. ئەوجا بەڕێ کەوتم بەرەو گوندەکە. نەمزانی چی هەیە لە گوندەکەدا. هەلیکۆپتەرەکان ڕۆیشتنەوە. دنیا تاریکی کرد. نزیکی گوندەکە بوومەوە بە تەمابووم بچم بۆ ئەو ماڵەی ئارامی لێیە. چوومە قەراغی گوندەکەو بە یەکجار لە ناو گوندەکەوە، بوو بە تەقە. وامزانی منیان دیوەو تەقەیان لە من کردووە. برادەرانی خۆمان بوون. مام ڕۆستەمو برادەرانی تر لە دوای ئێمە هاتبون بۆ گوندی گوڕباز بۆ لای ئێمە. خەڵکی دێکە پێیان وتبوون، کە ئێمە بەرەو تەنگی سەر ڕۆیشتووین. گوێشیان لە تەقە بووبوو، هەلیکۆپتەریشیان دیبوو، زانیبوویان ئێمە تووش بووین. هەموو گوندەکە دەستیانکردبوو بە گریان، وتبوویان:
" –ئەوان بەیانی چوون بەرەو تەنگی سەر. هەر ئەوانن."
کە وایان وتبوو، برادەرانیش یەکسەر هاتبوون بەرەو لای ئێمە بزانن چی بووە. تا گەیشتبوونە تەنگی سەر، ببوو بە شەو. ئەوانیش لەگەڵ مندا خۆیان کردبوو بە گوندەکەدا. دوو پێشمەرگەیان چووبوونە ماڵێ، سەیر دەکەن دیوەخانەکە پڕ بوو لە جاش، دەوری (١٠) نەفەری لێیە. خۆیان دەکەن بە ژووردا. هەر دوولایان حەپەسابوون! چ پێشمەرگەکانو چ جاشەکان. بواری هیچیان نەمابوو، چونکە ئاگایان لە خۆیان نەبوو. دوو پێشمەرگەکە کردە نەبوون. لە جیاتی ئەوەی هەر هەموویانیان

بکوشتایه، رایانکردبوو. یەکسەر بۆ دواوە پاشەو پاش خۆیان هەڵدابووە خوارەوە بۆ حەوشەکە. هەر دوو پێشمەرگەکە تفەنگەکانیان لە دەست پەڕیبوو، بێ چەك رایانکردبوو. جاشەکانیش هاتبوونە دەرەوە، لە هەموو لایەکەوە کردبوویان بە تەقە. پێشمەرگەکانیش هەندێ تەقەیان کردبوو. هیچیان نەکردبوو رۆیشتبوون. ئیتر من نەمتوانی بچمە گوندەکەوە. رۆیشتم بۆ شاخەکەی پشتی گوندی (برایم ئاوا) بە سەر تەنگی سەردا دەیڕوانی. ئەوشەوە زۆر ساد بوو. لەوێ مامەوە تا بەیانی. بەیانی جاشەکان رۆیشتبوون. چووم بۆ گوندی برایم ئاوا، کابرایەك جووتی دەکرد زۆر لێم تووڕە بوو وتی:

" -بۆ هەر ئاوا یەك یەك تەواوتان ئەکەن و ئەشبن بە خەفەت بۆ ئێمەش."

وتم:

" -چی بووە.؟"

وتی:

" -ئەو کاك بەکرەی، کە لەگەڵ خۆت بوو، دوێنێ لە تەنگی سەر جاشەکان کوشتیان."[38]

وتم:

" -بە راستە.؟"

وتی:

" -بە خوا ئەم بەیانییە لە تەنگی سەر بە خاکیان سپارد."

ئیتر خۆم پێ نەگیرا، یەکسەر دەستمکرد بە گریان. رۆیشتم بەرەو تەنگی سەر. لە رێگا پێشمەرگەیەکی خۆمانم دی ناوی (ئاشتی) بوو. دامان نابوو بە کادری ئەو دووسێ دێیە. سەیرمکرد ئەویش لە دێکەوە دەهات وتم:

" -ئاشتی راستە کاك ئارام شەهید بووە.؟"

وتی:

" -ئەرێ وەڵا راستە."

لێم پرسی وتم:

" -ئەی تۆ لەکوێ بوویت.؟"

وتی:

" -منیش هەر لە دێکە بووم. لەماڵی حاجی بووم."

هەموو خەڵکی ئێیەکانمان دەناسی. وتم:

" -تۆ دوێنێ لەوێ بوویت، ئەوانەی هاتن چی بوون.؟"

وتی:

---

[38] - بەکر شەهید ئارام بوو، لە قەرەداغ بەو ناوە ناسرابوو.

" –جاش بوون، که هاتن بۆ گوندەکە، من له ماڵەوه سەیرم دەکردن. تازه ئەم دەتوانی دەرچم. هەر لە ماڵەکە مامەوە. لە خواری گوندەکەوە تێپەڕین نەهاتنه ناو دێ. تۆزێکی پێ چوو تەقە دەستی پێکرد. بە خاوەن ماڵەکەم وت:
" –خۆ تۆ وتت ڕۆیشتن."
وتی:
" –بە خوا هەر لە خوار ماڵەکانەوە بوون، نەهاتنە ناو دێکەوە ولمدەزانی ڕۆیشتوون."
ئیتر من هەر لە ماڵەکەدا مامەوە. بەڵام نەمزانیوە کاک ئارام لە دێکەدا بووە. نازانم کەی هاتوون بۆ ئێرە. کەس نەیزانیوە، کە هاتوون. منیش لە کاتی تەقەکاندا لە گوندەکە رامکرد."
ئەویش هەر لەو جێگایەوە رایکردبوو، کە من چووبووم. نزیکی ماڵەکان بوو چەمێکی قووڵ بوو هەر لە بەردەمی ماڵەکاندا بوو. بە یەکەوە چووین بۆ ماڵەکە، کە سەیرمکرد هەموو دەگریان پێم وتن:
" –بۆ کاک ئارامتان وا لێکرد.!؟"
دەستیانکرد بە گریان وتیان:
" –بە خوا کاک ئاوات، هەڵەی خۆی بوو."
پێم وتن:
" –چۆن بوو خۆ ئێوە بە منتان وت لە تۆ باشتر ئاگامان لێی ئەبێت. ئەی بۆ واتان لێکرد.؟"
بووکی ماڵەکە وتی:
" –کاک ئاوات هەر تۆ لە ماڵەوە ڕۆیشتی، من چووم بۆ کانی بۆ ئاو. سەیرمانکرد کۆمەڵێ چەکداری زۆر لە لای گوندی (گەڕەزیل)ەوە بەرەو گوندی تەنگی سەر هاتن. منیش بە پەلە پەل هاتمەوە بۆ ماڵەوە. بە کاک ئارامم وت:
" –کاک ئارام کۆمەڵێکی زۆر چەکدار هاتن لەو لاوە، پێشمەرگەی خۆتانە.؟"
وتی:
" –لە کوێوەیە.؟"
لە سەر بانەکەی خۆمانەوە بە دووربین سەیریکردن وتی:
" –نە وەڵا، جا ئێمە کەی ئەوەندەمان پێشمەرگە هەیە. ئەوە هەمووی جاشە."
ئێمەش پێمان وت:
" –کاک ئارام ئەگەر جاشیش بن قەت ئەوان وەك عەسکەر تەفتیش ناکەن. بچۆرە ژورەوە دانیشە."
بە قسەی نەکردین هەر ئەچووە ژورەوەو ئەهاتەدەرەوە. پێم وت:
" –کاک ئارام ئێستا راکە هەتا نەهاتوونەتە ناو دێ، یان لە ژوورەوە خۆت بشارەوە. کاک ئارام سەری لێشێوابوو. خۆشی نەیئەزانی چی ئەکا، کە جاشەکان گەیشتنە

گوندەکە، ئارام بەرەو دەرەوە رۆشت. دوای ماوەیەك تەقە دەستی پێ کرد. ئیتر ئێمە هەر نەمانزانی کاك ئارام بەرەو کوێ رایکردبوو. کاتێکمان زانی جاشەکان خەڵکی دێکەیان کۆکردەوە وتیان ئەوە پێشمەرگەیەکمان کوشتووە بچن بیهێننەوە بینێژن."
خەڵك هەر نەشیانزانیبوو کاك ئارامە هەتا دوایی. جاشەکانیش هەر نەیانناسی بوو. ئیتر شەو لە مزگەوتەکەدا دلیان نابوو. تازە چی لەو ماڵە بکەین، خۆ ئەوان بڵێن چی؟ تازە رۆیشت لێمان. هەر چی بڵێین بە هیچ ناچێت. چووین بۆ سەر گۆڕەکەی لە سەرقەبرانی بەرامبەر گوندەکە تێر گریاین. دوایی چووم لە خەڵکی گوندەکەم پرسی. ئەوانەی ئاگایان لە رووداوەکەوە بوو، وتیان:
" -کە جاشەکان هاتن، نەهاتنە دێکەوە، لە خوار ماڵەکانەوە بوون."
دێکە شوێنێکی لێبوو، دایم گەنجەکان لەوێ دەوەستان. بەرزییەك بوو. وتیان:
" -جاشەکان داوای ئاویانکرد. ئێمەش ئاومان بۆ بردن. لێیان پرسین وتیان: " -ئەم ناوە پێشمەرگەی لێیە.؟"
وتمان:
" -زۆر دەمێکە نەهاتوون."
جا راستیش بوو. زۆر دەمێك بوو پێشمەرگە نەچووبوون بۆ ئەوێ. وتیان:
" -جاشەکان زۆریان پەلە بوو برۆن. هەر سەیری ئەم لاو ئەو لایان ئەکرد. زۆر ئەترسان. لە پڕ یەکێکیان وتی:
" -ئەو زەلامە بۆ را ئەکات؟ خۆ ئێوە ئەڵێن کەسی لێنیە. ئەی ئەوە بۆ رایکرد.؟"
وتمان:
" -بە خوا رەنگە ئەوە خەڵکی دێکە بێت فیرارە."
وتیان:
" -جا بۆ را ئەکات، خۆ ئێمە فیرار ناگرین. خوای ئەکرد هەموو دێکە عەسکەری فیرار ئەبوو."
لەو کاتەدا، کاك ئارام چەکەکەی بە شانەوە بوو، دایگرتبوو بۆ شانەکەی تری. تیشکی خۆرەکە لێی دابوو شەوقی دابۆوە. جاشەکان وتیان:
" -خۆ ئەوە چەك بوو پێی."
زۆر دووریش کەوتبۆوە، بەڵام لە بری ئەوەی بەرەو شاخەکە رابکات بەرەو (قازان قایە) رایکردبوو. یەکێ لە جاشەکان رایکرد بە دوایدا، وتی:
" -ئێستا ئەزانم بەرەو کوێ رائەکات، ئەچم پێشی لێ ئەگرم."
رایکرد، زۆری پێ نەچوو هەندێ تەقە کراو هاتەوە چەکەکەی پێبوو وتی:
" -کوشتم. وا لەو چەمەدا بچن بیهێننەوە."
ئێمە هەر وامانزانی خەڵکی دێکەی خۆمانە، چونکە کەس نەیزانیبوو. ئێوارە بوو جاشەکان نەیانوێرا برۆن، جیهازیان کرد، هەلیکۆپتەر فریایان بکەون. وایانزانیبوو

ئێستا پێشمەرگە دێن، کە چووینە سەر تەرمەکەی ئەوجا ناسیمانەوە کاك ئارامە. بەڵام سەیربوو بە لامانەوە! کاك ئارام چی کردووە لێرە؟ بۆ هەر بە تەنیایە!؟ جاشەکان وتیان:

" -ئێوە نایناسن.؟"

وتمان:

" -قەت ئەمەمان نەدیوە لێرە. زۆریان ئەناسین، بەڵام ئەمەمان نەدیوە."

بە راستی ئەو رۆژە رەشترینو تاڵترین رۆژ بوو. زۆر بە داخەوە کاك ئارام شەهید بوو. شەهیدبوونی ئەو سکرتێرە، گەورەترین کەلێنی خستە کۆمەڵەوە. هەزان سڵاو لە گیانی پاکی. هەر لە یادمە. هەتا مردن لە یادم ناچێتەوە، چونکە خۆشەویسترین هاوڕێم بوو. هەر بە خۆڕایی خۆی والێکرد. خۆی وای نەکردایە قەت شەهید نەدەبوو، چونکە چەندین کات بە یەکەوە بووین، رژێمیش سەدان جار کێومالّو هجومی بۆ کردووە هەر لەو ناوچەیەش بووین. دوایی (مەلا بەختیار)یش هات. چوو بۆ ئەو ماڵەی، کە شەهید ئارامی لێبوو پێش شەهید بوونی. رووداوەکە چۆن بوو، بۆ ئەویشیان گێڕابۆوە. ناردم پێشمەرگەکانم کۆکردەوە دووسێ جار کۆبوونەوەمان سازدا بۆ رێزلێنان لە گیانی پاکی شەهید ئارامو هەموو شەهیدانی رێگای رزگاری کوردستان. پەیمانماندا بە شەهید ئارامو هەموو شەهیدەکانی رێگای رزگاری کوردستان، کە تا مردن بە وەفابین بۆ رێبازە پیرۆزەکەیان.

٤٣

لە دوای شەهیدبوونی ئارام ماوەیەك لەگەڵ هاوڕێیان جەولەمان بە یەکەوە کرد. دوای ئەو ماوەیە بە هاوڕێیانم وت:

" -من ئەچم بەڵکو ئەو ماڵو منداڵەم بۆ لایەك بنێرم."

ژیانی ئەو سەردەمە زۆر دژواربوو. هەمووی هەر خۆ حەشاردان بوو لە گوندەکاندا. گومانمان لە هەموو شتێك دەکرد، رۆژێ دەسگیر بکرێین. پارەشمان نەبوو. ئەو کاتە وەزعمان زۆر خراپ بوو. بڕوا ناکەم بە هەموومان خاوەنی (١٠٠) دینار بووبین. ئێمە قەت پارەمان بۆ هیچ شتێ وەرنەگرتووە. داوای یارمەتیشمان نەدەکرد. ئەو کاتە

حکومەت هەموو کەسوکاری پێشمەرگەکانی ئازاد کردبوو. دلێشو باوکی منیشی ئازاد کردبوو. رژێم زانیبووی گرتنی ئەوانە بێ هودەیە. منیش وەڵامم ناردەوە بۆ برادەرانی شار، وتم:

" –من بە تەمام منداڵەکانم بنێرمەوە بۆ سلێمانی. ئاگاتان لێیان بێت."

وتیان:

" –با بێنەوە."

هیچ نەبێ ئەوان یارمەتیان ئەدان. منداڵەکانیش گەورە ببوون. دەبوایە بچنە قوتابخانە. بە هاورێیەکی[39] خۆماندا ئەوانم ناردەوە. چوونە ژوورێکی ماڵی باوکی زەینەب. باش بوو کرێی خانوویان نەدەدا. هاورێیانیش یارمەتیان دەدان. منیش ئازاد بووم. ئیتر خەمی ماڵو منداڵم نەما. پێشمەرگەکان هەموو چووبوون بۆ گەرمیان. هەر منو ئاشتی مابووین، ئەویش لەگەڵ خۆم بوو. بۆ ئەوەی بە یەکەوە بچین بۆ لای هاورێیان. رۆژێ بەرێکەوتین بەرەو (قەرەداغ) بۆ نانی نیوەرۆ چووینە گوندی (گەرەزیل) لە ماڵی (شێخ مارف) لاماندا. ماڵێکی باش بوون. دوای نان خواردن بەرەو گوندی (تیمار) رۆیشتین. چووینە گوندی تیمار چایەکمان خواردەوەو رۆیشتین بەرەو گوندی (قارەمان). زوو بوو گەیشتینە قارەمان، کە چووینە ئەوێ زۆریان پێ ناخۆش بوو، کە بە رۆژ چووینەتە ئەوێ. زۆر قسەیانکرد وتیان:

" –بۆ بەم رۆژی نیوەرۆیە هاتوون.؟"

منیش چووم بە گژیاندا وتم:

" –یا خوا زیرەکەن."

وتیان:

" –خۆ ئێمە خەمی خۆمان نیە، خەمی ئێوەمانە."

وتم:

" –خەمی ئێمەتان نەبێت، نان ئەخۆینو ئەرۆین."

ئێوارە نانمان خوارد وتم:

" –ئاشتی با برۆین."

وتی:

" –دە تو خوا کاک ئاوات با ئەم شەو لێرە بین، زۆر هیلاکم."

وتم:

" –چار نیە هەر ئەبێت برۆین، چونکە ئەمرۆ هەر لە گەرەزیلەوە خەڵک ئێمەیان دیوە هەتا گەیشتوینەتە ئێرە. زۆر خەتەرە هەر ئەبێت برۆین. ئەزانن هەر دووکمانین. ئێرەش زۆر لە جادەوە نزیکە."

---

[39] - مەلا عومەر بوو، خەڵکی گوندی هەرگێنە بوو.

–له قەرەداغەوە بە سەیارە (١٠) خولەکێك بوو–. ئاشتی دەستی کرد بە پاڕانەوە وتی:

" –بە خوا هیچ نابێت، تازە ئەم شەو با لێرە بین."

خۆ ئەگەر بە دزییەوە بچووینایە هیچ نەدەبوو، چونکە جێگای زۆر باشیان هەبوو. جاری وابوو (١٠) نەفەر بووین بە (١٢) ڕۆژ لەوێ دەماینەوە، کەس نەیبینیوین. حوکمەتیش بچووایە نەیدەدۆزینەوە. زۆریان پێ وتین:

" –بڕۆن لێرە مەبن مەترسی هەیە."

من وتم:

" –با تازە ئەم شەو لێرە بین ئینشائەڵلا هیچ نا بێت."

شەو لەوێ ماینەوە. دانیشتین هەتا درەنگ. زۆر درەنگ نوستین. ئاشتی زوو نوست. نوستبووین، کاتێ رایان وەشاندمو خەبەریان کردمەوە بە گریان وتیان:

" –گیران چی ئەکەن؟ چەندمان پێ وتن بڕۆن، قوڕتان بە سەر خۆتانو ئێمەشدا کرد.؟"

وتم:

" –چی بووە.؟"

هەر هەستامو سەیرمکرد لە حەوشەکەدا ئاشتی بە دەست دوو جاشەوە بوو، هاوار یانکرد وتیان:

" –ئاواتمان گرتووە."

سەربانەکەش هەمووی جاش بوو. ئەو ژوورەی، کە لێی نوستبووین، لە پاڵ ژووری ئاژەڵەکانیانەوە بوو. دەرگایەکی تیابوو بۆ سەر گەوڕی ئاژەڵەکان، بەڵام ئاشتی لە پێش منەوە هەڵسابوو. نانو چای خواردبوو ریشی تاشی بوو، لە دیوەخانەکەدا دانیشتبوو، کە جاشەکان هاتبوونە ژوورەوە یەکسەر گرتبوویان وایان زانیبوو منم. ئەوێ ماڵی خوشکم بوو. ئەو ماڵانەی، کە من دەچووم هەموویان گرتبوو. دیار بوو ئیخباری کرابووین. دەوری ئەو ماڵانەیان گرتبوو، کە خزم بوون. لێپرسراوی جاشەکان ناوی (ئەحمەد عەزیز کاکی)[40] بوو. کە (ئاشتی)یان بردبوو بۆ لای، لەوێ جاشێکی لەگەڵ دەبێ خەڵکی سلێمانی بوو وتبووی:

" –کەی ئەمە ئاوتە؟ ئەمە (بەکرە) من ئەیناسم خەڵکی گەڕەکی خۆمانە."

بەکر ناوی ئەسڵی خۆی بوو. ناوە نهێنیەکەی ئاشتی بوو. لێیان پرسیبوو:

" –ئەی کوا ئاوات؟ ئێوە بە یەکەوە بوون ئێوارە.؟"

ئەویش وتبووی:

---

40- کاتی خۆی پۆلیس بوو، پاش ئەوە لە حەفتاکاندا بوو بوو بە پێشمەرگەو بوو بوو بە سەرلق، دوای ئەوە بوو بوو بە جاشو ئامری مەفرەزەی خاسە. لە دواییدا هەر بە دەستی پێشمەرگە کوژرا.

" –ئاوات ئەمشەو رۆشتووە نازانم بۆ کوێ چووە."
کە (ئاشتی)یان برد هەموو جاشەکان رایانکرد بە دوایدا بۆ لای ئەوانی تر. لە پشتی خانووەکەوە کونێکی تیابوو بۆ دەرەوە. ماڵەکەش لە سەرپەڕی گوندەکەوە بوو. پشتی ماڵەکە هەموو دارو دەوەن بوو شیوێکی قووڵ لە پاڵیدا بوو، کە دەچوویتە ناوی، زۆر لە نێکە دوور دەکەوتیتەوە، تەنانەت کەس نەیدەبینی. لەو کاتەدا من لەوێوە دەرچووم. لەوە دەترسام ئاشتی ئیعتراف بکا، ئەگینا بچوومایەتە شوێنە نهێنیەکەی خۆمان کەس نەیدەدۆزیمەوە. مەگەر گوندەکەشیان بسووتانایە. بەلام ئاشتی ئەو شوێنەی دەزانی، چونکە زۆر جار لەوێدا خۆی حەشاردابوو. لە سەرەتاوە دەوری (٢٠) رۆژ ملازم جوامێرو شەماڵو هاوڕێیانی تر لەوێدا بوون. هەر پێش هاتنە دەرەوەم ئەو شوێنەمان لەوێ دروستکردبوو. ماڵی ئامۆزاو خوشکێکم هەر لەوێ بوون. ئەوان هەر لە ساڵی ١٩٧٣دا کۆمەڵە بوون. کاتی خۆی کاک (ئاوات عەبدولغەفور)یش دەیناسین. لە دوای ئاش بەتاڵ. مامۆستا (محەمەد ئەمین) خۆی مەسئوولیان بوو. ئەو لە قەرەداغ مامۆستا بوو. دوو جاریش (مەلا بەختیار) چووبوو بۆ ماڵیان، شوێنی خۆشاردنەوەکەی دیبوو. کە (ئاشتی)یان برد، من دەرچووبووم. ئاشتی زۆر مەرد بوو. لە سەر کەس قسەی نەکرد. کەسی بە گرت نەدابوو. خۆ ئەگەر لەو کاتەی، کە گرتیان پێی بوتنایە من ئاوات نیم، هەر لە ماڵەکەدا دەیانگرتم، چونکە ئەوان بۆ من هاتبوون. ئەوەی ئیخبارییەکەی کردبوو بۆ من بوو، چونکە ئاشتی هەمیشە لەو دوو سێ دێیە بوو. کردبووم بە کادری ئەو ناوە. هەر خۆشی بە تەنیا لەو ناوەبوو. بە راستی هەڵەی خۆی بوو، ئەگینا هەر ئەو شەوە دەڕۆیشتین. ئەوانیش زۆر لێمان پاڕانەوە. پێی دەوتن:
" –ئەوە کەی ئێوە ئەوەندە ترسنۆکن. دەوازمان لێبێنن با بخەوین."
جا راستی دەکرد. رێگەکە زۆر دووربوو زۆر هیلاك بووین. ئەوەی من لێی ترسام تووشمان بوو. زۆر بە داخەوە ئەو کوڕە باشە گیراو لە سێدارە درا. زۆر کوڕێکی گەنجو جوان بوو. لەگەڵ یوسف بە یەکەوە هاتنە دەرەوە هەردووکیان قوتابی زانکۆ بوون، بەلام یوسف وەکو پێشتر باسم کرد هەر زوو تەسلیم بووەوە.
لەپاش ئەو کارەساتە ئیتر بە تەنیا مامەوە. گەڕامەوە بەرەو ناوچەی (بازیان)، شەو چوومە گوندی (گوپیان) لە کاتی رلکردندا لە بەرزییەکەوە خۆم هەڵدابووە خوارەوە قاچم لە جێ چووبوو. نەمدەتوانی یەك هەنگاو برۆم. شەو بوو چوومە ماڵی (حاجی رەفیق) لەوێ قاچیان بۆ داشۆردم. ئەوەندە ئازارم هەبوو، لە تاودا ئارامم نەبوو. وتیان:
" –دوێنێ شەو مەلا بەختیار لە ماڵی ئێمە بوو."
وتم:
" –بە راست.؟"
وتیان:

" –بە خوا. "

وتم:

" –جا ئەو بوو. ؟"

وتیان:

" –بەڵێ ئەو بوو، هەواڵی تۆی پرسیوە وتی بۆ لای ئەوان هاتووم. "

زۆرم پێ خۆش بوو. بەیانی نامەیەکم بۆ نووسی، بە برادەرێکی خەڵکی دێکەدا بۆم نارد. خۆم نەمدەتوانی بە پێ برۆم، چونکە قاچم زۆر ئازاری دابووم. کاتێکم زانی پێشمەرگەیەکی بە دوامدا نارد بە وڵاخێکەوە. لە گوندی (مێوڵی) بوو، هەر نیو سەعات دوور بوو، کە چووم بۆ لایان مەلا بەختیار زۆری پێ خۆش بوو، کە منی بینی. سەیرمکرد شەماڵ[٤١] و کاک ئازاد حەمە غەریب[٤٢] و هەندێ لە هاوڕێیانی خۆشمانی لەگەڵ بوو. ئەوان چووبوون بۆ لای کاک نەوشیروان، مەلا بەختیار لە رێگا تووشیان بووبوو، لەگەڵ خۆی گێڕابوونیەوە. خۆیشی سامان گەرمیانیو عادل شکورو دلێری سەید مەجیدو عەلی ئامەخانو فەهمی لەگەڵ بوو. نزیکەی(١٥) پێشمەرگە دەبووین. چوار پێنج رۆژ لەو ناوە جەولەمانکرد هەتا قاچم باش بوو. باسی چۆنیەتیی شەهیدبوونی کاک ئارامم بۆ کرد. هەروەها باسی خۆمو (ئاشتی)[٤٣]م بۆ کرد، چیمان بە سەر هاتو چۆن ئەو کارەساتە روویداو چۆن بە رێکەوت دەرچووم. باسی خۆمانو ناوچەکەم بۆ کرد. زۆر وەزعمان باش بوو لە هەموو روویەکەوە، بەڵام، شەهید بوونی کاک ئارامو دەسگیرکردنی ئاشتی، کارەساتێکی بێ سنور ناخۆش بوو.

## ٤٤

هاوڕێیان هەموو چووبوون بۆ گەرمیان بۆ جەولە. من نەمزانیبوو، کە (ئازادی سەگرمە)یان لابردبوو لە ئامر مەفرەزەیی. مام رۆستەم فەرماندەی مەفرەزەبوو. نازانم بۆچی تێکچوبوون. (شێخ محەمەدی باخ)، کە ناسرابوو بە شەماڵ، ئامرکەرت بوو. من لەوێ نەبووم. لە گەرمیان ئاڵوگۆڕیان کردبوو. ئازادیان لابردبوو، مام رۆستەمیان کردبوو بە ئامر مەفرەزە. رۆیشتین بەرەو دەربەندیخان. ئێوارە چوینە گوندی قارەمان نانمان خواردو شەو لە جادەی قەرەداغ پەڕینەوە. شەو درەنگ گەیشتینە گوندی (میریاسیی خوارو) –میریاسیی دوو دێیە میریاسیی سەرو، میریاسیی خوارو، میریاسیی سەرو لە ناو شاخدایە بە پشتی شاخی (سولیاوا)وە، بەڵام (میریاسی)ی خوارو لە

---

[41]- رابەر سیاسی بوو، ناوی خۆی مامۆستا حەمە ئەمینی شێخ عەلی بوو.

[42]- ئازادی سەگرمە.

[43]- لە زیندانی بەعس لە موسڵ ئیعدام کرا.

دۆڵێکدایە، لە بن شاخەکەدا وەك لە ناو مەنجەڵێکدا بێ وایە. بەردەمی گوندەکە تەختە. شەو چووینە ئەوێ، وتیان:

" –با لادەین."

وتم:

" –باشە چایەك ئەخۆینو دوایی ئەبێ بڕۆین."

مەلا بەختیار وتی:

" –خۆت ئەزانیت زۆر هیلاك بووین، با ئیسراحەت بکەین."

چونکە نزیکەی شەش سەعات دەبوو بەڕێوەبووین. مانگی دووی ساڵی ١٩٧٨ بوو. دنیا زۆر سارد بوو. منو مەلا بەختیارو عەلی ئامە خانو دلێری سەید مەجید چووینە ماڵێ. من هەموو ماڵەکانم دەناسی (شەماڵ)یش هەر دەیناسین. هەموو دۆستی خۆمان بوون. شەماڵو ئازادو فەهمی چوونە ماڵێ. هەموو لە ماڵەکان دابەشبووین. پێم وتن:

" –کەی نانو چاتان خوارد، وەرنەوە بۆ لای ئێمە."

ماڵەکان کەم بوون. هەر (١٠) ماڵێك دەبوون. وتیان:

" –باشە."

دوایی هەموو کۆبونەوە وتیان:

" –تازە بۆ ئەمشەو لێرە نەبین، زۆرهیلاك بووین."

وتم:

" –نا بێت لێرە بین. ئێرە زۆر مەترسی لە سەرە. دەورمان بگیرێت، یەك کەسمان دەر ناچین. لە جادەی قەرەداغیشەوە زۆر نزیکین."

عەلی ئامەخانو هەندێ برادەری تر دەستیانکرد بە بۆڵە بۆڵ وتیان:

" –کاك ئاوات وا مردین، لە بەیانی زووەوە ئێمە هەر بە ڕێوەین."

وتم:

" –بۆ کاك عەلی، هەر تۆ بە ڕێوە بوویت؟ خۆ من سەیارەم پێ نەبووە. ئێرە مەترسی هەیە ئەگینا من لە تۆ زیاتر حەز ئەکەم بمێنینەوە."

کاك شەماڵیش وتی:

" –دە کاك ئاوات تازە با لێرە بین. بڕوا ناکەم هیچ رووبدات."

وتم:

" –کاك شەماڵ حەقە ئێمە ئیتر ئەوەندە خۆمان نەدەینە دەست قەزاو قەدەر دوایش، کە تووش بووین ئەوجا چی بڵێین. با بڕۆین."

ئەوان هەموو زۆر ماندو بوون. من هەر خۆم ئەو بۆچونەم هەبوو. مەلا بەختیاریش وتی:

" –دە کاك ئاوات تازە با لێرە بین."

وتم:

" –باشە، ئەبێ زوو بڕۆین، نانو چای بەیانی لێرە ناخۆین."

وتیان:
" -باشه زوو ئەڕۆین."
وتم:
" -ئەبێت دوو کەس دوو کەس حەرەس بین، تا دەمەو بەیان. ئەبێت کەمینی بە هێزمان هەبێ."
وتیان:
" -باشه."
بەیانی زووەکەشی پەشیمانبوونەوە بۆ نان‌و چا خواردن مانەوە. دوو دوو حەرەسیاتمان دەرکرد، خۆم‌و مەلا بەختیارم بۆ حەرەسیاتی بەیانی دانا، چونکە بەیانیان خەتەرتر بوو. شەو دەوری دێیان دەگرت هەتا بەیانی نەدەهاتنە ناو دێ. وتم ئەگەر شتێك روویدا، بەیانی زوو دەبێت. باخۆم بەیانییەکەی حەرەس بم. ئێمە بەیانی زوو شەماڵ‌و ئازادو فەهمیمان گۆڕی وتمان:
" -بڕۆن نان‌و چا بخۆن. من‌و مەلا بەختیار حەرەس بووین لە پشت دێکەوە. شاخەکە بە پشتمانەوە زۆر بەرز بوو. زۆربەی برادەران، نانی بەیانیان خواردبوو هاتبوونە دەرەوە. بانگی ئێمەیان کرد وتیان:
" -وەرنە خوارەوە ئەوە ئێمە لە دەرەوەین، ئێوەش بچن نان بخۆن."
هەر من‌و مەلا بەختیار مابووین نانی بەیانی بخۆین. ئێمەش هاتینە خوارەوە چووینەوە بۆ ئەو ماڵەی، کە پێشتر لێی بووین. عەلی ئامە خان‌و کاك دلێری سەیدمەجیدو یەك دوو برادەری ترمان لەگەڵ بوو. کە رۆشتینەوە، ئەوان نان‌و چایان خواردبوو. هەر من‌و مەلا بەختیار مابووین لە ژوورەوە. ئەوەندەم زانی ژنی خاوەن ماڵەکە خۆیکرد بە ژووردا وتی:
" -کاك ئاوات پێشمەرگەی ترتان لەگەڵە.؟"
وتم:
" -بەڵێ، وان لە ناو ئاوایی."
وتی:
" -ئەوانە ناڵێم، کە لەگەڵ خۆتن."
وتم:
" -ئەی.؟"
وتی:
" -لە میریاسیی سەرووەوە هێزێکی زۆر هات."
وتم:
" -نەوەڵا، هەر خۆمانین."

ئیتر زانیم دووژمنە. مەلا بەختیار یەکسەر دەرپەڕییە دەرەوە. من لە ژوورەوە مابووم. وامزانی هێشتا دوورن. هەر لەژوورەوە پێڵاوەکانم پوت بوون لە سلێمانیەوە بۆیان ناردبووم قەیتانی هەبوو. هەر لە ژوورەوە قەیتانەکانم توندکرد بۆ راکردن. هاتمە دەرەوە سەیری شاخەکەمکرد لە هەموو لایەکەوە شۆڕ بوونەوە بۆ ناو دێ، کە سەیرمکرد زۆر نزیك بونەتەوە لە ناو دێ. ئەوان زاڵ بوون بە سەرماندا. بەردەمی ماڵەکانیش زۆر تەخت بوو. تۆزێك لە ماڵەکان دووردەکەویتەوە، ئیتر پێچێکی تیابوو بەرەو گوندی (نەوتی) خوار گوندەکەش شیو بوو هەتا سەر چەمی دێوانە. بەرامبەر شاخی (دەلوجە)و (قەڵای قایمەن) زۆر دوور بوو لە وێوە. هاتمە دەرەوە، تفەنگەکەم گرت بە دەستمەوە. ملم شۆڕکرد وەك هەر ئاگام لە هیچ نەبێ. ویستم ئەوان هەست نەکەن، کە من پێشمەرگەم، هەتا ئەگەمە نزیکی پێچەکە. سەیرمکرد (عادل شوکور)یش بە جێ ماوە. لە پێش منەوە بوو. ئەو نزیکی لۆفەکە بوو بووەوە. جەیشەکە پێیان زانین. لە هەموو لایەکەوە دایانگرتینەوە. لە بەینی منو (عادل)دا هەر ئاگرم دەبینی لە زەوی دەدات. من هەر بەردەمی خۆم دەبینی، نەم دەزانی لە دوای خۆمەوە چی روویداوە؟ لەو کاتەدا گەیشتمە ئەو بڕوایەی، کە مرۆڤ ئەجەلی نەیەت نامرێت. ئەگینا ئەو رۆژە منو عادل شوکور بە لای کەمەوە دەبووایە هەر یەکەی (١٠٠) گوللە زیاترمان بەرکەوتایە. کەچی یەك گوللەمان بەر نەکەوت. برادەران هەموو بەرەو چەمی دێوانە رایانکرد. منیش هەر بە دوای ئەواندا رامکرد. زۆر لە دواوە بووم. قاچم تەواو نەبوو. گەیشتمە ناو ئاوەکەی دێوانەو هەلیکۆپتەر هات. وتم:

" -رابکەن بگەنە شاخەکە، ئەگینا ئێستا لەم چەمەدا ئەمانبینێت."

هەموو رامانکرد بۆ بناری شاخەکە، لە خوار گوندی (دەلوجە) لە بەینی گوندی دەلوجەو ئەستێڵی خوارو. -ئەستێڵ هەر لە قەراغی چەمی دێوانە دایە-. هەتا گەیشتینە بنارەکە بە راکردن، لە سەر شاخەکەی پشتی دەلوجەش عەسکەری دابەزان. ماوەی بەینی میریاسیی خوارو بۆ سەر چەمی دێوانە سەعاتێك دەبێت بەپێ. شاخەکەش گیرا. وتیان:

" -چی بکەین.؟"

وتم:

" -کاکەگیان هەر دوو دوو لەم ناو بەردو دارانەدا خۆمان ئەشارینەوە. عەسکەر دانابەزن. ئیتر بۆ کوێ بچین؟ من ئەزانم هەر بۆ ناو گوندەکان دائەبەزن. ئەگەر بە رێکەوتیش دابەزین بە سەرماندا، ئەوە شەڕ ئەکەین هەتا هەموومان ئەکوژرێین، یان دەرئەچین. من لەو بڕوایەدام نایەنە خوارەوە. با ئەوەندە هاتوچۆ نەکەین، چونکە ئەو عەسکەرانە ئەمانبینن."

وتیان:

" -بە خوا دێنە خوارەوە هەر بە دەست ئەمان گرن."

وتم:

" -بابە خۆ چۆلەکە نین بمانگرن. چی بکەین هەر ئەوەمان پێ ئەکرێت لەوە زیاتر بۆ کوێ بچین؟ ئەوەتا هەموو ناوچەکە گیراوە. خۆتان ئەزانن ئێمە لەو بەرەوە راویان ناوین بۆ ئێرە، ئێرەش هەمووی گیراوە."

ئەوان هەر دەیانوت با لێرە نەبین بمانبە بۆ شوێنێکی تر. بە تایبەتی عەلی ئامە خان.

وتم:

" -عەلی شەو ئەموت با لێرە نەبین، بەلام ئێوە ولتان ئەزانی هیچ لە ئارادا نیە. من ئەم فلیمەم لە بەر چاو بوو. ئەی ئێستا بۆ سەری دنیاتان لێ هاتۆتەوە یەك. لەمە زیاتر هیچ شوێنێك نییە هەر ئێرە هەیە. چار چییە؟ شەڕ ئەکەین تا ئەمرین..؟"

هەر ئەوەندەم وت:

" -عەلی ئامە خان بەرەو چەمی دێوانە رایکرد. هەموو بە دوای ئەودا رایانکرد. هەر منو مەلا بەختیار ماینەوە وتی:

" -ئێمەش چی بکەین؟ با ئێمەش لێرە بڕۆین."

وتم:

" -باشە، بەلام بە خوا ئێرە لە هەموو شوێنێك باشترە."

بەس کاك دلێری سەید مەجیدو کاك شەماڵو کاك ئازادو فەهمی مان لەگەڵ نییە. پێم وتن:

" -ئەی ئەوان کوژراون.؟"

وتیان:

" -نازانین هەر کەس بۆ خۆی رایکردووە."

خۆشم ئەوانم لە سەر ئاوەکە گرتبۆوە. ئیتر هەلیکۆپتەر بە سەرماندا بە نزمی دەهات. نازانم چۆن ئەو پێشمەرگانەی ئەدی رایاندەکرد. ئێمەش هاتینە خوارەوە بۆ ناو دێوانە بۆ چەمەکە. بۆ بەردەمی ماڵەکانی ئەستێڵی خوارو. بەردەمی دێکە زۆر بێشەلان بوو. لە بەر ئەوەی زستان بوو دارو دەوەن روت بوو. بەس ئەو شوێنە توترك و قامیشەلان بوو وتم:

" -ئێرە زۆر باشە، خۆمان ئەشارینەوە هەتا ئێوارە. لەوانەیە ئێوارە جەیشەکە بڕواتەوە. ئەو کاتە ئەچینەوە بۆ ناو دێکە."

مەلا بەختیار وتی:

" -بە خوا بێن ئەمانگرن."

وتم:

" -کاك بەختیار دوو کلاشنکۆفمان پێیە، هەر زانیمان دێنە سەرمان شەڕ ئەکەین هەتا ئەکوژرێین، بەلام نایەن زۆر جێگایەکی باشە."

سەیرمکرد فاخر لە بەردەمماندا خۆی شاردبۆوە. وتم:

" –زۆر باشە نەجولێیتەوە، ئەوە ئێمەش لەولا تۆوە ئەچینە ئەو توترکەوە."
سەیرمکرد (سامانی گەرمیانی)ش وا لەو لامانەوە. زۆر باشە، بووین بە چوار کەس بە (سامان)یشم وت:
" –مەجولێ، هەر لێرە دانیشە."
لە بەردەمی ماڵەکانو هەلیکۆپتەریش هەر بە سەرماندا دێو هێز لە ناوچەکەدا دادەبەزێنێ. هەموو گوندەکانو شاخەکانی گرتبوو. بوو بە نیوەڕۆ، تۆزە تۆزە دنیا بوو بە تەمو خومار. تۆزێ ئومێدمان پەیداکرد. زۆری پێ نەچوو، سەیرمکرد برادەرێك لە دێکەوە بەرەو لای ئێمە هات، کە سەیرمکرد برادەرێکی خۆمان بوو ناوی (محەمەد) بوو. بە هێواشی بانگمکرد، هات بۆ لام وتی:
" –ماڵتان بە قوڕ گیرێت ئەمە تۆیت."
وتم:
" –ئەروەڵا."
وتی:
" –زۆر باشە لە جێگەکەتان مەجولێن، چونکە ناو دێو پشتی دێکە هەموو عەسکەرە. بەس وەك حەیوان مۆڵیان خواردووە، چاویان لە ئێوە نیە. ئێوە مەجولێن ئێستا ئەڕۆمەوە، منداڵێکم هەیە بەوا نانتان بۆ ئەنێرم. ناوێرم خۆم بێمەوە نەوەك شکم لێ بکەن. نابێ بێنە دەرەوە هەتا خۆم دێم بە دواتاندا. با تاریك بکات ئەوجا دێم."
وتم:
" –باشە."
زۆر لێی دڵنیابووم. هەر لە پێش شۆڕشەوە برادەرم بوو. ڕۆیشتەوە ئەوەندەی پێ نەچوو کوڕەکەی هات. تەمەنی هەر دە ساڵ دەبوو. بانگم کرد نانەکەی بۆ دانابنو خۆی ڕۆیشتەوە. نانو هێلکەو پیازبوو. زۆر بە لامانەوە خۆش بوو. زۆر هیلاکو برسی بووین. ترسمان نەما بەرەو عەسر دەچووین، جموجۆڵی هەلیکۆپتەریش نەما. وامانزانی عەسکەرەکانیش نەماون. سەیرێکی پشتی ماڵەکانمانکرد نە ڕۆشتبوون. هێشتا ڕۆژ ئاوا نەبوو بوو وتیان:
" –با بڕۆین بۆ ناو دێکە."
وتم:
" –بابە بوەستن ئەو کوڕە خۆی دێ بە دواماندا."
مەلا بەختیار وتی:
" –تازە هیچ نابێ. خۆمان ئەڕۆین."
تەموو خوماربوو، چاومان لە عەسکەرەکان نەبوو. وتم:
" –باشە با بڕۆین."

که چووینه ناو ماڵەکان، عەسکەر لە پشتی ماڵەکانەوە بوون . کوڕەکە زۆری پێ ناخۆش بوو وتی:

" -باشە من نەموت خۆم دێم بە دواتاندا. بۆ خۆتان هاتون. هێشتا زووە. ئەوە عەسکەرە سەیرکەن."

مەلا بەختیار لە کوڕەکە زۆر توڕەبوو. چوو بەگژیا وتی:

" -هەر نایەینە ماڵی پیاوی وەك تۆ ترسنۆك."

وتم:

" -کاك بەختیار ئەو لەبەر ئێمەیەتی. تۆ بۆ لێی توڕە ئەبیت.؟"

وتی:

" -من نایەمە ماڵی پیاوی وا. تۆ بچۆ."

نەهات. سەرەڕای پیاوەتی چوو بە گژ پیاوەکەدا.

وتم:

" -کاك سامان، فاخر ئێوە بچن."

من لە بەر مەلا بەختیار نەچووم، ئەو نەهات. منو ئەو چووینە ماڵێکی تر نانمان خواردو هاتینە دەرەوە. هەر ئەو برادەرەی خۆم چوو لێفەو بەتانی بۆ هێناین، نای لە گوێدرێژێك وتی:

" -جێگایەك هەیە، زۆر باشە باران لێی نادات. بەرامبەری دێکەیە. ڕۆژ بێتەوە بەرامبەری عەسکەرەکانە، نابێت دنیا روناك بێتەوە، دەبێ لەوێ بڕۆن، بچن بۆ دیوی ئەشکەوتەکانەوە. شتەکان هەر لە جێی خۆی بە جێ بێڵن من ڕۆژێکی تر یەمەوە بۆ شتەکان."

خۆم شارەزا بووم دەمزانی، کە ڕۆژ بۆوە کوێ باشە. خۆشی لەگەڵمان هات بردینی بۆ ناو ئەشکەوتێك، ئەدوت خانووە. پڕبوو لە (بەڵمی برنج)[44] لە دۆشەك خۆشتربوو. بۆ خۆمان لەوێ لێی نوستین. نانی ڕۆژی دوایشی بۆ پێچابووینەوە. دوایی (سامان) وتی:

" -ئێوە نەهاتن، فەقیرە مریشکی بۆ سەربڕی بوون. ئەوەندە برنجو گۆشتیان لێنابوو، بەشی دەکەس."

وتم:

" -نۆشی گیانتان بێت، ئێمەش لە سایەی سەری مەلا بەختیارەوە نانو چامان خوارد."

ئەو شەوە لەوێ بووین. هەر زوو پێش ئەوەی دنیا روناك بێتەوە ڕۆشتین. دیوی ئەو شوێنەی لێی نوستبوین چەمو بێشەبوو کەس نەی دەبینی، بەڵام ئێمە چاومان لە

---

[44] - بەڵمی برنج : چەڵتوك، کە گێرەی دەکەن، چەڵتوك و کاکەی لە یەك جیا دەبێتەوە. بەوکایە دەڵێن بەڵمە برنج.

هەموو شوێنێکەوە بوو. بۆ دوای نیوەڕۆ جەیشەکە لە سەرجەم ناوچەکە گەڕایەوە. ئێمەش ڕۆشتین بەرەوگوندی (دەلوجە)، کە چووینە دەلوجە، پێیان راگەیاندین وتیان:
" -مامۆستا حەمە ئەمین (شەماڵ) شەهید بووە."
وتمان:
" -لە کوێ.؟"
وتیان:
" -هەر لە خوار میریاسی یەوە."
وتمان:
" -ئێوە دڵنیان ئەوبوو.؟"
وتیان:
" -بەڵێ، بە هەلیکۆپتەر تەرمەکەیان بردووە بۆ قەرەداغ، لەوێوە بردویانە بۆ کەرکوك."
زۆرمان پێ ناخۆش بوو. نەمانزانی چۆن شەهید بووە؟ سەیر بوو! من دواین کەس بووم لەو دێیە، کە بە جێ مابووم. ئەو لە کوێ بووە؟ من دەمزانی ئەو و فەهمی بە یەکەوە بوون. جارێ ئەوان دیارنین. زۆری پێ نەچوو هەر لەوێ بووین، کاك دلێری سەید مەجیدیش هاتەوە بە شەلە شەل. ئەویش قاچی تەواو نەبوو دەشەلی. وتمان:
" -کاك دلێر ئەوە لە کوێ بوویت.؟"
وتی:
" -دوو ڕۆژە لەگەڵ کیسەڵێکدا، لە ناو قەرەقاچێك داین."
من هەر خەمی کاك دلێرم بوو، چونکە نەشارەزا بوو، قاچیشی تەواو نەبوو. باش بوو بە سەلامەتی هاتەوە. عەلی ئامە خانو کاك عادل شوکورو برادەرانی تر چووبوونەوە بۆ بەری دۆڵی جافایەتی. عەلی ئامە خان وتبووی:
" -هەر ئێمە دەرچووین، رەنگە ئەوان گیرابن یان کوژرابن."
لەوێوە چووین بۆ گوندی (قەڵای قایمەن) ماڵێکی لێ بوو ماڵی (عەلی قەڵا قایمەن) یان پێ دەوت. بە شاخەکەوە بوو. زۆر پیاوێکی چاك بوو. چووین بۆ ئەوێ، کە بیستی کاك شەماڵ شەهیدبووە، زۆر گریا، چونکە زۆری خۆش دەویست. زۆریش دەچووینە ماڵیان. شوێنەکەیان زۆر قایم بوو بە سەر شاخەکەوە بوو. ئیتر لە دیوی دەلوجەو کانی هەنارەوە دەچووین بۆ دیوی گوندی (سێوسێنان) هەر لە وێوە دەڕۆشتینو لە وێشەوە بە زۆری دەهاتینەوە بۆ دیوی دوکان. ڕۆشتین بەرەو گوندی سێوسێنان، چووینە ئەوێ. جەماعەتیش لەو لاوە لە دیوی گەرمیانەوە هاتنەوە. لەوێ یەکمان گرتەوە. ئازادو فەهمیش هاتنەوە. وتم:
" -کاك ئازاد کاك شەماڵ لەگەڵ ئێوە بوو، چۆن لە ئێوە دا برا.؟"
وتی:

" –ئێمە هەر لە ماڵەکەدا بووین، کە تەقە دەستی پێکرد. کاک شەماڵ هەر قسەی بۆ خاوەن ماڵەکە ئەکرد. چوار پێنج ڕۆژ لەوەو پێش مامۆستا ئەنوەر زۆر لە کابرای ماڵەکەی دابوو. ئەویش پیاوێکی باش بوو. کاک شەماڵیش هەر دڵخۆشی دەدلیەوە."

مامۆستا ئەنوەر تازە بووبوو بە کادری ئەو ناوە. نازانم کێ رقی لە کابرا بوو، چووبوو بۆ لای مامۆستا ئەنوەر وتبووی پیاوێکی خراپە. ئەویش هەموو گیانی شکاندبوو. (شەماڵ)یش دەیناسی.

کاک ئازاد وتی:

" –لەو کاتەدا تەقە دەستی پێکرد، رامانکرد بەرەو خوار، بەڵام کاک شەماڵ یەکسەر لە پێ کەوت، نەیتوانی رابکات. هەرچی بە زۆر پاڵمان پێوەنا، هەر نەیتوانی رابکات. هەر بە زۆر هێنامان هەتا خوار ئاوایی، ئیتر ئێمە رامانکرد بەرەو گوندی نەوتی، ئاگامان لێی نەما چی بە سەر هات."

دیاربوو هەر لە دوای ئەوان شەهید ببوو.

دوای جەولەکردن لە ناوچەکەدا، چەند کۆبوونەوەیەکمان ئەنجامدا لەگەڵ مەفرەزەو کادرەکاندا. لە گوندی دوکانی قەرەداغ. (سیروان)مان دانا وەك سەرپەرشتیاری هێزەکە، چونکە پێش ئەو شێخ محمەدی باخ ناسراو بە شەماڵ، ئەومان دانابوو بە فەرماندەی کەرت. لە بەر ئەوەی ئەو لەوێ نەبوو. (سیروان)مان دانا بۆ ماوەیەکی کاتی هەتا شەماڵ دەگەڕێتەوە. دوایی گەڕاینەوە بۆ بەری بازیان. رووومانکردە گوندی (گوڕیان)، هەموو شتەکانی شەهید ئارام لە جانتایەکی گەورەدا بوو. لای من دانابوو. هەموو ئیشەکانی هەر لە یەکەم رۆژی دەست پێکردنی بە ئیشوکارەکانی کۆمەڵەو شۆڕش، نامەی شەخسیو ئەوەی پەیوەندیی بە رێکخستنەوە هەبێ، هەمووی لەو جانتایەدا بوو. هەموویم دایە دەستی مەلا بەختیار. هەمووی لای ئەو مایەوە، چونکە ئەو سەردەمە دوای شەهیدبوونی کاک ئارام، ئەو مەسئوولی کۆمەڵە بوو لە دەرەوە. لە بەرئەوەی سالار عەزیز لە ئەوروپا بوو لەو کاتەدا. هەروەها (ئازاد هەورامی)ش لای مام جەلالو کاک نەوشیروان بوو لە سەرکردایەتی. ئەو سێ کەسە مەسئوول بوون لە کۆمیتەی هەرێمەکان دوای شەهید ئارام، هەتا کۆبوونەوەکانی نۆکان. تا مانگی چواری ۱۹۷۸. بە مەلا بەختیارم وت:

" –من وەزعم زۆر خراپە، ئەگەر مەجال هەیە ئەتوانن بمنێرنە دەرەوە بۆ عیلاج. شەهید ئارام وەعدی دابوو بە یەکەوە بچینە دەرەوە. بچین بۆ ئەڵمانیا، بەڵام ئەو شەهید بوو.

وتی:

" –زۆر باشە، کۆبوونەوەی سەرکردایەتی ئەنجام ئەدرێت، بە یەکەوە ئەچین بۆ ئەوێ. ئەگەر توانیان بە رێگای قاچاخدا دەتنێرنە دەرەوە."

وتم:

" –زۆر باشە دێم."
سەرکردایەتی ئەو کاتە لە نۆکان بوو. پێش ڕۆیشتنم بە ڕۆژێ هەموو پێشمەرگەکانم کۆکردەوە، خواحافیزیم لێکردن. پێم وتن:
" –من ئەچم بۆ سەرکردایەتی. لەوانەیە بچمە دەرەوە بۆ عیلاج ئەگەر کرا. هەر رەخنەو گلەییەکتان هەیە، ئێستا بە خۆم بڵێن هەتا خۆم لێرەم. لە دوای خۆم گلەیی نەکەن."
پێشمەرگەکان هەموو زۆریان پێ ناخۆش بوو، کە بە جێیان دێڵم. بە راستی خۆشم پێم ناخۆش بوو، بەڵام وەزعم زۆر خراپ بوو، نەمدەتوانی بڕۆم بە ڕێگادا. ئەو کاتەش دەبووایە شەوو ڕۆژ هەر بە ڕێوە بین. ئەگینا تیا دەچووین. گەر حکومەت بیزانیایە لە کوێین، یەکسەر هێرشی بۆ دەکردین. هەتا ئەو کاتە مانگی ٣ ی ساڵی ١٩٧٨ مەسئوولی سیاسیو عەسکەریی ناوچەی قەرەداغو گەرمیان بووم. خواحافیزیمان لە جەماعەت کرد لە گوندی گوڕپاز. ئیتر بە ڕێکەوتین. جگە لە ئێمە دلێری سەید مەجیدو ئازادی سەگرمەش لە گەڵمان هاتن. مەفرەزەکەی مەلا بەختیارمان بە ڕێ کرد بۆ (دۆڵی جافایەتی) لەوێ چاوەڕوانمان بکەن هەتا خۆمان دەچین. هەر ئەو ڕۆژە یەکسەر ڕۆیشتین بۆ سلێمانی. لە ڕێگا دلێر هەر نوکتەو قسەی خۆشی کرد هەتا گەیشتینە وڵووبە. لەوێ دابەش بووین. منو مەلا بەختیار بە یەکەوە ڕۆیشتین. دلێرو ئازادیش بە یەکەوە ڕۆیشتن. منو مەلا بەختیار هەر چووینە سەر جادەکەی گەڕەکی حاجیاوا، لە سلێمانی، تاکسیەکمان گرت. سوار بووین بۆ ناو شار، بۆ گەڕەکی سەرشەقام. مەلا بەختیار ریشێکی هێشتبووەوە، هەموو گیانمان لە قوڕدابوو. دیاربوو، کە لە دەرەوە هاتبووین. لە دووری ئەوماڵە دابەزین، کە بۆی دەچووین. بە پێ ڕۆشتین بۆ ماڵی خوشکم. لە وێش ناردم بە دوای کاک غەفووردا –کوڕی پورم بوو– لە وێش دانەنیشتین چووین بۆ ماڵی خوشکێکی زەینەب وتم:
" –با بێت بۆ ئەوێ بە دواماندا."
بۆ ئەوەی جێگاکەمان بگۆڕین نەوەک شۆفێری تاکسیەکە پیاوی دەوڵەت بێت. بۆیە ئەو ماڵانەم گۆڕی. زۆر دانیشتین دیار نەبوو بێت. نانمان خوارد ئەوجا خۆیان کرد بە ژووردا. ژنەکەشی لەگەڵ خۆی هێنابوو وتی:
" –هەستن با بڕۆین بە پەلە، ئەوە سێ جارە هاتووم، هەر بواریان نەداوە بێم. هەموو ئەو ناوە بە (قوات خاصە) گیراوە. دوو جار سەیارەکەیان راگرتووەو سەیری ناوەکەیان کردووە. بەس ئەم جارە هاتم کەسی لێ نەمابوو."
بە پەلە ڕۆشتین یەکسەر کردینی بە ماڵی خۆیاندا. مەلا بەختیار وتی:
" –وەڵا وای هێناین، لە فیلم دەچوو."
دیاربوو شۆفێری تەکسیەکە، سەر بە دەوڵەت بوو. ئیخباری کرد بووین. ماوەی ١٠ ڕۆژ لەوێ ماینەوە. ڕۆژانە برادەران دەهاتن بۆ لامان. تا ڕۆژێ چووین بۆ ماڵێك لە ڕێگای

سەرچنار بوو. نازانم ماڵی کێ بوو لە وێوە بە گەلابەیەك گەڕاینەوە بەرەو (دۆڵە رووت) منو کاك دلێری سەید مەجید لە دوای گەلابەکەوە بووین، مەلا بەختیاریش لە پێشی گەلابەکەدا بوو. ئەو گەلابانە بوو، کە بەردی دەکێشا لە کانەبەردەکانی چەق چەق، بەرامبەر سەرچنار. کە لە سلێمانی دەرچووین، جێبێکی عەسکەری لە دوامانەوە بوو. منیش جوتێك پێڵاوی سورم لە پێ دا بوو. کاك دلێر وتی:

" —پێڵاوەکانت بشارەوە. بە قورعان ئێستا وا ئەزانن تۆ (نائب زابت) یت."

جا راستیشی دەکرد. هەر لە پێڵاوی ئەوان دەچوو. گەیشتینە کانەبەردەکان. لەوێ دابەزین. بە پێ رۆشتین بەرەو گوندی هەناران. لە وێشەوە چووین بۆ چۆخماخ، بۆ ماڵی خاڵە شێخ صدیق، کە یەکێکە لە کادرە ماندوەکانی شۆڕشی ئەیلولو شۆڕشی نوێ. ماڵەکەی دیوەخانی شۆڕش بوو. برادەرانمان دۆزییەوە. بەرەو سەرکردایەتی بە رێکەوتین.

٤٥

مام جەلالو کاك نەوشیروانو عەلی عەسکەریو دکتور خالیدو تایەری عەلی والی بەگو شێخ حسین بابە شێخ لە نۆکان بوون. دکتور مەحمود عوسمانو قادر جەباریو چەند برادەرێکی تر، بە ناوی (لیژنەی تەحزیری)ەوە کاریان دەکرد. ئەمان لەگەڵ مام جەلالو برادەراندا، لە سوریاوە گەڕابوونەوە بۆ کوردستان.

ئێمە بەرەو نۆکان بە رێ کەوتین. لە سنوور چووینە گوندی (قەلە رەشە) دێیەکی ئێران بوو. لە ماڵێ بووین، شەو رادیۆ باسی خۆپیشاندانێکی کرد، کە لە شاری (ئەصفەهان) بەرپا ببوو. لەو کاتەدا خۆپیشاندان لە ئێران دەستی پێ کردبوو، بەڵام کەم کەم بوو. شەو نانمان خوارد. زوو دەرچووین لە گوندەکە، چونکە (پازگا)ی تیابوو. ئەو کاتەش کێ ئەی وێرا باسی کورد بکا، بە تایبەتی لە گوندەکانی ئێراندا. پۆلیسێك هەموو گوندەکانی دارکاری دەکرد، کەس نەیدەوێرا قسە بکا. مانگی چوار بوو چووینە نۆکان. زۆر ساردبوو دووسێ ماڵی ئێرانی لێبوو. مام جەلال لە خانوویەکدا بوو، کە لە ژوورێك پێکهاتبوو. چادرێکی بچووکی هەڵدابوو. عەلی عەسکەریو کاك

نەوشیروانیشی لێبوو. هەموو یەکێتی بوون. هەرچی مەسئوول بوو، هاتبوون بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی. هەموو کادرەکانی کۆمەڵەش کۆبووبوونەوە. ئەو دەمانە کاک (ئارام) شەهید ببوو. سالار عەزیزیش لە دەرەوەی وڵات بوو. کاک نەوشیروان مستەفا خۆی وادانابوو، کە بێ لایەنە، بەڵام لە ناو شارەوەو هەم لە وانەی دەرەوە وا دانرابوو، کە تەنیا کاک نەوشیروان جێگای شەهید ئارام بگرێتەوە. بۆچوونی هەموومان وابوو لە ناو شارەکانیشەوە. هەم داوایان لێکردبوو. ئیتر خۆشی بڕیاری دابوو، وەك کۆمەڵە ئیش بکات. وتی:

" –ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە کۆبونەوەیەك بکەین لە سەر وەزعی ئێستای کۆمەڵە بدوێین. بە ڕەئی من ئێستا زۆر باشە ئێستا با شترین هەلە، کادرێکی زۆری کۆمەڵە کۆ بوینەتەوە. ناوی ئەنێین کۆبوونەوەی کادرانی کۆمەڵە. بۆ ئەوەی سەرکردایەتیەك هەڵبژێرین بۆ کۆمەڵە، سەرپەرشتی بکات."

هەموو پێمان باش بوو، چونکە ئەو کاتە کۆمەڵە سەرکردایەتی نەبوو. هەر شەهید ئارام سەرپەرشتی دەکرد. ئەویش شەهید ببوو.

چادرێکی دڕاومان هەبوو (٤٠) نەفەر لە ژێر ئەو چادرەدا بووین. ماوەیەك شەوو ڕۆژ کۆبونەوەمان هەبوو لە سەر وەزعی کۆمەڵەو شۆڕش. لە کۆبوونەوەکەدا موناقەشەی زۆرمان دەکرد. ڕۆژێ عوسمانی قادر منەوەر لەوێوە تێ دەپەڕێ، گوێی لەو هەموو دەنگە دەنگەو موناقەشە کردنە دەبێت. دەچێتەوە بۆ لای برادەرەکانی خۆیان دەڵێ: کوڕینە بە زاتی خوا ئەوە یەك خێمەیە لەوێدا موناقەشەو دەنگە دەنگێکە، ئەڵێی شەڕە هەر ناوێری لەوێوە بڕۆیت. سەرکردایەتیمان هەڵبژارد بۆ سەرپەرشتیکردنی کۆمەڵە، هەتا کاتی کۆنفرانس. کاک نەوشیروان هەڵبژێردرا وەك سکرتێر بۆ سەرپەرشتیکردنی کۆمەڵە (٧–٨) برادەریش بۆ ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە. منیش یەکێ بووم لەوانە. کۆبوونەوەکانی کۆمەڵە دەنگێکی زۆری دایەوە. ئێران بەمەی زانی. دیارە سەردەمی شابوو، زۆر دژی ڕێکخستنێکی وابوون. کەوتنە ئاگادارکردنی یەکێتی، کە چۆڵی بکا. هەر ئەو دەمانە کۆبونەوەکانی یەکێتیش دەستی پێ کرد. تەشکیلاتی سەرکردایەتی‌و دابەشکردنی ئیشوکارەکانی مەکتەبی سیاسی‌و مەکتەبی عەسکەری دیاریکرا. بەڵام ئێران فشاری خستبووە سەرمان. بڕیان کردبۆوە هێزەکان بڵاوە پێ بکەن. هێزی سەرەکی کۆبکەنەوە بۆ (بادینان) هەر هەرێمەی چەند پێشمەرگەیەکیان ناردەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان. ئامر هەرێم یان جێگری ئامر هەرێم. هێزە سەرەکیەکە بۆ بادینان. کاک نەوشیروان لە بارەی منەوە وتی:

" –با کاک ئاوات بڕوات بۆ دەرەوە بۆ عیلاج."

کاک نەوشیروان وتی:

" –نامەش بۆ برادەرانی دەرەوە ئەنوسم، تۆش بۆ خۆت وەزعی ئێستەی کۆمەڵەو شۆڕشیان بۆ باس بکە."

من له سەر ئەو بڕیارە مامەوە لەگەڵ جەماعەت بچم بۆ بادینان، دوایی لەوێوە بە ڕێم بکەن بۆ سوریا. لە وێشەوە بۆ ئەوروپا. دیاربوو چونی هێزەکان بۆ بادینان بۆ دوو مەبەست بوو. یەکەم: ئێران دەهاتە سەرمان دەبوایە نۆکان چۆڵ بکەین، چونکە بەشی ئێران بوو. دووەم: بە تەمابوون سەرکردایەتی بەرنەوە ئەو جێگایەی، کە ساڵی ۱۹۷۷ لێی بوو. ئەویش سێ گۆشەکەی کوردستان بوو. سنوورەکانی (ئێران، تورکیا، عێراق) لەبەر ئەوەی ئەوێ زۆر سەخت بوو. لە وێشەوە دەیانتوانی دەستیان بگاتە ئەو چەکانەی، کە بۆیان دانابوون، بیهێننەوە بۆ ناوچەکانی (سۆران) هەر بۆ ئەوەش بوو زۆربەی پێشمەرگەی هەرێمەکانیان کۆکردبۆوە. بڕیار بوو هەر هەرێمەی بەشی خۆی چەك بێنێت بۆ هەرێمەکەی.*

٤٦

بڕیار درا هێزەکان بکەن بە (سێ) بەشەوە. یەکەم: دکتۆر خالید. دووەم: عەلی عەسکەری. سێهەم: مام جەلال‌و کاك نەوشیروان‌و دکتۆر مەحمودو برادەرانی تر. من لە کۆبوونەوەکەدا نەبووم. برادەران بۆیان باسکردم، کە بڕیاری مەکتەبی سیاسی چۆنە. وا بڕیاربوو دکتۆر خالید خۆی‌و ئەو هێزەی، کە لەگەڵ ئەودان، بچنە (دۆڵی خواکورك) لەوێ چاوەڕوانی هێزی دووەم بکا. ئەو هێزە بوو، کە لەگەڵ عەلی عەسکەریدا بوو، کە لەوێ یەکیان گرتەوە، بڕۆن بۆ (دۆڵە فشە) هاوڕێیان خۆیان ناویان لێ نابوو. ساڵی پێشوو لە وێ بوون. ئەوجا وەلام بنێرن بۆ هێزی سێهەم، کە مام جەلال‌و کاك نەوشیروان بوون. لەگەڵ دکتۆر مەحمودو هاوڕێیانی. ئەو کاتە (جەلالی حاجی حسێن) بە ناوی (پاسۆك)ەوە ئەویشیان لەگەڵ بوو. هەموو هێزەکە لەگەڵ عەلی عەسکەری بوو. وتم:

" -منیش لەگەڵ کاك ئازاد هەورامی دا ئەڕۆم."

کاك نەوشیروان وتی:

" -تۆ نەخۆشیت مەڕۆ، لەگەڵ ئێمەبە، دوایی ئەڕۆین. ئێستا بەفر زۆرە."

شەهید ئازاد هەورامی‌و ملازم عومەریش وتیان:

" -تۆ مەیە دەر ناچیت."

بەلام من هەر چووم. مانگی پێنجی ساڵی ۱۹۷۸ )بوو. کاك دکتۆر خالید لەگەڵ (شێخ حسێن بابەشێخ)و هێزەکەی بە ڕێکەوتن. دەوری (۳۰۰) پێشمەرگە بوون لە ئامر هەرێم‌و ئامر کەرت‌و کادرو پێشمەرگە. ئەوان بە ناو دێهاتەکانی کوردستانی عێراقدا ڕۆیشتن. زۆر باش دەرچوون. جار جار توشی شەر بووبوون، بەلام هیچ نەبوو. هەر دەرچوو بوون. ئێمەش هەموو بە ڕێکەوتین دەوری (۷۰۰) پێشمەرگە دەبووین. لە

تۆکانەوە بەرەوە (دۆڵە کۆکە) گولیە ئێران ڕێگامان دەدات بە سنوری ناو ئێراندا بڕۆین. پارەشیان دلوە بە خەڵك، کە خواردنمان بۆ دابین بکەن لەو جێگایانەی، کە پیایدا دەڕۆین، بەڵام ئێران هەموو سنوری لێ گرتبووین. هێزی زۆری هێنابوو بۆ سەر سنور، دیاربوو لەگەڵ عێراقدا ڕێکەوتبون بۆ لێدانمان. هەر لە (دۆڵە کۆکە)وە بۆ (گوێزێ) سەرمان کرد بە دیوی ئێراندا، لە گوێزێ درلینە بەر هاوەن. خەریکبوو زۆرمان لێ شەهید بکەن. بواریان پێ نەدلین سەرکەوین بە دیوی ئێراندا. ئەو ڕۆژە گەڕاینەوە ناو دۆڵەکە ئاگرمان کردەوە دەستمانکرد بە چا لێنان. باش بوو ئەو دۆڵە زۆر دارستان بوو. منو ئازاد هەورامی، کۆمەڵێ کادری کۆمەڵەمان لەگەڵ بوو. ئازاد هەورامی ئەو کاتە نوێنەری کۆمەڵەبوو لە سەرگردایەتی یەکێتی. دەچووە کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی یەکێتی یەوە. مسئول نەبوو لە یەکێتی، هەر ئیشی کۆمەڵەی دەکرد. لە ناوەندی کۆمەڵە بوو. ئێمە هەموو بە یەکەوە بووین زۆرمان بێ چەك بووین. ئەوانەی کۆمەڵە بۆ ئەوە هاتبوون بە تەمای ئەوە بوون، کە چوونە بادینانو سەرکردلیەتی دامەزرا، لەوێ خولی کادران بکەنەوە. زۆریان بۆ ئەوە هاتبوون. دوای خولەکە لەوێ چەك وەرگرن ئەوجا بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان. من چەکەکەی خۆمم بە پێشمەرگەیەك دا بە ناوی (فاخر) لەگەڵ کاك نەوشیروان بوو. هەر یەك دەمانچەم پێ بوو. لە دۆڵەکەدا چامان لێنابوو، هەر یەکەی دووسێ ناوساجیمان پێ بوو. دەستمانکرد بە خواردنی. لەو لامانەوە دووسێ برادەر دەنگە دەنگیان بوو لە سەر خواردن. برادەرێکمان هەبوو ناوی ساجید کەرکوکی بوو، زۆر کوڕێکی باش بوو. لەو کۆمەڵە گەنجانەبوو، کە لە زیندان ئازاد کرابوو. هات بۆ دەرەوە. دوایش لە هەکاری شەهیدبوو وتی:

" -بۆ خاتری خوا هاوڕێیان عەیبە حەیامان چوو. ئەو پێشمەرگە عادیانە، بزانە یەك دەنگیان لێوە دێ."

مامۆستا سەلامو ملازم عومەر لەو لامانەوە بوون، مامۆستا سەلام پەلاماری ساجیدی دا وتی:

" -ئێمە عادین.؟"

بە هەزار حاڵ لە یەکمان کردنەوە وتمان:

" -کەی لەگەڵ تۆی بووە. بابە بە ئێمە ئەڵێت پێشمەرگەی عادی."

هەر چۆنێ بێ هێمن بوونەوە. بۆ نەگبەتی ئەو ساڵە بەفر زۆر باریبوو هەر دەشباری. ڕۆژی دوایی بە ڕێکەوتین بەرەو دیوی ئێران. بە شاخی (قەندیل)دا ڕۆیشتین. لە بەر بەفر ڕێ نەبوو بڕۆین. زۆر سەختو زۆر سارد بوو. خەریك بوو هەموومان هەر لە وێ ڕەق ببینەوە. (قادر ئاغا)شمان لەگەڵ بوو. هەر یەکەم ڕۆژ هێستریێکی کەوتە خوارەوە تۆپی. من ئاگام لەوە نەبوو، کە گوایە مام جەلالو کاك نەوشیروان رایان وا نەبووە بچنە دیوی ئێران، بەڵام عەلی عەسکەری تورەبووە وتوویەتی:

" —هەر بەوێدا ئەڕۆم."
بە نووسیّ ڕۆژو شەو گەیشتینە دۆڵێ لە قەندیل. نازانم ناوی چی بوو. ئەو دۆڵانەی قەندیل هەمووی ناوی هەیە، وەك (دەراوی گورگان، دەراوی ورچان، بەردە خلیسك ...هتد) چەندان ناویان هەبوو. نازانم ئەوە کامیان بوو. ئەوەندە دەزانم هەندێ دارگوێزی لێبوو، بن ئەشکەوت و تاوێر بوو. هەمووی بەفر بوو. هەر لەوێ کەس نانی پێ نەما، چونکە هەر بەشی یەك دوو ڕۆژ نانمان پێبوو. بڕیاریش بوو لە هەموو ئەو جێگایانەی بۆیان دیاری کردبووین خواردنیش دانرابێ. ئێوارەبوو، لەو دۆڵەدا هێزەکەیان جیاکردەوە. دیاریبوو خۆیان کۆبونەوەیان کردبوو، بڕیاریان دابوو مام جەلال‌و کاك نەوشیروان‌و دکتۆر مەحمود لەوێ بمێننەوە. عەلی عەسکەری‌و ئازاد هەورامی‌و ملازم عومەرو ملازم تایەری عەلی والی، ئەمان لەگەڵ ئەو هێزەی عەلی عەسکەری بە ڕێکەوتن بەرەو بادینان. ئەو هێزەی، کە عەلی عەسکەری قیادەی دەکرد، لە خولکوڕك لەگەڵ هێزەکەی دکتۆر خالید یەك بگرنەوەو بچنە ئەو جێگایەی، کە بۆیان دیاری کرابوو. ئەویش دۆڵە فشە بوو. کە چوونە ئەوێ‌و جێگیربوون، دولتر وەڵام بنێرن بۆ مام جەلال‌و کاك نەوشیروان. ئەمانیش بە ڕێکەون. هەندێ هێزی موتەفەریقە مابوونەوە، لەگەڵ مام جەلال‌و کاك نەوشیروان. مام جەلال مەفرەزەیەکی لەگەڵ بوو. کاك نەوشیروانیش چوارپێنج پێشمەرگەی لەگەڵ بوو. ئێوارە هێز بە ڕێکەوت خواحافیزیمان لەگەڵ کردن‌و بە ڕێکەوتین. شەو گەیشتینە بەردەمی ڕەبایەکانی عێراق. پێشمەرگەیەك لەگەڵ عەلی عەسکەری بوو ناوی (زەردە) بوو لە پێش هێزەکەوە بوو بۆ شارەزایی. هەموو هێزەکە بە ڕیز دەڕۆشتین. بەفرێکی زۆریش ڕێگەی گرتبوو. بەفرەکە بەستبووی قاچمان دانەدەچوو. لەو کاتەدا ورچێك سەر ڕێگەکەی گرتبوو، لە پڕ هەموو وەستاین وتیان:
" —یەك یەك بیگەیەنن، زەردە ئەڵێت بە کاك عەلی بڵێن ورچێك ڕێگاکەی گرتووە. تەقەی لێ بکەم.؟"
یەکە یەکە گەیاندمان تا گەیشتە کاك عەلی. کاك عەلی وەڵامەکەی دایەوە وتی:
" —بی گەیەنن بڵێن عەلی ئەڵێت، زەردە گوی خوارد."
(٧٠٠) پێشمەرگە بووین بە یەکەوە. یەك بە یەك وتمان:
" —بی گەیەنن کاك عەلی ئەڵێت زەردە گوی خوارد."
ئاخری ئێمە لاماندا. ئەو هەموو هێزە ڕێگامان چۆڵکرد بۆ ورچێك. ناچار بووین، ئەگەر تەقەی بکردایە ئاشکرا دەبووین. گەیشتینە ئەو جێگایەی، کە بڕیار بوو خواردنمان بۆ دانێن، هیچی لێ نەبوو. ئیتر بە نائومێدی ڕۆشتین. شەو گەیشتینە سەر جادەی بەینی (خانەو حاجی هۆمەران) سەیر دەکەین هەر هەمووجادەکە بە دەبابەی ئێران گیرابوو. ئێمەش بە پاڵ سەیتەرەکەی عێراقدا ڕۆشتین پەڕینەوە ئەو بەری جادەکە، بەرەو (شنۆ) گەیشتینە پشتی شاری (خانە)و ڕۆژ بۆوە. هەر بە ڕاکردن رامانکرد. بۆ ئەوەی

خۆمان بگەیەنینە بناری شاخەکە. نازانم ئەو شاخە ناوی چی بوو. زۆر بەرز بوو، کە گەیشتینە بناری شاخەکە، بە تەواوی خۆر کەوت. لە دەشتەکەوە دایانینە بەر تۆپی دەبابە. ئینجا هەلیکۆپتەر لە ئاسمانەوە دایگرتینەوە. ئەوەیان پێ کردین، کورد دەڵێ (با بە دەواری شڕی نەکات) ئێمەشیان وا لێکرد، بەڵام کەسمان لێ شەهید نەبوو. ئەوە جێگای دووەم بوو، کە بڕیار بوو خواردنمان بۆ دابنێن. لە بری خواردن تۆپو تەیارەیان بۆ دانابووین. ئیتر تەواوی هێزەکە پشتی شکا لە برسا. وەزعمان زۆر خراپ بوو سێ رۆژبوو نانمان نەخوارد بوو، شەو و رۆژیش هەر بە رێگادا دەڕۆشتین. ئەو رۆژە هەتا ئێوارە رۆشتین. بۆ ئێوارە گەیشتینە جێگایەك وتیان:

" -ئەمە (زێوە)یە سەربازگەیەکی لێ بوو. ئێوارەبوو بەرەو تاریکی دەڕۆیشت. زۆر ساردیش بوو بە پێوە خەریك بوو دەیبەستین. لەم دیوی سەربازگەکەوە هەموو وەستا بووین وتمان:

" -با بچینە ئەم دێیانە نان بخۆینو نانی رۆژێکیش هەڵبگرین."

گوندەکان زۆر بوون دەمانتوانی بچین نان بخۆینو نان هەڵگرین. کاك عەلی رازی نەبوو وتی:

" -ئەچین پرس بەو سەربازگەیە ئەکەین. لە خۆمانەوە ناچینە دێهاتەکان."

ئەگەر بچووینایەتە گوندەکان وامان لێ بە سەر نەدەهاتو هیچیش نەدەبوو. عەلی عەسکەری نەیهێشت. وتیان:

" -با دوو کەس بنێرین بۆ لای ئەو سەربازگەیە."

کاك (جەمالی حەمەی خواکەرەم) و کاك (ئەنوەری مەجید سوڵتان) یان نارد وتیان:

" -کاك جەمال فارسی ئەزانێت با لەگەڵ کاك ئەنوەر بچێت."

ئەوان رۆشتن. ئێمەش لەم دیوی سەربازگەکەوە وەستا بووین چاوەڕێی وەڵام بووین. ئەوەندە سارد بوو، هەر رەق بووینەوە. چوار رۆژ بوو نانمان نەخوارد بوو. شەو و رۆژ بەفر و باران لێی دەداین. هەر چاوەڕوانمان دەکرد بێنەوە. کاتێکمان زانی بەر هاوەنو دۆشکەیان داین. بە پەلە رامانکرد ئەو شەوەش دامان بەو شاخەدا. هەر زۆر ساردبوو. ئەو ناوەش زۆر کوێستان بوو. هەر ئەو شەوە پێشمەرگە زۆر خۆیان کرد بە ناو گوندەکانی ئێراندا. رەنگە (٥٠) پێشمەرگە زیاتر بوبن تەسلیم بوونەوە. ناحەقیان نەبوو، چونکە گێڕانەوەی ئەو وەزعە ناخۆشو سەختە هەر بە دەم خۆشە. یەك هەفتە بوو نانمان نەخواردبوو. سەرماکەشی بێ سنووربوو. ئەو شەوە چەند پێشمەرگەیەك خوێنیان هەڵهێنایەوە. بۆ بەیانی گەیشتینە جێگایەك، زەویەکەی رەش بوبۆوە. گیا دەرکەوت بوو. کوڕێکمان لەگەڵ بوو ناوی (حەمەی نانەوا) بوو، زۆر نەبوو لە ناو شارەوە هاتبوو بۆ پێشمەرگایەتی. لە سلێمانی رێکخستنی کۆمەڵە بوو. وەزعی زۆر خراپ بوو، ئەڕشایەوە خوێنی هەڵدەهێنایەوە. لە قاچ کەوتبوو ئەی دەتوانی بڕوات.

برسیو سەرما وای لێکردبوو، دیاربوو دەمرد. پازگایەکی ئێران نزیك بوو. عەلی عەسکەریو ئازاد هەورامیو ملازم عومەر پێیان وت:
" —بچۆ بۆ ئەو (پاسگا)یە خۆت تەسلیم بکەرەوە، با نەمریت."
وتی:
" —من مردن هەڵئەبژێرم، نەك ئەو پاسگایە. خۆ ئەزانم ئەمرم. مردنەکە زۆر پیرۆزترە لە وەی خۆم تەسلیمی ئێران بکەم."
هەرچی هەوڵیان دا لە گەڵی نەچوو. بەرەو ئێوارە دەچوو، لە بەردەم شاخی (کێلە شین)دا بووین. بە ناچاری چووم لە برسا هەندێ گیام خوارد. یەك هەفتەبوو لە باتی نان، هەر بەفرم دەخوارد. دەبوایە بەو شاخەشدا هەڵگەڕێین. هەمووشی بەفر بوو، شارەزاکانیش ڕێگەکەیان نەدەدۆزییەوە، چونکە ساڵی پێشو ئەوان لە بادینانەوە هاتبوونەوە بەوێدا. بەڵام ئەوەندەی بەفر تێ کردبوو ڕێ دیار نەبوو. هەرکە دامان بە قەد شاخەکەدا، بەر چاوم تاریك بوو. مەعیدەم تێکچوو رشامەوە، چونکە مەعیدەم هیچی تیانەبوو. خەریك بوو ریخۆڵەکانم دەربێ. کەوتم. بە ئازاد هەورامیم وت:
" —ئێوە بڕۆن بە جێم بێڵن. من ئیتر ناتوانم بڕۆم."
ئازادو ملازم عومەر هاتن وتیان:
" —چۆن ئەبێت بە جێت بێڵین. وردە وردە بڕۆ."
وتم:
" —بشم کوژن یەك بست ناتوانم بڕۆم."
شاخی (کێلەشین)یش هەمووی بەفرە، رەشایی بە دەرەوە نیە. لەو کاتەدا کردیشی بە بەفرو کرێوەیەك، چاوت لە بەردەمی خۆت نەبوو. منیش بە تەمەنم ناوی کێلەشینم نەبیستووە. کەوتم. ئەوان ناچار ڕۆشتن. ئەگەر ئەوان بووەستانایە، ئەوانیش دادەبڕان لە جەماعەت. کەسیشیان شارەزا نەبوون. دوو پێشمەرگەی لای عەلی عەسکەری نەبێت ساڵی پێشوو لە وێوە هاتبوونەوە. ئەو کاتەی ئەوان هاتبوونەوە، بەفری نەگرتبوو. بڕوا ناکەم خەڵکی ئەوێش ڕێی دەربکەن. شەویش هات بە سەردا کەوتم. بەفر دایکردەوە. قەمسەڵەیەکم لە بەردا بوو، کڵاوی هەبوو. کڵاوەکەیم دایەوە بە سەرمداو پاڵکەوتم. دەوری نیوو کات ژمێر کەوتم. تۆزێ باش بوومەوە، چاوم کردەوە، کەس نەماوە. یەك بست پێش خۆم نابینم. بەفرو زریانێکیش بوو، شەویش بوو. دەمانچەکەم دەرهێنا، بە رووتی بە دەستمەوە گرتو هەر دوو دەسم خستبووە بەینی رانمەوە وتم:
" —نەوەك گورگ یان درندەیەك بم خوات."
لێی کەوتم هەتا بەیانی. ئەوە بەفریش هەر دەبارێت. لەشم بووبوو بە ژێر بەفرەوە، هەر نەمزانی سەرما چی یە. گوێم لە دەنگو بانگە بانگ بوو، لە ژێر بەفرەکەوە. هاتمە دەرەوە سەیری دنیام کرد، هەر سپی دەچۆوە. جێگایەك دیار نەمابوو. هەر ڕێچکەیەکیش دیار نەبوو. منیش هیچ جێگایەك نازانم. لە دڵی خۆمدا وتم:

" –جا روبکەمە کوێ.؟"
کەش‌و هەواخۆش بووبوو. کردی بە خۆرەتاو. گوێم لە دەنگە دەنگو بانگیان بوو، بەڵام تەمومژێك بوو، کەس دیار نەبوو. گوێم لە دەنگی شەهید ئازاد هەورامی بوو، وام دەزانی بە دوای مندا گەڕاونەتەوە. منیش هاوارمکرد:
" –کاك ئازاد وام لێرە."
هاتن. کە سەیر دەکەم، هەموو هێزەکەیە. وتم:
" –ئەوە بە دوای مندا گەڕانەوە.؟"
وتی:
" –بۆ تۆ لە کوێ بوویت.؟"
وتم:
" –ئەی ئێوارە لێرە بە جێ نەمام.؟"
وتی:
" –بە خوا هەر بیریشمان نەمابوو. وامزانی هەر لەگەڵ خۆماندا بوویت. بە دوای تۆدا نەهاتووین ئەمشەو ئێمەش هەر لە سەروی تۆوە بووین، نەمان توانی بڕۆین. ڕێگەکەمان نەدۆزییەوە. هەر لەو بەفرەدا بووین بە پێوە هەتا بەیانی."
وتم:
" –ئێستا بۆ کوێ ئەچین.؟"
وتی:
" –نازانم، شارەزاکان لە پێشەوەن. وتیان بە دواماندا وەرن. ئەوە ئێمەش دولیان کەوتوین."
بە ڕێکەوتینەوە، من‌و ئازاد هەورامی، لە دواوە دەڕۆشتین بە شوێن پێی پێشمەرگەکاندا. بەفرەکە زۆربوو. هەموو دوای یەك کەوتبووین. تۆزێ ڕۆشتین سەیر دەکەین، ئەو پێشمەرگەیەی، کە ناوی حەمەی نانەوا بوو، ئێوارە پێیان وت خۆت تەسلیم بکەرەوە نەچوو، لە سەر ڕێچکەکە کەوتووەو بە جێیان هێشتووە. بە حاڵ ڕۆحی تیا مابوو، نەی دەتوانی دانیشێت. هەندێ ئەم دیودیومان کرد، سودی نەبوو. تەواو بووبوو، نەیدەتوانی بجوڵێ. تۆزێ وەستاین بە دیارییەوە، بێ سوودبوو. من‌و ئازاد وابزانم برادەرێکی تریش بوو، هەڵمانگرت‌و بردمانە بن بەردێك دامانناو بە جێمانهێشت. زۆر ناخۆش بوو لەگەڵ ئازاددا زۆری بۆ گریاین. بە ڕاستی ئازارێکی جەرگ بڕبوو، کوڕێکی وا گەنج لە برساو بەو شێوەیە گیان لە دەست بدا. ئاوڵتی شێخ جەنابمان لەگەڵ بوو. بە دەست ئەویشەوە دامابووین. پەکی کەوتبوو. بەتانیەکی پێ بوو هاواری دەکرد بۆ ئازاد هەورامی دەیوت:
" –کاك ئازاد من ناتوانم بڕۆم، ئەو بەتانیەش فڕێ ئەدەم خۆم ئەدەم بە عەرزا."
ئازادیش هەر دڵنەوایی دەکرد دەیوت:

" –بە قوربان برۆ زۆرمان نەماوە بگەینە ئاوەدانی."
منیش زۆر بێزار بووم وتم:
" –کوڕە خۆت ئەدەی بە عەرزا قیروسیا خوای ئەکرد ئەمردیت. چیت لێ بکەین."
وەزعیشی زۆرخراپ بوو. تۆزێکی تر رۆشتین پێشمەرگەیەکی تر کەوتبوو بە ناوی ئازاد لە مەفرەزەی ملازم تایەری عەلی والی. ئەویش هەر مردبوو لە ناو بەفرەکەدا جێیان هێشتبوو. کوڕێکی زۆرگەنج بوو. من بۆ خۆم ئەو دوانەم دی، کە مردن لە برساو لە سەرمادا. رەنگە زیاد لە (٢٠) پێشمەرگە مردبوون، بەڵام هەر ئەو دوانە لە سەر رێگاکەدا کەوتبون. ئیتر وای لێهاتبوو کەس بە تەمای ئەوە نەمابوو بژی. زۆر نا ئومێد بووین، بە تایبەتی لە شاخی کێلە شین. زۆر کوێستان‌و چۆڵەوانیش بوو. عەلی عەسکەریش هەر دەیوت:
" –زۆرمان نەماوە بگەینە ئاوەدانی."
بەڵام کەس بڕوای بە قسەی نەمابوو، چونکە، کاك عەلی هەر لە قەندیلەوە دەیوت:
" –تۆزێکی تر ئەگەینە ئازووقەو خواردن، وا لە سەر رێگاکە بۆیان داناوین."
هیچ وا نەبوو. لە بەر ئەوە کەس بڕوای بە قسە نەمابوو. ناحەقیشیان نەبوو. ئەوانەی، کە پارەکەیان دابوێ بۆ خواردن، کە بۆمان دابنێن لەو شوێنانەدا درۆیان لەگەڵ کردین. پارەکەیان خواردو خواردنیشیان بۆ نەهێنایین. بۆیە وامان لێ بە سەرهات. بە نائومێدی‌و بە ماندوی‌و بە هیلاکی ریزمان بەستبوو، بە رێگادا دەڕۆیشتین بە دوای چارەنووسێکی نادیاردا. کاتێکمانزانی گەیشتینە دۆڵێ. سەیرمانکرد دووسێ چادر دەرکەوت هەر لە خۆمانەوە دڵمان پێ خۆش بوو. وتمان دیارە لە ئاوەدانییەوە نزیك بووینەتەوە. ئێمە لە دواوە بووین لەگەڵ ئازاد هەورامی‌و عەلی عەسکەری‌و برادەرانی تر. لە دواوە سەیرمانکرد پێشمەرگە هەمووی رایکرد بۆ ناو خێمەکان وتمان:
" –ئەبێت چی تیابێت وا هەموو پەلاماری ئەو چادرانەیاندا."
کەس دیار نەبوو لە دەوری چادرەکان لە دواوە چاومان لێ بوو برادەران پێشمەرگەکانیان دوورخستەوە لە چادرەکان. ئێمەش گەیشتینە ئەوێ سەیرمانکرد، رەنگە (١٠) فەردە ئاردو (٤) تەنەکە رۆن‌و (٤–٥) فەردە شەکری وردەی لێ بوو، جگە لە(٤–٥) مەنجەڵی زۆر گەورەو هەندێ قاپ‌و کەوچك. کەسیشی لێ نەبوو زۆر چۆڵەوانی بوو. ئیتر دەست کرا بە ئامادەکردنی خواردن. چوار پێنج نەفەریان دانا، ئاردیان دەکردە ناو مەنجەڵەکانەوە لەگەڵ رۆن‌و شەکرو ئاو. تۆزێ گەرمیان دەکرد. هەر یەکەی کەوچکێك یان دوو کەوچکی چێشت خواردنیان دلینێ، دەمانخوارد. زۆر باش بوو هەموو زیندو بووینەوە. تۆزێ بوژاینەوە. بەوە هێزەکە لە مردن رزگارمان بوو. ئیتر نازانم ئەوە بۆ ئێمەیان دانابوو، یان بۆ ئەوەبوو دوای بەفرو باران کۆچەری خۆیان بێنە ئەوێ. گرنگ ئەوەبوو دەوری (٦٠٠) نەفەر لە مردن رزگار بووین. ئەوەمان خواردو

به رێكەوتینەوە. عەلی عەسكەری كۆبوونەوەیەكی پێ كردین. دوای ئەوەی زۆر باسی قارەمانی هێزەكەی كرد وتی:

" -تەواو رزگارمانبوو. زۆرمان نەماوە ئەگەینە ناوچەی (لۆلان) هەموو دۆستی خۆمانن. یەك جێگای زۆر باش هەیە ناوی (دۆڵی سالاری) یە زۆر دارستانە. ئەچینە ئەوێ. زۆر خۆشە بۆ خۆمان ئاگرئەكەینەوە، ئەنێرم نان‌و خواردنی زۆرمان بۆ بێت. حەیوانی زۆر ئەكڕین یەك هەفتە لەوێ ئەمێنینەوە. حەقی هەمووی ئەكەینەوە."

دووسێ جار كۆبوونەوەی كرد. باسی دۆڵی سالاریی كرد لە ناوچەی لۆلان‌و شێخان. ڕۆیشتین چووینەوە دیوی كوردستانی عێراق. ئیتر رەبایەكانی دەركەوتەوە. لە ئێران رزگارمان بوو، ئینجا دەبێت وریای هەلیكۆپتەرەكانی عێراق بین. رەنگە (١٥٠) نەفەر تەسلیمی ئێران بووبێتەوە بە دزیەوە. كە گەشتینە دێهاتەكانی كوردستانی عێراق، نانیان بۆ دەهێنایین. لە گوندەكان لامان نەدەدا. دووسێ پێشمەرگەیان دەنارد نانیان كۆدەكردەوە دەیان هێنا. ئیتر كێشەی خواردنمان نەما. دنیاش خۆشی كرد بەهار بوو. پێمان نەزانیبوو پێشمەرگەیەك خۆی دزیوەتەوە چووە تەسلیم بە رەبایەكانی عێراق بووە. بە وردی وەزعی هێزەكەی باسكرد بوو، كە چۆنەو چیمان بە سەر هاتووە. پێشی وتوون دەچن بۆ

دۆڵی سالاری، كە عەلی عەسكەری دووسێ ڕۆژبوو باسی دەكرد. ئێمەش كەس نازانێ، كە پێشمەرگە تەسلیم بۆتەوە، بەلآم بە رێكەوت نەچووینە ئەو دۆڵەی، كە بە نیاز بووین بچین. چووینە ئەو لاتر (دۆڵی خرێنە)یان پێ دەوت. بەیانی زوو گەیشتینە ئەو دۆڵە. زۆر دارستان بوو. زۆر دوورو درێژیش بوو. ئەوەندەش قووڵ بوو، بە حاڵ چاومان لە ئاسمان بوو. هەموو هێزەكە خۆیانكرد بە دۆڵەكەدا. ئێمە لە دواوە بووین. من‌و ئازاد هەورامی‌و كاك ملازم عومەر بووین برادەرێكی ئێرانیمان لەگەڵ بوو ناوی (بەشیری خەسرەوی) بوو بە (مەحمود) ناسرابوو رێكخراوەكەیان (سازمانی ئینقلابی) بوو. كاتی خۆی لەگەڵ مام جەلال‌و برادەران، لە سوریاوە گەڕابونەوە بۆ كوردستان لەگەڵ برادەرێكی تر بە ناوی (دكتۆر حسێن) لەگەڵ ئێمە بوو. زۆر قارەمان بوو. ئەو هەموو ناخۆشییەمان بە سەر هات، ئەو هەر بە خەیاڵیدا نەهات. كۆڵێكی گەورەشی بە كۆڵەوە بوو. زۆر هانی پێشمەرگەكانیشی دەدا ورەی بەرز دەكردنەوە. دكتۆر حسێن لای مام جەلال‌و كاك نەوشیروان مابۆوە. لە خوار هێزەكەوە ئاگرمان كردبۆوە. كۆمەڵێ كادری كۆمەڵەشمان لەگەڵ بوو. ئەوانەی ناوەكانیانم لە یاد ماوە ئەمانە بوون: كاك شۆڕش ئیسماعیل، كاك ئاولتی شێخ جەناب، دوانی كەركوكیش بوون یەكێكیان ناوی ساجیدو ئەوی تریان ناوی ئەڵماس، نازناوەكەی (هەڵمەت) بوو. خوا تەمەڵی وای دروست نەكردبوو، دامابووین بە دەستیەوە. برادەرێكی تریشمان لەگەڵ بوو ناوی دكتۆر ئاسۆ بوو. یاریدە دەری پزیشكی بوو. خۆی ناوی جەلال بوو لە قەرەداغ بوو. ئەویش هاتبوو. هەر ئەوەندەم لە یاد ماوە. نان‌و چای بەیانیمان خواردو هەموو

خەومان لێکەوت. هەر ئەوەندەمزانی دەنگی هەلیکۆپتەر هات. هەموو هەڵساین خۆمان کۆکردەوە. هەلیکۆپتەرەکان یەکسەر ڕۆشتن بۆ ئەو دۆڵەی، کە بڕیار بوو بچین. پۆل پۆل هەلیکۆپتەر بە سەرماندا دەڕۆشتن بۆ (دۆڵی سالاریێ) دیار بوو پێشمەرگە ئەوەندە هیلاك بوون، گوێیان نەدا بەوەی هەڵسن خۆیان کۆبکەنەوە. ئەوان چووبوونە ئەو جێگایەی، کە بەتەما بوون ئێمەی لێبین، بەڵام کەسی لێ نەبوو. ئەوجا هەلیکۆپتەرەکان کەوتنە گەڕان بە دواماندا بەرەو ئەو جێیەی، کە ئێمەی لێبووین. هاتن. هاواریانکرد:

" –ئاگرەکانتان بکوژێننەوە."

یەك دوو جار گەڕان بە دۆڵەکەدا. کاتێکمانزانی، لە پڕ ئەو دۆڵە بوو بە ئاگر. ناو دۆڵەکەیان داگرتەوە وەك باران ساروخیان دەباران بە سەرماندا. دوای نیوەڕۆ بوو، بۆ یەك دەقیقەش بواریان نەدەدایین. ئیتر ئێمە ئاگامان لە سەرو خۆمانەوە نییە، نازانین چی ڕووی داوە؟ هێزیشی دابەزاندبوو، هەموو بەرزلییەکانیان لێگرتبووین. هاتنە سەرمان. لە سەر ئەو هەموو ماندوبونو ناخۆشیەشداو لەژێر ڕەحمەتی ڕۆکێتەکانی هەلیکۆپتەرو جەیشی پیادە، پێشمەرگەکان هێرشیان بۆ کردنەوە لە خوار ئێمەوە. یەکێ لەو پێشمەرگانەش شەهید جەمالی عەلی باپیر بوو. هێزەکەیان شکاند. زۆریان لێ کوشتن هەتا دیلیشیان لێ گرتن. زۆر قارەمانانە لێیاندان. ئێمە هەموو بێ چەك بووین. ئەوانەی کادری کۆمەڵە بوون. بەس من دەمانچەیەکم پێ بوو. هەندێ برادەری تریش چەکیان پێ بوو. ئێمە هەر لە ناو دۆڵەکەدا ماینەوە. هەلیکۆپتەر بە بەردەوامی بۆردومانی دەکردین. ئەم پۆل دەڕۆیشت پۆلێکی تر دەهات. باش بوو ڕۆژ ئاوا بوو، بەرەو تاریکی دەڕۆیشت. هێزێکی زۆری پیادەشی دابەزاندبوو. وتیان:

" –کاك عەلی دەڵێت هەر بە دۆڵەکەدا وەرن بە دوامدا بەرەو سەرەوە."

ئێمە دوا وەجبە بووین لە دواوە. ڕۆیشتین لە ناکاو چ دیمەنێکمان بینی! وەك قەسابخانە دەهاتە بەر چاوم. ئەو هەموو پێشمەرگەیە شەهیدو بریندار بوو بوون. لە ژوور ئێمەوە (عەبدوڵای مەلا) گۆرانی بێژو هونەرمەند شەهید ببوو. ساروخێکی بەرکەوتبوو، بڕوا بکەن کردبووی بە دوو کەرتەوە. ئیتر هەر ناوی عەبدوڵای مەلام لە بیرە. زۆرتربوون بە لای کەمەوە (٤٠–٥٠) پێشمەرگە شەهید ببوون، بێجگە لەو هەموو بریندارە. لە ناو بریندارەکاندا (ئەنوەری سەعید بەگ)[45] بریندار بوو، بە جێیان هێشتبوو. وەزعی زۆر خراپ بوو. دەتوت بێژنگە هەموو گیانی کون کون بووبوو، نەیدەتوانی بجولێ. هەڵمان گرت بۆ ئەوەی هەر تۆزێ لە جێگای شەڕەکە دووری بخەینەوە. زۆر قورس بوو، بە زۆری کاك (مەحمود)، کە زۆر بە هێزبوو لەگەڵ ملازم عومەرو مامۆستا سەلام عەبدوڵلا، هەڵیان گرت. ئێمە خۆمان بەکێش دەکرد. بردمان

---

[45] - ئامۆزای تایەری عەلی والی بوو، شەهید بووە.

دوورمان خستەوە. زۆر نازابوو یەك هاواری نەکرد. بەو هەموو برینەوە، هەر بە خەیاڵیا نەدەهات. چار نەبوو بردمانە بن بەردێکەوە. دووسێ بەتانیمان پێ بوو، هەموومان پیاداو بە جێمان هێشت. وتمان:

" -رەنگە دوو سێ سەعات بژیوو دوایی بمرێ. یان ئەگەر زووش نەمرێت، خۆ هەر ئەمرێتن."

چونکە ناتوانێ بڕوات بۆ جێگایەك. بڕوا ناکەین کەسیش بەو ناوەدا تێپەڕێ. یان بەیانی عەسکەر دێنەوە ناوچەکەو جەنازەکەی دەگرن. کە بەجێمان هێشت زۆر بەزەیم پیادا دەهاتەوە، کە چی خۆی زۆر بە ورە بوو. ڕۆشتین بەیانی گەیشتینە کۆتایی دۆڵەکە. چووینەوە دیوی ئێران وتیان:

" -ئەمە (دۆڵی گادەر)ە."

زۆر ناخۆش بوو. لەوێشەوە بە ڕێکەوتین. بەیانی زوو بوو، شۆڕبووینەوە بە دیوی دۆڵی (خوا کورك)دا زۆر سەخت بوو، کە لە شاخەکە چووینە خوارەوە سەیرمانکرد برادەرانی خۆمان لەوێن. وەزعیان زۆر باشە بۆ خۆیان لەو ناوە بوون. زۆر بە ئاسانی گەیشتبوون. ئەو هێزەی کاك دکتۆر خالیدو ئەوان نەچووبوونە دیوی ئێران، هەر بە ناو گوندەکانی کوردستانی عێراقدا ڕۆیشتبوون. زۆر باش بوون. بەیانی زوو بوو، کە چاویان بە ئێمە کەوت چیمان بە سەر هاتووە، دەتوت هەموو لە قەبر هاتووینەتە دەرەوە. بڕوا بکەن پێشمەرگەمان هەبوو من بۆ خۆشم نەم دەناسییەوە، وای لێهاتبوو. نانمان نەخواردبوو، ئەو هەموو شەڕەشمان لە سەر بوو. ئێران – عێراق لێیان دەداین. ئەوە بەفرو بارانو سەرمای ئەو کوێستانەش لەو لاوە بوەستێ. ئەو بەیانیە هەموو بە سەر ئەواندا دابەش بووین. من چوومە لای کاك نەبەزو جەمالی عەلی باپیرو ئەوان. شیریان گەرم کردبوو زۆر خۆش بوو بە لامەوە. هەر بۆیان تێ دەکردم دەم خواردەوە. زۆر دەمێك بوو هیچمان نەدی بوو. کورد ئەڵێ (چاوی چووە) بە ڕاستی چاومان چووبوو. نان و چامان خوارد. تازە سەعات هەشتی بەیانی بوو، کاتێکمان زانی(٨) هەلیکۆپتەرمان لێ پەیدا بوو. هەر هات و دایگرتینەوە. ئەوان وتیان:

" -بە خوا بە دوای ئێوەدا هاتوون. ئەگینا ئێمە یەك هەفتەیە لێرەین، بۆ نەهاتوون.؟"

وتم:

" -بە خوا ڕاستە."

هەلیکۆپتەر لێی داین، هەر لە هەشتی بەیانیەوە هەتا ئێوارە. شوێنەکەمان زۆر قایم بوو. کەسمان لێ شەهیدو بریندار نەبوو. کە دنیا تاریکی کرد، هەموو هێزەکە کۆبووینەوە. وتیان:

" -ئەڕۆین."

هەر لە ئێوارەوە بە ڕێکەوتین. بە شاخێکدا ڕۆشتین هەر نەگەیشتین. بۆ دەوری بەیانی گەیشتینە سەر شاخەکە. لە پەلوپۆ کەوتبووین. چووینە خوارەوە ئاوێك بوو. من قەت ئەو ناوەم نەدی بوو، نەشم بیستبوو. ئاوەکە زۆر ساردبوو وتیان:

" —خێراکەن بڕۆین."

لە ئاوەکە پەڕینەوە بەرزیەك بوو. سنووری سێ گۆشەکە بوو. وتیان:

" —سەرکەون ئەمە سنورە. بچینە ئەو دیو، کوردستانی تورکیایە. ئیتر ترسمان نامێنێ لە هەلیکۆپتەر."

لە ئاوەکە پەڕینەوە چووینە ئەو بەر. تۆزێ ڕۆشتین بەرزییەك بوو، لە بەرزیەکە چووینە خوارەوە، دارستانێ بوو. چاومان بە گوندێکان کەوت وتیان:

" —ئەوە گوندەکانی کوردستانی تورکیا یە."

دوو گوندیان لە ئێمەوە زۆر نزیکبوو. ناوی (ماسی ڕۆ و گارێ)بوو لە ناوچەی (شەمزینیان). چووینە ناو ئەو دارستانەوە. دیاربوو لە ناو گوندەکاندا دۆستی خۆمانی تیابوو. هەر ئەو ڕۆژەی گەیشتین، یەکسەر لە گوندەکانەوە بە بار نانو خواردن هات. زۆربەی بە پارەبوو. هەرچیمان بویستایە هەبوو. دەچوون دەیان هێنا. ڕۆژانە بە دەیان خەڵك شتیان دەهێنا. ئیتر بووژاینەوە. نزیکەی (١٠) ڕۆژ لەو دۆڵەداماینەوە. ڕۆژانە کۆبونەوەیان دەکرد. عەلی عەسکەریو برادەرانی ترو زۆربەی لێپرسراوانی یەکێتی لەوێ بوون. هەر مام جەلالو کاك نەوشیروان لەوێ نەبوون. دیاربوو ئەو دۆستانەی خۆمانیان بانگ دەکرد بۆ ئەوەی دەنگوباسی تورکیایان پێ بڵێن. بڕیاریان دابوو خۆیان بڕۆن بەرەو (هەکاری) کاك ئازاد لە کۆبوونەوەکانیاندا بەشدار بوو. ئەو کاتە ئەو نوێنەری کۆمەڵەبوو. لە هەموو کۆبوونەوەکانی یەکێتیدا بەشدار بوو. ملازم عومەریش هەر کۆمەڵەبوو. ئەویش ئەندامی مەکتەبی عەسکەری بوو. عەلی عەسکەریو ملازم تایەری عەلی والی هەر دووکیان مەکتەبی سیاسی بوون. دکتۆر خالیدو شێخ حسێنو تالب ڕۆستەم ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی بوون. دیاربوو لە کۆبوونەوەکانیاندا بڕیاریان دابوو، ئەو بڕیارەی تۆکان هەڵبوەشێننەوە. عەلی وتبووی:

" —ئێمە زۆرینەی دەنگین."

ئازاد هەورامی بۆی باسکردم. دۆستەکانی خۆمان لە تورکیا پێیان وتووین:

" —مەچنە ناوەوەی تورکیا، چونکە لێتان ئەدەن."

ئەو کاتە (قیادە موئەقەتە) لە ناو کوردستانی تورکیا بوون (میت)ی تورکیش ڕێی پێ دابوون. لە ناوچەکەدا ئازاد بوون. بە ئارەزوی خۆیان هاتوچۆیان دەکرد. بە هەموو گوندەکانی سەر سنووری کوردستانی تورکیایان ڕاگەیاند بوو، کە ئەوانە جاشی عێراقین، پارەو چەکی زۆریان پێیە. بڕۆن لێیاندەن پارەو چەکو هەرچیەکیان پێیە، بۆ خۆتان. بەس خۆیان تەسلیم بە ئێمە بکەن. دیاربوو ئەو گوندانەی سەر سنور زۆر دواکەوتوو شڕەخۆر بوون. ئیتر هەر لە بەر شڕەخۆری بوو یان بە ڕاستی بڕوایان

کردبوو، که ئێمه جاشی عێراقین، بەڵام مەسەلە هەر شرەخۆری بوو. هەموویان ئامادەبوون بۆ لێدانی ئێمە. پێش ئەوەی برادەران بە ڕێ بکەون، قاچاخچییەکیان بۆ ئێمە پەیداکرد بمانبات بۆ سوریا. ئێمە (١٠) نەفەر بووین. سەرەتا هەر من بووم. لە ڕێگا (٧) پێشمەرگەی بادینی لە وانەی لای (شێخ حسێن) بریندار بوون. وتیان:

" -با ئەوانیش بڕۆن."

ئەوان کاتی خۆی لە سوریاوە هاتبوونەوە. ماڵو منداڵیان لە سوریا بوو. دوو پێشمەرگەی خۆشمان نەخۆش بوون، بە ناوی هەڵمەتو شەوکەت. بەوانەوە بووین بە (١٠) کەس. (٧) پێشمەرگە بادینیەکەیان پێش ئێمە نارد. من بەوە زۆر تووڕە بووم، بە کاک ئازاد هەورامیم وت:

" -من هەر ناڕۆم، لەگەڵ ئێوە دێم."

بەڵام ئەوان زۆر تکایان لێ کردم، کە گوێی نەدەمێ وتیان:

" -با ئەوان بڕۆن."

گوایە ئەوان برینداربن، بەڵام واش نەبوو. بە حاڵ دەمو چاویان پارچەی وردی بەرکەوتبوو. ملازم تایەر دوو بە قەد ئەوان بریندار بوو. کاک ملازم عومەرو کاک ئازاد وتیان:

" -ئێستا لەوانەیە بڵێن ناوێرێ لێرە بەجێبمێنێت."

بەوە وایان لێ کردم وتم:

" -باشە با ئەوان بڕون."

قاچاخچیەکە ئەو ڕۆژە ئەوانی برد. ئێمە سێ نەفەربووین ماینەوە. بۆ ئێوارەش هێزەکە بە ڕێکەوتن لە (ماسی ڕۆ)وە بەرەو (هەکاری) ئیتر من خواحافیزیم لە برادەرانی خۆمانکرد. ئەو دەمانچەیەی پێم بوو دام بە کاک ملازم عومەر. ئەوانیش چەند کەسێك بوون، بڕیار بوو بێن بۆ سوریا لەوێشەوە بۆ خولێك لە لوبنان. وتمان:

" -هەموو لە سوریا یەك ئەگرینەوە."

کاک ملازم عومەر وتی:

" -دەمانچەکەت بۆ ئەفرۆشم، دوایی لەگەڵ خۆم پارەکەت بۆ دێنم."

وتم:

" -باشە."

خۆشم هیچ پارەیەکی وام پێ نەبوو. دەوری (٢٠) دینارم پێ بوو. پارەی قاچاخچیەکەیان دابوو. بڕیار بوو هەتا سوریا بمانبات. ئێوارە بوو ئەوان بە ڕێ کەوتن ڕۆشتن. ئێمەش سێ نەفەر بووین، کە لەوێ ماینەوە بە برادەرێکیان سپاردین. ناوەکەیم لە یاد نەماوە. لێپرسراوی ئەو ناوەبوو لە گوندی (گارە) دادەنیشت. دیاربوو برادەران پارەی باشیان دابوو بە ئەویش. خۆی بە دۆستی یەکێتی دادەنا. ئەو شەوە بردینیەوە بۆ ماڵی خۆیان. بۆ بەیانی بردینی بۆ شاخەکە وتی:

" —ناو دێ مەترسی هەیە، چونکە جەندرمەی قەرەقولەکان دێنە ناو دێکەوە."
کابرای قاچاخچی، کە نەفەرەکانی تری برد وتی:
" —هەر شەش رۆژم پێ ئەچێت دێمەوە بە دوای ئێوەشدا."
وتم:
" —شەش رۆژ هیچ نیە با بڕوات."
١٠ رۆژی پێ چوو. هاتەوە وتی:
" —با بڕۆین."
بە شاخ و داخی ئەو ناوەدا بردینی. بە شەو دەڕۆیشتین بەو شاخەدا دەیوت:
" —خۆتان دانەوێنن."
زۆر سەیر بوو بە لامەوە! ئاخر بەو شەوەو بەو شاخەوەو زۆر دارستانیش بوو، کێ چاوی لە ئێمەیە؟ زۆر کابرایەکی ترسنۆك بوو. ئیتر نازانم بە ئەنقەست وای لێ دەکردین یان بە راستی بوو. سێ شەوو سێ رۆژ رۆشتین. هەر بەو شاخەدا بردینی. لە نزیکی (گەڤەر) لە شاخەکەدا داینایین‌و خۆی رۆیشت وتی:
" —ئەچم ئوتۆمبێل دێنم بۆتان. خۆتان باش بشارنەوە."
وتمان:
" —باشە. برۆ بەس نەجاتمان بێت لە دەستت."
بۆ شەوی دوایی هاتەوە هەر لە دورەوە وتی:
" —بۆ دواوە بگەڕێنەوە."
ئێمەش زۆر پەست بووین، لە داخا نەماندەزانی چی بکەین؟ چۆن هەم دیسان بەو شاخەدا بگەڕێینەوە؟ وتمان:
" —چی یە بۆ بگەڕێینەوە.؟"
وتی:
" —برادەرانتان کەسی نەماوە. هەموو گیراون‌و کوژراون. قیادەی موئەقەتە هەموویانی گرتووە."
ئێمەش دەمانوت:
" —ئەم سەگبابە بە درۆوە وا دەڵێت بۆ ئەوەی نەمان بات."
وتی:
" —ئەو کابرایەی من چووم بۆ لای سەیارەکەی بێنم بتان بات، بووە بە قیادە موئەقەتە. ئێستا پێشتان بزانێت، ئێوەش ئەگرێت. با زوو بڕۆین."
ئێمەش هەر بڕوامان بەو نەدەکرد دەموت:
" —هەر بۆ ئەوە وا دەکات پارەکە بخوات. یان داوای پارەی زیاتر دەکات. خۆ چاریش نەبوو. بە بۆڵە بۆڵ دوای کەوتین. بە سێ چوار شەو و رۆژ هێنایینیەوە گارە، بۆ لای ئەو برادەرەی، کە لای بووین پێی وت:

" -با بزانم چۆن ئەبێت. ئەگەر خەڵکم دۆزییەوە، دێمەوە بە دولیاندا."
هەر ئەو هاتنەوەیەبوو، کە وتی. کابرای (گارە)ش ئەو لوتفەی جارانی نەمابوو. ئیهمالی کردبووین. هەر بە شاخەوە بووین. وەزعمان زۆر ناخۆش بوو. ئیتر بۆمان دەرکەوت قسەی کابرا راستبوو. برادەران هەر هەموویان تیاچوو بوون. کاك عەلی عەسکەری هەر یەکەم رۆژ گیرابوو. لە هەموو گوندەکانەوە لێیان دابوون. ئەوانیش هەموو نەشارەزا بوون. لە برساندا رویان کردبووە هەر گوندێك بۆ نانخواردن، لە باتی نان فیشەکیان پێوە نابوون. حاڵیان زۆر خراپ بوو. نیوەیان بە شەڕ دەرچوو بوون. دکتۆر خالیدو کاك ملازم عومەرو کاك ئازاد هەورامیو شێخ حسێن، زۆر دورکەوتبوونەوە لەو ناوە. دکتۆر کەمال خۆشناو لە سوریاوە هاتبۆوە بۆ لایان، چەکی بۆ هێنا بوون. ماوەیەك لەو ناوە مابوونەوە. دیسانەوە لە هەموو لایەکەوە هێزیان لە سەر کۆکردبوونەوە، لێیان دابوونەوە، ئەوانیشیان لەناو برد. ئەوەی گیرا گیرا. زۆریشیان شەهید بوون. لەوانە رەئوف بەگ ئامر هەرێم بوو. هێزێکی زۆریش چوونەوە خۆیان بە دەست رەبایەکانی عیراقەوە دا. تالیب رۆستەم خۆیو (١٥٠) کەس لە پێشمەرگەو کادر تەسلیمی عێراق بوونەوە. ئیتر ئەو هێزە گەورەیەی یەکێتی هەموو کوژرانو گیران. یەکێتی هەر هەڵوەشایەوە. هەموو هێزەکەی هەر ئەوەبوو. بڕوا ناکەم لە خوارەوە بە هەموو هەرێمەکان (٢٠٠) پێشمەرگە مابووبێ. من لە ناوچەی شەمزینیان مامەوە. ئەو کابرایەی، کە ئێمە لای بووین پێی وتم:
" -برۆ با بتبەم بۆ رەبایەکانی عێراق، خۆت تەسلیم بە عێراق بکەرەوە. تازە بە تەمای چیت؟ تەواو بوون. یەك نەفەرتان نەماوە."
ئیتر حەربی نەفسیی لەگەڵدا دەکردین. بە دەست ئەو دووانەشەوە تووش بوو بووم، نەمدەزانی چییان لێ بکەم. ئەوانیش شەریان پێ دەفرۆشتم. شەوو رۆژ بۆڵە بۆڵیان بوو، هەر دەیانوت:
" -با برۆین بۆ سوریا."
پێم دەوتن:
" -چۆن بچین بۆ سوریا؟ بێ پارەو بە ناشارەزایی. ئێوە بۆ ناڕۆن؟ من بۆ خۆم ئەگەڕێمەوە بۆ لای مام جەلال و کاك نەوشیروان."
ئەوانیش دەیانوت:
" -کێ ئەڵێت ئەوانیش ماون.؟"
وتم:
" -ئەوانیش نەمابن، پێشمەرگە بەشی من هەر ئەمێنێت."
دەمزانی مام جەلالو ئەوان هەر لە بەری (قەندیل)ن. بەڵام نەم دەزانی چۆن بگەڕێمەوە؟ نا چار هەر لەو ناوە ماینەوە. هەر ماوەی دەچووین بۆ گوندێك. ماوەیەك لە ماڵی پیاوێك بووین، ناوی (مام خورشید) بوو. رۆژێ ئەوەندەم زانی (ئەنوەری

سەعید بەگ) یان هێنا. زۆر سەیر بوو بە لامەوە! وەك ئەوە وابوو بڵێن مردوویەك لە گۆڕستان زیندو بۆتەوەو هاتۆتەوە. چۆن ئەمە نەمردوە!؟ ئەوەی لە خەیاڵمدا نەبوو، بینینەوەی ئەنوەری سەعید بەگ بوو وتم ئێسقانیشی رزیوە! زۆرم پێ خۆش بوو کاك ئەنوەر ماوە، چونکە کاتی خۆی بە برینداری لە بن بەردێکدا بە جێمان هێشت وتمان دەمرێت لە بەر ئەوەی ئازای ساغی نەمابوو. لێم پرسی:

" -کاك ئەنوەر چۆن هاتی بۆ ئێرە چۆن ماویت ئەو ماوەیە لە کوێ بوویت.!؟"

وتی:

" -ئەو شەوەی ئێوە دەرتانکردم لەو جێگایەی، کە لێی بریندار بووم. شەو لە بن شاخەکەدا بووم. بۆ بەیانی عەسکەر هات بۆ ئەو ناوە، باش بوو، منیان نەدۆزییەوە، چونکە زۆر دورتان خستبومەوە. دوو رۆژ دوای شەڕەکە زەلامێك هات بۆ ئەو ناوە، منی بینی بە برینداری کەوتوم، بردمیەوە بۆ ماڵی خۆیان. ماوەیەکی زۆر خزمەتیان کردم هەتا وەزعم باش بوو. دوای ئەوە هێنامیان بۆ تورکیا، بۆ دەوری (ماسی ڕۆ و گارە. دیارە ئەو گوندانەی سەر سنوور هەموو لەگەڵ یەك تێکەڵییان هەیە. بە حوکمی ئەوەی هێنابومیانەوە بۆ دیوی تورکیا."

ئەوانیش ئەو دووسێ گوندە هەموویان دەیانزانی ئێمە لەوێین. هێنابوویان بۆ لای ئێمە. ماوەی زۆر خزمەتمان کرد، دەیتوانی بۆ خۆی وەك ئێمە بڕوات. ئیتر من نائومێد بووبووم لەو ناوە. بەو برادەرانەی ئەوێم وت:

" -نەفەرێکمان بۆ پەیدا بکەن بە پارە بمانبات بۆ لای برادەرانی خۆمان."

دەیانوت:

" -کەس نیە. برادەرانی خۆتان کەس نازانێت لە کوێن."

راستیشیان دەکرد. مام جەلال‌و کاك نەوشیروان، هەر ماوەی لە جێگایەك بوون. نەیان دەوێرا خۆیان زۆر ئاشکرا بکەن لە خەڵك. بۆیە نەیاندەزانی لە کوێن. دوو مانگ ماینەوە لەو ناوەدا. زۆر بە ناخۆشی بردمانە سەر. ئەو برادەرانەی خۆمان ولیان بە سەر هاتبوو. یەکێتی لەوێ نەمان. ئەو دۆست‌و برادەرانەی خۆشمان باوەڕیان نەمابوو. دیاربوو هەندێ لەو دۆستانە بەرژەوەندیان هەبوو لەگەڵ (یەکێتی)دا. ئیتر بە تەمای ئەوە نەمابوون جارێکی تر یەکێتی دەچێتەوە ئەو ناوە. واش بوو. بۆ چونەکەیان راست بوو. ئێمەشیان پشتگوێ خستبوو. بۆ خۆمان هەندێ ناسیاومان پەیدا کردبوو، نان و چایان دەداینێ. بە رۆژ دەچووین بۆ دەرەوەی گوندەکە. بە شەویش دەهاتینەوە بۆ ماڵەکان دووکەس دوو کەس. من بۆ خۆم لە ماڵی مام خورشید بووم لەگەڵ یەك برادەریان ناوی هەڵمەت بوو . بە راستی زۆر ماڵێکی باش بوون.

رۆژێکیان لە دەشت بووین، برادەرێك هات بۆ لامان ناوی حەمە عەرەب بوو. خەڵکی گوندی (ماسی ڕۆ) بوو. ئەوە یەکەم جار بوو بیبینم. کەوتینە وتووێژ کردن. بۆم

باسکرد چۆن لێره گیرمانخواردووەو دەمانەوێت بگەڕێینەوه بۆ لای برادەرانی خۆمان. نازانین چۆن بڕۆینەوه؟ شارەزانین‌و کەسیشمان دەست ناکەوێت. وتی:

" —من لای مام جەلال‌و ئەوان بووم. وەزعیان زۆر باشه."

کە وای وت، یەکەم جار بڕوام پێ نەکرد وتم بزانه به تەمای چیه لەگەڵمان بکات. پێم وت:

" —تۆ چۆن مام جەلال ئەناسیت؟ بۆ چی چوویت؟ مام جەلال‌و کاك نەوشیروان له کوێن؟"

وتی:

" —دەمێکه ئەیان ناسم. من بۆ خۆم یەکێتیم. هەر ئیش بۆ یەکێتی ئەکەم."

کە ئەو زانیاریانەی وت، بڕوام پێ کرد، چونکه ئەیزانی له کوێن ڕاستی دەکرد. وتی:

"—من لەم ڕۆژانەدا ئەچمەوه بۆ لای ئەوان. ئەگەر ئیشت هەیه من پێیان ڕائەگەیەنم."

وتم:

" —ئەی بۆ ئێمەش لەگەڵ خۆت نابەیتەوه.؟"

وتی:

" —ناتوانم ئێوەبەرم، چونکه من به ناو ئێراندا ئەڕۆم. ئێوه ئەگیرێن. نامه بنوسن بۆتان ئەبەم بۆ لای مام جەلال‌و برادەران، زووش دێمەوه."

ئیتر چۆن ئەڵێی له ئاسمانەوه بۆیان ناردوینەته خوارەوه، وا بوو به لامانەوه. زۆر خۆش بوو. هەواڵی برادەرانی دامێ، کە ئەوان باشن. خۆشمان ڕزگارمان دەبێت لەم حاڵه ناخۆشه. من دوو نامەم نوسی. یەکێکیان بۆ مام جەلال، ئەوەی تر بۆ کاك نەوشیروان. باسی خۆمانم بۆ کرد، کە له کوێین‌و حاڵمان چۆنه. سێ برادەریشم لەگەڵدایه بەڵکو فریامان بکەون بێینەوه بۆ لای ئێوه. نامەکانم دا به حەمه عەرەب‌و ڕۆیشت وتی:

" —ڕەنگه یەك هەفتەم پێ بچێت. دێمەوه لاتان."

ئیتر نەمدەزانی چۆن ئەو هەفتەیەم لێ ڕۆیشت. ماوەیەکی پێ چوو حەمه عەرەب هاتەوه. نامەیەکی کاك نەوشیروانی بۆ هێنام. کاك نەوشیروان زۆری پێ خۆش بوو، کە بیستبووی ئێمە دووسێ برادەر ماوین‌و دەرچووین. له نامەکە دا دەڵێ:

" —(کاك حەمه عەرەب دۆستی خۆمانەو زۆرکوڕێکی باشه. ئەو خۆی ئەتان هێنێتەوه. لەگەڵ ئەودا بگەڕێنەوه.)"

دیار بوو حەمه عەرەب ئەو کاته تەتەر بوو له بەینی سوریاو مام جەلال‌و کاك نەوشیروان. نامەی دەبرد بۆ برادەرانی خۆمان له سوریا. ئەو کاته دکتۆر کەمال

خۆشناو نوێنەری یەکێتی بوو لە سوریا. دوو جاریش کاک شەماڵیان ناردبوو بۆ سوریا. هەر حەمە عەرب بردبووی، بەڵام ئێمە کاک (شەماڵ)[46] مان نەدی. حەمە عەرەب وتی:

" -خۆتان ئامادە بکەن ئەڕۆین."

ڕۆژێك بە ڕێکەوتین لە گارەوە بەرەو سنوری ئێران. لە سێ گۆشەکەی کوردستانەوە. مانگی هەشت بوو. ئەو سنورە هەر بەفربوو. زۆر سارد بوو. بە شەوو ڕۆژێ گەیشتینە گوندێ لە سەر سنووری ئێران ناوی (دزە) بوو. بەیانی زوو دنیا هێشتا تاریك بوو گەیشتین. بردینی بۆ ماڵێك وتی:

" -لێرە بن، تا دێن بە دواتاندا."

خۆی ڕۆیشت چوو بۆ (شنۆ) لەوێ بە دۆستەکانی خۆمانی وتبوو:

" -بچن بە دوایاندا لە فلانە ماڵن."

خۆشی ڕۆشتبوو بۆ لای مام جەلال‌و برادەران بۆ قەندیل. هەر ئەو ڕۆژە بۆ عەسر سەیرمانکرد، دوو برادەر خۆیان کرد بە ماڵەکەدا. تەوقەیان لەگەڵ کردین‌و تۆزێ دانیشتن وتیان:

" -با بڕۆین."

ئێمەش خواحافیزیمان لە ماڵەکە کرد. دیار بوو ئەو ماڵە دۆستی خۆمان بوون کۆمەڵێك کوڕی باشیان هەبوو. دۆستی یەکێتی بوون زۆر بە دڵسۆزی ئیشیان بۆ یەکێتی دەکرد. کە چووینە دەرەوە ئوتومبیلێکیان پێ بوو وتیان:

" -سواربن."

جێبێك بوو. ئەوان هەردووکیان لە پێشی جێبەکەدا سوار بوون. ئێمەش لە دواوە. وتیان:

" -ئێوە خۆتان لە هیچ مەگەیەنن. خۆتان بکەن بە کەڕەی شەربەت."

یەکێ لە کوڕەکان ناوی عەلی بوو. هەر زۆر کوڕی چاك بوو. سەرباز بوو. ئەو جێبەکەی لێ دەخوڕی پێم وایە لە ڕێگا دوو جار وەستانیانین. وەکو سەیتەرە وابوو، هەر عەلی قسەی دەکرد. ئیتر نەدەهاتن سەیری ناو جێبەکە بکەن. ڕۆیشتین گەیشتینە (شنۆ) من نەمدەزانی کوێیە. خۆیان وتیان:

" -ئەمە شنۆیە."

شەو بوو، کە گەیشتین. بردینی بۆ ماڵێك زۆر خۆش بوو. وتیان:

" -ماڵی (مامۆستا لەتیفە) زۆر بە ڕێزەوە پێشوازی لێ کردین. هەر بەو شەوە حەمامیان بۆ داخستین. خۆمان شت‌و جلەکانمان گۆڕی. زۆرمان پێ خۆش بوو زۆر دەمێك بوو شتی وامان بە خۆمانەوە نەدی بوو. نانیان بۆ دروست کردین، نانمان خواردو بە تەواوی حەساینەوە. تەلەفزیۆن ئیشی دەکرد. ئەو کاتەش سەردەمی (شا)بوو، ئێران

---

[46] - شێخ محەمەدی باخ.

بەرنامەی زۆر خۆشی هەبوو. پێشینان دەڵێ لە دوای ناخۆشی هەر خۆشی دەبێت. بۆ ئێمە وابوو. مامۆستا لەتیف زۆر پیاوێکی دڵسۆزو خەمخۆری گەلەکەی بوو. دوای دووسێ رۆژ بردمیان بۆ رەزایە بۆ لای دکتۆر، چونکە تەندروستیم زۆر خراپ بوو. هەر نەم دەتوانی برۆم بە رێگادا. لە وێ دکتۆر هەندێ عیلاجی بۆ نوسیم وتی:

" -دوای ماوەیەك بیهێننەوە."

هاتینەوە بۆ شنۆ ماوەی (١٥) رۆژ لە وێ بووین. زۆر خزمەتیان دەکردین. رۆژێك کورێك هات بۆ ماڵی مامۆستا لەتیف وتی:

" -ساواك خەبەری زانیوە، کە ئێوە هاتون بۆ شنۆ، بەڵام نازانێت لە کوێن."

ئیتر بە پەلە بردینیان بۆ ناو باخێك، هەر لە ناو شنۆدا بوو. زۆر خۆش بوو. ناو باخەکە خانویەکی تیابوو. من حەزم دەکرد دوو مانگ لە ناو ئەو باخەدا بمێنمەوە. ئازادیش بووین ماڵو منداڵی لێ نەبوو. جار جار برادەرانیش دەهاتن بۆ لامان. بە رۆژیش نانو خواردنیان بۆ دەهێناین. زۆر خۆش بوو. لە وێش یەك هەفتە ماینەوە، تا رۆژێك مامۆستا لەتیف وتی:

" -کاك ئاوات ئێمە زۆرمان پێ خۆش بوو تۆ لێرە بمێنیتەوە، بۆ ئەوەی بە باشی چاك ببیتەوە، بەڵام بارودۆخەکە جێی مەترسی یە. ساواك زانیویەتی لێرەن. زۆر لێتان دەگەرێن. ئەترسین بتانگرن. ئێمەش ئابرومان ئەچێت لای مام جەلالو کاك نەوشیروان. ڤیروسیا لە خۆمان، بەڵام ئێوە تیا ئەچن."

مامۆستا لەتیف بۆی باسکردم، کە کاتی خۆی گیراوەو بەڵێنی بە ساواك داوە، کە جارێکی تر خیانەت ناکات. دڵنیا بووم نەدەترسان. زۆر ئازاش بوون. ئەوەی ئەوان بۆ یەکێتی یان دەکرد، کەس نەیدەتوانی بیکات. رۆژێك هەر بە هەمان جێب، کە کاتی خۆی هێنانی بۆ شنۆ. سواری کردین بەرەو (خانە).

وتیان:

" -ئەتان بەینەوە بۆ لای برادەران. وان لە (قەندیل)."

هەر عەلی خۆی بە تەنیا هات لەگەڵماندا. بردینی هەتا چوینە بن قەندیل. دابەزین بە پێ کەوتینە رێ. سەرکەوتین بە قەندیل دا، چوینە لای مام جەلالو کاك نەوشیروان.

پێشمەرگەکان بە گەرانەوەی ئێمە زۆر خۆشحاڵ بوون. لە دۆڵێکدا بوون ناوی (دەراوی گورگان) بوو. مام جەلال تەنیا چادرێكو کاك نەوشیروانیش چادرێکی بچوکی هەبوو. ئەو هەموو برادەرەی تیابوو. مامۆستا جەعفەرو سەلاح چاوشینو هاورێ جەبارو ئازادی سەگرمەو حەمە سەعیدو هاورێ شێرکۆ[47]. منیش چوومە لایان. وەرزی هاوین بوو، قەندیل هەمووی بەفربوو. بە شەو زۆر سارد بوو. لە وێ بارودۆخی پر لە دژواری خۆمان بۆ کاك نەوشیروانو ئەوان باسکرد. چۆن لە مەترسیدا بووینو چیمان بە سەر

---

[47]- ناوی خۆی حسێن بوو، لە ئەنفالدا شەهید بوو.

هاتووە، چونکە وابزانم لەو هێزەی عەلی عەسکەری، کەس نەهاتبوونەوە لای کاك نەوشیروانو ئەوان. جەمالی عەلی باپیرو برادەران گەڕابوونەوە. ئەوان لەگەڵ هێزەکەی دکتۆر خالید بوون[48]. ئەو ماوەیە لەوێ بووم. هەموو لەو خێمەیەدا بووین، شەوێك هاوڕێ جەبار چووە دەرەوە، کە هاتەوە بۆ ناو خێمەکە، پێی نا بە قاچی کاك نەوشیرواندا. کاك نەوشیروان هەڵساو دەستی کرد بە قسەکردن. هاوڕێ جەباریش خۆی بێدەنگ کرد. کاك نەوشیروانیش نەیزانی کێ بوو. چووە دەرەوە خەوت. زۆر ساردیش بوو. هەر پێیان دەوت:

" —وەرەوە ناو خێمەکە."

نەهاتەوە. هاوڕێ جەباریش چی بکات تاریك بوو. جێگاکەش تەنگ بوو، هەمووی جێی چوار کەس بوو. ئێمەش(١٥) نەفەر زیاتر بووین. کاك نەوشیروان، جلە شڕێکی پەیداکرد، دای بە خۆی دا. لەو بن بەردەدا شەو مۆمێکی دادەگیرساند لە بەرئەو مۆمەدا دادەنیشت هەتا بەیانی شتی دەنوسی. ئەوەی لە بیرم بێت، دەربارەی کوردستانێتی کۆمەڵەو رێکخستنی کۆمەڵەبوو. وابزانم (سێ) نوسراو بوو. یەکێکیان دەربارەی کوردستانیەتی کۆمەڵەو یەکێتی. ئەوی تریان دەربارەی ئەندامێتی کۆمەڵە، سێیەمیان دەربارەی گەشەکردنی ئابوری کوردستان نووسی بووی. لەو کاتەدا نووسینەکانیش بە هێزبوو بۆ کۆمەڵە. مەگەر هەر لە توانای ئەودا بێ. هەندێ پێشمەرگە ئەو بەرهەمانەی دەست نەدەکەوت بە دەستنووس بۆ خۆیانو رێکخستنەکانیان دەنووسییەوە. هیچ ئامرازێك نەبوو لەو بارە ناهەموارەدا. تەنانەت نانیش نەبوو بی خۆین. خولێکیشیان بۆ ئێمە کردبۆوە لەو کاتەدا. کاك نەوشیروان تیایدا باسی ئابوری کوردستانی دەکرد. چۆن ئەگەر رۆژێ لە رۆژان لە کوردستانی خۆماندا حکوممان کرد؟ چۆن دەتوانین ئابووریی کوردستان پێش بخەین؟ مام جەلالیش باسی یەکێتیی نیشتمانیی بۆ دەکردین، زۆر باش بوو. ماوەیەك لەو دۆڵەدا بووین گواستمانەوە بۆ دۆڵێکی تر. پێیان دەوت (دەراوی ورچان) چووینە دەراوی ورچان. رۆژێك وەڵامیان نارد وتیان:

" —شێخ مەحمودی کارێزە هاتووە. حکومەت ناردۆتی بۆ لای ئێوە بزانن ئەڵێت چی؟

کاك رەسوڵ مامەندو دکتۆر مەحمود، زۆر بە جدییان بوو. لای ئەوانەوە هاتبوو. جوابیان نارد مام جەلالو کاك نەوشیروان بچن بۆ لای ئەوان. ئەمانیش نەچوون وتیان:

" —ئێمە نایەین."

---

[48] - کاك نەوشیروان لە کتێبەکەیدا زۆر باسی ئەوانە دەکات، کە گەڕانەوە لە کارەساتی هەکاری. بە هیچ شێوەیەك باسی منی نەکردووە، هەروەك ئەوەی من ئەو کاتە پێشمەرگەش نەبووبێتم. نازانم بۆ؟ زۆر باسی (ئەنوەری سەعید بەگ) دەکات. خۆی باش دەزانێت، کە من ئەنوەری سەعیدبەگم هێنایەوە لە تورکیاوە، کەچی هەر یەك ئاماژەشی بە من نەکردووە، کە من زۆربەی ژیانی پێشمەرگایەتیم لەگەڵ کاك نەوشیرواندا بووە.

دیار بوو شێخ مەحمودیشیان بۆ لای مام جەلال ناردبوو، دەبوایە هەر مام جەلالی بدیایە. شوێنێکیان دیاری کرد لە بەینی مام جەلالو رەسوڵ مەمەندو ئەواندا. کاك نەوشیروانو مام جەلالیش چوون. شێخ مەحمودی کارێزە وتبووی:

" —من (مەکتەبی صەدام) ناردومی بۆ لای ئێوە بزانم چیتان ئەوێ.؟"

مام جەلالیش وتبووی:

" —ئەوان لە خۆمان باشتر ئەزانن چیمان ئەوێت. یان هاتوویت بمانبەیتەوە."

ئەویش لە وەڵامدا وتبووی:

" —نەء بۆ ئەوە نەهاتوم. ئەوان زۆر مەبەستیانە بزانن ئێوە چیتان ئەوێت.؟"

کاك نەوشیروان وتبووی:

" —کاك شێخ مەحمود، من ئەزانم، کە حکومەت تۆی بۆ ئەوە ناردووە بزانی وەزعمان چۆنە. ئەرِۆینەوە یان نا. ئەگینا من پێت ئەڵێم حکومەت هیچ بۆ ئێمە ناکات. لە کاتێکدا ئەو هەموو هێزەمان هەبوو هیچی بۆ نەکردین. ئێستا دوو کەسو لەتێك ماوین واین لەم ناو شاخەدا چیمان بۆ ئەکات؟ من حەز ئەکەم رای خۆمت پێ بڵێم، ئێمە وەك کۆمەڵە شەرِ ئەکەین هەتا هەموومان ئەکوژرێین. ئەو کاتە تەرمەکەمان ببەنەوە. ئەوە مام جەلالە ئەگەر ئەو دێت بیبەرەوە."

مام جەلالیش وتبووی:

" —بە حکومەت بڵێ ئێمە شێت بووین، داومانەتە ئەم شاخە."

من خۆم لە دانیشتنەکەدا نەبووم. ئەوەی بۆیان باسکردووم، زۆر بە هەڵوێست قسەیان لەگەڵ کردبوو.

٤٧

قەندیل زۆر ساردو ناخۆش بوو. رۆح لەبەرێکمان نەدەدی لە خۆمان زیاتر. بەو هاوینە هەر بەفربوو. نەمان دەوێرا دەمو چاو بشۆین دەیبەست. ئاوەکەی هەر بەفربوو دەتوایەوە. ماوەیەك مامەوە زۆر بێ تاقەت بووم. تەندروستیشم باش نەبوو. ئەژنۆکانم ئاوی تیابوو زۆر ئازاری دەدام. رۆژێك مام جەلال وتی:

" —بچۆ بۆ ناوچەی (قەڵا دزێ) ببە بە یاریدەدەری (حاجی حاجی ئیبراهیم)."

ئامر هەرێمی ئەو ناوە بوو. وتم:

" —ناچم."

وتی:
" -بۆ نا چیت.؟"
وتم:
" -لە ناو ئەو هەموو ئاغاو عەشایەرەدا ئیشم بۆ ناکرێتو سەرکەوتوو نابم."
زۆری بۆ باسکردم، کە چەند گرنگە من بچم بۆ ئەو ناوچەیە، وەك کۆمەڵە. منیش هەر خۆم تاقەتی هیچم نەبوو، خوا خوام بوو هەر ناوی ئیشم لا نەیەنن. دەمویست بگەڕێمەوە بۆ ناوچەی سلێمانی هەواڵێکی ماڵو منداڵو کەسو کارم بزانم. خۆشم ماوەیەك پشوو بدەم، چونکە بە راستی ئەو سەفەرەی بادینان لە پەلوپۆی خستبووم. مام جەلال زۆر تووڕەبوو. زۆری پێ ناخۆش بوو، کە نەچووم. رۆژێك ئەوەندەم زانی مەفرەزەیەکی قەرەداغ هاتن. مامۆستا عەزیزو مام رۆستەمیان لەگەڵ بوو. مام رۆستەم بریندار‌بوو هێنابویان بە دزییەوە بینێرن بۆ ئێران، بۆ لای ئەو برادەرانەی خۆمان. بۆ ئەوەی چارەسەری بکەن. رۆژێك کاك نەوشیروان وتی:
" -باشە خۆ تۆ هیچ ناکەیت، تۆو کاك بەکری حاجی سەفەرو مەلا بەختیار ببن بە لیجنەیەکی سەرکردایەتی، سەرپەرشتی رێکخستنەکانی کۆمەڵە بکەن لە ناوچەی سلێمانی."
زۆرم پێ باش بوو وتم:
" -زۆر باشە ئەچم."
خۆشم پێم باش بوو ئیشوکاری کۆمەڵە بکەم. ئەو کاتە کاك بەکری حاجی سەفەر لێپرسراوی لقی یەکێتی بوو لە شارباژێڕ. مەلا بەختیاریش ئامر هەرێم بوو لە شارەزوور. لەو کاتەشدا کاك سالار عەزیز نامەیەکی بۆ رێکخستنەکانی کۆمەڵەو نامەیەکیشی بۆ کاك دلێری سەید مەجید نووسیبوو. ئەو کاتەش کاك نەوشیروان لێپرسراوی کۆمەڵە بوو، نامەکەیان دا بە کاك نەوشیروان. ئەویش نامەکەی خوێندەوە. سەیر دەکات هەمووی دژی خۆیەتی، کە خوێندیەوە دای بە ئێمەش وتی:
" -ئەو نامەیە بخوێننەوە. بۆ ئێوەی نوسیوە."
کە خوێندمانەوە، سەیر دەکەین هەر هەمووی رەخنەو گلەییە لە رێکخستنی کۆمەڵە، کە بۆ چی کاك نەوشیروان کراوە بە لێپرسراوی کۆمەڵە، ئەوە خیانەتە لە کۆمەڵە کراوە، چونکە نەوشیروان کۆمەڵە نییەو دژی کۆمەڵە بووە. ئەو جەلالی یە نەك کۆمەڵە. کاك نەوشیروان زۆری پێ ناخۆش بوو ئەو کاتە هەر خەریکی ئیشو کارەکانی کۆمەڵەبوو. زۆر ئیشی باشی بۆ کۆمەڵە کردبوو. بە راستی هەر ئەویش دەی توانی جێی شەهید ئارام بگرێتەوە لەو کاتەدا. من بە ویژدانەوە دەڵێم زۆر باش کۆمەڵەی بەرەو پێشەوە بردبوو. کاك نەوشیروان زۆر بێ تاقەت بوو. نامەکە لە برادەرێکی کۆمەڵەوە هاتووە. لە جیاتی دەست خۆشی، رەخنە گرتنو گلەیی. ئێمە زیاترمان پێ ناخۆش بوو. کاك نەوشیروان نامەیەکی نووسی بۆ مەلا بەختیارو بەکری حاجی

سەفەر، کە چی بکەن. من لەگەڵ مامۆستا عەزیزو برادەرانی تر لە قەندیلەوە گەڕامەوە بەرەو ناوچەی سلێمانی. ئەو کاتە مامۆستا عەزیز لێپرسراوی لقی کەرکوکی یەکێتی بوو. کاك (سیروان تاڵەبانیش)یش ئامر هەرێم بوو. پێش گەڕانەوە، مام جەلال‌و کاك نەوشیروان چەند جارێك لەگەڵ مامۆستا عەزیز کۆبوونەوە. داوایان لێکرد، کە نەچێت بۆ ناو سلێمانی. ئەو ئێستا سەرکردایەتی یەکێتی یە. گەر لەناو سلێمانیدا بگیرێت زۆر عەیبە. هەتا مام جەلال وتی:

" -بگیرێیت من یەك دێڕت لە سەر نانوسم. چیت لە سەر بنوسم بڵێم لە سەر کیپە خواردن گیراوە.؟"

زۆریان پێ وت. هەم کاك نەوشیروان، هەم مام جەلال زۆری لێ پاڕانەوە. ئەویش سوێندی خوارد، کە ئیتر ناچێت بۆ سلێمانی. منیش لە رێگا بە یەکەوە بووین، زۆرم پێ وت:

" -مامۆستا عەزیز بە راستی تۆ زۆر غەدر ئەکەیت، کە ئیتر بیر لەوە بکەیتەوە بچیت بۆ سلێمانی."

وتی:

" -بە گۆڕی شەهیدان ئیتر ناچمەوە بۆ سلێمانی."

منیش قەناعەتم کرد. گەیشتینە شاربازێڕ، (بەکر)مان بینی لە (پاڕازان) بوون. دوو رۆژ بە یەکەوە بووین نامەکانی کاك نەوشیروانم دایە. ئەوەی مەلا بەختیاریشم دا بەو بۆی بنێرێت بۆ شارەزور. کاك بەکری حاجی سەفەر وتی:

" -زۆرم پێ خۆشە بە یەکەوە بین. دەنێرین بە دوای کاك مەلا بەختیاریشدا بێت کۆبونەوەیەك بکەین بۆ چۆنیەتی ئیش‌و کارەکانمان."

وتم:

" -زۆر باشە. تۆ بۆ خۆت بنێرە بە دوای مەلا بەختیاردا. من ئەچم سەردانێکی قەرەداغ ئەکەم، دوایی دێمەوە بۆ لاتان."

وتی:

" -باشە."

لەگەڵ مامۆستا عەزیزو ئەو پێشمەرگانەدا رۆیشتم بۆ بەری قەرەداغ، کە چووین (سیروان)و جەماعەت لە گوندی (سێوسێنان) بوون. دوو رۆژ بە یەکەوە بووین من وتم:

" -ئەڕۆم بۆ بەری بازیان."

سێ پێشمەرگەم لەگەڵ خۆم برد بۆ بەری بازیان. چووینە گوندی سەرزەل، لەوێ بە پێشمەرگەکانم وت:

" -ئێوە ئازادن. ئەچنەوە بۆ لای جەماعەت یان بۆ خۆتان ماوەیەك لەم ناوە ئەبن."

وتیان:

" -چۆن تۆ بە جێ بهێڵین."

وتم:
" -زۆر سوپاستان دەکەم. قەیناکە ئێوە بڕۆن."
ئەوان ڕۆشتن‌و ئەو شەوە لە وێ مامەوە. ڕۆژی دوایی کەوتمە ڕێ بەرەو سلێمانی. خۆم کرد بە ماڵی خوشکێکم دا، کە چوومە ژوورەوە خەزورم لە وێ دانیشتبوو. زۆر لەوێ نەمامەوە، چونکە ماڵەکەیان لە سەر جادە بوو، وتم با بیگۆڕم، لە ڕێوە خۆمم بەوێدا کردبوو. ناردم بە دوای (غەفور)ی پورزامدا. چووم بۆ ئەوێ. ماڵی ئەوان بۆ من باشتر بوو. لەگەڵ ماڵی (ئەحمەدی زەڕەنگەر)دا نزیك بوون لە یەکەوە. ئەحمەد خۆی یەکێك بوو لە نێو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە. پیاوێکی زۆر چالاکیش بوو. ماڵەکەی وەك شوێنی حەوانەوەی پێشمەرگەکانی ناوچەی قەرەداغ بوو. هەر پێشمەرگەیەك، کە دەیاننارد‌ەوە بۆ ئیشوکاری ناوشار، دەیاننارد بۆ ماڵی ئەوان. تا لە دواجاردا ئاشکرابوون. خۆی رایکردو هەندێ لە ئەندامانی خێزانەکەی گیران. خۆشی بوو بە پێشمەرگە. جار جار دەچوومە ئەوێ، یان دەهاتمەوە ماڵی غەفور. کە ڕۆیشتبووم لە ماڵی خوشکەکەم خەزورم وتبووی:
" -مەحمود ئەم کوڕە کێ بوو هات.؟"
ئەویش وتبووی:
" -نەت ناسیەوە.؟"
وتبووی:
" -نە بە خوا."
ئەویش وتبووی:
" -کوڕێکی برادەرم بوو."
وام لێ هاتبوو، خەزورم نەیناسیبوومەوە. لەوێ مامەوە ڕۆژانە برادەران دەهاتن بۆ لام. ئەو کاتەش دکتۆر بەختیار هەر لە ناو شاربوو. نەهاتبوو بۆ دەرەوە. هەموو ڕۆژ دەهات بۆ ماڵی ئەحمەد بۆ لام چارەسەری بۆ ئەژنۆم دەکرد. ئاوی تیابوو. ئاوەکەی بۆ دەردەهێنام. زۆر باشبووم ئەو ماوەیە پشویەکی باشم دا، تۆزێ تەندروستیم باش بوو. لە بەر ئەوەی ئەوەندە خزمەتیان کردبووم، دەتوت هەر ئەو ئاواتەش نیم. منداڵەکانم بە دزییەوە جار جار دەهاتن بۆ لام بە شەو. لە بەر ئەوەی کەس هەست نەکا. دوای ماوەیەك برادەرێك هات بە دوامدا ناوی شێخ غەریب بوو، خەڵکی گوندی قەلا سورە بوو. برادەری خۆمان بوو. دوایش گیراو لە سێدارە درا. گەڕامەوە بۆ قەرەداغ، چوومەوە بۆ لای کاك سیروان‌و برادەران. دوو سێ ڕۆژ بە یەکەوە بووین. مامۆستا عەزیزم نەدی وتم:
" -مامۆستا عەزیز لە کوێیە.؟"
وتیان:
" -چووە بۆ گەرمیان."

منیش بڕوام کرد. ئەو لێپرسراوی ڕێکخستن بوو. ماوەی (١٠) ڕۆژ بە یەکەوە جەولەمانکرد بە ناوچەکەدا سەردانی ئەو مالانەم کرد، کە زۆر دۆستم بوون و زۆر چوویبوومە مالیان. ڕۆژێ بە (سیروان)م وت:

" –کاک سیروان من ئەگەڕێمەوە بۆ ناوچەی شارباژێڕ بۆ لای کاک بەکرو مەلا بەختیار."

وتی:

" –باشە."

مەفرەزەیەکیان بۆ ئامادەکردم بڕۆم. لە گوندی سێوسێنان بووین، ئەوەندەم زانی مامۆستانەریمان پەیدا بوو. کاک (سیروان)ی بردە ئەو لاوە. کاک (سیروان) ڕەنگی تێکچوو وتم:

" –مامۆستا نەریمان چی بووە.؟"

وتی:

" –وەڵلا مامۆستا عەزیز لە سلێمانی گیراوە."

وتم:

" –چی.!؟"

کە وتی لە سلێمانی گیراوە زۆر سەیر بوو بە لامەوە! وتم:

" –کاک سیروان تۆ بە منت وت چووە بۆ گەرمیان."

وتی:

" –بە گۆڕی شەهیدان لای من نەی وتووە ئەچم بۆ سلێمانی. وتی ئەچم بۆ جەولەیەکی ئەو دیو، تۆزێ ئیشم هەیە. ئەم مامۆستا نەریمانەی لەگەڵ بوو."

وتم:

" –مامۆستا نەریمان چۆن چوون بۆ سلێمانی.؟"

وتی:

" –من بلێم چی خۆی وتی ئەبێت بمبەیت بۆ سلێمانی. منیش بردم. لە مالی عومەری برام بوو، لە پڕ دایان بە سەر مالەکەیاندا. عومەری براشمیان گرتووە لەگەڵ ئەودا."

ئیتر زۆر ناخۆش بوو بە لامەوە. زۆر سەیر بوو ئەو هەموو ئامۆژگارییەی مام جەلال و کاک نەوشیروان، بە گۆڕی شەهیدان سوێندی خواردبوو، کە جارێکی تر ناچێت بۆ سلێمانی. ئیتر من گەڕامەوە بۆ لای کاک بەکری حاجی سەفەر. لە وێش وتم:

" –کاک بەکر من ئەڕۆمەوە بۆ لای کاک نەوشیروان."

وتی:

" –بۆ ئەڕۆیتەوە بۆ سەرکردایەتی.؟"

وتم:

" –بە خوا ئەچمەوە بۆ ئەوێ."

وتی:
" -ئارەزوی خۆتە."
مەلا بەختیاریش هەر ئەگەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی. پەیوەندی لەگەڵ شەوکەتی حاجی موشیرو محەمەدی حاجی مەحمود باش نەبوو.

٤٨

ئەو سەردەمە سەرکردایەتی لە قەندیلەوە گەڕابوونەوە بۆ خڕی نێوزەنگ. بڕیارمدا بگەڕێمەوە. کۆمەڵێ کادریش لەگەڵم هاتن. لەوانە وەهابی شێخ ئەحمەد، شۆڕش ئیسماعیل، شیروان شیروەندی، شیروان لە قەرەداغ بوو لەگەڵ سیروان. بەینی باش نەبوو لەگەڵیان. بە عاجزی هاتبوون. بە ڕێکەوتین بەرەو سەرکردایەتی. بە سەر سنوورەکاندا هاتین، گەیشتینە (بەردەپان) بە پشتی هەڵشۆدا سەرکەوتین، کەوتینە ناو جەیشی ئێرانەوە. نازانم چیان دەکرد. زۆر دەترساین، چونکە هەر پێشمەرگەیەك بگیرایە، یەکسەر ئێران تەسلیمی حکومەتی عێراقی دەکردەوە. ئێمە زۆر بووین. چەکدار بووین وتمان ئەگەر بیانەوێت بمانگرن، دەبێت شەڕیان لەگەڵ بکەین، بەڵام وتمان با لە پێشا بە قسەی خۆش خۆمان نەجات بدەین باشە. ملازم جەمالیشمان لەگەڵ بوو، وابزانم ئەو فارسی دەزانی. ناردمان قسەیان لەگەڵ بکا، بڵێ:
" -ڕێمان لێ تێکچووە. ئەگەڕێینەوە دیوی خۆمان."
ئەوانیش زۆر بوون. ئێمەش هەموو دامەزراین، چارمان نەبوو. باش بوو لە پاش مشتومڕێکی زۆر وازیان هێنا وتیان:
" -ئەبێت بگەڕێنەوە بۆ دیوی عێراق."
وتمان:
" -باشە."
خوا خوامان بوو نەجاتمان بێت. تۆزێ خۆمان کردەوە بە دیوی هەڵشۆدا، نزیکی ڕەبایەکانی عێراق هەتا لەوان دوور کەوتینەوە، گەڕاینەوە سنور. گەیشتینە ناو زەنگ. سەیرمانکرد برادەران لە وێ بوون.

٤٩

دەوری مانگی ١١ ساڵی ١٩٧٨ بوو. کاك نەوشیروان لە خێمەیەکدابوو، بە سەر بەرزییەکەوە. مام جەلالیش لە ناو دۆڵێکدابوو، خێمەیەکی هەڵدابوو. خانوومان نەبوو. تازە چووبووینە ئەوێ. خەڵکی گوندی (شێنێ)ش پێیان وتبوون:

" –ئەو جێگایە کەس لێی نازێ. لە زستاندا هەرەسی بەفر ئەتانکات بە ژێرەوە لەوێ مەبن."
بەڵام گوێیان پێ نەدان، هەر لەوێ مانەوە. وردە وردە قەرەباڵغ بوو. مام جەلال دوو ژووری دروستکرد. ئێمەش هەموو لە چادردا بووین.

٥٠

لە مانگی ١١ / ١٩٧٨ کاك نەوشیروان داوایکرد، کۆبوونەوەیەکی فراوانی کادرانی کۆمەڵە بکەین، بۆ ئەوەی جارێکی تر سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژێرین. هەموو کادرو ئەندامە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵە لە گوندی شێنێ کۆبوونەوە. نزیکەی (١٠) رۆژی خایاند. دوای چەندین وتووێژو گفتوگۆ، دیسانەوە سەرکردایەتی بۆ کۆمەڵە هەڵبژێردرایەوە. منیش یەکێ بووم لەو کەسانە هەڵبژێردرامەوە بۆ سەرکردایەتی. ئەو ئێوارەیە کۆبونەوەی کۆمەڵە کۆتایی پێهات. مام جەلالو هەموو برادەرانی سەرکردایەتی یەکێتی لای کۆمەڵە بانگهێشت کرابوون. ئێوارە هەواڵمان بۆ هات وتیان:
" –ئەمشەو حکومەتی عێراق هێرش ئەکات بۆتان."
برادەران هەموو گەڕانەوە بۆ ناو زەنگ، بۆ مقەڕەکانی خۆیان. ئەو کاتە حاجی حاجی ئیبراهیم ئامر هەرێمی ئەو ناوەبوو. مام جەلالیش پێی وت:
" –کاك حاجی سەر شاخی (مەمەندە) زۆر قایم بکە، چونکە ئەگەر مەمەندە گیرا، وەزعمان زۆر خراپ ئەبێت."
مەمەندە بەرزترین جێگابوو لەو ناوچەیەدا. بە سەر سەری ناو زەنگەوەبوو. لە سەرشاخەکەوە ناوچەیەکی فراوان لە ژێر رەحمەتیابوو. هەرێمی (٧)ی باڵەك لە مزگەوتەکەی شێنێ بوون. نازانم بۆ چی هاتبوون!؟ کات ژمێر (١١)ی شەو، لە سەر شاخی مامەندەوە تەقە دەستی پێکرد. وابزانم (١٠) دەقیقەی پێ نەچوو، رژێم مامەندەی گرت. ئەو شەوە لە جیاتی باران، بەفر باری. بۆ بەیانی رۆژ بۆوە سەیرمانکرد سەر شاخی مەمەندە هەمووی عەسکەر بوو. ئێمەش هەموو سەرکردایەتی، لە ژێر رەحمەتی ئەواندا بووین. ئەو دەمانە، وردە وردە خۆپیشاندان لە زۆربەی شارەکانی ئێران دەستی پێکردبوو. هەندێ چەکمان لە سوریاوە بۆ هات، گەیشتە تورکیا. لەوێشەوە بۆ ئێران. لە ئێرانیشەوە گەیاندیانە دەستمان بۆ ناو زەنگ. دران بەو کادرانەی بێ چەك بوون. من خۆم کلاشنکۆفێکم وەرگرت، لەگەڵ هەندێك فیشەك. هەر رۆژ بۆوە، شەڕ لە ئەرزو ئاسمانەوە دەستی پێکرد. رۆژی وابوو، بە جارێك (٥٠) هەلیکۆپتەر دەهاتەسەرمان. دەچووە ناو ئێرانەوەو لە ئێران هێزی دادەبەزان. دەرکەوت ئەمە رێکەوتنامەی نێوان ئێرانو عێراق بوو، کە بە هەردووکیان

دەرمانپەڕێنن لەو ناوە. ئێرانیش هێزەکانی خۆی هێنابوو بۆ سەر سنورەکان، بەرامبەری لێ گرتبووین. لەو ناوەدا ئابلۆقە درابووین. لە خوارەوە هێرشی کرد بۆ ناو گوندی (شێنێ) چەند ماڵێکی سوتاند. هێزی پێشمەرگە لێیان دان‌و شکان. عەسکەر زۆر کوژرا. چەند جار هێرشیان کردەوە بۆ ناو گوندی شێنێ، هەر دەشکان. ئەو پێشمەرگانەی (باڵەیان) زۆر ئازاو قارەمان بوون. کاك زیرۆ ئامر هەرێمیان بوو. ئەو کاتەدا ئەو نەخۆش بوو. ملازم عومەر چووبوو بۆ سەرپەرشتیان. (٩) رۆژ شەڕ بەردەوام بوو. شەهیدو بریندارمان هەبوو، بەڵام نازانم چەند بوون. کەش‌و هەوا بوو بە یارمەتی دەرمان بۆ ئەو شەڕە. کردی بە بەفرو سەرمایەکی زۆر. باش بوو عەسکەرێکی زۆر رەق بۆوەو بوون بە ژێر بەفرەوە. دوای نۆ رۆژ، هێزی دوژمن شکا. پاشەکشەیان کرد، ئەو هێزەی ئێرانیش چۆڵیانکرد. بە راستی شەڕی وا لەو کاتەداو بەو بێ ئیمکانیاتەوە نەکرابوو. ئەمەش وایکرد یەکێتی جێگیر ببێ لە (ناوزەنگ)دا.

٥١

ئێمە لە ناوزەنگ جێگیر بووین، هەموو دەستمانکرد بە خانوو دروستکردن. زستان بوو زۆر ساردبوو، هەر لە چادردا بووین. ئەو ساڵە سالار عەزیزیش لە دەرەوە هاتەوە. کاك نەوشیروان‌و ملازم عومەرو سالار عەزیزو هاوڕێ جەبارو حەمە سەعید لە یەك ژووردا بوون. من‌و ئازادو دووسێ برادەری تر لە چادرێکدا بووین. بە سەر بەرزییەکەوە بووین، هەموو شەوێك بەفر چادرەکەی بە سەرماندا دەڕوخاند. شوێنەکە زۆر کوێستان بوو. هەرچی برادەران پێیان دەوتین وەرنە خوارە، نەدەهاتین. شەوێك کردی بە باران‌و بەفرێکی زۆر، بایەکی زۆر بە هێزیشی هەڵکرد. خێمەکەی ئێمەی روخاند. شەو رامانکرد بۆ لای عەلی ئامە خان. ئەوان لە خوار ئێمەوە بوون. بەفرو با خێمەکەی ئەوانیشی روخاند. لە ژێر خێمەکەوە، هەر یەکەمان لایەکی خێمەکەمان گرتبوو، بۆ ئەوەی با نەی فڕێنێ لە سەرمان. هەتا بەیانی بەو شێوەیە شەوگارمان بە رێ کرد. بۆ بەیانی چووینەوە، خێمەکەمان چاك کردەوەو چووینەوە ناوی. من‌و ئازادو دلێری سەید مەجیدو ملازم جەمال‌و وەهاب بووین. ئیشەکانمان دابەشکردبوو. من دەچووم نانم دەهێنا، ئازاد چێشتی لێ دەنا، برادەرێکی تر قاپەکانی دەشت. هەر یەکەی ئیشێکمان دەکرد. ئێمە دوور بووین لە برادەرەکانی تر. ئەو سەردەمە پارە نەبوو، ئیتر قەرزو قۆڵەمان دەکرد لە کابرایەکی قاچاخچی بە ناوی (ئەحمەد ساروخ) .ئەو پارەیەی، کە دەیاندایێ بۆ خواردنی مانگێك بوو. دەبوو گوزەرانمان پێ بکردایە. ئیتر لەو مانگەدا مریشکێك یان کیلۆیەك گۆشتمان پێ بکڕیایە. هەر ئەوە بوو. ئەگەر دوو برادەر بهاتایە، ئەوەش نەدەما. رۆژێ مریشکێکمان کڕیبوو لێمان نابوو بۆ ئێوارە. کاك دلێری سەید مەجیدمان کرد بە مەسئوولی میوان دەرکردن وتمان:

" –ئەگەر هەرکەس هات‌و نەڕۆی، ئەبێت تۆ دەری بکەیت."

دلێر وتی:
" –چۆن ئەبێت.؟"
وتمان:
" –ئەبێت دەری کەیت."
وتی:
" –باشە.

هەر خۆمان بووین. خۆ کێ دەگەیشتە ئەو چۆڵەوانیە. باڵندەشی لێ نەدەژیا. هەر ئەو ڕۆژە، (ئیبراهیم جەلال) هات بۆ لامان. ئیبراهیم جەلال پیاوێکی زۆر توڕەبوو، کەس نەیدەوێرا گاڵتەی لەگەڵ بکا. دلێریش ئەرکی ئەوە بوو میوان دەر بکا. ئیبراهیمیش دانیشتبوو نەدەڕۆیی. دەستمانکرد بە گۆرانیو چەپڵە ڕێزان بۆ ئەوەی ئیبراهیم تووڕە بکەینو بڕوا، بەلاّم هەر مۆڕدەبۆوەو قسەی نەدەکرد. هەر نەڕۆیی. دلێریش هەر هەڵساو شەقێکی لە ڕۆپاکە هەڵداو ئاگرەکەی کوژانەوە. ئیبراهیم بەوە زۆر تووڕەبوو. زۆر بە لایەوە سەیربوو! بۆ وا لە بەر چاوی ئەو وای کرد!؟ دلێریش ناچار بوو وا بکا. دوایی ئیبراهیم جەلال چوو بوو بۆ لای نەوشیروان وتبووی:
" –ئەو جەماعەتەی تێکچوون."
بەو شێوەیە کاتمان دەبردە سەر لە ناو ئەو بەفرو بارانەدا.

٥٢

لە ساڵی ١٩٧٩، خۆپیشاندانەکانی ناو ئێران گەورەو فراوان بوو. زۆربەی شارەگەورەکانی ئێرانی گرتەوە. ناوزەنگیش زۆر قەرەباڵغو زۆر ئاوەدان بوو. هەندێ ماڵی شێنێش لە زەلّێ مابوونەوە خانوویان کردبوو. هەر لە ناو پێشمەرگەدا بوون. ساڵی دوایی هەموو خانوومان دروستکرد. مقەڕی ڕاگەیاندن لە ناو زەلّێ خانوویان کردبوو. ناوەندیی کۆمەڵەش هەر لەوێ بوو. کاك نەوشیروان هەر لە جێگای خۆی، دوو ژووریان دروستکردبوو. یەکێکیان ژوورێکی گەورەبوو، ئەوی تریان ژوورێکی بچوك بوو. منو کاك نەوشیروانو حەمە سەعید لەو ژوورە بچوکەدا بووین. هەر بە کەڵەکە بەرد دروستکرابوو، کە بەفر دەباری بە باوە، لە درزی بەردەکانەوە دەهاتە ژوورەوە. ژوورەکە زۆر سارد بوو، بە جێگایەکی زۆر بەرزیشەوە بوو، بەلاّم دڵخۆشبووین، چونکە بۆ خۆمان توانیبوومان بنکە دابمەزرێنین لە ناو عەرزی عێراقدا. جار جار حکومەت تۆپی پێوە دەنایین، بەلاّم هیچ نەبوو. بارودۆخی ئێرانیش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خراپتر دەبوو. وای لێهاتبوو، خەڵك زۆر ترسی نەمابوو. شارە کوردەکانی ئێران هەروەك خۆی وابوو، هێشتا خۆپیشاندان دەستی پێ نەکردبوو. ڕۆژێ مام جەلال ناردی بە دوامدا وتی:

" –ئاوات ئەتنێرم بۆ ئێران هەندێ دۆستو برادەرمان لە مهابادو سەقز هەیە، بچۆ بۆ لایان. خۆیان جوابیان ناردووە، ئەڵێن ئامادەین یارمەتیتان بدەین."

وتم:

" –باشە."

ئەو کاتە برادەرێکی ئێرانی لێبوو، ناوەکەیم زۆر لە یاد نەماوە. وابزانم ناوی سەعید بوو. ژوورێکی هەبوو لە ناوزەنگ. مام جەلال یەك دوو نامەی بۆ ئەو دۆستانەی ئێرانی نووسی. بەڵگەیەکیشی دا بە خۆم، کە مۆری مەکتەبی سیاسی لێدابوو. لە بەڵگەکەدا دەڵێت:

" –(ئاوات نوێنەری مەکتەبی سیاسیی یەکێتی نیشتمانیە. تکایە بڕوای پێ بکەن، هەرچی ئەو وتی منم.)"

نامەکەی دامێو وتی:

" –بچۆ بۆ لای ئەو برادەرە. ئەو خەڵکت لەگەڵ ئەنێرێت."

مام جەلال وتی:

" –بچۆ ئیتر بۆ خۆت ئەزانیت چی ئەکەیت."

وتم:

" –باشە."

چووم بۆ لای برادەرە ئێرانیەکە. ئەویش دووسێ نامەی بۆ نووسیم بۆ هەندێ خەڵکو براکانی، براکانی خۆی. لە سەقز بوون. کوڕێکی لا بوو وتی:

" –لەگەڵ ئەو برادەرەدا بڕۆ."

زستانیش بوو. بەفرێکی زۆر باریبوو. دوای نیوەڕۆ بە ڕێکەوتین بەرەو سەردەشت. ئەو کاتەش سەردەمی (شا) بوو. خۆیان ناردبوومیان نەدەترسام. ئەوەی منیان پێ سپاردبوو، دۆستی خۆمان بوو. برادەرەکە دوو هێستری پێبوو. من سواری دانەیەکیان بووم، خۆشی سواری ئەوی تریان بوو. هەر لە ناوزەنگ دەرچووین، پێش ئەوەی بگەینە کانی زەرد، سەیتەرەیەکی لێ بوو، کە چاوم کەوت بە سەیتەرەکە ترسام. دانەیەکیان هاتە سەر ڕێگاکەمان. دیاربوو خۆیان دەیانناسین. بە بەرتیل رازیان دەکردن ئیتر قسەیان نەدەکرد. ئیتر نازانم چەندیان دلێ. ڕۆیشتین هیچ قسەیان نەکرد. کەوتینە ڕێ، بۆ ئێوارە چووینە (سەردەشت) چووینە ماڵێ زۆر ڕێزیان لێگرتم وتی:

" –کاك ئاوات لای مام جەلالەوە هاتووە."

ئیتر زۆریان پێ خۆش بوو، زۆر ڕێزیان لێ گرتم. منیش شەو باسی شۆڕشی نوێو یەکێتیم بۆ کردن. دیاربوو زۆر ترسیان نەمابوو، زۆر حەزیان لە کوردایەتی دەکرد. ئێمەشیان زۆر خۆش دەویست. بە تایبەتی مام جەلال لای کوردی ئێران زۆر

خۆشەویست بوو. ئەو شەوە لەوێ بووم، بۆ بەیانی سواری ماشێن بووین بۆ (مهاباد) دوای نیوەڕۆبوو، گەیشتینە مهاباد وتیان:

" -کاك ئاوات لای مام جەلالەوە هاتووە."

نامەکەی مام جەلالم پێبوو، کە دەڵێ ئاوات نوێنەری مەکتەبی سیاسی یە هەرچی وت منم. زیاد لە سنور ڕێزیان لێ گرتم وتیان:

" -مەترسە ئەگەر بشت گرن، هەموو خەڵکی مهاباد خۆپیشاندان ئەکەن بەرت ئەدەین."

یەك هەفتە پێش ئەوەی من بچم، بیرم نەماوە وتیان:

" -یەکێیان گرتووە."

هەموو خەڵك خۆپیشاندانیان کردبوو، بەریان دابوو. بەیانی چوومە دەرەوە بۆ ناو شار. نامەکانم برد بۆ ئەو کەسانەی، کە مام جەلال بۆیانی ناردبوو. زۆریان پێ خۆش بوو. زۆر ڕێزیان لێ گرتم. ئەوانیش هەر یەکەی هەندێ خەڵکی تریان پێ ناسانم. ئیتر وای لێهات، شەوی وابوو خەڵکی زۆریان کۆ دەکردەوەو باسی یەکێتیو کۆمەڵەو شۆڕشی نوێم بۆ دەکردن. لە مهاباد یەك هەفتە مامەوە چووم بۆ سەقز بۆ ماڵی براکانی ئەو برادەرەی ناوزەنگ، کە لای خۆمان بوو. نامەکانم دانێ زۆریان پێ خۆشبوو. ئەوانیش هەندێ برادەری تریان پێ ناساندم. برادەرێکی تر هەبوو ناوی (محەمەدی) بوو ئەوانیش زۆربەی برادەرەکانی خۆیانیان پێ ناساندم. بە ماوەیەکی کەم زۆر دۆستو برادەرم پەیداکرد. هەمووشیان پیاوی زۆر باشو خەڵکی خوێنەوار بوون، لە مامۆستاو ئەندازیارو دکتۆر. ماوەی (٢٠) ڕۆژ مامەوە لە ئێرانو گەڕامەوە بۆ لای مام جەلال. ئەو یارمەتییەی، کە پەیدامکردبوو، نازانم چەندبوو، بردمەوە بۆ مام جەلالو دەنگو باسی خەڵکیشم پێ گەیاندن، کە چەند ئامادەییان تیایە بۆ یارمەتی دانی یەکێتی. بە ڕاستی ئەو کاتە بمانویستایە یەکێتی نیشتمانی لە ناو کوردستانی ئێراندا دروست بکەین، گەورەترین ڕێکخستنمان دروست دەکرد. هەموو کوردی ئێران لەگەڵمان بوون. ئەو کاتە هیچ ڕێکخستنێکی تر نەبوو لە ناو کوردەکانی ئێراندا. مام جەلال لە خۆشیدا نەیدەزانی چۆن سوپاسم بکات، چونکە ئەو کاتە بڕوا ناکەم بە هەموو مەکتەبی سیاسی یەکێتی هەزار دیناری هەبوو بێت. ئەو یارمەتیانە زۆر خۆش بوو بە تایبەتی لە کوردی ئێرانەوە. هاتوو چۆش دەستی پێکرد. جار جار برادەرانی ئەودیو دەهاتن بۆ لای مام جەلالو کاك نەوشیروان. دوو برادەری کوردستانی ئێرانمان لابوو یەکێکیان هەر لە ناوزەنگ ئیشی پزیشکی دەکرد. ئیشی زۆری دەکرد خۆشەویست بوو لای پێشمەرگە. وەزعی ئێران خەریك بوو تێك دەچوو، خەریك بوو دەسەڵاتی (شا) نەدەما. شارە کوردەکان هێشتا هەر مابوو هیچیان نەدەکرد. دەوڵەتیش وازی لە توندو تیژی هێنابوو. بۆ ئەوەی ئەوانیش نەوروژێن.

ماوەیەکی پێ چوو ڕۆژێك مام جەلال ناردی بە دوامدا، کە چووم برادەرێکی لابوو ناوی (میرزا کەریم) بوو لە شۆڕشی ئەیلولەوە چووبوو بۆ بانە لە ئێران. هاتبوو بۆ لای مام جەلال دانیشتبوو. مام جەلال بە یەکتری ناساندین پێی وتم:

" –میرزا کەریم دۆستی خۆمانە، خۆشناوەتی یە. لە بانە دادەنیشێت."

" –بەویشی وت:

" –ئەوە ئاوات قارەمانی‌یە، سەرکردایەتی کۆمەڵەیە. نوێنەری مەکتەبی سیاسیە. من مخەوەلم کردووە، هەر چی بڵێت، من وتوومە."

تۆزێکی تر ماینەوە بە قسەکردنەوە، مام جەلال وتی:

" –یەك دوو برادەری زۆر باش هەیە، بۆ ناچیت بۆ لایان قسەیان لەگەڵ بکەیت. بۆ ئەوەی بزانین ئەوان ئەتوانن چیمان بۆ بەکەن."

وتم:

" –باشە."

دوای نیوەڕۆ لەگەڵ میرزا کەریم بە ڕێکەوتین بەرەو (سەر دەشت) لەوێشەوە بۆ (بانە) چووینە ماڵی خۆیان ماڵەکەی بە بەرزییەکەوە بوو. لە وێ مامەوە. شەو باسی خۆی بۆ کردم، کە چۆن دوای ئاش بەتاڵ چووە بۆ بانە لە وێ ماوەتەوەو ژنی هێناوە. بۆ بەیانی ناردی بە دوای (مامۆستا سعدالله)دا هات بۆ ماڵەوە پێی وت:

" –ئەم برادەرە لای مام جەلالەوە هاتووە."

زۆری پێ خۆش بوو. چووینەوە بۆ ماڵی خۆیان. زۆر ماڵێکی باش بوون. پێنج برابوون ئەم لە هەموویان گەورەتربوو. دووسێ ڕۆژ لە ماڵی ئەوانیش مامەوە ئەویش وتی:

" –خاڵێکم هەیە زۆر کوڕی باشە ناوی (غەفوری هەمزەیی) یە، حەز ئەکەیت ببینیت."

وتم:

" –زۆرم پێ خۆشە."

هێشتا شا لە سەر حوکوم بوو، نەڕۆیشتبوو. دەترسام بمگرن، چونکە بگیرامایە تەسلیمی عێراقیان دەکردمەوە. کە هاتن دوو برابوون. ئەوان خۆیان پێ ناساندم، منیش خۆم پێ ناساندن وتم:

" –ناوم ئاوات‌و پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانیم."

ئەوان هەر دووکیان مامۆستای دوا ناوەندی بوون. ئیتر باسی یەکێتیم بۆ کردن، بۆم روون کردنەوە، کە چۆن دروست بووە. لە کۆمەڵەو بزوتنەوەو خەتی گشتی. هەروەها مێژووی کۆمەڵە چۆن دروستبووەو لە کەیەوە دامەزراوەو نەهجی کۆمەڵە چییە؟ هەروەها باسی بزوتنەوەشم بۆ کردن. ئەوان کەی دروست بوون‌و نەهجی ئەوان چییە؟ لەگەڵ خەتی گشتی. هەمووم بۆ باسکردن. ماوەیەکی زۆر قسەمانکرد، دوایی چووینەوە بۆ ماڵی خاڵەکەی، کە چوومەوە ئەوێ نەیانهێشت بگەڕێمەوە بۆ ماڵی

کەسیان هەر لەوێ مامەوە. زۆر ماڵێکی چاکبوون. ئەویش هەرچی برادەری هەبوو هەموویانی کۆکردەوە هێنانی بۆ ماڵی خۆیان. شەو و ڕۆژ خەریکی موناقەشە بوون. دیار بوو هەموو خۆیان بە چەپ دەزانی. زۆریشیان هەر حەزیان لەوەبوو کوردایەتی بکەن. بۆ ماوەیەکی زۆر مامەوە هەر نەیان هێشت بچمەوە بۆ ماڵی میرزا کەریم. هەر چی دەهات بە دوامدا، نەیان دەهێشت بچمەوە. خۆشم پێم خۆش بوو، چونکە هەموویان ببون بە هاوڕێم، لە تەمەنی خۆشمدا بوون. ئەوانیش لە ناو خۆیاندا پارەتیان کۆکردەوە وتیان:

" –ئەوە دیاری خۆمانە بۆ یەکێتی هەر چەندە کەمیشە، بەڵام تۆ نابێت ئێمە بە جێبهێڵیت، ئەبێت هەر لێرە بمێنیتەوە. ئێمە هەموو ئەبین بە یەکێتی."

ڕۆژانەش خۆپیشاندان بوو لە شارە گەورەکاندا. (شا) کۆنترۆڵی نەمابوو بە سەریاندا. منیش پێم خۆش بوو لە وێ بمێنمەوە، بەڵام نەمدەتوانی بڵێم باشە ئەمێنمەوە. وتم:

" –جارێ با بڕۆمەوە بۆ لای مام جەلالو کاك نەوشیروان."

ئەو کاتە من زیاتر پابەند بووم بە کۆمەڵەوە. ئەو کارانەی من، لە پێشدا هەر مام جەلالو کاك نەوشیروان دەیانزانی. گەڕامەوە بۆ ناوزەنگ. ئەو برادەرانەی (بانە) نامەیەکیان بۆ مام جەلال نوسیبوو، کە حەز دەکەن برادەرێکیان بۆ بنێرن، ئامادەن بۆ ئیشوکاری یەکێتی. هاتمەوە بۆ مام جەلالو کاك نەوشیروانم باسکرد، کە ئەوان وەزعیان چۆنەو ڕەئیان چۆنە بەرامبەر یەکێتی. بەڵام ئەوان قەت ڕەئی ئەوەیان نەبوو ئێمە لە ناو کوردی ئێراندا یەکێتی نیشتمانی دروست بکەین. ئەوەش هەڵەبوو. ئەگینا گەورەترین ڕێکخستنی یەکێتی نیشتمانیمان لە کوردستانی ئێران دروست دەکرد، چونکە یەك کەس نەبوو بڵێت من ڕێکخستنی ئەو لایەنەم. نامەی ئەو برادەرانەشم دانێ، کە ناردبویان بۆ مام جەلال. داوای برادەرێکیان کردبوو. مام جەلالو کاك نەوشیروان زۆریان پێ خۆش بوو بچم لەگەڵیاندابم وتیان:

" –تۆ تەندروستیت باش نیە، بەڵکو بشتبەن بۆ لای پزیشك چارەسەرت بۆ بکەن. زۆر باشە بچۆ لەوێبە."

گەڕامەوە بۆ ئێران، چوومەوە بۆ لای ئەو برادەرانەی، کە پێشتر لایان بووم هەموو زۆریان پێ خۆش بوو. مام جەلال نامەی بۆ نووسی بوون، کە من تەندروستیم باش نیە. ئازارێکی زۆر لە قاچمدابوو هەر نەم دەتوانی بە پێ بڕۆم وتیان:

" –کورە ئەوە هەر زۆر ئاسانە. ئەتبەین بۆ لای باشترین دکتۆری تاران."

دوو ڕۆژ مامەوە، چوار برادەر لەگەڵم هاتن. چووین بۆ تاران. ئەو کاتەش باشترین دکتۆر لە ئێران هەبوو. بۆ خۆشیان لە تاران برادەری تریان هەبوو، کە زۆر شارەزای تاران بوون. ئەوانیش هاتن بۆ ئەو ئوتێلەی، کە لێی دابەزیبووین. بردمیان بۆ لای دکتۆر. فەحسێکی زۆریان بۆ کردم. ئەوەی پێویست بوو، بۆیانکردم. دەرمانیان بۆ نوسیم وتیان:

" —با دووسێ ڕۆژ لێرە بمێنینەوە."
تاران زۆر ناخۆش بوو. ڕۆژانە خۆپیشاندان هەبوو. بارودۆخی ناو تاران تێکچووبوو. بە تایبەتی زانکۆکان. چوار پێنج ڕۆژ لە تاران ماینەوەو گەڕاینەوە. خۆپیشاندان زیادی کرد. زۆری پێ نەچوو (شا) ڕۆیشتو (شاپور بەختیار)ی لە جێی خۆی دانا. لەو کاتانەدابوو، ڕۆژێك وتیان:
" —با بڕۆین بۆ (تەورێز) لە وێ دکتۆری باشی لێیە."
دووسێ برادەری خۆشمان لەوێن، لە کۆلیجی پزیشکی ئەخوێنن. با بچین بۆ لای ئەوانیش."
بەیانی زوو دەرچووین بەرەو تەورێز. چووینە (بۆکان) بۆ نانخواردنی بەیانی چووینە چێشتخانەیەك سەرو پێمان خوارد وتیان:
" —بزانە هی لای ئێمە خۆشە یان سەرو پێی لای ئێوە."
منیش وتم:
" —بە خوا هی لای ئێمە، بەڵام ئەوەی ئێوەش خۆشە. بەس ناگات بە سەرو پێی سلێمانی. با ئینشائەڵڵا ڕۆژێك ئێوەش بێن بۆ سلێمانی، بزانن وایە یان نا."
وتیان:
" —جا کوا خوا ئەوەی بکردایە. ئێمەش سلێمانیمان بدیایە."
بەڵام ئاواتەکەیان هاتە دی، لە کاتی شۆڕشی کوردستانی ئێراندا، هەر چواریان بوون بە پێشمەرگە. زۆر لە سلێمانی مانەوە. یەکێ لەو چوار برادەرە، شەهید غەفوری هەمزیی بوو. دواجار لە بەغداد شەهیدکرا. خۆشەویست ترین هاوڕێم بوو. لە بۆکانەوە ڕۆشتین بەرەو تەورێز چووینە قەراغ شار، ڕێ نەبوو بڕۆین، لەبەر خۆپیشاندان. هەر هەموو جادەکانیان بەستبوو. هەر هەموو خەڵکی تەورێز لە سەر جادەبوون. مەرگ بە شابوو. وتیان:
" —بە خوا ئێمەش تووش بووین. چۆن بگەینە ناو شار خۆمان بکەین بە ئوتێلێکدا."
بەڵام، کە دەمانوت کوردین هاتووین زۆریان ڕێز لێ دەگرتین، ڕێگایان نیشان دەداین. دەیانوت لەوێوە بڕۆن. بۆ ئێوارە گەیشتینە ئوتێلێك وتیان:
" —با بەپێ بڕۆین بچین سەیرێکی ناو شار بکەین."
ئێوارە بوو نەبازاڕ هەبوو نەهیچ. لە سەر جادەکان هەر ئاگربوو. هەرچی (بانك) هەبوو هەموویان سوتاندبوو. زۆر ناخۆش بوو نەمان دەزانی چی بکەین. ڕۆژێ دوای نیوەڕۆ بوو، چووینە دەرەوە. کەوتینە ناو خۆپیشاندانێکی گەورەوە. خۆپیشاندەرەکان، ڕوویانکردە بینایەکی شەش قات دائیرەی پۆلیس بوو وتیان:
" —ئەمە (کەلانتەریی شەشە)"
پەلاماری کەلانتەریی شەشیان دا. ئەوانیش خەڵکەکەیان دایە بەر فیشەکو گوللە. کەس نەگەڕایەوە. وەك گەڵای دار خەڵك لە سەر جادە کەوتبوو. ئەوەندە کۆڵنەدەر بوون،

بیناکەیان گرتو سوتانیان بە خۆشیانەوە. یەك پۆلیس دەرنەچوو، کە ئەوەم بینی، هەر سەرسام بووم لە ئازایەتی ئەو خەڵکە! وتیان لە ماوەی چەند چرکەیەکدا (٦٠٠) کەس کوژراوە. خۆ ئێمەش هەر نەماندەوێرا لە ئوتێلەکە بچینە دەرەوە. ئەوان زیاتر لە بەر من بوو نەهاتنە دەرەوە. دووسێ ڕۆژماینەوە. شەوێك هەواڵ هات وتیان:
" –ئەوە شاپور بەختیاریش رایکرد، خومەینی گەڕایەوە."
ئیتر بوو بە ڕۆژی حەشر لە هەموو شارەکانی ئێراندا پەلاماری دامودەزگاکانی دەوڵەتیاندا. هەموویان گرت.
لە شارە کوردەکانیشدا شەڕ دەستی پێکرد. هەموو شارەکان کەوتە دەست خەڵك. لە دوای روخانی شا، کە کۆنترۆڵی بە سەر کوردستاندا نەما بوو. دەیان گروپو تاقمو رێکخراو دروست بوو. هەر یەکە لە ئاوازێك دەیان خوێند. کەس نەبوو کۆنترۆڵ بە سەر هەموو دائیرەو دەزگاکانی حکومەتدا بکات. هەر کەس بۆ خۆی بوو. هەر کۆمەڵێك پەیدا دەبوو بە ناوی مارکسیەوە ناوێکی لە خۆی دەنا. زۆر جەنجاڵ بوو، چونکە رێکخستنێك نەبوو. هەر کەس ئازابێو خەڵك لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە. ئێمەش لە بەرنامەماندا نەبوو بۆ خۆمان یەکێتی دروست بکەین. ئەو ماوەیە لە (بانە) مامەوە. ئەو هەموو حیزبە دروست بوو. هەر کەس بۆ خۆی لایەنێکی هەڵدە بژارد. کوردستان ببوو بە چێشتی مجەور. ئەوەندە حیزبو رێکخراوی تیابوو. هەر یەکە لە لایەکەوە بنکەیەکی دروستکردبوو، بە ئارەزوی خۆیان دروشمیان بەرزکردبووەوە. شاری بێ حاکم بوو. رۆژانەش لە ناو بازاڕی چەك فرۆشتندا، خەڵك دەکوژرا. لە هەموو بازاڕێ چەكو تەقەمەنی هەبوو. چیت دەویست هەبوو بۆ کڕین، بەڵام ئێمە پارەشمان نەبوو بچین چەك بکڕین. ماوەیەك بەو شێوەیە بارودۆخی ئێران بە رێوە چوو. منیش دوای ماوەیەك گەڕامەوە بۆ ناوزەنگ.

٥٣

مامۆستا شێخ جەلالی (بانە) برای مامۆستا شێخ عیزەدین حسینی، موعارەزە بوو. زۆر منی خۆش دەویست. رۆژێك مام جەلال پێی وتم:
" –ئەوە بۆ ناچیت بۆ لای ئەو برادەرە. بزانە هەندێ چەکی لێ وەرناگریت؟ تۆ زۆر عیلاقەت لەگەڵیدا باشە."
وتم: باشە ئەچم. تۆ خۆشت نامەیەکی بۆ بنوسە باشترە."
وتی:
"– زۆر باشە."
رۆیشتم گەڕامەوە بۆ ئێران چوومە لای برادەرەکە وتم:

" –وەزعمان زۆر خراپە، زۆر بێ چەکین و زۆربەی پێشمەرگەکانمان بێ چەکن. هەتا مەفرەزەکەی مام جەلال چەکیان پێ نیە."
ئیتر بارودۆخی خۆمانم بۆ باسکرد، کە چەند بێ چەکین. نامەکەی (مام جەلال)یشم دایە. ئەو برادەرە زۆر پیاوێکی باش بوو. هەندێ چەکی لە عێراق وەرگرتبوو، هەمووی لە جۆری کلاشنکۆف بوو. وتی:
" –باشە یارمەتیتان ئەدەم، نابێت لە خۆت و مام جەلال زیاتر کەسی تر بزانێت."
وتم:
" –دڵنیا بە کەس نازانێت."
(٥٠) برنەو و (١٠) کلاشنکۆفی دامێ وتی:
" –سێ کلاشنکۆفی بە دیاری بۆ خۆت، حەوتەکەی تری بۆ دەستەکەی مام جەلال. ئەو پەنجا برنەوەش بۆ پێشمەرگەکانی سەرکردایەتی."
وتم:
" –ماڵت ئاوا بێت."
بۆ ئەو کاتەی ئێمە ئەوە زۆر بوو. وتم:
" –باشە با جارێ هەر لای خۆت بێت. با بچمەوە بۆ سەرکردایەتی پێیان بڵێم بزانم چۆن بیان بەم."
چوومەوە بۆ لای مام جەلال. هەمووم بۆ گێڕایەوە. زۆری پێ خۆش بوو. نەیدەزانی لە خۆشیدا چی بڵێت وتی:
" –بچۆ بۆ لای کاک نەوشیروان و ملازم عومەر. بۆیان باس بکەو تەگبیری هاتنی بکەن. چەکەکان وا بهێنە، کەس نەزانێت. شەو بیهێنەو ببەن بۆ مقەڕەکەی خۆتان."
ئەو کاتە موقەڕی خۆمان بە بەرزییەکەوە بوو. دوو ژوورمان هەبوو، منو کاک نەوشیروان و کاک حەمە سەعیدو کاک حەمە تۆفیق لە ژوورێکیدا بووین. پێشمەرگەکان لە ژوورەکەی تردا بوون. کاک ئازاد ئامر کەرتی مقەڕەکە بوو. دەوری بیست پێشمەرگەمان هەبوو لەو مقەڕەدا. چووم بۆ لای کاک نەوشیروان بۆ ئەویشم باسکرد وتی:
" –زۆر باشە دەستت خۆش بێت کارێکی زۆر باشت کردووە. من پێم باشە بچۆ بیان هێنە. لە بەر ئەوەی ئەو برادەرە پێی خۆش نیە لە خۆت زیاتر کەسی تر بزانێت، هەر وابە، با کەس نەزانێت. ماڵی ئاوا بێت. خۆت و حەمە تۆفیق بچن."
وتم:
" –کاک حەمە تۆفیق با بڕۆین."
چوومەوە بۆ لای مام جەلال وتم:
" –کاک حەمە تۆفیق ئەبەم لەگەڵ خۆم. تۆزێ پارەمان بدەرێ بۆ کرێی سەیارەو ولاخ."

وتی:
" -بە سەر چاو، بەڵام تۆ بۆ خۆت هەندێك چەك دابنێ، هەر لەو ناوە مەی هێنەرەوە بۆ ئێرە. باقیەکەی بەرە بۆ مەقەڕ بۆ لای خۆتان، هەر لەوێ دابەشی بکەن."
وتم:
" -باشە."
لەگەڵ کاك حەمە تۆفیق بە رێکەوتین. ئەو سەردەمە، کە دەچووم بۆ ئەوێ، وەك ئەوە وابوو، بچم بۆ ماڵی خۆمان. ئەوەندە دۆستی باشم هەبوو. کە گەیشتینە ئەوێ چووم بۆ ماڵی ئەو برادەرەی، کە چەکەکانی بۆ دانابووم. کاك حەمە تۆفیقم لەگەڵ بوو. ئەوەندە ماستاومکردبوو. ئەوەندەم پیا هەڵدابوو، کاك حەمە تۆفیق دوایی دەیوت:
" -بە خوا مەگەر هەر تۆ لە زمانی ئەم کابرایە بزانیت."
وتم:
" -چی بکەم وا نەبێت لە دەستی نابێتەوە. مەجبورم ئەو هەموو ماستاوەی بۆ بکەم." کە بە کابرام وت، وتی:
" -باشە وەرە شەو بیانبە. هەر ئەبێ خۆت بزانی. لەگەڵ ئەو برادەرەی خۆت بچۆ سەیارەیەك بێنە باری بکەو بیبە."
منیش خۆم شۆفێریم نەدەزانی. بە کاك حەمە تۆفیقم وت:
" -تۆ شۆفێری ئەزانیت.؟"
وتی:
" -بە خوا منیش نازانم. کاتی خۆی تۆزێکم ئەزانی."
وتم:
" -هەر باشە، هەر چۆنێك بێت لە ماڵەکەی دووریخەینەوە، بیبەینە ماڵێکی تر. ئەوجا لە وێ ئوتومبێلێکی بەکرێ بۆ ئەگرم."
چووم جێبێکم لە برادەرێك وەرگرت وتم:
" -یەڵلا کاکە حەمە لێی خوڕە بۆ ئەو ماڵەی، کە چەکەکانی لێیە."
باش بوو کاك حەمە تۆفیق بە هەر حاڵێك بوو بردی بۆ بەر ماڵەکە. بە پەلە بارمانکرد بردمان بۆ ماڵی برادەرێکی خۆمانو جێبەکەمان بردەوە بۆ ئەو برادەرەی، کە لێم وەرگرتبوو. خۆشمان شەو هەر لە وێ بووین. بۆ بەیانی چووم ئۆتۆمبێلێکم بۆ گرت بۆ گوندی (بێورانی سەرو) لە وێشەوە بۆ لای خۆمان. بە ولاخ بارمانکرد. لە رێگا سەیتەرەی حیزبی (دیموکرات) دوو سەعات گرتینی. دەیانوت:
" -ئەم چەکانەت لە کوێ بوو."
دەموت:
" -کڕیومانە."
دەیانوت:

" –نەخێر تۆ لە خومەینیت وەرگرتووە."
دەموت:
" –کوڕە بابە چیم لە خومەینی وەرگرتووە. ئەوە هەمووی چەکی کۆنە بە پارە کڕیومە."
بەو حاڵە نەجاتمان بوو. بردمانەوە بۆ ناوزەنگ. شەو گەیشتینە ناوزەنگ، بردمانە مقەڕ کەس نەی بینێت. دامانگرت ناردمان، ملازم عومەر هات. ئیتر من دامە دەستی ئەو. ئەو دابەشی کرد. لە سەر قسەی مام جەلال خۆی (سێ) چەکم لە (سەردەشت) دانابوو. کلاشنکۆفێك و دوو بڕنەو. بە هەمووی سێ دانەم دانا. ئەو خۆی وتی:
" –پێنج دانە بۆ مەفرەزەکەی خۆت دابنێ."
من سێ دانەم دانا. کاك ملازم عومەر هەموو چەکەکانی دابەشکرد. وابزانم پێنج کلاشنکۆفی دانا بۆ مام جەلال، چوارەکەی تری ناردبوو بە سەر کادرەکانی تردا دابەش بکرێت. کاتێکم زانی پێشمەرگەیەکی لای مام جەلال هاتە سەرەوە. نامەیەکی پێ بوو وتی:
" –کاك ئاوات ئەوە هی مام جەلالە، بۆ تۆی ناردووە."
پێش ئەوەی من وەریبگرم، کاك نەوشیروان لە دەستی وەرگرت. دیار بوو مام جەلال توڕە ببوو. دوایی کاك نەوشیروان نامەکەی دایەوە دەستم بۆی نوسیبووم:
" –(ئەوە پێنج چەکەکەی تریشم بۆ ناردیتەوە بۆ خۆت. ئەی دەی بەکێ بیدە. نامەوێت)"
زۆر سەیربوو بە لامەوە بۆ نامەی بۆ من ناردووە!؟ بۆ چی چەك بۆ من دەنێرێتەوە. خۆ من دابەشم نەکردووە؟ بە کاك نەوشیروانم وت:
" –باشە کاك نەوشیروان من حەقم چییە؟ ئێوە دابەشتان نەکردووە.؟"
وتی:
" –مام جەلال بۆ خۆی ئەزانێت."
ملازم عومەر شەو ناردی ئەو چەکانەی دابەشی کردبوون، هەمووی کۆکردەوە. وتم:
" –با بچم بۆ لای پێی بڵێم من پەیوەندیم چی بووە بە سەر دابەشکردنی ئەو چەکانەوە؟ خۆت نەتوت تەسلیمی ملازم عومەری بکە؟ ئیتر بۆ لە من عاجز ئەبیت. من هەر ئەوەم لە سەر بووە بۆتان پەیدا بکەم و بۆشتان بێنم تۆش وتوتە بیدە بە کاك عومەر دابەشی بکات. خۆت بتووتایە بیهێنە بۆ مقەڕەکەی خۆم، هەمووم ئەهێنا بۆ خۆت."
کاك نەوشیروان وتی:
" –مەچۆ بۆ لای مام جەلال تۆ حەقت نەبێت. خۆم بەیانی قسەی لەگەڵ ئەکەم. لە بەیانیەوە بڕۆ بۆ ئێران هەتا خۆم پێت نەڵێم وەرەوە، مەیەرەوە."

بەیانی زوو ڕۆشتم هەر سێ چەکەکەی تریشم بە پێشمەرگەیەکدا بۆ ناردەوە. منیش خۆم توڕەکرد. بۆ بەیانی مام جەلال خۆی ناردبووی بە دوامدا بۆ ئەوەی ئاشتم کاتەوەو بڵێ:

" -من رەخنە لە خۆم ئەگرم، کە ئەو نامەیەم بۆ تۆ نوسی."

بەلام من لە وێ نەبووم. کاک نەوشیروان وتبووی:

" -(توڕە بووەو ڕۆشتووە بۆ ئێران)"

وتبووی:

" -بۆ کوێ چووە؟ با بنێرم بە دوایدا. من هەڵە بووم، کە شەو نامەم بۆ ئەو ناردووە."

لە نامەکەشدا هیچی غەڵەتی بۆ نەنوسی بووم، بەلام ئەو باسە پەیوەندی بە منەوە نەبوو. بۆ خۆم چووم بۆ دەورو بەری (سنە) دوایی ناردم بە دوای منداڵەکانمدا. لە سلێمانیەوە هاتن بۆ بانە. دەمێك بوو نەمدیبوون. ماوەیەك لام مانەوە، چووین بۆ تاران و تەورێزو کرمانشاەو زوربەی شارەکانی ئێران، بە یەکەوە گەڕاین. ماوەیەکی خۆش بوو لەو شارە خۆشانە بێترس گەڕاین. دواتر مام جەلال دەچوو بۆ دەرەوە. لە تاران بوو ناردی بە دوامدا بمبینێت، چووم بۆ لای. لە باکوری تاران بوو. لە ئوتێلێکی زۆر خۆش بوو. مام جەلال وتی:

" -ئاوات لە جیاتی ئەو چەکانەو لە جیاتی ئەو پێنج چەکەی خۆت، بە چەند لە من خۆش ئەبیتو ئاشت ئەبیتەوە."

خۆ منیش ئەوە نەبێت خۆم زۆر عاجز کردبێت وتم:

" -مام جەلال جەنابت برای گەورەی منی. بە بێ هیچ بەرامبەرێك ئاشت ئەبمەوە، بەلام نازانم تۆ بۆ نامەت بۆ من ناردبوو.؟"

وتی:

" -وامزانی تۆ خۆت هەر پێنج کلاشنکۆفەکەت بۆ خۆت داناوە. دوایی زانیم کاك ملازم عومەر دابەشی کردووە. هەر زوو ناردم بە دواتدا، بەلام تۆ زوو عاجز ببویت، ڕۆشتبوویت."

پاشان وتی:

" -باشە تۆ چەند چەکت ئەوێت من ئەی دەم بە تۆ."

تومەس بە تەمای ئەو چەکانەیە، کە (لیبیا) دابووی پێمان. ئێران رازی بووە، کە ڕێمان پێ بدات بیان هێنین. هەر ئەو ڕۆژە وتی:

" -لای خۆم بمێنەرەوە."

کاك کەمال خۆشناوی لابوو. ئێزنیدا ڕۆشتو من لە وێ مامەوە. (مستەفا جەمران) وەزیری دیفاعی ئێران بوو. مام جەلال بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کرد، دەربارەی چەکەکان. ئەویش بەڵێنی پێدا وتی:

" -چەکەکان ئامادەن. ئەتوانن بیبەن."

ئینجا نەیاندەهێشت بڕوا. هەر ئەمڕۆ بەیانی. (مام جەلال)یش خۆی نەیدەوێرا سەفەر بکا، هەتا ئەو چەکانە نەگاتە لای خۆمان، چونکە ئەگەر خۆی بڕۆشتایە، دەفەوتان. نەیان دەدایێ. باش بوو چەکەکان گەیشتو مام جەلالیش سەفەری کرد بۆ دەرەوە. ئیتر منداڵەکانم لە بانەوە ناردەوە. وەزعی شارەکانیش خراپ بووبوو. شەڕ دەستی پێ کرد لە بەینی کوردو حکومەتدا. شارەکانی گرتەوە. یەکەم جار لە (پاوە)وە شەڕ دەستی پێکرد. من لە کرمانشاە بووم، کە لە پاوە شەڕ بوو. منالەکانیشم لەگەڵ بوو. خۆپیشاندان لە ناو کرمانشاە بوو. دەیانوت:

مەرگ بە قاسم لو، شێخ عزەدینو جەلال تاڵەبانی. زۆر سەیر بوو بە لامەوە!

برادەرێکی بانەیم لەگەڵ بوو وتی:

" -ئەگەر ئێستا ئەزانن تۆ جەماعەتی تاڵەبانیت، وەزعت خراپ ئەبوو."

ئیتر بە پەلە گەڕامەوە بۆ بانە. لە وێوە منداڵەکانم ناردەوە بۆ سلێمانی خۆشم گەڕامەوە بۆ ناوزەنگ.

٥٤

چەند مانگێك بە سەر ئەو بارودۆخەدا تێپەڕی. ڕۆژێ کاك نەوشیروان جوابی بۆ ناردم، وتی:

" -خولێکیان بۆکردووینەتەوە لە لای فەلەستینیەکان. تۆش بچۆ، هەموو (١٠) کەسن. ئەمە بۆ یەکەمجارە خولێکی وامان بۆ بکەنەوە لە دەرەوەی وڵات. ئەبێت زۆر وریابن لە هەڵسوکەوتتان لە گەڵیاندا. ئەگەر ئێوە باش نەبن، ئیتر کەسی تر وەرناگرن. لە بەر ئەوە زۆر ئاگات لە برادەران بێت."

بە هۆی ئەوەی من ئەندامی سەرکردایەتی بووم ئەو کاتە. بووم بە لێپرسراوی ئەو نۆ کەسە. ئەو نۆ کەسەش ئەمانەبوون :

١ - ئازاد حەمە غەریب (ئازادی سەگرمە).

٢ - حامیدی حاجی غالی.

٣ - شۆڕش ئیسماعیل.

٤ - دانای ئەحمەد مەجید.

٥- ئەنوەر حەسەن. (ئەنوەر حەسەن گەڕلیەوە بۆ کوردستانو بوو بە ئامر هەرێم لە گوندی قازان لە دۆڵی سورداش لەگەڵ پۆلێك پێشمەرگەدا شەهیدکران.

٦ - مامۆستا ئەنوەر (ئەنوەری عەبدوللا سەبری) ناوی خۆی (رەفیق)ە.

٧- شاخەوان عەباس.

٨- ئەسکەندەر.
٩- سەلاح چاوشین.
هێشتا داوایان نەکردبووین بڕۆین، من بە کاک نەوشیروانم وت:
" -کاک نەوشیروان پێش ئەوەی بڕۆین، ئەمەوێت بچم جواب بۆ منداڵەکانم بنێرم بیانبینم."
وتی:
" -باشە بڕۆ."
دوو پێشمەرگەی لای خۆمانم برد. یەکێکیان ناوی حەمە سوور بوو، خەڵکی ناوچەی سیوەیل بوو. شارەزای دەوری ماوەت بوو. ئەوی تریان ناوی مستەفا بوو. ڕۆیشتین چووینە ناوچەی ماوەت. ئەو کاتە هەموو گوندەکانی سەر سنوور گوێزرابوونەوە، چۆڵ کرابوون. بە دوو ڕۆژ چووینە گوندی (کوڕە داوێ) زۆر دێیەکی خۆش بوو. چووینە ماڵی مەلای گوندەکە. من نەمدەناسی، بەڵام حەمە سوور دەیناسین، بەڵام پێی وتبوو ئەمە (ئاوات قارەمانی)ە. شەو چووینە ئەوێ. بۆ بەیانی مەلاکەم نارد بۆ سلێمانی بە دوای منداڵەکانمدا ناونیشانم دایەو چوو بە دوایاندا. خۆشمان بەیانیەکەی نانمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرتو چووین بۆ دەرەوەی گوندەکە، چونکە ئەو کاتە ناو گوندەکە خەتەربوو. هەتا ئێوارە نەگەڕاینەوە، کە هاتمەوە، منداڵکانم هاتبوون. تەنیا پێشڕەوی کوڕمی هێنابوو. دوو منداڵەکەی ترمی نەهێنا بوو. لە بەر ئەوەی کوڕەداوێ مەترسیی لەسەربوو. وتم:
" -ئێمە ئەڕۆین."
ڕۆیشتین، ئەو شەوە گەیشتینە ناوچەی (بێ ژوێ). بێ ژوێ دێیەکی ئێران بوو، شەش سەعات لە کوڕەداوێوە دوورە. حەمە سوور ژنو منداڵەکەی لەوێ بوو. شەو چووینە ماڵی ئەوان هەتا بەیانی. ئەو ڕۆژە لەوێ بووین. ڕۆژی دوایی وتم:
" -ئێوە بۆ خۆتان لێرە بن، لای منداڵەکانتان. دوایی بچنەوە بۆ ناوزەنگ بۆ مقەڕ. خۆشم لەگەڵ منداڵەکان، ڕۆیشتین بۆ (سەردەشت) لەوێوە چووم بۆ تاران. نزیکەی دە ڕۆژێ لەوێ ماینەوەو دوایی گەڕاینەوە بۆ ناوزەنگ. پێش ئەوەی بگەینە (کانی زەرد) خۆم لە پێشەوە دەڕۆیشتم. زەینەبو پێشڕەو بە سواری هێسترێکەوە بوون. لە دواوە دەڕۆیشتن قسەم بۆ دەکردن، لە پڕ دەنگ نەما. لامکردەوە سەیرمکرد، کەوتوونەتە خوارەوە، زەینەب جوڵە ناکا. راموەشاند، وتم بەخوا مرد. تۆزێ راموەشاند کەوتە جووڵە، کە هەڵمساندەوە، دەستیو دووسێ پەراسوی شکابوون. بردمەوە بۆ ناوزەنگ. ماوەیەک لەوێ مایەوە، تا باش بوو. ماوەیەکی پێچوو هەواڵمان بۆ هات وتیان:
" -ئیشەکانتان تەواو بووە. دەبێت بڕۆن بۆ تاران."
من بۆ خۆم لەگەڵ برادەراندا بە ڕێ کەوتم بەرەو تاران. منداڵەکانیشم ناردەوە بۆ سلێمانی. ماوەیەک ماینەوە لە تاران ئەوجا (لیزە پاس)یان بۆ کردین بۆ سوریا.

ماوەیەکیش لە سوریا بووین. دوایی بردینیان بۆ موعەسکەرێکی جەبهەی دیموکراتی لە دەرەوەی شام، کە سکرتێرەکەی (نایف حەواتمە) بوو. بیست رۆژ لە وێ بووین. دوایی بردینیان بۆ لوبنان بۆ مقەرەکانی خۆیان. ناسنامەی خۆیان بۆ کردین، بۆ ئەوەی وەك فەلەستینیەك بگەڕێین، کەس نەماننناسێ. پێیان وتین:

" –نابێت بچنە دەرەوە، چونکە خەتەرە. عێراق بزانێت ئێوە لێرەن، ئەتانکوژن. یەکێکتان شتێکتان لێ بێت، ئێمە چی بکەین؟ خۆ (ئەبو شەلال) ئابڕومان دەبات."

بە (مام جەلال)یان دەوت (ئەبو شەلال). دوایی بردینیان بۆ (جنوبی لوبنان) بۆ مەشق کردن. ئەو شارەی ئێمەی لێ بووین، ناوی (راشدییە) بوو. شارێکی بچووك بوو. لە ژوورێکدا بووین بە سەرە پاسەوانیمان دەگرت. جار جار کۆماندۆسی ئیسرائیلی، بە هەلیکۆپتەر بە شەو دادەبەزین. پێیان وتین:

" –دەبێت زۆر وریا بن."

ئێمەش وتمان:

" –باشە."

ئێمە زۆر گوێمان نەدەدایە. شەوێك شاخەوان عەباس پاسەوان بوو، بوو بە دەنگە دەنگ. شاخەوان هاواریکرد:

" –وەرنە دەرەوە."

کە چووینە دەرەوە، بەو شەوە دنیا وەك چراخان بوو. هەلیکۆپتەر بە نزمی دەگەڕا تەقەی دەکرد. وتم:

" –چییە شاخەوان.؟"

وتی:

" –نازانم."

مامۆستاکەی خۆمان فەلەستینی بوو، هات، وتی:

" –برادەران هەلسن. سوپای ئیسرائیلی دابەزیون."

کە سەیرمکرد لە ئێمەوە دوورە. بە برادەرانم وت:

" –بڕوا ناکەم هیچ ببێت، بەلام وریا بن."

لە پڕ کابرای فەلەستینی هاواریکرد وتی:

" –رەفیق."

یەکێك لە برادەرانی خۆمان وتی:

" –ها رەفیق چییە.؟"

کابرا زۆر بە لایەوە سەیر بوو، کە ئێمە بەو هەموو تەقەو فەرتەنەیە، هەر گوێمان نەدەدایە! دیسان ئاگاداری کردینەوە. دوایی وتی:

" –بیستبووم کورد کەللە رەقە، بڕوام نەدەکرد، بەلام ئێستا بۆم دەرکەوت ئێوە کەللە رەقن."

دوای تۆزێ هەموومان چووینە دەرەوە دامەزراین. وتمان ئەگەر هاتن، شەڕ دەکەین. لای ئێمەوە هیچ نەبوو. ئەو مقەڕە فەڵەستینیەی، کە لەگەڵ ئێمەبوو، چۆڵیان کردبوو، رۆیشتبوون. بەیانی هاتنەوە بۆ بارەگاکانیان، کە هاتنەوە ئێمە هەر لە شوێنی خۆمانبووین، بە خەیاڵماندا نەدەهات. نەدەترساین. زۆر سەیربوو بە لایانەوە! نەیاندەزانی ئێمە لە کوردستان ئەوەندە راوڕاوێنیان لەگەڵ جەیشی عێراقیو هەلیکۆپتەرو جاشو عەسکەریدا پێ کردبووین، سیوامان بووبۆوە. ئیتر ناومان دەرکردبوو. وامان لێ هاتبوو هەموو دەیانزانی، کە ئێمە کوردین. ئەگەر شتێك ببوایە، رەنگە بمانتوانیایە شەڕ بکەین. لێپرسراوی ئەو موعەسکەرە لە ئێمە دڵنیابوو. هیچ شەوێ لەوێ نەدەمایەوە. بۆ خۆی دەڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوە. زۆر بڕوای پێمان بوو. دەیوت:

" –لە بەر ئەوەی ئێوە لێرەن، ئیتر پێویست ناکات من لێرە بمێنمەوە. "

شەوانە پاسەوانمان دەردەکرد. هەموو شەوێ. وایان لێ هاتبوو، دەبوو شەوی یەکێك لە ئێمە، وەك زابتی (ئەفسەری) مراقیب، بەسەر مقەڕەکانی ئەوانیشدا بگەڕێن، چونکە حەرەسەکانی خۆیان شەو دەنوستن. حامیدی حاجی غالی سەلاح چاوشینی هەڵدەساند. (سەلاح)یش زۆر تەمەڵ بوو بۆ پاسەوانی. حامید هەڵدەستا دەیوت:

" –سەلاح هەڵسە سەرەی پاسەوانیتە. "

ئەویش دەیوت:

" –حامی گیان کەمێك بۆستە با تۆزێکی تر بخەوم. "

یان دەیوت:

" –دە بوەستە با چاوم بکرێتەوە. "

بەو شێوەیە سەعاتێکی بە حامیدی فەقیر تەواو دەکرد، خۆشی هەر لە جێگادا بوو. حامیدیش توڕە دەبوو، دەیوت:

" –من سەلاح خەبەر ناکەمەوە بۆ پاسەوانی. "

هەر لەگەڵ ئەویش دایان دەنا. بە یەکیشەوە نانیان دەخوارد. دوو دوو نانمان دەخوارد. حامید زۆرخۆربوو. (سەلاح)یش کەمخۆر بوو. هەموو جارێك سەلاح دەچوو بەشەکەی لە ناو قاپەکەدا جیا دەکردەوە. لە بەر ئەوەی کاك حامید زۆر بە پەلە بوو. سەلاح چاوشین پێی دەوت:

" –قەرە. "

هەر بەو ناوەوە بانگی دەکرد. حامیدیش بەوی دەوت:

" –سەگە چاو کەوە. "

هاوڕێیەتیان خۆش بوو پێکەوە. ماوەیەکی خۆشمان بردە سەر. رۆژێ هەواڵمان بۆ هات وتیان:

" –خۆتان کۆبکەنەوە دەچین بۆ موعەسکەرێکی تر.

که چووین، باخه هەنارێکی زۆر گەورە بوو. خانوویەکی لێ بوو، خانووەکە لە پاڵ باخەکەدا بوو. کە چووین بۆ شوێنەکە، کابرا خۆی لەگەڵمان بوو. وتی:

" -بە قوربانە زۆر ئاگاتان لەو باخە بێت، ئەوە هی کەنیسەیە."

وتمان:

" -باشە بەسەر چاو ئاگامان لێی ئەبێت."

ئەوان تەجروبەی پێشوتریان هەبوو. خۆمان لە پێشدا لە ناو باخە پرتەقاڵێکدا بووین.

حامی هەر پێش نانخواردنی بەیانی دەیوت:

" -ئەم بەیانیە ١٢٠ دانەم خواردووە."

هەموو دەمو لێوی برینداز ببوو، ئەوەندە پرتەقاڵی هێنابوو بە دەمیا. هەتا ڕۆژێکیان پێی وتم:

" -کاك ئاوات وەرە بۆڵێك مۆزم شاردۆتەوە بۆ ئەوەی بگات."

وتم:

" -جا کاڵە ئێستە چۆن ئەخورێت.؟"

وتی:

" -برا ئێستە گەیوە، چونکە کردومەتە ژێر پوشەوە."

کە چووین، نەمابوو. نزیکەی چارەکێك بە دوایدا گەڕا، نەیدۆزیەوە. گەڕاینەوە، ئەنوەر حەسەن وتی:

"- ئەوە بۆچی ئەگەڕای.؟"

ئەویش وتی:

" - بەخوا ئیشی تۆیە شاردوتەتەوە لێم."

تومەس، کە کاتێك حامید شاردبوویەوە، شەهید ئەنوەر حەسەن ئاگای لێ ببوو. چوو بوو دەری هێنابوو، لێی شاردبۆوە. بە سێ قۆڵی چووین دەرمانهێنایەوە، بۆڵە مۆزەکە پێگەیشتبوو. کەسمان ئەوەمان نەدەزانی بەو کاڵیە پوشو کا بکەی بە سەریا، پێدەگا. بەس حامید ئەوەی دەزانی.

کە هاتینە ناو باخە هەنارەکەوە وتیان:

" -بە قوربانە ئەمەیان واڵێ مەکەن."

هەر ئەو شەوە چووینە ئەوێ پاسەوانمان دەرکرد. مامۆستا ئەنوەر پاسەوان بوو. ئەوەندەم زانی یەك جامانەی پڕ کردبوو لە هەنار. وتی:

" -هەڵسن هەنار بخۆن."

وتم:

" -مامۆستا ئەنوەر کابرا هاواریکرد ئاگاتان لەو باخە بێت. تۆ بۆ کاولت کرد."

وتی:

" -بابە چۆن بەوە کاول ئەبێت. خۆ من هەر دانەم لە برێك کردۆتەوە. ئەوە ماڵی کەنیسەیە خێرە بیخۆیت. خۆ ئەوە بۆ فرۆشتن نیە. هەر بۆ خواردنە."

وا بزانم هەمووی (٢٠) رۆژ لەوێ بووین، کاولمان کرد. هەر شەوێ یەك کوڵمان لێدەکردەوە. ئەو خولەی ئێمە دەمان بینی، خولی بەکارهێنانی تۆپو گراد بوو. مامۆستایەکمان هەبوو، هەر چییەك دەبوو یان هەر چیمان دەوت، دەیوت:

" -موش موشکلە."

ئیتر ئەوە جوابی ئەو بوو. ئێمەش وازمان لێ هێنابوو. هەر دەرسمان دەخوێند. رۆژێك دەرس تەواو بوو، دەچووین بۆ مەشق کردن. بە عەمەلی تۆپمان تاقی دەکردەوە، کە چۆن دەتەقێ‌و بەکاردێ. جێگایەکمان دیاری کردو بە هاوەن‌و تۆپی گەورەو گراد بۆردومانمان دەکرد. من گرادەکەم تەقاند بۆ ناو دەریایەك، چونکە یەك گوللەیان داینێ بیتەقێنین. وتیان:

" -با ئاوات بیتەقێنێ."

ئیتر ئەو رۆژە هاوەن‌و تۆپمان تاقی کردەوە. تومەس دانەیەکیان داوێتی بە ماڵێکدا، ماڵەکەی سوتاندبوو. چەند ئوتومبێلێکیشی شکاندبوو. مامۆستاکەمان، کە بەیانی هات، زۆر بێ تاقەت بوو. خەریك بوو دەگریا وتمان:

" -ها رەفیق ئەوە چییە.؟"

وتی:

" -جا چی نییە؟ دوێنێ لە کاتی مەشقەکەدا، گوللە بەر ماڵێك کەوتووە وێران بووە. دوو سێ ئوتومبێل شکاوە."

سەلاح چاوشین وتی:

" -رەفیق موش موشکلە."

کابرا دای بە سەری خۆیدا وتی:

" -چۆن موشکیلە نییە؟ قوڕ کرا بە سەرمدا، ئەم خەنە زیندانەوە."

سەلاحیش دەیوت:

" -هیچ نییە."

وتمان:

" -قوڕ کراوە بە سەریدا، تۆش ئەڵێیت هیچ نیە."

وتی:

" -سێ مانگە ئەو هەر ئەڵێت موش موشکلە. منیش ئەڵێم رەفیق موش موشکلە."

خولەکەمان تەواو بوو. دوای سێ مانگ لە فەڵەستینیەکانمان داواکرد بمان بەنەوە بۆ سوریا. لەگەڵ برادەرانی خۆمان قسە بکەین. بۆ ئەوەی بێن بە دواماندا. وتیان:

" -لوبنان بەم خۆشی یە، بۆ چی ئەوەندە پەلەتانە برۆنەوە.؟"

وتمان:

" –راستە خۆشە، بەڵام ئێمە بۆ گەشتو گوزار نەهاتووین. دەمانەوێت زوو بڕۆینەوە بۆ کوردستان."
وتیان:
" –ئەمە بۆ یەکەم جارە خەڵك هاتبێ بۆ ئێرەو، وا پەلەی بێت بۆ گەڕانەوە. هەرچی هاتووە، بە زۆریش دەرمان کردوون نەگەڕاونەتە.
ڕۆژێك وتیان:
" –وەرن ئەوە برادەرانی خۆتان هاتوون بۆ لاتان."
کە چووین دکتۆر فوئاد مەعصومو دارۆی شێخ نوریو هەڤاڵ خەجۆیان لەگەڵ بوو. هەڤاڵ خەجۆ کوردی کوردستانی تورکیا بوو. سکرتێری حیزبی (ئاڵای رزگاری) بوو. هاتبوون بۆ سەردانی ئێمە. ئێمەش تۆزێ بۆڵە بۆڵمانکرد بە سەریاندا وتمان:
" –ئێمە سێ مانگە لێرەین، جارێك نەهاتن بۆ لامان بزانن وەزعمان چۆنە.؟"
هیچ پارەمان پێ نەبوو. ئەوانیش نەهاتن بە لاماندا. وتمان:
" –ئێمەش دەڕۆینەوە بۆ سوریا."
وتیان:
" –دە باشە ئێمە ئەگەڕێینەوە، بۆ ئەوەی جێگاتان بۆ دابین بکەین، کە گەڕانەوە."
ئوتومبێلیان بۆ هێنایینو ئێمەش گەڕاینەوە بۆ سوریا. لە سوریا بردینیانە ئوتێلێ. ماوەیەك لەوێ بووین، زۆر دەکەوت لە سەرمان. دوایی خانویەکیان بۆ گرتین بە کرێ. چووینە ئەوێ. ئیتر خۆمان خواردنمان دروست دەکرد. ساڵی ١٩٨٠ بوو، شەڕی ئێران و عێراق دەستی پێکردبوو. زۆر خۆشحاڵ بووین. وتمان ئیتر حکومەتی عێراق ناپەرژێتە سەر ئێمە. هەرچی هێزی هەیە، بە شەڕی ئێرانەوە سەرقاڵ دەبێ. خەبەریشمان هەبوو زۆری رەبایەکانی کوردستانی چۆلکردووەو بەرەو باشوری بردووە. ئێمەش هەر پەلەمان بوو، چۆن بگەڕێینەوە؟ ئەو کاتەش مام جەلال لەوێ بوو. پێمان وت:
" –بەڵکو تۆ خۆت شتێکمان بۆ جێ بە جێ بکەیت بگەڕێینەوە."
دیار بوو هیچ نەدەکرا. هەر دەیانوت:
" –چاوەڕێ بکەن."
ئێمەش بە مام جەلالمان وت:
" –ئەگەر هەر نەکرا، بە پێ ئەگەڕێینەوە بە ناوچەی بادیناندا. تا ئەگەینەوە ناوزەنگ.
دەوری هەشت مانگمان پێ چوو. دوایی مام جەلال خۆی لەگەڵ فەڵەستینیەکاندا محاوەلەی بۆ کردبووین، کە بە پەساپۆرتی ئەوان بتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئێران. پێی گەڕاینەوە بۆ ئێران. پێش گەڕانەوەمان، مام جەلال وتی:

" –چوارتان مەڕۆنەوە. لەوانەیە (روسیا) هەندێك خەڵكمان بۆ وەربگرێ، بۆ دەورەیەكی تر.
منیش وتم:
" –باشە، با لە هەر شارێ یەكێك بچێ."
وتی:
" –باشە."
لە هەر شارەی نەفەرێكمان دانا. دانای ئەحمەد مەجید – سلێمانی، شاخەوان عەباس – هەولێر، ئەنوەرحەسەن – كەركوك، ئەسكەندەر – بادینان.
هەر یەكەیان خەڵكی شارێك بوون. خۆشیان پێیان خۆش بوو. ئەوانمان جێهێشت. خۆشمان شەش كەس بووین، گەڕاینەوە بۆ ئێران. دوو رۆژ لە تاران ماینەوە، ئەوجا گەڕاینەوە بۆ لای برادەران لە ناوزەنگ. كە هاتینەوە ئێران، زستان بوو بەفرێكی زۆر باری بوو. شەو گەیشتینە (دیواندەرە) منو كاك حامیدی حاجی غالیو كاك شۆڕش ئیسماعیلو كاك سەلاح چاوشین بووین. شەو گەیشتینە بازگەی یەكەم، پاسدارێك هاتە ناو پاسەكەوە، داوای ناسنامەی لێ كردین. ئێمەش لە تارانەوە وەرەقەیەكی رێگایان بۆ كردبووین. برادەرانی خۆمان لە وێ بوون. عیلاقاتمان هەبوو لە تاران. پاسدارەكان دایان بەزاندین. هەرچەند وتمان:
" –(بەرگە)مان پێیە."
سوودی نەبوو. پاسەكەیان ئیزن داو ئێمەیان هێشتەوە. وتیان:
" –لێرە بن."
بردینیان بۆ ژورێك دایان ناین. پەتاتەیان هەبوو، بۆیان هێناین. ژوورەكەش زۆر گەرم بوو. زۆپایان بۆ داخستبووین. من لێی خەوتم. كاك حامید زۆر دەترسا، جێگای بە خۆی نەدەگرت. دەچووە دەرەوەو دەهاتەوە. هاتە لامەوە وتی:
" –هەڵسە بچۆ ئەو شتانەی پێتە، هەمووی بدڕە."
زۆر وێنەو ناسنامەو پاسپۆرتی فەڵەستینیمان پێ بوو. هەر یەكەی بە ناوێكی عەرەبیەوە. وێنەی هەموو دەورەكەشمان پێ بوو. كاك شۆڕش ئیسماعیلو كاك سەلاح چاوشین، هیچیان پێ نەبوو. لە تاران لای برادەرانی خۆمان دلیاننابوو. كاك حامید وتی:
" –چیت پێیە، بچۆرە توالێتەكە، هەمووی بدڕەو ئاوی پیا بكە. من هەموویم وا لێكرد. نەجاتمدان.
وتم:
" –وازم لێ بێنە. من نایان دڕێنم."
وتی:
" –بۆ نای دڕی، ئەتەوێ هەموومان توش بكەیت.؟"

وتم:

" –جا تۆ بۆ تووش ئەبیت. ئەوەنیه تۆ هیچت پێ نەماوە.؟"

وتی:

" –ئاخر هەموو به یەکەوەین. ئێمەش توش ئەبین."

وتم:

" –به خوا ئەگەر بەیانی منو تۆیان له سەر ئەو جادەیه ئیعدام کردبێ، من یەك شت نادرێنم."

تورەبوو، دەستی کرد به قسەکردن وتی:

" –بەڵێ به تەمای بیبەیتەوە بۆ کوردستان خۆتی پێوە بادەی."

وتم:

" –ئەی بۆ چیم هێناوەتەوە؟ هەر بۆ ئەوەمە."

من هەر به خەیاڵمدا نەدەهات. دەمزانی هیچ نییه. زۆر جار ئاوا رایانگرتووم به بەلاش. دوایش وتویانه برۆ. خۆ ئێمه قاچاخ نەبوین. ئەو کاتەش پەیوەندی نێوان فەلەستینیەکان و ئێران، خراپ نەبوو. ئەو شەوە هەتا بەیانی کاك حامید بۆ یەك دەقەش خەو له چاوی نەکەوت. هەر دەیبۆلاندو جوێنی به خۆی دەدا، که رەفیقی من دەکات. بەیانی خۆر کەوت، به خەبەریان هێناین وتیان:

" –هەڵسن بەرچایی بخۆن.

دەموچاومان شتو نانو چامان خوارد، تۆزێ دانیشتین. هەڵسام چووم بۆ لای مەسئولەکەیان وتم:

" –ئاغا ئێمه چی بکەین. بۆ چی ئێمه تان داناوە لەم شوێنه؟"

وتی:

" –ئاغا بۆ نارۆن."

وتم:

" –ئەی بۆ شەو ئێمەتان داگرت.؟"

وتی:

" –له بەر ئەوەی شەو دژی ئینقلاب ئەیانگرتن. بۆیه نەمان هێشت برۆن."

ئەوان به پێشمەرگەی حیزبی دیموکراتیان دەوت دژی ئینقلاب. وایان دەزانی ئەمانگرن.

بانگی پاسداری سەرجادەکەی کرد پێی وت:

" –رەوانەیان بکە."

چوومەوە وتم:

" –کاك حامید با برۆین."

کاك حامید گاڵتەی لێ دەهات، وتی:

" -بە راستتە.!؟"

وتم:

" -ئەی بۆ چی؟ جانتاکەت هەڵگرە با بڕۆین."

ئەوجا هەتا گەڕاوینەتەوە بۆ ناوزەنگ بە گاڵتەو پێکەنینەوە، سەرمکردبووە سەر کاك حامید تا ناوزەنگ. کاك حامید لە داخا نەیدەزانی چی بکا. ئەو هەموو وێنەو یادگاریانەی دڕی بوو. زۆر پەست بوو. نەیدەزانی چی بڵێ. لە داخا دەیوت:

" -جانەوە چی یە؟ هەر نامەوێت."

هاوڕێیەتی کاك حامید زۆر خۆش بوو. ئەو ماوەیەی بە یەکەوە بووین، زۆر بە خۆشی بردمانە سەر.

کە گەیشتینە لای برادەران لە ناوزەنگ، بەفرێکی زۆر باری بوو. برادەران دەنگوباسی دەورەکەیان لێ پرسین، کە چۆن بوو؟ ئێمەش بۆمان باسکردن. دوایی وتیان:

" -کاك نەوشیروان گیراوە."

کە وایانوت، بە لامەوە زۆر سەیربوو! منیش وتم:

" -لە کوێ گیراوەو کەی گیراوە.؟"

وتیان:

" -کە بە ئیشی خۆی چووە بۆ شارەزور. لەوێشەوە چووە بۆ لای ئەوان بۆ سوڵح، کە چی (ح، س، ك) گرتویانە."

وتم:

" -ئەی چی ئەکەن.؟"

وتیان:

" -ئێستا سەر قاڵین بۆ بەردانی. هەوڵمان داوە لە ڕێی حیزبی شیوعیەوە. ئەوان وان لە بەیندا."

هەواڵێکی ناخۆش بوو. چووەمەوە بۆ مقەڕەکەی خۆمان، سەیر دەکەم مقەڕەکە گۆڕابوو. مقەڕەکەی کاك نەوشیروان هاتبونە ژورێکی تر. ئەوی تریان دابوو بە پێشمەرگەی سەرکردایەتی. دوو ژووری تریان بۆ خۆمان دروستکردبوو. زۆر خۆشتربوو. ژوورێکی گەورە بۆ پێشمەرگەکان. ژورێکی بچوکتر بۆ خۆمان. ماوەیەك لە وێ بووم. لە هەموو شتێ خۆشتر ئەوە بوو، کە گەڕامەوە، لە ناوەندی کۆمەڵە دانیشتبووم، لە پڕ کاك ئازادی مەلا بە ناوی (شاهۆ) خۆیکرد بە ژووردا. باوەشمان کرد بە یەکدا. زۆرم پێ خۆش بوو. دەمێك بوو نەم دیبوو. ئەو لە زیندان بوو. ئەو ماوەیەی، کە لە ناو شاردا بووین، زۆر پەیوەندیمان خۆش بوو. منو ئەو لەگەڵ شەهید شوان، زۆر یەکمان خۆش دەویست. دلیم بە یەکەوە بووین. کە چومە شاخ شوانیش دوای من هاتە شاخ. شاهۆ گیرا. ئیبراهیم حەسەن بە گرتی دابوو. ئەوە بوو شوانە شەهید بوو. دووسێ ڕۆژ بە یەکەوە بووین وتم:

" –من ئەچم بۆ خوارەوە، بۆ دەورو بەری شاربازێڕ بۆ لای کاک (وەهاب) ئەو کاتە ئامر کەرتی شاربازێڕ بوو لە هەرێمی سێ."

وتم:

" –ئەگەر بوار هەبێ، لە پێشا جواب ئەنێرم بۆ ماڵو منداڵەکەم چاوم پێیان بکەوێت."

بە ڕێکەوتم بەرەو شاربازێڕ. گەیشتمە (پاڕەزان) وتیان:

" –دوێنێ کاک نەوشیروان لە زیندان رایکردووە. لە خۆشیدا بووە بە تەقە کردنو هەلایەك هەر مەپرسە."

ئەم هەواڵەمان زۆر پێ خۆش بوو. شەو چووم بۆ لای لەگەڵ بەکری حاجی سەفەرو مەلا بەختیار. هەموو هێزەکانی شاربازێڕو شارەزوری لەگەڵ بوو. (وەهاب)یشی لێبوو. شەو کاک نەوشیروان دەنگوباسی دەورەکەی لێ پرسیم چۆن بووە؟ منیش بۆم باسکرد، کە چۆن بووە. ئیتر کاک نەوشیروان بەیانی بەرەو سەرکردایەتی بە رێ کەوت. منیش لەگەڵ وەهاب چووینەوە بۆ شاربازێڕی تەخت. بۆ دەوری (سیتەك)و (چنگیان) لەوێ چووینە ماڵی (مامۆستا رەفیق) لە چنگیان مامۆستا بوو. برادەری وەهاب بوو. ئەو چوو بۆ سلێمانی منداڵەکانی بۆ هێنام. دووسێ ڕۆژ لە ماڵی ئەوان بووم. ئیتر ئەوانم ناردەوە بۆ سلێمانیو خۆم لەگەڵ وەهاب مامەوە. جەولەمان دەکرد. مەلا بەختیار لە دیوی پاڕەزان بوو. جوابی بۆ ناردم، کە بچم بۆ لایان. لەوێ دەنگی ئەوە هەبوو کۆنفرانسی کۆمەڵە بگیرێت.

٥٥

لە پاڕەزان چووم بۆ لای مەلا بەختیار. نامەیەکی کاک نەوشیروانی پیشاندام، کە بۆی نووسیوە، داوای کردووە هەموو بگەڕێنەوە بۆ سەرکردایەتی. کاک نەوشیروان زۆر توڕە بووە، دەڵێ:

" –من وازدێنم. لەگەڵ ئێوە ئیش ناکەم."

وتم:

" –چییە.؟"

مەلا بەختیار وتی:

" –لە برادەرانی ناوەند زویر بووە. شتیان دژی ئەو لە بڵاوکراوەی (کۆمەڵە)[49]دا نووسیوە."

مەلا بەختیار زۆری پێ ناخۆش بوو، وتی:

" –زۆر خراپیان کردووە ئەوەیان نووسیوە."

پێی وتم:

[49] - کۆمەڵە : بڵاوکراوەیەك بوو، زمان حاڵی کۆمەڵە بوو.

" –ئەبێ زوو بگەڕێینەوە."
منیش وتم:
" –زۆر باشە با بڕۆینەوە بۆ سەرکردایەتی بۆ ناوزەنگ. خۆ هیچ ئیشم نەماوە ماڵو منداڵم دیوە. هەر بۆ ئەوە هاتبووم بۆ ئەم ناوە."
یەك دوو ڕۆژی تر ماینەوە. دوای ئەوە گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی. چوومەوە بۆ مقەڕەکەی لای خۆمان، بۆ لای کاك نەوشیروان. سەیرمکرد زۆر بێ تاقەت بوو. وتی:
" –بەتەماین کۆنفرانس بگرین."
ئەوجا وتی:
" –هەر بۆتان بە جێ دێڵم."
وتم:
" –بۆ چی بۆمان جێ دێڵی.؟"
وتی:
" –من لەگەڵ خەڵکی وا ئیش ناکەم. ئەمانە زۆر بێ وەفان. وایانزانی من بەرنابم. لە باتی هەموو مەدحکردنێکیان، کەچی لە کۆمەڵەدا لە دژم شتیان نوسیوە."
دیار بوو نووسینەکە (مامۆستا جەعفەر) نووسیبووی. سالار عەزیزو فەریدون عەبدولقادر رازی ببوون لە سەر بڵاوکردنەوەی. کاك نەوشیروان زۆر پێی بێ تاقەت بووبوو. ئیتر داوایان لە ڕێکخستنەکانی شارەکانیش کردبوو ئامادەبن بۆ کۆنفرانسی کۆمەڵە. ئەوە یەکەم (کۆنفرانس) بوو، کە هەموو ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بەشداریی تێدا بکەن. ئیتر ئەو ماوەیە زۆر لە کادرو ئەندامەکانی ناو هێزی پێشمەرگە کۆببوونەوە. دەستکرابوو بە کۆبوونەوەی ئەندامانی ڕێکخستنەکانی ناو هەرێمی پارێزگاری. دەورووبەری سەرکردایەتی زۆربەی لە کۆمەڵە بوون. شەوانە لەگەڵ کاك نەوشیرواندا زۆرمان موناقەشە دەکرد لە سەر کۆنفرانس. ئەو ڕەئی وابوو کۆنفرانس هەر لە بەرژەوەندیی ئەو برادەرانەیە. گۆڕانی بە سەردا نایەت. ئەو کاتە حەمە تۆفیقو وەهابو شۆڕش ئیسماعیلو سامانی گەرمیانو سەلاحی موهەندیسو زۆر لەو برادەرانە لەوێ بوون. ئێمە زۆر باش دەمانزانی ڕەئی برادەرانی کۆمەڵە چییە، چونکە زۆربەی یەکتریمان دەناسی. زۆر گوێمان بۆ یەکتری دەگرت. بە قسەی یەکترمان دەکرد. لە ناو هێزی پێشمەرگەدا چیمان بویستایە دەمانتوانی بیکەین. بۆ کۆمەڵەو گۆڕانکاری لەسەر سەرکردایەتی. من جارێك بە کاك نەوشیروانم وت:
" –من گرنتیت دەدەمێ، ئەگەر تۆ وەعد بدەیت بە جێمان نەهێڵی. ئەگەر کۆنفرانس بە دڵی تۆ نەبوو، چیمان ویست وا نەبوو، بڕۆ هەر وازی لێ بێنە. ئەم ڕێکخستنەی ئێمە بە کەڵك نایەت."
کاك نەوشیروان وتی:

" —ئەگەر وابوو، من وەعد بە ئێوەو کۆمەڵەو شەهیدەکان ئەدەم، هەتا مردن من لەگەڵتان بم."

من لە بریی هەموو برادەرانی خۆمان پەیمانم دایە. حەمە تۆفیق‌و وەهاب ئاگایان لەوەبوو. من هەتا باسی دەنگەکانیشم کرد لە سەر هەر هەموو برادەرەکان، ئەگەر بیریان مابێ. پێش ئەوەی کۆنفرانس دەست پێ بکا، چەند کۆبوونەوەیەکمانکرد وەك سەرکردایەتی کۆمەڵە. ئەو کاتەش من هەر سەرکردایەتی بووم. دکتۆر کەمال خۆشناو سەرکردایەتی یەکێتی بوو بە ناوی خەتی گشتییەوە ئیشی دەکرد. دووسێ جار بە من‌و برادەرانی وت:

" —من ئیتر نامەوێت بە ناوی خەتی گشتییەوە ئیش بکەم. من کۆمەڵەم. هەر لە بەر کۆمەڵەش هاتوومەتەوە. ئەمە بۆ من شتێکی مێژوویە یەکەم کۆنفرانسی کۆمەڵەیە دەمەوێ کۆمەڵەبم، بەڵام بەشدار نەبم لە کۆنفرانسدا زۆر ناخۆشە. هەر دێم، ئەو مەسئوولیەتەم ناوێ. من وەك ئەندامی کۆمەڵە چیم پێ بڵێن ئەیکەم."

منیش پێم وت:

" —بوەستە با لەگەڵ کاك نەوشیروان قسە بکەم، دوایی جوابت لێ ئەگێڕمەوە."

بە کاك نەوشیروانم وت. ئەویش وتی:

" —باشە ئێوارە کۆبوونەوەمان هەیە. تۆ بۆ برادەرانی باس بکە. بزانین ئەوان رایان چییە."

وتم:

" —باشە."

شەو کۆبوونەوەی سەرکردایەتیمان هەبوو، پێم وتن:

" —کاك دکتۆر کەمال خۆشناو ئەیەوێت بێت بۆ کۆنفرانس."

زۆر لە برادەران وتیان:

" —جا ئەو ئێستا سەرکردایەتیە. ئەگەر بێت بۆ کۆنفرانس ئیتر ئەبێ واز لە سەرکردایەتی بهێنێت. کێ ئەڵێت لە کۆنفرانس بۆ سەرکردایەتی دەرئەچێتەوە. رەنگە ئەو کاتە دکتۆر کەمال زویر بێت."

منیش وتم:

" —ئەو گوێ بە سەرکردایەتی نادا."

وتیان:

" —با سبەی شەو بانگی بکەین، بزانین خۆی ئەڵێت چی.؟"

هەموو پێمان باش بوو خۆی بێت. ئەو شەوە دوای کۆبوونەوەکە هەستاین چووینە دەرەوە. ئەبو شەهاب پێڵاوەکانی ون ببوو. نەی دۆزییەوە. هەر هەمووشی پێڵاوی لاستیك بوو. نازانم چ پێشمەرگەیەك لێی گۆڕا بوو لە پێی کردبوو. ئەبو شەهاب دەستی کرد بە بۆڵە بۆڵ تووڕە بوو وتی:

" –ئیتر من نایەم بۆ کۆبونەوەی وا. خەڵك سەرکردەی شۆڕش بێت، نازانێت کامە پێڵاوی خۆیەتی؟ من لەگەڵ خەڵکی وا کۆنابمەوە."
چووین بۆ لای وتمان:
" –عەیبە."
وتی:
" –بە خوا نایەم."
هەر نەهات بۆ لای برادەران. ئیتر من چوومەوە، بە دکتۆر کەمال خۆشناوم وت:
" –رای برادەران وایە تۆ هەر لە جێگای خۆت بمێنیتەوە، چونکە تۆ ئێستا ئەندامی سەرکردایەتیت، کە هاتی بۆ کۆنفرانس ئیتر ناتوانی لە سەر خەتی گشتی بمێنیتەوە."
وتی:
" –من پێویستیم بەوە نیە سەرکردەبم. من بۆ پێشمەرگایەتی هاتووم. خۆم بە کۆمەڵە ئەزانم. ئەمەوێت بەشداریم لە کۆنفرانسدا."
وتم:
" –باشە ئەم شەو وەرە بۆ کۆبونەوە، خۆت بۆ برادەرانی باس بکە."
وتی:
" –زۆر باشە."
ئەو شەوە ئاخر شەو بوو تیا کۆببینەوە. بۆ بەیانی کۆنفرانس دەستی پێ دەکرد. کاك کەمال هات بۆ کۆبوونەوە پێی راگەیاندن، کە دەیەوێت بەشداری بکات لە کۆنفرانسدا.
هەر هەموو برادەران وتیان:
" –هاتنی تۆ باش نیە بۆ کۆنفرانس."
زۆر موبەڕیریان بۆ هێنایەوە، کە نەیەت. کاك نەوشیروانیش وتی:
" –باشە مەیە."
کاك کەمالیش زۆری پێ ناخۆش بوو. وتی:
" –باشە نایەم."
شەو لەگەڵ کاك نەوشیروان، کە گەڕاینەوە بۆ مقەڕەکەی خۆمان پێم وت:
" –باشە کاك نەوشیروان بۆ نەیەت.؟"
کاك نەوشیروان وتی:
" –ئاخر ئەگەر دەرنەچێت بۆ سەرکردایەتی، خۆ ئەبێت واز لەوێش بێنێت."
وتم:
" –تۆ موشکیلەی ئەوەتە دەرنەچێتەوە.؟"
وتی:
" –بەڵێ."
وتم:

" –باشە گرنتیت ئەدەینێ، کە کارێکی وا بکەین دەربچێتەوە."
وتی:
" –زۆر باشە، جا وەلا ئەگەر وا ئەزانیت مسۆگەرە، منیش زۆرم پێ خۆشە. هەر خۆت بچۆ پێی بڵێ با بۆ بەیانی خۆی ئامادە بکات."
ئیتر ئەو شەوە چووم بە کاك کەمالم وت:
" –بەیانی وەرە."
زۆر دڵخۆش بوو وتی:
" –بابە من کەی موشکیلەی سەرکردایەتیم هەیە."
بڕیاربوو بە شەو بچین بۆ (کانی زەرد) لە مزگەوتەکەی کانی زەرد دابنیشین. بە ڕۆژیش لە دەرەوەی گوندەکە جێگایەکمان چاك کردبوو. ئەو شوێنە ناوی (مالیمۆس) بوو. دۆڵێکی دارستان بوو. هەمووی دارگوێز بوو. ئاوێکی زۆر لە شاخەکەوە دەهاتەخوارەوە. لە بنی دار گوێزەکانەوە ئاو هەڵدەقوڵا. لە ترسی تەیارەی عێراق چوو بووینە ئەوێ. ئەو کاتەش ئەوێ ئازادبوو. هەموو دێکانیش دۆستمان بوون. بەیانی خۆمان پێچایەوە بە ڕێکەوتین. دکتۆر کەمال خۆشناویشمان لەگەڵ بوو. برادەران، کە چاویان پێ کەوت زۆریان بە لاوە سەیر بوو! وتیان:
" –ئەی بڕیار نەبوو، کە کەمال نەیەت.!؟"
کاك نەوشیروان وتی:
" –خۆی حەز ئەکات بێت. ئێمەش وتمان وەرە."
(مام ڕۆستەم)یش لە قەرەداغەوە هاتبوو. پێیان وتبوون هەر کەس بەتانی لەگەڵ خۆی بێنێت. نازانم چ پێشمەرگەیەك بەتانیەکەی بردبوو، بەتانیەکی خراپتری بۆ دانابوو. ئەویش پەست ببوو. لە قەرەداغەوە بە کۆڵ بەتانیی بۆ خۆی هێنابوو بردبوویان. لە ڕێگا پێی گەیشتین، هەر بۆڵە بۆڵی بوو وتمان:
" –ئەوە چی یە هەر بۆڵە بۆڵتە.؟"
وتی:
" –ئەمە کاکڵەکەیەتی.؟"
جوێنێکی بە کاکڵەکەیدا."
وتمان:
" –چی بووە.؟"
وتی:
" –من لە بازیانەوە بە کۆڵ بەتانیم بۆ خۆم هێناوە، نازانم کێ بردوویەتی. ناحەقمە جوێن بدەم. ئەمە کۆمەڵە ئەسڵیەکەو کاکڵەکەیەتی، ئەبێ خراپەکانی چۆن بێت.؟"
وتمان:
" –هەر گوێشی مەدەرێ. کۆمەڵە ئەبێت دڵ فراوان بێت. بەتانی چیە.؟"

چووینه (کانی زەرد) شەو ڕێو ڕەسمی کۆنفرانس دەستی پێکرد. کاك نەوشیروان لە مزگەوتەکەی (کانی زەرد)دا ڕاپۆرتی کۆنفرانسی خوێندەوە. موناقەشە دەستی پێکرد. ئەو کاتە برادەرانی زیندان هەندێکیان هاتبوونە دەرەوە. بە تایبەتی سەرکردایەتی پێشوو. دیار بوو لە نێوان برادەرانی پێشووو کۆمیتەی هەرێمەکان ناکۆکی هەبوو. ناکۆکیەکەش سیاسی نەبوو، هەرگلەیی بوو لە سەر یەکتر. هەر کە برادەران لە زیندان بەربوون، یەکسەر هاتنە دەرەوە. لەو کاتەدا مەلا بەختیار وتارێکی لە سەر سەرکردایەتیی پێشوو نووسیبوو. لە بڵاوکراوەی کۆمەڵەدا بڵاوی کردبۆوە. تیایدا هاتبوو، کە چۆن ڕایانکردووە بەرەو ئێران‌و کۆمەڵەیان بە جێهێشتووە. ئەوە برادەرانی زۆر زویر کردبوو. برادەرانی زیندان دەیانوت:

" —لەباتی بەخێر هاتنەوەمان ئیهانەی کردووین."

جا خۆی هەردوو لایان ڕاستبوون. هەم ئەوەی مەلا بەختیار نووسیبووی. هەم ئەوەی برادەرانیش دەیانوت. ئەوەی مەلا بەختیار نووسیبووی ڕاست بوو. کاتی خۆی هەموو سەرکردایەتی خۆیان دەرباز کردبوو. بە حسابی خۆیان لە هەر شارەی برادەرێکیان داناوە بۆ سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنەکان. ئەوان بە قارەمانێتی خۆیان لە زیندان ئەوەیان سڕییەوە. بە تایبەتی شەهید شەهاب‌و هاوڕێکانی، کە لە سێدارە دران، چونکە ئەوان تەنازولیان بۆ ڕژێمی بەعس بکردایە، کۆمەڵەیان هەڵدەوەشاندەوە. ئەگەر بەو شێوەیە ڕوی نەدابایە دەبوو کۆمەڵە هەموو سەرکردایەتی پێشوی دەربکردایە، چونکە گەورەترین هەڵەیانکرد لە خۆیان‌و لە کۆمەڵەش. وەك وتم ئەو هەڵەیەیان بە خوێنی خۆیان سڕییەوە. ئیتر ئەو شەوە لە سەر ئەوە زۆر مشتوومڕیان بوو. دوای ئەوە مەلا بەختیار هەستا کەوتە باسکردنی خۆی، کە چی کردووە. وا باسی ئیشوکارەکانی ڕێکخستنی کرد، کە لە خۆی زیاتر کەسی تر نەبووە سەرپەرشتی ڕێکخستنی کردبێ. هەر خۆی کۆمیتەی هەرێمەکانی بردووە بە ڕێوە. بە تایبەتی کۆمیتەی هەڵمەت لە سلێمانی. وای باسکرد، کە هەرچی چالاکی بووە، ئەو بە تەنیا ئەنجامی داوە. هەر خۆی تاکە سوارەی مەیدان بووە. هیچ حسابێکی بۆ ئەو هاوڕێیانەشی نەکرد، کە لەوێدا دانیشتبوون، کە ڕۆژانە لە ناو سلێمانیدا بە یەکەوە بوون بۆ ئەنجامدانی ئیش‌و کارەکان. زۆر سەیر بوو! یەك برادەر ڕەدی نەبوو بۆ قسەکانی! زۆر لەو برادەرانەش لە وێ بوون. لەوانە سالار عەزیزو دلێری سەید مەجید. ئەوان لە سلێمانی بوون. ئاگایان لە زۆربەی کارەکان بوو چۆن کراوە. من بۆ خۆم هەتا ئەو شەوە، مەلا بەختیارم زۆر بە لاوە گرنگ بوو. زۆرم خۆش دەویست. هیوایەکی زۆرم پێ بوو بۆ دوا ڕۆژی کۆمەڵەو گەلی کورد، بەڵام، کە ئەوەم لێ بینی، ئەو بۆچونەی جارانم لە سەری گۆڕا. هەر چاوەڕوانمکرد بزانم وەڵامی برادەرانی تر چییە؟ بە تایبەتی سالار عەزیز، چونکە ئەو خۆی بەوە دەزانێ، دەبوایە لە دوای (شەهید ئارام) ئەو لێپرسراوی کۆمەڵە بێت. ئیتر زۆربەی هاوڕێکانی کۆنفرانس هەر حەپەسا بوون لەوەی

مەلا بەختیار بە تەنیا چۆن توانیویەتی ئەو هەموو ئیشەبکات!؟، چونکە کەس وەڵامی نەبوو. ئیتر من زۆر بێ تاقەت بووم، دەستم هەڵبڕی وتم:

" —کاک مەلا بەختیار جەنابت وات بۆ هاوڕێیان باسکرد، کە کۆمیتەی هەرێمەکان دروست بۆتەوە، یەك نەفەر نەبووە لە هەموو شارەکاندا. تۆ بۆ خۆت ڕێکخستنت دروست کردووە. هەر خۆت ئیشەکانی پێشمەرگەی ناو شارت کردووە. هەمووی خۆت بردوونت بە ڕێوە. تۆ زۆر بێ ویژدانانە باسی ئیشکردنی خۆت بۆ هاوڕێیان کرد. تۆ هەر هیچ نەبێت بڵێ کۆمەڵە، یان ڕێکخستن ئەوانەی کردووە. تۆ بۆ خۆت ئەڵێی پیاوێکی مارکسیم، چۆن مرۆڤی مارکسی حساب بۆ خەباتی هاوڕێکانی خۆی ناکات؟ من یەك پرسیارت لێ دەکەم، باشە کاك بەختیار تۆ بۆ خۆت هەر خەڵکی سلێمانی نیت. تۆ خانەقینیت. ئەگەر لە سلێمانی ڕێکخستن نەبوایە، کەسیشت لەوێ نەدەناسی. ئیتر چۆن ئەتوانی لە سلێمانی بژیت.؟"

دیار بوو زۆری پێ ناخۆش بوو. دوایی هاتە سەر ئەوەی باسی منی کرد وتی:

" —تۆ زۆرت کردووە بۆ کۆمەڵە."

هات بە شانو باڵی مندا، کە چیم بۆ کۆمەڵە کردووەو ماڵەکەم مقەڕی کۆمەڵە بووە. پیاوێکی چەند قارەمان بووم. وتم:

" —من هەر هیچم نەکردووە. باسی خۆشم ناکەم، بەڵام تۆ زۆر بێ ویژدانیت حسابت بۆ کەس نەکرد. جا ئەگەر ڕێکخستن یەك نەفەریبوویێت، ئەبێ ئەو ڕێکخستنە چی بێت؟ ئەبوایە بە ویژدانەوە باسی ئیش وکارەکانی ناو شارت بکردایە، نەك هەمووی بسڕیتەوەو هەر باسی خۆت بکەیت."

مەلا بەختیار زۆر توڕە بوو، هەڵسا خەریکبوو بیکات بە شەڕ. کاك نەوشیروان لێی توڕە بوو. ئیتر وای دەزانی من گەورەترین دوژمنایەتیم کردووە. من هیچی خراپم پێ نەوتبوو. بە پێچەوانەوە ئەو خۆی بەو قسانە شکاند. ئیتر ئەوانەی ناو شاریش زۆر ڕەخنەیان لێ گرت. بۆ بەیانی کاك دلێری سەید مەجید لە پشتی مزگەوتەکەوە هات بۆ لام. پیاسەمان دەکرد وتی:

" —کاك بەختیار زۆرگلەیی لێتە."

وتم:

" —بۆ، هێشتا ئەو گلەیی لە من ئەکات."

وتی:

" —ئەو ئەڵێت من کاك ئاواتم بەقەد هەموو دنیا خۆش ئەویست، کەچی ئەو هەڵساوە دژی من قسەی کردووە."

وتم:

" —کاك دلێر تۆ بۆ خۆت ئەزانیت منو مەلا بەختیار چەند یەکترمان خۆش ویستووە. زۆریش ڕێزمان لە یەکتر گرتووە. ئەو خۆشەویستیە هەر هی سەر جادە نەبووە. ئێمە

هەدووکمان بۆ یەك ڕێباز ئیشمان کردووە. هاوڕێی یەکتری خەبات بووین. دوای ئەوە خۆ من هیچی خراپم نەوتووە. تەنیا ڕەخنەم لێ گرتووە."

وتم:

" -کاك دلێر لە خۆت ئەپرسم تۆ خۆت یەکێك بوویت لەوانەی لە سلێمانی بوویتو کۆمەڵەش بوویت. ئاگاداری زۆربەی ئیشو کارەکانیت. خۆ ئێستا کەسمان لا نیە. ئەو قسانەی مەلا بەختیار وتی، ڕاستە یان نا. من ئەو پرسیارە لە تۆ ئەکەم.؟"

وتی:

" -نەوەڵا، زۆر بێ ویژدانانە باسی کرد."

وتم:

" -ئەی باشە بۆ نەت وت وانیە؟ قەیناکە منو تۆ هیچمان نەکردووە. ئەی هاوڕێ شەهیدەکانمان، کە خۆیان لێرە نین. منو تۆ هاوڕێیانین ئەزانین چیان کردووە، ئێستا منو تۆو سالار ئاگامان لەوەی سلێمانیە، ئەوە ئازادی مەلاو شوان عەلی شەهید بوون، ئەوان لەگەڵ منو تۆو مەلا بەختیار بوون. ئێمە هەر لە ئێستاوە هەموو هاوڕێ نزیکەکانمان لە بیرچوو، ئەی قوڕ بەسەر ئەوانەی، کە نایان ناسین. ئێمە قیادەی پرۆلیتارین قوڕ بەسەر پرۆلیتار بۆ خۆیو قیادەی. وتی:

" -ئەوەی تۆ ئەیڵێیت ڕاستە، بەڵام ئەبوایە تۆ دەنگت نەکردایە."

وتم:

" -بۆ چی دەنگم نەکردایە.؟"

وتی:

" -ئاخر کاك بەختیار زۆری پێ ناخۆش بووە."

وتم:

" -بۆ چی زۆری پێ ناخۆش بووە. ئەو خۆی وای کرد ئەوە ڕوویدات."

ئیتر ئەوە بوە هۆی ئەوەی مەلا بەختیار ئەوانە لە دڵ بگرێ.

کۆنفرانس بەردەوام بوو (١٠) ڕۆژی خایاند. بۆ هەڵبژاردن هاتینەوە بۆ ناوزەنگ. هەڵبژاردن دەستی پێ کرد بۆ سەرکردایەتی. ئێمەو هەندێ برادەر سەرکردایەتی بووین، خۆمان هەڵنەبژاردەوە بۆ سەرکردایەتی نوێ. ئەوانەی هەڵبژێردرانەوە هەموو تازە بوون. هەر یەك دوو برادەری کۆنەکانی تیابوو. لەوانە کاك نەوشیروانو مەلا بەختیارو ئەوانەی زیندان فەرەیدون عەبدولقادرو عەلی بچکۆلو عومەری سەید عەلی بوو، کە ئەو کاتە بریندار بوو. هەر وەك ئەندامی فەخری هەڵبژێردرا. دکتۆر کەمال خۆشناویش یەکێك بوو لەوانەی بۆ سەرکردایەتیی نوێ هەڵبژیردرایەوە. ئەوانەی تر کەسیان دەرنەچونەوە. هەر لە کۆبوونەوەکەدا مەلا بەختیار قسەی دژی ئەندامانی کۆنفرانسەکە کرد، کە گوایە بێ ویژدانن. دوای ئەو ئازاد هەورامی هەستا قسەکانی مەلا بەختیاری دووبارە کردەوە. ئیتر زۆری نەمابوو ببێتە ناخۆشی. هەر هەموو خۆیان

تورەکردو چوونە (تۆژەڵە) دوایی کاك نەوشیروان چوو بۆ لایان ئاشتی کردنەوە. هەر هەموویشیانی هێنایەوەو لە جاران باشتر. باشترین لێپرسراوێتی پێ سپاردن. مامۆستا جەعفەر هەر خۆی هەڵنەبژارد بوو. ئیتر هەر وازی هێنا داوای کرد بچێتە دەرەوە. ڕۆیشت بۆ ئەڵمانیا. دوای کۆنفرانس رای کاك نەوشیروانم وەرگرت دەربارەی کۆنفرانسەکە وتم:

" —کاك نەوشیروان کۆنفرانسەکە چۆن بوو.؟"

وتی:

" —بە راستی ئێستا ئەزانم کۆمەڵە ڕێکخستنێکی زۆر هۆشیارن. بەڵێن بێت هەتا مردن لەگەڵتان بم."

ئیتر ئیشەکانیش زۆر بە باشی ئەنجام دەدرا. ئەو برادەرانەی هەڵنەبژێردرانەوە بۆ سەرکردایەتی، هەر بە رقەوە ئیشیان دەکرد. بارودۆخەکەیان زۆر بە دڵ نەبوو.

٥٦

دوای کۆنفرانس بە ماوەیەك کاك نەوشیروان پێی وتم:

" —تۆ بۆ مقەرێك دانانێت. بۆ خۆت هەندێك پێشمەرگەی باش کۆبکەیتەوە، بۆ ئەوەی ئەگەر چوویت بۆ هەر شوێنێك مەفرەزەی خۆتت لەگەڵ بێت.؟"

منیش وتم:

" —ئەگەر تۆ پێت باش بێت. باشە."

وتی:

" —بنێرە بە دوای ماڵو منداڵەکەتدا با بێن بۆ لای خۆت. ئێستا وەزعمان باشە. ناوچەکە ئازاد کراوە. خەڵکی وا هەیە ماڵو منداڵەکەی لە پێش خۆیەوە ئەنێرێتە دەرەوە. ماڵو منداڵەکەی تۆ چەند ساڵە کوناوکون خۆیان ئەشارنەوە. با بێنە دەرەوە، ئیتر رزگاریان بێت لەو وەزعە ناخۆشە."

وتم:

" —باشە ئەنێرم بە دوایاندا."

لە ناوزەنگدا بازاڕی زۆر گەورە هەبوو. هەرچیشمان بویستایە هەبوو. ئەو کاتە هاوین بوو. خۆم دووسێ پێشمەرگەم لابوو، بەڵام هەر لەگەڵ کاك نەوشیروان بە یەکەوە بووین. ئەو کاتە دکتۆر کەمال خۆشناو لێپرسراوی ئیدارەی مەکتەبی سیاسی بوو. دوو پێشمەرگەم نارد بۆ لای وتم:

" —بەتەمام مقەڕو ماڵ دابمەزرێنم. هەندێك پارەم بۆ بنێرە."

کاك نەوشیروانیش نامەی بۆ نووسیبوو. وەك مەکتەبی سیاسی. دکتۆر کەمال خۆشناو زۆری پێ خۆش بوو. پارەی بۆ ناردم بۆ دامەزراندنی مقەڕو ماڵەکەشم. منیش ناردم مقەڕێکی خۆشیان دروستکرد. کەپرێکیش بۆ ماڵەکە. مەفرەزەیەکی زۆر رێکوپێکم دروستکرد. پێشمەرگەیەکمان هەبوو بە ناوی دکتۆر ئاسۆ، زۆر کوڕێکی بە رەوشت بوو. ئەومکرد بە ئامر مەفرەزەیان. زۆر باش لە ئیدارەی مقەڕی دەزانی. ماڵیشم لە ناوزەنگ دروستکردبوو. ناردبووم بە دوای ماڵو منداڵدا. چادرێکم لە بن دارو ئاوێکدا بۆ هەڵدابوون. زۆر خۆش بوو. چاوەڕێم کردن ماڵو منداڵ بێن، هەر دیار نەبوون. زۆر سەیر بوو بە لامەوە بۆ نەهاتن! ؟ شەوو رۆژ لەگەڵ حەمە تۆفیق لەو چادرەدا بە قسەی خۆشو نوکتە، کاتەکەمان دەبردە سەر. ماڵی مام جەلالیش هەر لە خوار ئێمەوە بوو. تازە حەمە جەزاش هاتبووە دەرەوە. ماڵو منداڵەکەی لەگەڵ بوو. ئەوانیش هەر لە پاڵ ئێمەدا بوون. منداڵێکیان پێ بوو ناوی رۆژە بوو، زۆر گرینۆك بوو. دایم نوزەی دەهات بە حەقو ناحەق هەر دەگریا. خێزانەکەی حەمە جەزا ناوی خەپە بوو پێم وت:

" -توخوا ئەگەر ئەم منداڵە فڕێ نەدەی."

دەیوت:

" -توخوا چۆن دڵت دێ وای پێ ئەڵێیت."

ناوزەنگ زۆر خۆش بووبوو. زۆر قەرەباڵغیش بوو. وەزعیشمان زۆر باش بوو. ماڵەوە دواکەوتن هەر نەهاتن. زۆر بێ تاقەت بووم. دەمووت ئەبێت چی رویدابێت وا نەهاتن؟، چونکە پشوی قوتابخانەبوو، منداڵەکانیش لە قوتابخانە نەبوون. ئاخری رۆژێك دوو پێشمەرگەم نارد بە دوایاندا بۆ شاربازێڕ بۆ لای وەهاب. ئەو کاتە ئامر کەرت بوو لە شاربازێڕ. دوو پێشمەرگەکەش لای خۆم بوون. بورهان و ئەنوەر. ماوەیەکیان پێ چوو هێنایانن. کە گەیشتنە لام تەماشادەکەم ئاشتی کچم سمتی شکاوە، وەزعی زۆر خراپە. لایەکی وا لە عەرزا. لە دایکیم پرسی:

" -ئەوە بۆ وای لێهاتووە.؟"

وتی:

" -منداڵێکی دراوسێکەمان وای لێکردووە. دارتوویەك لە ماڵی باوکمدایە چووبوونە سەر توووەکە. منالی دراوسێکەمان پاڵێکی پێوە ناوە، کەوتۆتە خوارەوە سمتی شکاوە. (٤٠) رۆژە وام بە دیارییەوە، بۆیە نەهاتووم. نەشم وێرلوە بیبەم بۆ خەستەخانە پیشانی دکتۆری بەم. ماڵەکەش وتویانە قسە بکەن خۆشتو هەر سێ منداڵەکەت بە گرت ئەدەین. جەڕاحم بۆ بانگ کردوە لە ماڵەوە بۆی گرتوەتەوە."

ئیتر زۆرم پێ ناخۆش بوو. نەیدەتوانی بڕوا. ئەو جێگایەش، کە لێی بووین زۆر لا پاڵبوو. بە پاڵ شاخەکەوە بووین. ئێوارەیەك منو زەینەب چووین بۆ ماڵی مام جەلال. ئاشتی لەگەڵ هیوادا هەر لە ناو خێمەکەدابوو. کاتێکمانزانی ئاشتی پڕ بە دنیا

زیراندی. هەموو رامانکرد وامانزانی گل بۆتەوە یا خود مار پێوەی داوە، کە چووین هەر دەی قیژاندو پەلاماری ئێمەیدا. دوو پێشمەرگەی مام جەلال لەو ناوە بوون وتمان:
" —چی یە.؟"
دەستی بۆیان راکێشا وتی:
" —ئەوانە ئەمنن هاتوون بۆم."
پێم وت:
" —رۆڵە ئەوانە پێشمەرگەن. ئەمنی چی.؟"
چونکە ئەوندە باسی ئەمنیان بۆ کردبوو لە سلێمانی، پێیان وتبوو مەچۆرە دەرەوە ئەمن دەمانگرێ. وای دەزانی هەرچی چەکی پێ بوو، هەر ئەمنە. زۆر گوناح بوو لە ترساندا وەك شۆرەبی بە باوەشی دایکیەوە هەڵدەلەرزی. ئیتر مام جەلالو هێرۆ خان، کە چاویان پێ کەوت بەو شێوەیە، زۆریان پێ ناخۆش بوو. لە زەینەبیان پرسی:
" —ئەوە بۆ وای لێهاتووە.؟"
زەینەبیش بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش وتیان:
" —بیبەن بۆ لای دکتۆر."
مام جەلال پێی وتم:
" —تۆ ئەو هەموو برادەرە دکتۆرەت هەیە لە ئێران، بی بە بۆ لایان بزانە بۆیان چارەسەر ناکرێت. ئەگەر ئەوان بۆیان نەکرا بیبە بۆ تاران."
بردم بۆ سەردەشت شارێکی کوردستانی ئێران بوو لە خۆمانەوە نزیك بوو. ئەو کاتە هەر بە دەست کورد خۆیەوە بوو. هێشتا دەوڵەت نەهاتبۆوە ناوی. برادەرێکی خۆمی لێ بوو، بە ناوی (دکتۆر ئەحمەد) سەرۆکی نەخۆشخانەکە بوو. زۆر کوڕێکی باش بوو. لە نەخۆشخانەکە چوار پێنج دکتۆری تریشی لێ بوو. فەحسیان کردو ئەشیعەیان بۆ گرت. ئەنجامەکەی دەرچوو وتیان:
" —کاك ئاوات ئەمە لێرە چارەسەر ناکرێت. قاچی کورت بۆتەوە. ئەبێت نەشتەرگەری گەورەی بۆ بکرێت. بیبەن بۆ تاران بۆ لای دکتۆری تایبەت بە ئێسقان. تاران دکتۆری باشی لێیە، چونکە قاچی سەقەت بووە."
ئەوانم هەر لەسەردەشت بە جێ هێشتو خۆم گەڕامەوە بۆ لای مام جەلال. باسی وەزعەکەم بۆ کرد، کە لە سەردەشت چارەسەر ناکرێ، دەبێت لە تاران عیلاج بکرێ وتی:
" —زۆر باشە، برۆ بیبە بۆ تاران."
پارەی دامێو گەڕامەوە بۆ سەردەشت بۆ لای ئەوانو کچەکەم برد بۆ تاران. ئەو کاتەش مەکتەبمان هەبوو لە تاران. هەندێ پێشمەرگەی برینداری لێ بوو. یەکێك لەو پێشمەرگانە هاوڕێ کامەران پێنجوێنی بوو. ئەژنۆی بریندار بوو. زۆر دەمێك بوو لە وێ بوو. ئەو کاتە هەموو ئەوانەی خۆمان لە ئوتێلێکدا بوون، بە ناوی ئوتێل فارس.

ئوتێلێکی خۆش بوو. چووم له وێ ژوورێکم بۆ خۆمان گرت. نوێنەرمان پارەی ئوتێلەکەیان دەدا بۆمان. ئەو پارەیەی، که له مام جەلالم وەرگرتبوو، هەر بۆ دکتۆر بوو. ئیتر لەگەڵ ئەو برادەرانەی خۆمان گەڕاین، دکتۆرێکمان دۆزییەوە بە ناوی (دەریا پەیمان) نەخۆشخانەی تایبەتی خۆی هەبوو. بردمان بۆ لای. له نەخۆشخانەکە خەوانی به ۲۰ هەزار تومەنی ئەو کاتە، نەشتەر گەری بۆ کرد. ۱۰ ڕۆژ له خەستەخانە مایەوە. دوای ئەوە هێنامەوە بۆ ئوتێلەکە. زۆر گوناح بوو. له سنگی بەرەوخوار له گەچ گیرابوو. ببوو بە تەختە. بە باوەش ئەم دیوو ئەو دیومان پێ دەکرد. دامابووین بە دەستیەوە. دەبوایە دوای دوو مانگ بم بردایەتەوە گەچەکەی لێ بکەنەوە. دوای دوو مانگ بردمانەوە، ئەشیعەیان گرتەوە وتیان:

" –هێشتا یەکی نەگرتۆتەوە. با ماوەیەکی تر گەچەکەی پێوە بێت، ئەوسا بیهێننەوە."

زۆر ناخۆش بوو، چونکە پارەیەکی زۆرمان دەویست. مەسرەفیش زۆر گران بوو. ئێمەش خۆمانو سێ منداڵ بووین. ماوەیەك ئەوانم بە جێ هێشت له ئوتێلەکەدالو خۆم گەڕامەوە بۆ ناوزەنگ. هیواشم لەگەڵ خۆم هێنایەوە. ماوەیەکی پێ چوو، گەڕامەوە بۆ لایان. کچەکەم بردەوە بۆ لای هەمان دکتۆر، لەوێ نەبوو وتیان:

" –دکتۆر دەریا لێرە نیە. چووە بۆ جەبهە."

وتم:

" –کەی دێتەوە.؟"

وتیان:

" –نازانین. تازە چووە."

وتم:

" –باشە ئەو گەچەی لێ بکەنەوە."

وتیان:

" –هێشتا ماوێتی. با دوو هەفتەی تری پێوە بێت."

هاتینەوە بۆ (مهاباد) دووسێ ماڵی دۆستی خۆمان له وێ بوون، چووینە ماڵی ئەوان. دوو هەفتە له وێ ماینەوە. دوای ئەوە چووینەوە بۆ تاران. دکتۆرەکە هەر نەهاتبۆوە. ناچار بردم بۆ لای دکتۆرێکی تر گەچەکەی لێ کردەوە وتیان:

" –با عەزێتی نەبێت، گۆچان بەکار بهێنێت. دوای سێ مانگ بیهێنەوە."

وتمان:

" –تۆ جارێ با لێرە رزگارمان بێت، خوا کەریمە بۆ سێ مانگی تر."

هاتینەوە بۆ ناوزەنگ، ساردو سەرما دەستی پێ کردبوو. چووینە گوندی (شێنێ) دوو ژورمان پەیداکرد. ژورێك بۆ خۆمانو ژورێ بۆ پێشمەرگەکان. ئەو زستانە زۆر سەخت بوو. بە فرێکی زۆر باری بوو. ئەو زستانەمان لەوێ بردە سەر. شێنێ گوندێکی خۆش

بوو. لەگەڵ ماڵی عەبدولڕەحیم بە یەکەوە بووین. پیاوێکی زۆر باش بوو. بوو بە مەسئول عەسکەری مەڵبەندی دوو، دواتر لە شەڕێکی نەبەردانەدا لە تەق تەق شەهید بوو.

٥٧

شەڕ لە نێوان یەکێتیو برادەرانی (ح، س، ك)دا لە ناوچەی هەولێر رویدا بوو. برادەرانی یەکێتی لەو ناوچەیەدا بێ هێز بوون، دەریان کردبوون بەرەو (هەرێمی چوار) لە وێشەوە دوایان کەوتبوون بەرەو (سەفرەو زەروون) کاك نەوشیروان هێزێکی لە ناوزەنگەوە بردە خوارەوە. لە (هەرێمی پێنج) یشەوە کاك (مستەفا چاو رەش) هاتبوو لەگەڵ هەرێمی چوار. لە وێوە شەڕ دەستی پێکرد، لە دوو قۆڵەوە. بە ماوەیەکی کەم لەو ناوچانە دەریان کردنو دوایی گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی. ماوەیەك دوای ئەوە بڕیار درا، تەشکیلاتی هێزی پێشمەرگە بگۆڕن لە (هەرێم)ەوە بۆ (تیپ) لەبەر ئەوەی هەرێمەکان زۆر گەورە بوون. هەم بۆ ئەوەی هێزەکانیش چالاکتربن بە باشترین شێوە کۆنترۆڵ بە سەر هێزەکاندا بکرێ. ئەم کارە زۆر سەرکەوتوو بوو. کۆمەڵێك ناکۆکی لە ناو هەرێمەکاندا هەبوو، بەو گۆڕانکارییە ئەویشیان نەهێشت. تەشکیلاتەکەش بەم شێوەیەبوو:

هەرێمی یەك بوو بە دوو تیپ (١٥)ی شارەزوور (١١)ی هەورامان. هەرێمی سێ بوو بە تیپی (٣٣)ی سلێمانیو (٣٧)ی شارباژێڕ. (٣١)ی بەرزنجە. هەرێمی چوار بوو بە دوو تیپ (٤٧)ی پیرەمەگروون لەگەڵ (هێزی مەرگە) بەو شێوەیە هەموو هەرێمەکان کران بە تیپ. هەرێمی (١٤) هەر بە ناوی هەرێمەوە مایەوە. لەبەر خاتری (سوارە ئاغا) ناوی تیپی پێ خۆش نەبوو. دوای ئەوە سەرتیپەکانیشیان دیاریکرد بەم شێوەیە:

ئاوات قارەمانی بۆ تیپی (٣٣)ی سلێمانی.

شەوکەتی حاجی موشیر بۆ تیپی (١١)ی هەورامان.

حامیدی حاجی غالی بۆ تیپی: (١٥)ی شارەزوور.

سەلاح چاوشین بۆ تیپی (٣١)ی بەرزنجە.

عەلی چوارتایی بۆ تیپی (٣٧)ی شارباژێڕ.

سەلاحی موهەندیس بۆ تیپی ( ٤٧ )ی پیرەمەگروون.

سامان گەرمیانی بۆ تیپی ( ٥١ )ی گەرمیان.

هەرێمی پێنج بوو بە دوو بەش. قەرەداغو گەرمیان. مام رۆستەم بۆ قەرەداغ بوو، ملازم سمکۆ بۆ ناوچەی کۆیە. ئەو سەرتیپانەی یەکەم جار دانران، ئەو چەند کەسە

بوون، كە لە سەرەوە ناوم تۆماركردون. لەوانە دوانمان لێ شەهیدبوون. ئەوانیش شەهید (سەلاحی موهەندیس)و شەهید (عەلی چوارتایی) بوو. سەرەتا وەك تاقیكردنەوەیەك ئەم تەشكیلەیە كرا. دوایی زۆر سەركەوتوو بوو. لە ماوەیەكی كەمدا لە سەرانسەری كوردستاندا دەیان تیپ دروست بوو. پێش ئەوەی برۆین مام جەلال‌و ملازم عومەر لە سەربانەكەی خۆیەوە كۆبوونەوەیەكی پێ كردین. ئەو كاتە تیپەكان جیهازی لاسلكیان لا نەبوو. هەر چیەك بوایە لە ڕێگای (رادیۆ)وە بۆیان بڵاو دەكردینەوە. هەر لە ڕێگای رادیۆوە ئاگادار دەكراینەوە. هەموو تیپێك (جفرە)ی تایبەتی خۆی هەبوو. تەنها سەرتیپەكان‌و سەركردایەتی دەیانزانی چیە. ئیشەكە زۆر بە سەركەوتووانە ئەنجام دەدرا. سەری لە دوژمن تێك دابوو. جفرەكان (ژمارە) بوون (بەختیار مستەفا ئەمین)ی برای كاك نەوشیروان لێپرسراوی بوو. ئەوەندە ئەزموونی فراوان‌و قوڵی لەو بوارەدا هەبوو. هەموو داموو دەزگاكانی ڕژێم‌و دواتر فەیلەقی یەك‌و پێنج نەیان دەتوانی یەك هێمای ناو جفرەكان لێك بدەنەوە.

## ٥٨

پێش ئەوەی بڕۆم بۆ شار بازێڕ، منداڵەكانم لە پێش خۆمەوە ناردەوە. بۆ ئەوەی لە سلێمانیەوە بێنەوە بۆ شار بازێڕ. هەروەها مەفرەزەكەشم ناردەوە بۆ شاربازێڕ. حەمە جەزا وتی:

" —منیش لەگەڵ تۆ دێم بۆ شاربازێڕ.

وتم:

" —باشە، تۆ لە پێشا بچۆ لە گوندی (باراو) دوو خانوو دروست بكە بۆ هەر دووكمان."

لەو ناوچەیەدا لە گوندی باراو قایم تری تیا نەبوو. دوای ئەوەی ئیشەكانم لە سەركردایەتی تەواو بوو، خۆشم گەڕامەوە بۆ شاربازێڕ. وەهاب ئەو كاتە سەرپەرشتی هەرێمی (٣)ی دەكرد. كرابوو بە جێگری من. مەفرەزەیەكی منیش هەر لەگەڵ ئەودابوو. كە چووەمە گوندی (سەرخواں) بەرامبەر پاڕەزان بوو، وتیان:

" —كاك وەهاب وا لە پاڕەزان."

ناردم بە دوایاندا وتم من هاتووم وام لە سەر خوار. ئەو كاتەش تیپی (٣٣) سێ كەرت بوو. وەهاب خۆی ئامر كەرتی سێ بوو. شۆڕش ئیسماعیل ئامر كەرتی دوو بوو. حەمەی تەیب ئامر كەرتی یەك بوو. لەگەڵ مەفرەزەكەی خۆم بە هەموویان دەوری (٨٠) پێشمەرگە بوون. كە هات بۆ لام، سەیر دەكەم وەهاب تەواو نییە. وەك ئەوە هاتە بەر چاوم، كە بە زۆر هێنابێتیان. زۆر سەیر بوو بە لامەوە! وەهاب دەیان جار دەهات بۆ سەركردایەتی داوای لە سەركردایەتی دەكرد دەیوت:

" —با كاك ئاوات بێت بە ئامر هەرێمی سێ لە باتی كاك بەكری حاجی سەفەر."

چونکە دلیم لەگەڵ یەکردا ناکۆك بوون. ئەوو شۆڕش ئیسماعیلو سەلاحی موهەندیس زۆریان پێ خۆش بوو من بچم بۆ لایان، چونکە هەموویان پەیوەندیان لەگەڵ مندا زۆر باش بوو. منیش زیاتر لە بەر ئەوان بۆ تیپی(٣٣) پێم خۆش بوو، ئەگینا سەرتیپیم ئەوەندە بە لاوە گرنگ نەبوو. کە هاتن، چووم بۆ لایان. هەموو پێشمەرگەکان زۆریان پێ خۆش بوو، کە من چووم بۆ ئەوێ. هەموو هاتن بەرەو پیرم. هەموو دەیانناسیم. وەهاب نەهات. نامیق معاون کەرتی ئەو بوو، زۆر پیاوێکی قارەمان بوو. زۆر منی خۆش دەویست. هات بۆ لام وتی:

" –کاك ئاوات کاك وەهاب بە هەڵە لە گۆڕانکارییەکان تێگەیشتووە. تۆ بچۆ بۆ لای، چونکە ئەو برادەرانە مێشکیان تێکداوە. ئێمەش پێمان وتووە تۆمان زۆر خۆش ئەوێت. ئەگەر بەتەمابیت دژایەتی کاك ئاوات بکەیت، یان لە یەکێتی عاسی بیت، ئەوە هەر لە ئێستاوە برۆ بۆ خۆت چی ئەکەیت بیکە. ئەو کاتەش، کە یەکێتی نەبوویت. هەر کاك ئاوات پێمان بڵێت، ئەوا هەر خۆم دێمە سەرت. جا ئەوە لە مێشکی خۆت دەربکە."

دیاربوو ئەو برادەرانەی، کە خۆیان بارودۆخەکەیان بە دڵ نەبوو، هەموو لە (پاڕەزان) کۆبووبوونەوە دەیان ویست خەڵك وا لێ بکەن کێشە دروست بکەن. بە تایبەتی دژی من، بۆ ئەوەی نەتوانم لە وێ سەرکەوتووبم. هانی وەهابیان دابوو پێیان وتبوو، کە گوایە تۆ غەدرت لێکراوە. چۆن عەلی چوارتاییان کردووە بە سەرتیپ، کەچی تۆیان دانەناوە. یان سەلاحی موهەندیس، کە تۆ لێرە مەسئولی هەموویان بوویت. تۆ کاك ئاواتت زۆر خۆش ئەویست، کەچی هاتووە بۆ سەرتیپی ئێرە، کە ئەبوایە خۆی تۆی دابنایە، نەك خۆی بێ. ئەوە ئیشی کاك نەوشیروانو ئەوانە. رقیان لە تۆیە، بۆیە نەیانکردوی بە سەر تیپ. کە چووم بۆ لای، دیار بوو بێ تاقەت بوو. رەش هەڵگەڕا بوو، وتم:

" –ئەوە چییە کوڕی باش، لە باتی پێشوازی خۆتمان لێ زویر ئەکەیت. زۆر سوپاس."

کە منی دی زۆر تەریق بۆوە وتی:

" –بە گۆڕی شەهیدان هیچم لەگەڵ تۆدا نییە. تۆ هەر برای گەورەو بە رێزی منی. من ئەوەم پێ ناخۆشە، کە کاك نەوشیروان دژایەتی من ئەکات. من مەسئولی ئێرەبووم هی عەلی چوارتاییو سەلاحی موهەندیسیش، کەچی ئەوانی کردووە بە سەرتیپ. من بە کەڵك نایەم. بیستومە وتوویەتی وەهاب کەی هی ئەوەیە بکرێت بە سەرتیپ، کە من کاك نەوشیروانم زۆر لا گرنگ بوو. زۆریشم خۆش ویستووە. نەمزانیوە ئەو زۆر منی لا سوکە. ئەگینا کاك ئاوات من تۆم قبوڵ بوو. سەرتیپی بۆ تۆ چییە؟ تۆ سەرکردایەتی بوویت؟ سەرتیپی هەر ئیشی تۆ نییە. تۆ زۆر بە رێزیت لای من. من تەنیا ئەو گلەییەم لە تۆ هەیە، ئەبوایە تۆ منت دابنایە دیفاعت لێ بکردمایە. ئەگینا من وەك برای گەورە حسابت بۆ ئەکەم."

من هەر گوێم بۆ گرت، پاشان وتم:
" -قسەکانت تەولو.؟"
وتی:
" -بەڵێ."
وتم:
" -دەگوێ بگرە، ئەوەی، کە ئەم قسانەی بۆ تۆ کردووە، هەر هەمووی درۆیەو هیچی وانیە. جارێ من هەر لە بەر خاتری ئێوە هاتووم. ئەگینا بە میوانیش تاقەتی شارباژێڕم نەبووە. تۆ خۆت یەکێك بوویت لەوانەی، کە دەیان جار هاتوویت بۆ سەرکردلیەتی بە منت وتووە بۆ نایەیت بۆ شارباژێڕ، ئێمە زۆرمان پێ خۆشە، کە تۆ بێیت. هەر خۆت چەند جار بە کاك نەوشیروانت وتووە با کاك ئاوات بێت بۆ ئامر هەرێمی شارباژێڕ، کە هەرێمی سێ تیپ بوو. ئێستا، کە هاتووم بۆ زویر بوویت.؟"
دیارە کاتی خۆی، کە واتان دەوت بە راستتان نەبووە. ئەو قسانەی، کە بۆ تۆ کراوە هەمووی بە هەڵە پێیان وتوویت. ئەوەی قسەکانی بۆ کردوویت بۆ ئەوە بوو توشی هەڵەت بکات. ئەگینا کاك نەوشیروان تۆی زۆر خۆش ئەوێت. قەت نەیوتووە وەهاب بە کەڵك نایەت. ئەو قسانە نەئەسڵی هەیەو نە ئەساس. تۆ خۆت ئەزانیت کاك نەوشیروان قسەی زۆر لە رووە. لە پاشملە باسی کەس ناکات. بە پێچەوانەوە، لە پاشملە دیفاع لە خەڵك ئەکات. ئەگەر واش نەبێت تۆ ئەبوایە ئەوانەت بزانیایە، یان دەبولیە چاوەڕوانت بکردلیە تا من ئەهاتم، ئەوجا بۆت باس بکردمایە. کاك نەوشیروان پێی وتم بچۆ بۆ لای کاك وەهابو ئەوان، دەمێکە چاوەڕوانی تۆن."
زۆرمان قسەکرد دوایی وتم:
" -کاکە گیان من پێت ئەڵێم تۆ هەر لەم دەقیقەیەوە لێرە سەر تیپی. من بۆ دوو هەفتە لەگەڵتان جەولە ئەکەم، دوایی ئەگەڕێمەوە بۆ سەرکردایەتی. جا بزانە کاك نەوشیروان تۆ لە سەر تیپی لا ئەبات. ئەگەر وابوو، ئەوە دیارە ئەوانە راست ئەکەن، کە پێیان وتوویت کاك نەوشیروان تۆ بە هیچ نازانێت."
ئیتر کاك وەهاب زۆر پەشیمان بۆوە. نەیدەزانی لە شەرما چی بکات، کە بەرەو روم بۆتەوە، چونکە زۆری خۆش دەویستم. بە یەکەوە کەوتینە جەولە کردن. منیش نامەیەکم بۆ کاك نەوشیروان نوسی. تیایدا بۆم باسکرد، کە چییان بۆ وەهاب باسکردووە. بۆشم نوسی بوو کاك وەهاب لە هەندێك رووەوە حەقی خۆیەتی، چونکە ئەو لە زۆر برادەران باشترە، کە بۆ سەر تیپی دانرون. ئەوە من لای خۆمەوە بڕیارم داوە لێرە سەر تیپ بێت. من ماوەیەك لەگەڵیاندا جەولە دەکەم دوایی دێمەوە.
وەهاب بۆ خۆی ئەوەی قبوڵ نەبوو من بڕۆم. قەت حەزم لە شارباژێڕ نەبوو، چونکە زۆر موشکیلە بوو. کاك نەوشیروانیش وەڵامی نامەکەی دابوومەوە ئەڵێ:
" -(تۆ خۆت هەر لە وێ بمێنەرەوە. با وەهاب بێت بۆ لام)"

نامەیەکیشی بۆ خۆی ناردبوو. وەهاب چوو بۆ لای کاک نەوشیروان پێی وتبوو:
" -ئەگەر ئەتەوێت بچیت بۆ جێگایەکی تر، ئەتکەین بە سەر تیپ. چاوەڕێ بکە."
ئیتر دیاربوو کاک وەهاب بڕوای کرد ئەوانەی بۆیان باسکردبوو، هیچی وانەبوو، کە گەڕایەوە زۆر موڕتاح بوو.

٥٩

ماوەیەکی تر لەگەڵ کاک وەهابدا لە شاربازێڕ بە یەکەوە بووین. ڕۆژێکیان بۆ چەك کردنی ئیسلامی بزوسکەیەکمان بۆ هات. ئیسلامیەکان لە ناوچەی شاربازێڕ زۆر بووبوون. چەکو پارەیان زۆر بوو. زۆر کەس دەچوون بۆ لایان. ئەو کاتەش عەسکەری فیرار لە ناوچەی شاربازێڕ زۆربوو. هەموو جۆرە خەڵکێك چەکی لا هەڵدەگرتن. خەریك بوو مەترسییان دروست دەکرد. بنکەی سەرەکیان لە (سەرگەڵو) بوو. هەموو تیپەکان لە یەك شەودا کۆبووینەوە دەورمان گرتن. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا هەر هەموویانمان چەك کردن، بەڵام لە دەوری سەرگەڵو شەڕیانکرد (سەلاحی موهەندیس) لەو شەڕەدا شەهیدکرا. ئێمە گەڕاینەوە بۆ باراو. نیوەڕۆ بوو. لە ماڵی خۆمان دانیشتبووین، کە هەواڵی شەهیدبوونی سەلاحی موهەندیسمان بیست. هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو. نیوەڕۆبوو، نانم بۆ نەخورا. سەلاحی موهەندیسم خۆش دەویست. زۆرم پێ ناخۆش بوو شەهید کراوە. دوای چەند ڕۆژێ ملازم عومەر هات بۆ لامان بۆ کۆکردنەوەی چەکەکان، بزانێت چۆن دابەش کراوە. خۆی هەمووی کۆکردەوەو دابەشی کردەوە. ئەو لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو. ئەو کاتەش تیپەکان بەسترابوون بە مەکتەبی عەسکەرییەوە. ئیتر ماوەیەك لەو ناوە ماینەوە. دوایی وەهابیان نارد بۆ سەرپەرشتی تیپی (٤٧) ماوەیەك لە وێ بوو. دیاربوو ئەوێی بە دڵ نەبوو. ئیتر قەرەداغیان کرد بە دوو تیپ. مام ڕۆستەم سەر تیپی (٥٧)ی سەگرمەو شێخ جەعفەر سەرتیپی (٥٥)ی قەرەداغ بوو. مام ڕۆستەمیان گواستەوە بۆ تیپی (٢١)ی کەرکوك. وەهابیش گوێزرایەوە بۆ جێگاکەی مام ڕۆستەم بۆ تیپی (٥٧)ی سەگرمە.

٦٠

هاوینی ساڵی ١٩٨٢ بوو ئاوات عەبدولغەفورو قادری حاجی عەلیو دانای ئەحمەد مەجید هاتبوون بۆ کۆنفرانسی ناوخۆی کۆمەڵە. ئەو کاتە ئەوان لە دەزگای ناوەندی کۆمەڵە بوون. هاتبوونە خوارەوە بۆ کۆنفرانس. هاتن بۆ تیپی (٣٣)ی سلێمانی. لەو کاتەشدا، من دوو ئوتۆمبیلم لابوو، تازە بۆیان هێنابووم لە ناو سلێمانییەوە.

ئوتۆمبیلێکیانم دا بەوان. وتم با پێتان بێت هەتا ئەگەڕێنەوە بۆ سەرکردایەتی. دانای ئەحمەد مەجید ئوتومبیلەکەی لێ دەخوڕی. نیوەڕۆ بوو چووین بۆ گوندی (چنگیان) پێم وتن:

" -ئەگەر حەز لە دۆندرمە ئەکەن، دەوری عەسر ئەچین بۆ گوندی (سیتەك)."

وتیان:

" -زۆر باشە بمان بە."

گوندی سیتەك کارەبای هەبوو. دووکانی ساردەمەنی تیابوو. هەموو جارێك لە بەر هەلیکۆپتەر، لە ئێواراندا دەچووین. سیتەك زۆر نزیك بوو لە سلێمانییەوە. ڕەبایەکانی ئەزمڕ لە پشتییەوە بوو. جادەکەی چوارتاش لەوێوە نزیك بوو. عەسر بەرێ کەوتین. من‌و وەهاب لە پێشەوە دەڕۆیشتین. وەهاب ئوتومبیلەکەی لێدەخوڕی. قادری حاجی عەلی‌و ئەوان، لە دوای ئێمەوە دەهاتن. حەمەی تەیب لە دوای ئەوانەوە بوو. پێش ئەوەی بگەینە گوندی (تۆدێ) دەشتاییەکی لێ بوو، زۆر ڕوت بوو. ئاگامان لە خۆمان نەبوو، لە پڕ وەك ئەوەبوو ئاسمان بڕوخێ بە سەرماندا، بووین بە ژێر تۆزو خۆڵەوە. من‌وامزانی کەمینیان بۆ داناوین. پێشمەرگە هەموو خۆیان فڕێدایە خوارەوە. هەر من‌و وەهاب مابووینەوە لە ناو ئوتومبیلەکەدا. ئێمەش خۆمان فڕێدایە خوارەوە، کە سەیرمانکرد، چوار هەلیکۆپتەر بە سەرمانەوە بوو. هەر ئەوەمان پێکرا خۆماندا بە عەرزا. هەلیکۆپتەر چوار دەورمانی بە ساروخ کێڵا. نازانم چۆن بەر نەکەوتین. ئوتومبیلەکەی کرد بە بێژنگ. چەکێکی گەورەشمان پێ نەبوو وەك (ئاڕ بی جی) یان (بی کەی سی) ئەو دوو چەکە باش بوو بۆ بەرگری لە هەلیکۆپتەر. ئوتومبیلەکەی کاك قادرو ئاوات عەبدولغەفور سووتا. خۆیان دەرچووبوون. هەموومان بە سەلامەتی دەرچووین. سەیارەکانمان سوتا. بە هەزار حاڵ ڕزگارمان بوو. خەریك بوو ببین بە شەهیدی دۆندرمە.

## ٦١

ماوەیەکی پێ چوو، کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵە دەستی پێکرد. پێش کۆنفرانس کۆمەڵێك لە کادرانی شارەزور، لە برادەرانی کۆمەڵە هەموو لە پاڕەزان کۆببوونەوە. سالار عەزیزیش لە وێ بوو. بەکری حاجی سەفەر ماڵەکەشی هەر لەوێ بوو. هەموو هاتن بۆ کۆنفرانس. ئەو کاتە مامۆستا جەمال تایەریش لە زیندان ئازاد کرابوو. ئەویش لە کۆنفرانس بوو. مامۆستا جەمال تایەر لێپرسراوی سەرکردایەتی ناوەوە بوو. چەندین

جار له لایەن رژێمی بەعسەوە گیرابوو. ئەو قارەمانە بەرگریەکی بێ سنووری کردبوو. هەموو نهێنییەکانی پاراستبوو. بە (عافوات) بەربوو. لە سەرەتاوە بە نهێنی هاتبوو، دەمو چاوی خۆی هەڵبەستبوو. زۆر لە هاوڕێیان دەیانناسی. لە هەڵبژاردندا زۆربەی دەنگی هاوڕێکانی بە دەست هێنا. مامۆستا جەمال تایەر دەوری زۆر باشی هەبوو لە کۆبوونەوەکاندا. لە بەینی هاوڕێکانی دا. هەم بۆ یەکێتیو هەم بۆ کۆمەڵەش. دوای چەند رۆژێك کۆنفرانس زۆر بە سەرکەوتوویی کۆتایی هات. کۆمەڵە زۆر باش بوو. هەموو ساڵێك یان دوو ساڵ جارێك کۆنفرانسیان دەگرت. لە بەرئەوە کەس نەی دەوێرا بە رێکو پێکی ئیشەکانی نەکات، چونکە دەیزانی ساڵی ئایندە دەرناچێتەوە بۆ سەرکردایەتی. بە راستی کۆمەڵە رێکخستنێکی رێکو پێکو بە هێز بوو.

٦٢

مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٨٢ بوو. رۆژێ چووین بۆ جەولە بۆ دەوری (مۆریاس) ئەو کاتە (جەباری عەلی عەوێز) و (حەمەی تەیب) ئامر کەرت بوون لە تیپی ٣٣ی سلێمانی. وتیان رەبایەیەك لە پشتی (گرێزە)وە هەیە لە لای مۆریاسەوە رەبایەی (شێرە بەرە) یان پێ دەوت. بە بەرزییەکەوە بە سەر ماڵەکانی شێرە بەرەوە بوو. دەورو بەری زۆر رووت بوو. خۆشی زۆر بەرز بوو. رۆژێك لەگەڵ حەمەی تەیبو جەباری عەلی عەوێز سەردانی ئەو شوێنەمانکرد وتمان:

" -ئەمشەو دەچینە سەری بزانین بۆمان ناگیرێت.؟"

ئەو کاتەش پێشمەرگە فێری ئەو شەڕانە نەبوو پەلاماری رەبایە بدات، یان شەڕی گەورە بکات. زیاتر بۆ ناو سلێمانی بوو. یان کەمینی بچوك دانان بوو. سنووری تیپی ٣٣ ئەم شوێنانەبوو: سلێمانیو ناو بەرزنجەو رێگای بەرزنجە ـ عەربەت، رێگای سلێمانی-چوارتا بوو. سنووری سێ تیپ بوو بە تیپی (٤٧) دەبوو بە سنووری چوار تیپ. (تیپی ٣١ی بەرزنجە، ٣٧ی شارباژێڕ، ٣٣ی سلێمانی، ٤٧ی پیرەمەگرون. وتمان:

" -با خۆمان تاقی بکەینەوە. یان ئەیگرین. یان دووسێ کەسمان لێ شەهید ئەبێو بۆشمان ناگیرێت."

شەڕ هەر وایە. دوو ئارپی جیمان پێ بوو. یەکێکیان بە حەمەی تەیب بوو، ئەوی تریان بە جەبار بوو. دوو کەرتەکەی ئەوانم لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆمدا برد. بڕیارماندا شەو بچینە سەر رەبایەکە. وامان دانا، کە لە سێ لاوە پەلاماری بدەین. حەمەو جەبار لە دوو لاوە، منیش لە ناوەڕاستەوە لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆم. ئەو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵمدا بوون، زۆر ئازا بوون لێیان نە دەترسام. وامان دانا، کە ئەوان لە هەردوو شانی رەبایەکەوە بە ئارپیجی لێی بدەن، ئێمەش پەلاماریان بدەین. رەبایەکە جاشی تیا

نەبوو. هەمووی عەسکەر بوو. دەوری رەبایەکەش ئەوەندە روت بوو، یەك بەردی لێ نەبوو خۆمانی لە بندا بشارینەوە. شوێنێکی ناخۆش بوو بۆ شەڕو بۆ دەربازبوون. بە رووناکی چووین شوێنم بۆ هەر یەکێکیان دیاریکردو نیشانم دان. دیاربوو جەبارو حەمەی تەیب عەقڵیان نەی بڕیبوو، کە رەبایەکە دەگیرێت. پێیان نەوتم، کە ناکرێت. وتیان:

" —باشە."

هەرکەسەمان چووین بۆ جێگای خۆی. سەعاتی سفرمان دانا. بڕیار بوو ئەوان لە دوو لاوە بە ئارپیجی لێی بدەنو پەلاماری رەبایەکە بدەین بە بێ وەستان. چوار دەوری ربایەکە دیواری بەردبوو. تەنیا ئاڕ بیجی دەی روخاند. فیشەك هیچ کاریگەریەکی نەبوو. لە کاتی خۆیدا لێمان دان. تەنیا تەقەی فیشەك بوو. چاوەڕێ بووم بە ئاڕ بیجی لێی بدەن. دەنگی تەقە لای جەبارو حەمەی تەیبەوە نەبوو. ئێمەش لە ناوەڕاستدا بووین، چووبووینە بن رەبایەکە. زۆر تاریك بوو، بارانیش دەباری، کە ئەوان دەنگیان نەبوو ئیتر لە داخا نەمدەزانی چی بکەم؟ کاتێم زانی حەمەی تەیب بە پێشمەرگەیەکدا ئاڕ بیجیەکەی بە دوو گوللەوە بۆ ناردم وتبوی:

" —من ناتوانم بی تەقێنم. لای ئێمەوە رێ نیە. ئەوە ناردم بۆ خۆت."

ئەوە ئێمەش گیرمان خواردووە لە بن ربایەکە دا. لای حەمەی تەیبەوە تەقە نەما. منیش ئەو دوو گوللە ئاڕ بیجیەم پێوەنان. زۆر ترسان. یەکسەر بێدەنگ بوون، کردیان بە هاوار هاوار. دیار بوو لێیان کوژرا، چونکە زۆر نزیك بووین. پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو ناوی حەمە چاوشین بوو، زۆر ئازا بوو. ئەویش دوو رومانەی پێ بوو. لەو کاتەدا، کە من ئاڕ بیجیەکەم پێوەنان، ئەویش رومانەکانی هەڵدایە ناویان. ئەوان زۆریان لێ کوژرا. ئێمە شەش کەس بووین. منو حەمە چاوشینو عەتاو فەخرەدینو شوانەی رەئوف نوریو عوسمان کاژاوی لە بن رەبایەکەدا گیرمان خواردبوو. فەخرەدین لە دوای منەوە بوو. گوێم لە پرخە پرخی بوو. دەنگی نەبوو هەر دەی پرخاند. ئیتر گوللە ئارپیجی نەماو لە هیچ لایەکیشەوە تەقە نەما. ئێمەش فیشەکمان پێ نەمابوو. بە ئارپیجیەکە زۆریان لێ کوژرابوو، وەزعیان خراپ بوو. ئەگەر لەو کاتەدا پێشمەرگە لە هەموو لایەکەوە پەلاماری بدانایە دەگیران. بە عەتام وت:

" —بزانە فەخرەدین بۆ دەنگی نەماوە، هەر ئەپرخێنێت. لەوانەیە بریندار بووبێت."

ئەویش زۆر هاوڕێی بوو. هەردووکیان سەرچناری بوون. هەر بە یەکەوە بوون. بە سکەخشێ خۆی گەیاندە لای وتی:

" —کاك ئاوات بەرکەوتووە، هەموو سەری خوێنە. هەر لرخە لرخی دێ قسە ناکات."

تومەس فیشەك داوێتی لە سەری، ئێمەش نەمانزانی. دەنگی نەمابوو هاوار بکات. شەویش درەنگە رەبایەکەش زانیان ئێمە تەقەمان نەما، زاڵ بوون بە سەرماندا. خۆمان نووساندبوو بە عەرزەکەوە نەمان دەتوانی یەك تۆز سەر بەرز بکەینەوە. زۆریش

لەوانەوە نزیك بووین. ئەوان نەیاندەزانی ئەوەندە نزیکین. ترسیان نەمابوو. بە ئارەزوی خۆیان سەریان بەرز کردبۆوە بە دەوری خۆیاندا تەقەیان دەکرد. لەو کاتەدا بارانێکی بە هێز باری. ئێمەش بە زەحمەتێکی زۆر بە سکە خشێ خۆمان دوور خستەوە. هەر (دە) مەترێك لەو جێگایەی خۆمان دوور کەوتینەوە لێژیو نەدیوی بوو. لە رەبایەکەوە دەرنەدەکەوتین. دەرباز بووین. بە هەرسێکمان شەهیدەکەمان راکێشا. ئەوەی باش بوو لێژی بوو تا ناو ماڵەکانی شێرەبەرە. تا گەیاندمانە ئێکە رۆژ بۆوە. ئاوایییەکە چوار پێنج ماڵ بوون. بە پەلە وڵاخێکیان بۆ پەیداکردین، تەرمەکەمان لێنا. کەوتینە رێ بەرەو مۆریاس. مانەوە بە رۆژ زۆر خەتەر بوو. تەنیا هەرسێکمان بووین. هەموو بە جێیان هێشتبووین. یەك نەفەر لە سەرمان نەوەستا بوو. ئەو شەوەم هەرگیز لە یاد ناچێت. ئەوە هەڵەیەکی گەورەبوو کردیان. ئێمە ئێوارە بڕیارمان وابوو، کە ئەگەر لە دوورەوە رەبایەکە پێ ی زانین، ئەوە ناچینە سەریان. کە ئێمە چووینە نزیك رەبایەکە پێیان نەزانین. بۆیە بڕیاری لێدانیماندا. ئەوان وایانزانی بوو، کە ئێمەش پاشەکشەمان کردووە. دواتر وایان زانیبوو هەر چوارمان شەهید بووین. لە رێگاش چاوەڕوانیان نەکردبووین، بزانن چیمان بە سەر هاتووە. ئەو پێشمەرگەیەشمان بە ناوی (فەخرەدین ئیسماعیل) شەهیدبوو. خەڵکی سەرچنار بوو. دەرچووی ئامادەیی پیشەسازی بوو. پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو بوێر بوو. زۆر کوڕێکی بە ئەدەب بوو. کە گەڕاینەوە بۆ گوندی مۆریاس، هەموو خەڵکی مۆریاس بە گەورەو بچوکەوە، بە پیرمانەوە هاتن، کە زانیان ئێمە ماوینو گەڕاوینەتەوە. بینیانین هەموو گیانمان لە خوێندابوو. ئەو پەرۆشیو پێشوازییە پڕ لە خەمخۆرییەی ئەو رۆژە خەڵکی مۆریاس کردی بۆ ئەو شەهیدەو ئێمە، من پێم وایە ئەگەر هەموو خەڵکی مۆریاس خوشکو دایکو باوکی شەهیدەکەش بوونایە، هەر ئەوەندەیان بۆ دەکردین. ئەو هەڵوێستەی گوندی مۆریاسم هەرگیز لە یاد ناچێت. ئەوان کارێکیان کرد بە جەبارو حەمەی تەیب، من هەر قسەم نەکرد. زۆر توڕەبوون لە هەردووکیان وتیان:

" –بۆ ئەوانتان بەجێ هێشتووەو لەسەریان نەوەستاون.؟"

خەڵکی گوندی مۆریاس لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی لە وێ بوون، ئاگادارنو شایەتن. حەمە جەزاو عەلی رەشە جووتە لە وێ بوون. ئەوانم هەر لە مۆریاس بە جێ هێشتبوو. ئەم بردبوون. تەرمی شەهیدەکەمان لە مۆریاس شتوکفن کرد. هێنامانەوە بۆ گوندی (گورگەیەر) ئەوەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کردیان بۆ ئەو شەهیدە، بۆ کەس نەکراوە. هەر لە گوندی مۆریاسەوە دێ بە دێ خەڵکی ئەو ناوچەیە بە دوای ئەو تەرمەوە بوون، هەتا گوندی گورگەیەر. شەهید بوونی فەخرەدین زۆر ناخۆش بوو. لە لایەکی ترەوە ئەو هەموو خۆشەویستیەی خەڵکی ناوچەکە بەرامبەر ئێمە، هەڵوێستێکی جوامێرانە بوو. من هەرگیز خەڵکی شارباژێڕ لە یاد ناکەم. ئەو هەموو خزمەتکردنەی پێشمەرگە بە بێ بەرامبەر. بە راستی خەڵکی گوندەکان زۆر دڵسۆزی پێشمەرگە بوون. بە

قەناعەتەوە پێشمەرگەیان خۆش دەویست. ئەوەی خەڵکی لادێ کردیان بۆ شۆڕش باس ناکرێت. بۆ سەلماندنی ئەم راستیەش، کاتێ گوندەکان نەمان، ئێمەش لە ناوچەکەدا نەماین. وەك ئەوەی ماسی لە ئاو ببڕێ وابوو.

٦٣

(ی.ن.ك)و (پ.د.ك) لە سەر ئەوە رێککەوتبوون، کەوا ئەوان بگەڕێنەوە بۆ ناوچەی سۆران. ئێمەش هێز بنێرین بۆ بادینان. وتیان هەر تیپەی کەرتێك پێشمەرگە بنێرێ. لە سەرکردایەتی گەڕامەوە، (کاکە برا)م نارد بە کەرتەکەیەوە. (کاکەبرا بەرزنجی) زۆر کوڕێکی ئازاو رێکو پێك بوو. رۆیشتن ماوەیەکی زۆر لە سەرکردایەتی بوون. لە وێ مانەوە دیاربوو (پ، د، ك) رێگای نەدان پێشمەرگەی ئێمە بچێتەوە بادینان. ئیتر چەند شەڕێك لە چەند شوێنێك رووی دابوو. ئەوانەی ئێمە ناردبوومان بۆ سەرکردایەتی بۆ ئەوەی بچن بۆ بادینان. چووبوون بۆ ئەو شەڕانە. لەبەر ئەوە زۆری هێزەکانی خۆمان، بانگ کرابووین بۆ سەرکردایەتی. رۆژێك بە (ئیزاعە)[50] کەی خۆمان ئاگاداریان کردمەوە بانگیانکردم، کە خۆمو (١٠٠) پێشمەرگە بچم بۆ سەرکردایەتی. منیش سەد پێشمەرگەم کۆکردەوەو لەگەڵ خۆم بردمن. رۆشتین بەرەو سەرکردایەتی. پێش ئەوە دوو برادەر هەبوون بە ناوی (بەختیاری حاجی فارس) ئەوەی تریان ناوی (سورکێو) هەردووکیان ئەندامی کۆمەڵە بوون. زۆر ئازاو کوڕی چاك بوون. سورکێو ئەو کاتە رابەر سیاسی تیپ بوو. بەختیاریش مەسئولی دارایی بوو. دوایش شەهیدبوو. دەرچووی زانکۆ بوو. زۆر کوڕێکی ئازابوو. کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەش کاك کەمال عەلی بوو. برادەران هەر لە خۆیانەوە لە من نارازی بوون. نەمدەزانی چی بووە؟ زۆر رقیان لە سورکێوو بەختیار بوو. ئەوانیش هەمیشە لەگەڵ من بوون. من زۆر بڕوام بە هەردووکیان بوو. هەم بۆ ئازاییو هەم بۆ دڵسۆزی. ئەوان دلیم خەریکی فشقیات بوون. گوێیان لە دنیا نەبوو. دیاربوو دووسێ جار نامەیان لە سەر من بۆ کاك نەوشیروان نووسیبوو، کە یارمەتیان نادەمو دژی ئەوانیش ئیش دەکەم. جارێك کاك نەوشیروان پێی وتم:

" –باشە کاك ئاوات تۆ کادری کۆمەڵەیت، بۆ چی دژی کۆمەڵە ئیش دەکەیت.؟"

ئەوەم زۆر بە لاوە سەیربوو!. وتم:

" –کاك نەوشیروان بۆ چی دژی کۆمەڵە ئیش دەکەم.؟"

وتی:

" –هەموو برادەران لێت نارازین."

---

[50] - ئیزاعەکە: رادیۆی دەنگی گەلی کوردستان بوو. ئەو کاتە هەر ئیشێك یان بانگەواز بۆ هەر کەسێك یان هەر تیپێك بوایە، لە رێی ئەو ردیۆیەوە ئاگادار دەکرایەنەوە.

وتم:
" –وەلا بلێم چی؟ ئەوان بۆ خۆیان دژی کۆمەڵەن، نەك من. بۆ خۆیان هەر لە ماڵەوە دادەنیشن. بە حەیاتیان نایەنە ناو پێشمەرگەوە. هەموو پێشمەرگە گلەییان لێ دەکات. منیش چەند جارێك لەگەڵیان دانیشتووم، ئەوانەم هەموو پێ وتوون. هەر گوێشی نادەنێ. هێشتا ئەوان گلەیی لە من دەکەن. وتی:
" –باشە بەختیارو سورکێوم بۆ بنێرە."
وتم:
" –باشە."
سەرەتا، کە چووین بۆ سەرکردلیەتی لەگەڵ خۆم بوون. گەیشتمە (قاسمە رەش) وتیان:
" –مام جەلال وا لە (داوداوێ)."
منیش هەر لە وێوە نامەیەکم بۆ کاك نەوشیروان نووسی وتم:
" –(کاکە ئەوە ئێمە هاتووین، ئەو دوو برادەرەشم لەگەڵ خۆم هێناوە. جارێ ئەچین بۆ لای مام جەلال. ئەگەر گەڕاینەوە لە شەڕ، ئەوا دێین بۆ لاتان چیمان لێ ئەکەن ئامادەین. خۆ ئەگەر لە شەڕ نەگەڕاینەوە، ئێوە خۆش)."
ئێمە چووین بۆ لای مام جەلال. مام جەلال لە ژوورێکی بچوکدابوو. وتیان:
" –ئەمە مقەڕی پاسۆك بووە."
تۆزێك لای مام جەلال دانیشتم وتی:
" –ئاوات بچۆ بۆ ئەو شاخە."
شاخێك بوو پێیان دەوت شاخی جەنگی لە ناوچەی سەردەشت. زۆر سارد بوو. هێشتا بەفر نەباری بوو. چووین ماوەیەك لە وێ بووین. ڕۆژێ مام جەلال ناردی بە دوامدا وتی:
" –بە پەلە وەرە خوارەوە."
چوومە خوارەوە، سەلاح چاوشین لە وێ بوو. لەگەڵ مام جەلال عاجز بوو بوو. چوومە ژوورەوە بۆ لای مام جەلال وتی:
" –بەڵکو تۆ بچیتە شوێنی سەلاح لە تیپی (٤٧) ئێوە بچن لەگەڵ تیپەکەدا."
وتم:
" –بەڵێ باشە."
ئێمە ڕۆشتین بۆ ئەو شوێنەی، کە بۆی دیاری کرد بووین. دەوری سێ مانگ لەوێ بووین. زستانێکی زۆر سەخت بوو. بە تایبەتی ئەو ناوچەیەی، کە ئێمەی لێ بووین، بەینی سەقزو بۆکان بوو.

ڕۆژێ گوێم لە ئێزگەکەی خۆمان بوو، باسی تەشکیلاتی مەڵبەندی خوێندەوە. ئەو ناوچانەی، کە لە ژێر دەسەلاتی یەکێتی دان، کردوویانە بە سێ مەڵبەند بەم شێوەیە: مەڵبەندی یەك، مەڵبەندی دوو، مەڵبەندی سێ. مەڵبەندی یەك مەلا بەختیار لێپرسراوی بوو. مەڵبەندی دوو عەلی بچکۆل لێپرسراوی بوو. مەڵبەندی سێ دکتۆرکەمال خۆشناو لێپرسراوی بوو. گەڕامەوە بۆ ناوزەنگ چووم بۆ لای کاك نەوشیروان. مام جەلال لە وێ نەبوو، کاك نەوشیروان زۆر سوپاسی کردین وتی:

" —بە راستی زۆرتان لێ رازیم."

وتم:

" —کاك نەوشیروان ئەوەش برادەرانە. بە سەلامەتی گەڕاوینەتەوە. ئیتر چیمان لێ ئەکەن ئێمە ئامادەین."

کاك نەوشیروان بە (بەختیار)ی وت:

" —تۆ بۆ خۆت کۆمەڵەیت. چەند لە ناوەندی کۆمەڵە بوویت. ماوەیەکیش هەر لەگەڵ خۆم بوویت. ئەو برادەرانە بۆ لێت نارازین.؟"

هەمان شتی بە سورکێویش وت. ئەوانیش وتیان:

" —کاك نەوشیروان بڕوا بکە ئەو برادەرانە بە خۆڕایی گلەیی ئەکەن. ئەگینا خراپی ئێمە چیە با پێمان بڵێن."

کاك نەوشیروان وتی:

" —بڕۆنەوە."

بە کاك نەوشیروانم وت:

" —من ناچم بۆ مەڵبەندی یەك."

وتی:

" —بۆ.؟"

وتم:

" —لەبەر ئەوەی مەلا بەختیار لە مەڵبەندی یەکە. لەوانەیە بە رقو کینەوە ئیشم لەگەڵ بکات. لە دوای کۆنفرانسەوە پەیوەندی لەگەڵمدا باش نییە. لەوانەیە هەرچیەك بکەم هەر بە خراپی بزانێت. پێم خۆشە بمگوێزیتەوە بۆ مەڵبەندێکی تر. یان لە سەرکردایەتی ئەمێنمەوە. ئەو مەسئولی مەڵبەندەو ئەندامی مەکتەبی سیاسیشە هەرچیەك ئەو بیڵێت گوێ لەو ئەگرن."

کاك نەوشیروان وتی:

" —وانیه. ئەو مەڵبەندی یەکی پێ خۆش نەبووە. حەزی ئەکرد بچێت بۆ مەڵبەندی سێ. ئێمە خۆمان بۆ مەڵبەندی یەکمان ناردو داوای لە ئێمە کردووە، کە ئێوە هاوکاری لەگەڵ بکەن."
منیش پێم وت:
" —ئەوەی واجباتو بڕیاری شۆڕش بێت من لە سەدا سەد جێ بەجێ ی ئەکەم." وا ئیتفاقم کرد، کە بگەڕێمەوە بۆ مەڵبەندی یەك. ئەوەی ئیشی شۆڕش بێت جێ بەجێی بکەم. وتم:
" —من لە جاران زیاتر ڕێزی لێ ئەگرم، هیچ شتێکم لەگەڵ ئەودا نیە، بەڵام ئەگەر هەر شتێکی دەربارەی من وت هیچ ناکەن هەتا لێکۆڵینەوە لەو قسەیەی نەکەن. لە خۆتانەوە بڕیار مەدەن."
وتی:
" —باشە."
لە ڕێگای گەڕانەوەمدا بەرەو شاربازێڕ، هەر منو سورکێوو بەختیار بووین. هەموو پێشمەرگەکانم لە پێش خۆمەوە ڕەوانە کرد. ڕۆشتین چووینە گوندی (بێ ژوێ) لە ناوچەی (ئالانە) وتیان:
" —مام جەلال لێرەیە."
لە ماڵی حەمەی مەلا عەلی بوو. حەمەی مەلا عەلی پیاوێکی باش بوو زۆر دۆستی یەکێتی بوو. دۆستی هەموو کوردێکی باش بوو. ماڵەکەی وەك دیوەخانی ئێمە وابوو. لە سەر ڕێگاکەمان بوو، کە چووم مام جەلال لە وێ بوو زۆر ڕێزی لێ گرتین زۆر سوپاسی کردین وتی:
" —سەری ئێمەتان بەرزکردەوە لەو شەڕانەدا."
منیش زۆر سوپاسی مام جەلالم کرد وتم:
" —ئەرکی پێشمەرگایەتی خۆمانە."
دواتر بۆ (مام جەلال)یشم باسکرد، کە نامەوێ بچم بۆ مەڵبەندی یەك. ئەویش هەمان ڕەئی کاك نەوشیروانی پێ وتم. گەڕامەوە بۆ شاربازێڕ. چووم سەرێکم لە ماڵەوەدا. ئەو کاتە ماڵەکەم لە گوندی (شوکێ) بوو هەفتەیەك ئیسراحەتمکرد. دوایی چووم بۆ سەردانی مەڵبەند لە گوندی (حاجی مەمەند) مەلا بەختیار لێپرسراوی مەڵبەندبوو. حەمەی فەرەج مەسئوولی عەسکەری بوو. عومەر عەزیز مەسئوولی سیاسی بوو. مامۆستا ساڵح مەسئوولی کۆمەڵایەتی بوو. ڕەفعەتی مەلا مەسئوولی دارایی بوو. ئاسۆی شێخ نوری ئەویش ئەندامی مەڵبەندبوو. کە چووم مەلا بەختیار زۆر موجامەلەی کردم هەروەك جارانی خۆی. سوێندی خوارد هەروەك یەکەم ڕۆژ، کە یەکترمان ناسیوە بەو شێوەیە ئیشم لەگەڵ دەکاتو بە ڕقو کینەوە ئیش ناکات. وتی:
" —با بە ڕۆحی ڕۆژانی ناو شارەوە سەیری یەکتر بکەین."

منیش وتم:

" -کاك بەختیار من هەروام وەك جاران هیچ گۆڕانم بە سەردا نەهاتووە ئیتر تۆش خۆت ئەزانی."

پێکەوە چووین بۆ سنوری تیپی (٣٣) جەولەیەکمان کرد. کۆبوونەوەی بە گوندەکانو پێشمەرگەکان کرد. ماوەیەك بە یەکەوە بووین. پاشان ئەو گەڕایەوە بۆ مەڵبەند لە حاجی مەمەند. ئێمەش لە ناوچەکەی خۆمان ماینەوە. ئەو کاتە شۆڕش ئیسماعیل جێگری تیپ بوو. نامیقی حەمە چەتە ئامر کەرت بوو. چووبوو بۆ چالاکیەك لە ناو شاری سلێمانی. ئەو کەسەی، کە بردبووی بۆ ئیشەکە خزمی خۆی بوو. فێڵی لێکرد بوو. پێش ئەوەی بگەنە ناو شار، ئیستخباراتی ئاگادار کردبۆوە. هەر لە ناو ئەو تەکسیەی، کە پێی ڕۆیشتبوون شەهیدکرا. شۆفێری تاکسیەکەشیان پێوە شەهید کردبوو. پیاوێکی ئازاو دڵسۆزو کەسێکی بەڕێز بوو. پێش شەهیدبوونی جارێك بریندار بووبوو. لە جێی ئەو (حاجی ئاراس)مان کرد بە فەرماندەی کەرت. ئەو کاتە پێنج کەرتمان هەبوو. حاجی ئاراسو حەمە عەلی بەرزنجیو کاکە برا بەرزنجیو عەلی رەشە جووتە لەگەڵ کەرتی فەرەج هۆنەرێنی بوو. دوایش فەرج هۆنەرێنی لە مەڵبەند لە گوندی حاجی مەمەند شەهید بوو. سورکێو رابەر سیاسی تیپ بوو. کەمال عەلی لێپرسراوی رێکخستنی کۆمەڵە بوو. کاکە برا قرگەیی لێپرسراوی رێکخستنی شۆڕش گێڕان بوو. حەمەی تەیب ئامر کەرت بوو. ئەوکاتە ئەو گوێزرابوەوە بۆ مەڵبەند.

٦٥

ڕۆژێ مەلا بەختیار ناردی بە دوامدا. منیش چووم. کە چوومە ئەوێ سەیرمکرد، داناى ئەحمەد مەجید سەرتیپی (٣١) لە وێ بوو. چووینە مەڵبەند. بارەگای مەڵبەند لە گوندی حاجی مەمەند بوو. منو داناى بانگ کرد. ئاسۆی شێخ نوریش دانیشتبوو. مەلا بەختیار وتی:

" - (ح، س، ك) دوو کادری خۆمانی لە شارەزور گرتووە، کە ناویان (جەمیل هەورامیو شەوکەت حەمە ساڵح)ە چەند جار داوامان لە (حەمەی حاجی مەحمود) کردووە، بەریان نادات. ئەبێت هەوڵ بدەین بەڵکو چەند کادرێکیان بگرین بۆ ئەوەی بیان گۆڕینەوە. بە منی وت:

" –کاك ئاوات (ح، س، ك) لە سنوری تۆدان. ئەبێت تۆ ئەو کارە ئەنجام بدەیت، چونکە سنوری دانای ئەحمەد مەجید (حسك)ی لێ نیە."

ئەو کاتە (ح، س، ك) هەر (عوسمانی قادر منەوەر) لەو ناوچەیە بوو. منیش پێم وت:

" –ئاخر کاك بەختیار چۆن کادری ئەوان بگرین؟ ئەوان حیزبێکی جیاوازن لە ئێمەو چۆن ئەتوانین چەکیان بکەین؟ تۆ جاری وا هەیە ئەتەوێت پێشمەرگەیەکی خۆت چەك بکەیت. چەك نابێت. خۆ ئێمەش حسابی ئەوەی بۆ بکەین، ئەگەر چەکی دانەنا، ئەبێت تەقەی لێ بکەین. ئەگەر تەقەشت لێکرد شەڕ دروست ئەبێت لە بەینی ئێمەو ئەواندا. جا ئەو کاتە کێ تەحەمولی مەسئولیات ئەکات، چونکە خەڵکی تیا ئەکوژرێت."

وتی:

" –من مەسئوولی مەڵبەندمو ئەندامی مەکتەبی سیاسیم. من تەحەمولی ئەو مەسئولیەتە ئەکەم. بە مەرجێك تۆ بتوانیت هەندێك کادری ئەوان دەستگیر بکەیت. خۆ ئەگەر عوسمان خۆشی بێت زۆر باشترە."

وتم:

" –من خۆم ئەچم بۆ ئەو (عەمەلیەیە) بۆ ئەوە ناچین پێشمەرگەی ئاسایی بگرین، چونکە هەر گوێشی نادەنێ."

دانای ئەحمەد مەجیدو ئاسۆی شێخ نوری هەردوکیان شایەتن. پێم وایە کەمال شاکرو مامۆستا پشکۆشی لێبوو لەو ژوورەی، کە ئەو بڕیارەی لێ دەرکرد. ئەو کاتە ئاسۆی شێخ نوری ئەندام مەڵبەند بوو. برادەرێکی تریشی لێبوو، بەڵام هەر ئەو چوارەم لەبیرە. دوای نیوەڕۆ بوو لە گوندی (حاجی مەمەند)ەوە گەڕاینەوە بۆ گوندی باراو. ئەو کاتە مقەڕی تیپمان لە بارلو بوو. وتم فەرمانی مەڵبەند جێ بەجێ دەکەم. بۆ ئەوەی نەڵێن ئیلتیزام ناکات‌و گوێ لە بڕیارەکانی ئێمە ناگرێ، چونکە کاتی خۆی، کە ئەو بوو بە لێپرسراوی مەڵبەند، من بڕیارم دابوو، کە هەموو فەرمانێکی شۆڕش مەلا بەختیار پێم بڵێ جێ بەجێ ی بکەم. بەڵام من نەمزانی ئەو مەبەستی هەیە. بۆیە بڕیارمدا خۆم هەڵسم بە ئیشەکە. بۆ ئەوەی کەسی تیا نەکوژرێت. بە تەمای ئەوەش نەبووم، کە بچم (عوسمانی قادر منەوەر) بکوژم. من لەگەڵ عوسماندا پەیوەندیم زۆر باش بوو. هیچ کێشەیەکم لەگەڵیدا نەبوو. کە گەیشتمە مقەڕ لە بارلو، ناردم بە دوای ئامر کەرتەکان‌و رابەر سیاسی تیپ. ئەوەی مەلا بەختیار لە مەڵبەند بە منی وتبوو، بۆ ئەوانیشم باسکرد. پێم وتن:

" –هیچ بە پێشمەرگە مەڵێن، ئەمە نهێنی یە. نابێت کەس بزانێت. هەر کۆیان بکەنەوە بە ناوی جەولەکردنەوە ئەچینە خوارەوە، بۆ دەوری گوندی (بزەینیان)و (گورگەیەر)و ئەو دێیانەی خوارەوە."

خۆم چوومەوە بۆ شوکێ ماڵەکەم لەوێ بوو. مقەڕی تیپەکەشمان هەر لە وێ بوو. کاکەبرا مەسئولی ئەو کەرتە بوو، کە لەمقەڕەکەی شوکێ بوو. بەوانیشم وت:

" –ئێوەش وەرنە خوارەوە بۆ شوکێ، دوایی لە وێوە بە جەولە ئەچینە خوارەوە، بەڵام ئاسایی بن بۆ ئەوەی کەس هەست نەکات. با پێشمەرگە نەزانێت. ئەگەر عوسمانتان بینی لە جاران زیاتر رێزی لێبگرن، هەتا خۆم ئەڵێم."

دوای نیوەڕۆ بوو چووینە گورگەیەر. لە وێ خۆم (١٥) کەسم جیاکردەوە. لەوانە دوانیان ئامر کەرت بوون. کاکەبرا بەرزنجیو حاجی ئاراسم برد لەگەڵ خۆمدا. حەمە عەلی بەرزنجیو عەلی رەشە جووتە لەگەڵ سورکێو. ئەوانم لە وێ بە جێ هێشت. پێم وتن:

" –بۆ خۆتان لێرەبن. دابەش بن بە سەرماڵەکاندا هەروەك جاران. ئەگەر عوسمان خۆی هات، یان هەر مەسئولێکی ئەوان، ئێوە عیلاقەتان نیە بە سەریانەوە. زۆر ئاسایی بن لەگەڵیاندا هەروەك جاران."

ئەو پانزە پێشمەرگەیەی، کە هەڵم بژارد بوون، سواری ئۆتومبیلەکەی خۆمم کردن بەرەو گوندی (بناویلە) چووینە گوندی (شارستێنە) عوسمانی قادر منەوەر ئەو کاتە بەردەوام رووپان دەکردە (شارستێنە) دەچوونە سەر ئەو جادەیەی، کە لە عەربەتەوە دەهات بۆ (سیتەك) لە وێ دارێکی لێبوو دلیم لە وێ بوون. ئەو دارە ناو نرابوو (دارەکەی حسك)، چونکە عوسمانی قادر منەوەر هەر ئیشی ئەوە بوو، دەینارد بە دوای خەڵکدا لە سلێمانی یەوە، کە دەهاتن بۆ لایان، لە وێ پارەیان لێ دەسەندنو دەیان ناردنەوە. دەمزانی لەوێن. کە چوومە شارستێنە ماڵی پێشمەرگەیەکی خۆمان لەوێ بوو بە ناوی (عەلی شینە) لە باوکیو ئەوانم پرسی وتم:

" –عوسمانو ئەوان ئەمڕۆ نەهاتوون بۆ ئەم ناوە.؟"

باوکی عەلی وتی:

" –جا ئەوان کەی لێرە نین. دەوری سەعاتێکە رۆشتوون بەرەو سیتەك."

ماڵەکە زۆر هەوڵیان لەگەڵ داین بۆ ئێوارە بمێنینەوە. وتمان:

" –ئیشمان هەیە ناتوانین بمێنینەوە."

بەرەو سیتەك گەڕاینەوە. پێش ئەوەی بگەینە سیتەك، چاڵاییەکی تیایە. لە گوندی بناویلە، لەو چاڵەدا ئۆتومبیلەکەمان کوژایەوە. لەو کاتەدا، کە خەریکی ئۆتومبیلەکە بووین، بۆنیدەکەیمان هەڵدابۆوە بزانین هۆی چیە کوژاوەتەوە؟ کاکەبرا بەرزنجی کابرایەکی زۆر وریابوو. خێرا دابەزی چووە سەرگردەکە لە پشتی ماڵەکانی بناویلە، کە هاتە خوارەوە وتی:

" –کاك ئاوات گوێم لە سێ چوار سەللەی کلاشنکۆف بوو، لای گورگەیەرەوە."

منیش وتم:

" –لەوانەیە لە دەست خەڵك دەرچووبێت. یان راوچی یان نیشانە بووبێت. ئەگینا گورگەیەر چی لێیە تا تەقەی تیا ببێ.؟"

سەیارەکەمان چاك کردەوەو بەرەو سیتەك رۆشتین. چووینە بەردەمی مزگەوتی سیتەك. سەیرمکرد شێخ عومەری شێخ کەریمو حەمە عەلی عوسمانی مەلاو یوسف بە (یوسفە لچە) ناسرابوو. لە مزگەوتەکەی سیتەك بوون. لەگەڵ شێخ عومەرو حەمە عەلی دا تۆزێك وەستاین. شێخ عومەر فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی (٤٧) بۆ سەردان هاتبوون بۆ سیتەك. وتم:

" –ئەوە چی ئەکەن لێرە.؟"

وتی:

" –دووسێ رۆژە لێرەین. جەماعەتیشمان لەگەڵ بوون. شەوی رابردوو ئەوان گەڕانەوە بۆ بەری ٤٧ هەر منو حەمە عەلی ماوین. ئەمشەو ئێمەش ئەگەڕێینەوە. بۆیە نەڕۆیشتین، پێشمەرگەیەکمان فیشەکی لە دەست دەرچووە. پێشمەگەیەکی خۆمانی بریندار کردووە. شەوی رابردوو بە دیار ئەوەوە بووین. وتم:

" –ئەی پێشمەرگەکە کوانێ.؟"

وتی:

" –پێش ئەوەی ئێوە بێن، عوسمانی قادر منەوەرو جەزای عەلی کاتب لێرە بوون. عوسمان ئوتومبیلەکەی بە جەزا دا، وتی:

" –من بە پێ ئەڕوم بۆ (گەڕەدێ) بۆ لای جەماعەت."

جەزاش ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵ خۆی برد بۆ خەستەخانەکەی ئێوە بۆ باراو. وتم:

" –بە راستە.؟"

وتی:

" –بە خوا."

ئیتر من هەر لە خۆمەوە زۆر ترسام لەوەی تۆ بڵێی ئەو تەقانە لە جەزا کرا بن، چونکە وتی بە ئوتومبیلەکەی عوسمان رۆیشتووە. ئیتر بۆ شێخ عومەرم باسکرد، کە دەمانەوێ هەندێ کادری (ح، س، ك) بگرین، چونکە ئەوان دوو کادری یەکێتیان لە شارەزور گرتووە، بۆ ئەوەی بیان گۆڕینەوە. پێم وتن:

" –وریای خۆتان بن نەوەك لەگەڵ (حسك) تێك بچینو ئێوە تووش بێن. لەبەر ئەوە ئاگادارین. "

وتی:

" –ئێمە دوو سەعاتی تر لێرە ئەبین، ئەگەڕێینەوە بۆ شوێنی خۆمان."

منیش خواحافیزیم لێکردنو بە برادەرانی خۆمانم وت:

" –سوار بن با بڕۆین."

وتم:

" –تۆ بڵێی لە خۆیانەوە تەقە لە ئوتومبیلەکە بکەن، چونکە پێم وتبوون ئەگەر عوسمان بۆ خۆشی هات ئێوە هیچ حەقتان نەبێت."

چونکە ئێمە بە تەمای هیچ نەبووین. بۆیە هەر خۆم بە ئیشەکە هەڵسا بووم، بۆ ئەوەی کێشە دروست نەبێ. ئەو کاتە مقەڕی پارتی لە گوندی (عازەبان) بوو. مقەڕی عوسمانیش هەر لەوێ بوو. گەڕاینەوە بەرەو گوندی (گورگەیەر) بۆ لای برادەرانی خۆمان. خۆم ئوتومبیلەکەم لێ دەخوڕی. پێش ئەوەی بگەمە گوندەکە یەکێك لە پێشمەرگەکان وتی:

" -کاك ئاوات بوەستە. هەموو سەرگردەکانی دەوری دێکە گیراوە."

وتم:

" -جا تۆ بڵێیت (حسك) لە گەڕەدێوە هاتبێت هەموو هێزەکەی ئێمەی راو نابێت."

وتم:

" -بەخوا ناوەستم ئەگەر هەمووماں کوژراوین."

نەوەستام خۆم کرد بە ناو دێدا. لە پێشا گەیشتم بە عەلی رەشە جووتەو سورکێو. زۆر مات بوون. دابەزیم وتم:

" -ئەوە چییە بۆ هەموو بەو یالآنەوەن. ! ؟"

(١٥) پێشمەرگەی پارتیشی لێ بوو. وتیان:

" -چیت پێ بڵێین؟ ئوتومبیلەکەی عوسمان لە خوارەوە هات لای ئێوەوە، گەیشتە خوار دێکەو تۆزێ وەستا. ئینجا گەڕایەوە بە رێگاکەی ئەو دیو دێکەدا رۆیشت بەرەو بزەینیان. کاتێکمانزانی بوو بە تەقە. حەمە عەلی‌و کۆمەڵێك پێشمەرگە هەر لە سەر ئەو گردە بوون. لە وێ دانیشتبوون. ئەو جادەیە بە پشتی ئەو گردەدا دەڕۆیشت، کە ئەوانی لێ دانیشتبوون هەر بە پشتی ماڵەکانەوە بوون."

وتم:

خۆ کەس نەکوژراوە."

وتیان:

" -با جەزا خۆی‌و سێ پێشمەرگە کوژراون."

ئیتر نەمدەزانی تازە چی بڵێم؟ کارەساتەکە رووی دابوو. پێم وتن:

" -باشە من چیم پێ وتن؟ نەموت ئەگەر عوسمان خۆشی هات، لە جاران زیاتر رێزی لێ بگرن. لەبەر چی تەقە لە سەیارەی عوسمان دەکەن. ؟ "

ئیتر ئەو برادەرانەی پارتی خۆیان هاتن بۆ لام وتیان:

" -کاك ئاوات بە خوا ئێمە خۆمان لێرە بووین. لەگەڵ برادەرانی ئێوەدا بە یەکەوە بووین. خەتای جەزایە چووە بە ئوتومبیلەکەی عوسمانی قادر منەوەر پیاسە ئەکات. ئەمە موئامەرەیە عوسمان لێی کردووە."

وتم:

" -خەتای جەزا ناگرم. خەتای ئەو برادەرانەی ئێمەیە، کە تەقەیان لەو ئوتومبیلە کردووە. ئەگەر عوسمانیش بێت. خۆ ئێمە لەگەڵ عوسماندا هیچمان نییە."

پێم وتن:
" –باشە ئێوە لێرە بوون. من لێرە نەبووم. ئەمەوێت ئێوە خۆتانو ویژدانی خۆتان. چۆن بووە واباسی بکەن بۆ برادەرانی خۆتان."
وتم:
" –خۆزگە لێپرسراوێکی خۆمان بوایە. هەرگیز ئەوەندەم پێ ناخۆش نە ئەبوو."
بە راستی ئەو روداوە، ناخۆشترین روداو بوو، کە نە دەبوو رویدات، چونکە منو جەزا یەکتریمان نەدەناسی. هیچیش لە نێوان ئێمەو پارتی دا نەبوو. ئەوان وتیان:
" –ئێمە وەك پارتی ئاگامان لێبووە، کە روداوەکە بە رێکەوت بووە. تۆش ئەتوانیت لەگەڵ برادەرانی خۆت قسە بکەیت، کە چۆن بووە. بۆ ئەوەی دوژمن سود لەم رووداوە وەرنەگرێت، بە جۆرێك گەورەی بکەن، نێوان یەکێتیو پارتی تێك بدەن. وتم:
" –ئێوەش وەك ویژدانی خۆتان بۆ دوا رۆژ شاهیدبن."
دوایش نامەم بۆ کەریم کانی ساردی لێپرسراوی عەسکەری پارتی نوسیو بە برادەرەکانی خۆیاندا بۆم نارد. پێم وتن:
" –لیژنەیەك دروست بکەین بۆ لێکۆڵینەوە لە روداوەکە."
ئەو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵ جەزادا کوژرا بوون، یەکێتی بوون. یەکێکیان ئامۆزای خۆم بوو. بە ناوی (فازیل) لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا، ناخۆشترین رووداو بوو لام. چەندەها جاریش داوام کردووە لیژنەیەك پێك بێنن بۆ لێکۆڵینەوە لەو روداوە، بەڵام هەر گوێیان نەداوەتێ. هەتا ئێستا هەر بە هەڵە باسی لێوە دەکەن. لە هەمان سەعاتیشدا، نامەم بۆ مەلا بەختیار ناردووە دەربارەی روداوەکەو بۆم باسکردووە، کە چۆن رویداوە. هەر ئەو شەوە، کاك رەفعەتی مەلا، ئەندام مەڵبەند لە بارلو بوو. هاتە خوارەوە بۆ لام. پێکەوە شەو چووینە گوندی چنگیان. لە وێشەوە دووبارە نامەیەکمان بۆ مەلا بەختیار ناردەوە، کە ئاگادار بێت لەگەڵ لێپرسراوانی پارتیدا گفتوگۆ بکا دەربارەی رووداوەکە، کە چۆن بووە. هەم هێزەکانی خۆمان ئاگادار بکاتەوە بۆ ئەوەی وریا بن. لە هەمان کاتیشدا دوو نامەی دوورو درێژم بۆ برادەرانی پارتیش نارد. ئەو کاتە کەریم کانی ساردی لەوێ بوو، زۆر بە ناشرینی وەڵامی نامەکانی دەدایەوە. من هەر بە دۆستایەتی وەڵامی نامەکانیم دەدایەوە. هەر بۆ بەیانی لەگەڵ (ح. س. ك) دا یەکیان گرت بۆ ئەوەی شەڕی ئێمە بکەن. من هەموو هێزەکانی خۆمانم کۆکردەوە، چووینە دەوروبەری گوندی (باراو)و گوندی (چنگیان) لەگەڵ کاك رەفعەتی مەلادا بە یەکەوە بووین. هەموو کاتێك پەیوەندیمان دەکرد بە مەلا بەختیارەوە، هەتا دوو رۆژ دوای ئەو روداوە. رۆژێك مەلا بەختیار نامەیەکی بۆ ناردم وتی:
" –ئەوە پارتی زۆر بە نامەردانە چوون کەمینیان بۆ برادەرانی تیپی (٣١) داناوە. (٩) پێشمەرگەیان شەهید کردووە. ئەوان دووژمنایەتی ئێمە ئەکەن. خۆ ئەگەر ئەتوانیت تۆ

له دیوی خۆتانەوە لێیان بدەن. ئەو پێشمەرگانەیان زۆر بە نامەردانە شەهید کردووە، بە بێ ئەوەی ئاگایان لە هیچ بێت."

لە گوندی چنگیان بووین، پێشمەرگەکانم کۆکردەوە وتم:

" -تازە وەزعەکە وای لێهاتووە. ئەوە نامەی مەلا بەختیارە، ئەڵێت ئەگەر بۆتان ئەکرێت لێیان بدەن."

خۆ ئەگەر ئێمە شەڕی ئەوانمان بکردایە، بە ئەوان‌و بە (حسك)یش بەرگری دوو سەعاتیان پێ نەدەکرا. من زۆرم پێ ناخۆش بوو. حەزم بە شەڕی ناوخۆ نەدەکرد، چونکە ئامانجمان خەبات بوو بۆ کوردایەتی. بڕوام بە شەڕی کورد بە کورد نەبووە. سەیرمانکرد ئەوانیش هەموو کۆبونەتەوە، بەرەو گوندی (باراو) بۆ ئەوەی مقەڕەکەی ئێمە بگرن‌و بیسوتێنن. دیاربوو ئەوان لای خۆیانەوە بڕیاری شەڕیان دابوو. ئێمەش بەرەو (نۆدێ) دەڕۆیشتین لە گورگەیەر بە یەك گەیشتین‌و بوو بە شەڕ. شەڕەکە دوو سەعاتی نەخایاند. بەرەو گوندی عازەبان راومانانان. لە وێشەوە بەرەو (دوکانیان) چوونە بەردەمی رەبایەکانی گۆیژە. شەو هات بە سەرماندا، نەچووین بە دوایاندا. ئیتر هەموو مقەڕەکانمان گرتن. ناوچەکەمان لێ پاککردنەوە. هەموو خەڵکی گوندەکان بێزار بوون لێیان. لە رۆژێکدا پێشمەرگەی ٣-٤ لایەنی جیاواز دەچوونەماڵیان. هەر لەو چوار پێنج گوندەدا، ئەو هەموو حیزبە هەبوو. یەکێتی، پارتی، حسك، حیزبی شیوعی. بۆ شەوەکەی گەڕاینەوە لەگەڵ کاك رەفعەتی مەلادا نامەیەکمان نوسی بۆ مەلا بەختیار، لە بارەی شەڕەکەوەو راونانیان بەرەو سلێمانی. بۆ بەیانی چووم بۆ لای‌و رودلوەکەم بە ووردی بۆ گێڕایەوە. زۆر دەست خۆشی لێ کردین‌و وتی:

بە راستی تۆڵەی ئەو پێشمەرگانەتان لێکردنەوە، کە بە ناحەق شەهیدیان کردبوون. دوای ئەوەی، کە ئێمە لە ناوچەکانی خۆمان دەرمان کردن، گەڕابوونەوە بۆ سەر سنوورەکان، بۆ ناوچەی شلێر. ئەو کاتە هەموو هێزەکانی (پ،د،ك)و (ح،س،ك) لەو ناوچەیە کۆبووبوونەوە.

زۆری پێ نەچوو (پ. د. ك)و (ح. س. ك) هێزێکی زۆریان کۆکردەوە بۆ سەر مەڵبەند. ماوەی چەند رۆژێ (حیزبی شیوعی) لە بەینابوو، بۆ ئەوەی شەڕەکە روونەدا. ئەوان هەر سوور بوون لە سەر شەڕ کردن. هەموویان لە دەورو بەری گوندی (دەرەمیانە)و گوندی (سەر خوان)و ناوچەی (موبڕە)و (مامە خەلان)و بەرامبەری (پاڕەزان)و (دۆڵ پەموو) بوون. ئێمەش هەموو تیپەکانی سنوری مەڵبەندی یەك کۆبووینەوە. (١٥)ی شارەزور حامیدی حاجی غالی (١١)ی هەورامان شەوکەتی حاجی موشیر. کاکە حەمەی فەرەج لە قۆڵی (ڕەزەڵە)وە بەرەو دەرمیانە. کاك مستەفا چاو رەش لەگەڵ تیپی (٥١)ی گەرمیان‌و تیپی (٣١)ی بەرزنجە، ئەوان لە قۆڵی (موبڕە)و (مامە خەلان)ەوە. ئێمەش تیپی (٣٣)ی سلێمانی‌و تیپی (٥٧)ی سەگرمە، چووینە (دۆڵ پەموو) لای ئەبوو شەهاب. ئەو کاتە لێپرسراوی رێکخراوی کۆمەڵە بوو. بارەگایان لە وێ بوو.

ئێمەیان دانابوو لە ناوەڕاستەوە پەلاماریان بدەین. بەرامبەری دۆڵ پەمووو سەرخوار بوو. شەڕ بەم جۆرە دەستی پێکرد:ئێمە لە ناوەڕاستەوە پەلامارماندان، منو وەهاب هێزەکەی خۆمانکرد بە دوو بەش، بەشێکی لای وەهاب مایەوە لە دۆڵ پەموو. باقی هێزەکە لەگەڵ من هات. شەو لە تەنکە بوار پەڕینەوە. پشتی ئەو هێزەی گوندی سەرخوارمان گرت، کە بەرامبەر دۆڵ پەموو بوون. ئەوە هێزی سەرەکیان بوو. بە هەموو چەکە قورسەکانیان، کە دۆشکەو هاوەن بوو، قەسفی دۆڵ پەمووو پاڕەزانیان دەکرد. مەلا بەختیار بۆ خۆی لەگەڵ عەدەد جیهازی مەڵبەندو مەفرەزەکەی خۆی، لە سەر شاخی حاجی مەمەند بوو. هەموو جیهازی بچوکیان پێ بوو. منو کاك وەهاب یەك دانەمان پێ بوو، لای خۆم بوو. هێزی یەکەم، خۆم بووم چووم بۆ شەڕکە. کاك وەهاب هێزی دووەم بوو. لە هەموو جەبهەکانەوە شەڕ دەستی پێ کرد. یەك ڕۆژ مقاوەمەیانکرد. بۆ بەیانیەکەی شکان بەرەو گوندی (بەیانە)و (دەرەمیانە)و ناوچەی (شلێر) دوایان کەوتین. لە پشتی (سەر خوار) لەگەڵ هێزی دووەم، کە وەهاب بوو، یەکمان گرتەوە. شەڕ نەمابوو بەرەو دەرەمیانە دەڕۆیشتین. لەو کاتەدا گوێم لێ بوو، مەلا بەختیار هاواری دەکرد:

" -دەست خۆش لێیان دەن."

بێ ئەوەی بزانێت شەڕەکە چۆنە. جیهازەکە بە من بوو. مەلا بەختیار وتی:

" -ئەمەوێت لەگەڵ کاك وەهابدا قسە بکەم."

منیش جیهازەکەم دا بە وەهاب وتم:

" -مەلا بەختیار ئەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات."

منو وەهاب بە یەکەوەین، گوێم لێیە دەڵێ:

" -کاك وەهاب گیان دەست خۆش. هەردوو تیپەکە بکە بە یەكو خۆت قیادەی بکەو لێیان دەن."

ئەو کاتەی ئەو وای دەگوت، شەڕ نەمابوو. پارتی بە ڕێوە بوون بەرەو شلێر. ئێمە بە پیاسە بەرەو دەرەمیانە دەڕۆیشتین. ئیتر هەموو هێزەکان لە دەرەمیانە یەکمان گرتەوە. وەهاب خۆی زۆری پێ ناخۆش بوو، کە مەلا بەختیار ئەو قسانەی کرد وتی:

" -گوێ لەم کابرایە بگرە. هەر لە خۆیەوە قسە ئەکات، بە بێ ئەوەی ئاگای لە هیچ بێت."

منیش وتم:

" -گوێ مەدەرێ چی ئەڵێت با بیڵێت."

من ئەمەی ئەی نوسم ڕاستیەو وەهاب بۆ خۆی ماوەو شاهیدی ئەو قسانەیە.

دوای شەڕەکان، هەر خۆی لیژنەیەکی پێك هێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕوودلوەکە. ناردی بۆ گوندی گورگەیەر ئەو شوێنەی ڕوداوەکەی تیا ڕووی دابوو. وتم:

" –هەموو تیپەکە کۆبکەرەوە بە لێپرسراوو پێشمەرگەوە. من هەر نایەم. خۆتان بچن تەحقیق بکەن، بزانن من چیم بە ئامر کەرتو پێشمەرگەکان وتووە."

لیژنەیەك پێك هاتبوو لە (حەمەی فەرەج) لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەند، (مامۆستا ساڵح) لێپرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی، کاك (کەمال عەلی) لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە، دڵنیا نیم بۆ ئاسۆی شێخ نوری، وابزام ئەویشی تیابوو. چوون بۆ گوندی گورگەیەر بۆ لێکۆڵینەوە. ئیتر خۆیان تەحقیقیان کردبوو لەگەڵ ئامرکەرتەکانو رابەر سیاسی تیپ، کە چۆن بووەو منیش چیم پێ وتوون. دوای ئەوەی، کە لیژنەکە لە تەحقیق کردن تەواو بوون، کاکە حەمەی فەرەج لێپرسراوی لیژنەکە بوو وتی:

" –کاك ئاوات ئەوەی، کە ڕوویداوە هیچ پەیوەندیی بە تۆوە نییە. تەنها هەڵەی ئەو پێشمەرگانە بووە، کە ئیشەکەیان کردووە. تۆش لە وێ نەبوویت. بە گوێرەی قسەی ئامر کەرتەکان تۆ هیچت پێ نەوتوون. ئەو پێشمەرگانە بێ هیچ ڕێنماییەك، سەر بە خۆ ئەو کارەیان کردووە."

وتی:

" –ئەچینەوە بۆ مەڵبەند، ئاگاداری سەرکردایەتی ئەکەین، کە ئەو ڕوداوە پەیوەندی بە تۆوە نیە."

ئەوە تەواو بوو، کە من هیچم لە سەر نیە.

٦٦

شەڕ تەواو بوو پارتیو سۆشیالیست شکانو پەڕینەوە بۆ ئێران. تەنها حیزبی شیوعی لە ناوچەکەدا مانەوە. ئەو کاتە مەلا بەختیار پەیوەندی زۆر باش بوو لەگەڵیاندا. من پێم وایە هەر لە دژی سەرکردایەتی بوو. ئەگینا لە دڵسۆزییەوە نەبوو. ئینجا مەلا بەختیار کەوتە بیانوو گرتن لە من. لەم لاو لا، نەك بەرەو ڕوو. نازانم بۆ چی؟ دوو جار حەمەی فەرجی ناردبوو بۆ لام وتبووی:

" –بچۆ پێی بڵێ با خۆی نقڵ بکات بۆ جێگایەکی تر. منیش وتم:

" –کاکە حەمە بۆ چی خۆم نقڵ بکەم، تۆ خۆت لێپرسراوی عەسکەری ئێمە نیت؟ پێم بڵێ لە سەر چی خۆم نقڵ بکەم.؟"

وتی:

" –کاکە گیان مەلا بەختیار ئەڵێت، ئاوات نابێت لە سنوری ئەم مەڵبەندە بێت. ڕازی نیەو پێی خۆش نیە تۆ لێرە بمێنیتەوە."

وتم:

" –بۆ لای تۆ باسی ناکات لە سەر چیە.؟"

وتی:

" -ئەو هەر ئەڵێت بە کەڵکی ئێرە نایەت. پێم وایە سەرکردایەتیشی ئیزعاج کردووە بۆ لابردنت، چونکە مام جەلال بە منی وت ئاوات چیەتی وا مەلا بەختیار لە سەری ئەنوسێت؟ منیش وەڵامم داوەتەوە، کە ئەوەی مەلا بەختیار لە سەر کاک ئاوات باسی دەکات، هیچی راست نیە. ئەو بۆ خۆی رقی لێیەو حەز ناکات لەم سنورەدا بێت. نازانم چی کۆنیان لە نێواندا هەیە."

جارێکی تر کاک حەمەی فەرەج هاتەوە وتی:

" -کاکە گیان پێم ئەڵێت ئەچیت لای بەریت، یان خۆم ئەچم.؟"

منیش وتم:

" -کاکە حەمە فەرموو، ئەوە خۆتانو تیپەکەتان، با مەلا بەختیار بۆ خۆی کێ بە باش ئەزانێت دای بنێت. مادەم تۆ هاتوویت ئەوە هەموو تیپەکەت بۆ کۆ ئەکەمەوە، بەڵام حەزم ئەکرد خۆی بهاتایەو جەنابتی نەناردایە."

چونکە من زۆر رێزی کاکە حەمەم لابوو. وەك برا گەورەی خۆم حسابم بۆ دەکرد. هەموو تیپەکەم لە بن دارو شەخسەکەی گورگەیەردا کۆکردەوە بە لێپرسراوو پێشمەرگەوە. کاکە حەمە زۆر قسەی بۆ کردن وتی:

" -ئەوە کاك ئاوات لە بەر بەرژەوەندی شۆڕش نقڵ ئەبێت بۆ جێگایەکی تر."

پێشمەرگەکان بە جارێك لە کاکە حەمە هەڵسان وتیان:

" -بۆ، کاك ئاوات ئەگەر لێرە بێت شۆڕش زەرەر ئەکات؟ ئەبێت پێمان بڵێن بۆ چی.؟"

منیش پێم وتن:

" -کاکە گیان ئەوە پەیوەندی بە خۆمەوەیە، کە بەرگری لە خۆم بکەم بۆ چی نەقڵم ئەکەن؟ من رازیم نەقڵ بم."

ئەوانیش وتیان:

" -ئێمەش وەك پێشمەرگە، مافی خۆمانە بپرسین. با بزانین."

وتم:

" -ئەوە لە کاکە حەمە بپرسن."

کاکە حەمەش زۆر باسی سیفاتی باشی کردم، دوای ئەوە وتی:

" -مەڵبەند بە باشی ئەزانێت، کاك ئاوات نقڵ بکات بۆ جێگایەکی تر."

بە جارێك هەموو پێشمەرگەو لێپرسراوەکان چەکیان داناو وتیان:

" -باشە کاکە حەمە گیان، ئەوە خۆتانو چەکەکانیشتان. بیانبەرەوە بۆ مەڵبەند. ئێمەش بە بێ چەك ئەچین بۆ سەرکردایەتی. ئەگەر ئەوانیش گوێیان نەگرت، بۆ خۆمان هەموو ئەچینەوە ماڵی خۆمان."

کە وایانکرد، من خۆم زۆر بە لامەوە سەیر بوو! لە لایەکەوە پێم ناخۆش بوو، نەوەك وابزانن من بۆ خۆم وام فێرکردوون. لە لایەکی تریشەوە پێم خۆش بوو، ئەو

پێشمەرگانە ئەوەندە دڵسۆزی من بوون‌و ناحەقی قبوڵ ناکەن، چونکە ئەوانیش دەیانزانی، کە مەلا بەختیار منی خۆش ناوێت. ئەگینا نەقڵی ئاسایی بوایە، رەنگە بەو شێوەیە نەبوایە. کاکە حەمە، کە وەزعەکەی دی، حەپەسا! پێی ناخۆش نەبوو، چونکە دەیزانی ئەوە ناحەقیە مەلا بەختیار لە منی دەکات. زۆر سوپاسی کردن وتی:

" -زۆر سوپاسی ئێوە ئەکەم بۆ هۆشیاریتان دەربارەی هاورێکانی خۆتان. من زۆرم پێ خۆشە، کە ئێوە کاك ئاواتتان ئەوەندە خۆش ئەوێت‌و ئەوەندە بڕواتان پێیەتی. کاك ئاوات با هەر لە جێی خۆی بمێنێتەوە، من ئەچمەوە بۆ مەڵبەند، ئەمە باس دەکەم، کە وەزعی تیپ چۆنە. ئەگەر مەلا بەختیار هەر سور بوو، من بۆ خۆم لەگەڵ سەرکردایەتی باسی ئەکەم."

گەڕایەوە بۆ حاجی مەمەند، بۆ مەڵبەند. ئیتر نازانم کاکە حەمە ئەوەی بۆ سەرکردایەتی باسکرد یان نا. مەلا بەختیار هەر سور بوو وتبووی:

" -خۆم ئەچم لای ئەبەم. هەر پێشمەرگەیەکیش یان لێپرسراوێك قسە بکات، هەر دەری ئەکەم."

کە ئەوەیان پێ وتم، ئیتر زانیم ئەوە لە مەسەلەی سیاسەت دەرچووە. دژایەتی شەخسییە. وتم:

" -با بێت لامبەرێت. ئەوە من لە شوکێ دانیشتوم، ئەوەش تیپەکەیە."

پێشمەرگەکانم کۆکردەوە، قسەکانی مەلا بەختیارم بۆ گێڕانەوە، کە چی وتووە. وتم:

" -دیارە ئەوەی ئەو ئەیکات لە بەرژەوەندی شۆڕش نیە. ئەیەوێت قسەی خۆی بەرێتە سەر، کە بڕیاری داوە من لە مەڵبەند لابەرێت. ئێوە گوێ مەدەنێ. ئەوە بەینی من‌و مەلا بەختیارە."

مەلا نەهات. دیاریوو دەیزانی بارودۆخەکە چۆنە. زۆری پێ نەچوو، کۆبونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی دەستی پێ کرد، لە (دۆڵی بالیسان) مەلا بەختیار لە رۆشتنیدا بۆ سەرکردایەتی، نامەیەکی بۆ (شۆڕش ئیسماعیل) ناردبوو. لە نامەکەیدا دەڵێ:

" -بە دڵنیاییەوە پێت ئەڵێم، لەمەو دوا تۆ سەرتیپی سی‌و سێیت. وا من ئەڕۆم بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی. یان خۆم نایەمەوە، یان نابێت ئاوات سەرتیپ بێت. من دڵنیام هەر ئەو لا دەبەن. تۆ لە ئەمڕۆوە خۆت بە سەرتیپی ۳۳ بزانە."

کاك شۆڕش نامەکەی بۆ خۆم هێنا. ئەو وایدەزانی من‌و کاك شۆڕش ناکۆکین. کاك نەوشیروان خۆی دەزانێت، من لە سەرکردایەتی خۆم بە زۆر کاك شۆڕش ئیسماعیلم کرد بە جێگری سەر تیپ. من کاك شۆڕشم زۆر خۆش دەویست. ئیتر نازانم ئەو لای مەلا بەختیار چی وتووە، وا مەلا بەختیار ئەو نامەیەی بەو شێوەیە نوسی بوو. کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی دەستی پێ کردبوو. بە داخەوە لە کاتی کۆبوونەوەکاندا، مامۆستا جەمال تایەر بە روداوی ئۆتومبیل شەهیدبوو. ئەوە کارەساتێکی زۆر ناخۆش بوو. زیانێکی گەورەبوو لە یەکێتی‌و لە کۆمەڵە کەوت. مامۆستا جەمال تایەر، زۆر

پیاوێکی ئازاو قارەمان بوو. زۆر لێهاتوو لێزان بوو بۆ ئیشوکاری ڕێکخستن. هاوڕێی دڵسۆزم بوو. زۆرم خۆش دەویست. ئەو هەواڵە زۆر ئازاری دام، کە لە ڕێی (ئیزاعە)کەوە گوێم لێ بوو. ئەوەش نەگبەتیەکی تری کورد بوو.

هەر، کە کۆبوونەوەکان تەواو بوو، بڕیاریان دابوو، کە لام بەرن. مەلا بەختیار هەر لە وێوە جوابی بۆ برادەرانی خۆی ناردبوو، کە ئاوات لە تیپی (٣٣) لابراوە. وەك ئەوەی ئاوات سەرۆکی جمهوری بێت‌و بە لابردنی گۆڕانکارییەکی گەورە بە سەر وولاتدا بێت.

هاتن پێیان وتم:

" -لایان بردوویت."

منیش وتم:

" -گرنگ نیە، چونکە ئەوە بڕیاری سەرکردایەتی یە، نەك مەلا بەختیار. ئیتر مەلا بەختیاریش خۆی‌و خوای خۆی چی وتووەو چی کردووە. هەر خۆی‌و سەرکردایەتی ئەیزانن."

دوای یەك هەفتە وتیان:

مەلا بەختیار هاتۆتەوە، وا لە مەڵبەند. لابراوەو کاك بەکری حاجی سەفەریان داناوە."

من هەر لە مقەڕەکەی خۆمان لە شوکێ دانیشتبووم. کاکەبرا بە کەرتەکەیەوە لە وێ بوو. ڕۆژێك لە مقەڕ دانیشتبووم، منداڵەکانم لە وێ نەبوون، چووبوونەوە بۆ سلێمانی. لە پڕ ئەوەندەمزانی چوار پێنج ئوتومبیل، خۆیانکرد بە ناو گوندی شوکێ دا. مەلا بەختیار هێزێکی کۆکردبۆوە لە جەباری عەلی عەوێزو ئەوانەی لای خۆی. من جەبارم دەرکردبوو لای خۆمان. زۆریان خۆش نەدەویستم. هەموویانی کۆکردبۆوەو هێنابوونی. هەر، کە گەیشتن، کۆڵان‌و سەر سوچی ماڵەکانیان گرت. وایان دەزانی شەڕ دەبێ. نەیاندەزانی من هەر بە خەیاڵمدا نایەت‌و بە لامەوە گرنگ نییە، چونکە پێش خۆیان، من هەر لە ماڵەوە دانیشتبووم. خۆم دەمزانی لە سەرکردایەتی لایان بردوم. پێش ئەوەی ئەو بگەڕێتەوە، خۆم وازم هێنابوو. لە ماڵەوە دانیشتبووم. ئامر کەرت‌و پێشمەرگەکان منیان هەر بە لێپرسراوی خۆیان دەزانی. هەر دەهاتن بۆ لام. مەلا بەختیار هەر پێی خۆش بوو خۆی پێم بڵێت لەمەولا تۆ سەرتیپ نیت‌و لابراویت. ئەگینا چ پێویستی دەکرد لە مەڵبەندەوە هێز لەگەڵ خۆی بێنێت‌و بێت. کاکەبرا پیاوێکی گورج‌و گۆڵ بوو، یەکسەر هەموو پێشمەرگەکانی دابەشکرد. پێم وتن:

" -هەر گوێشی مەدەنێ. خۆتان تێك مەدەن. ئەوان بە خۆڕایی خۆیان شپرزە کردووە."

کاکە برا وتی:

" -ئاخر لەوە ئەچێت خەیاڵیان خراپ بێت وا ئەمانەی لەگەڵ خۆی هێناوەو دامەزراون."

وتم:

" –له خۆیان ولیه من جەبهەم لێگرتوون."
وتی:
" –جا ئەگەر ئێمە جەبهەمان لێبگرتایە، ئەمان ئەمێشت بێنە ناو دێ."
وتم:
" –ئەوە ئیشی مەلا بەختیارە، هەر ئەوەندەی لێ ئەزانێت."
هاتن بۆ مقەڕەکە. منیش لە بەریان هەڵسام‌و وتم:
" –فەرموون."
کاک ئاوات عەبدولغەفوور‌و کاک ڕەفعەتی مەلای لەگەڵ بوو. وتم:
" –کاکە برا چایەکیان بۆ لێ بنێ."
مەلا بەختیار توانجێکی لە کاکەبرا دا وتی:
" –ئەوە ئەڵێی نیازتان خراپە، وا خۆتان ئامادە کردووە."
کاکەبراش وتی:
" –ئێمە هەر دایم ئامادەین. نەك بۆ ئێوە هەر، کە بەیانی لە خەو هەستاین، خۆمان بەستووە."
دوای چا خواردن، مەلا بەختیار وتی:
" –ئەمانەوێت چەند سەعاتێك لەگەڵ برادەران دابنیشین."
وتم:
" –جا ماڵی خۆمان کەسی لێنیە، بچنە ئەوێ."
بردمن بۆ ئەوێ. خۆی‌و ئاوات عەبدولغەفوور‌و ڕەفعەتی مەلاو شۆڕش ئیسماعیل چوار پێنج قۆڵی دانیشتن. بە منی وت:
" –ئەگەر زەحمەت نەبێت، نابێت خۆت لێرە بیت."
وتم:
" –باشە."
چوومە دەرەوە بۆ مقەڕ. لە وێ لەگەڵ پێشمەرگەکان دانیشتم. زۆری پێ نەچوو، ناردیان بە دوامدا، کە چووم، مەلا بەختیار دەستی کرد بە قسەکردن. کەوتە باسی ئەوەی، کە گوایە مام جەلال‌و کاك نەوشیروان منیان لابردووە لە سەرتیپی‌و ئەویش زۆر دیفاعی کردووە. ئەوان هەر سور بوون لە سەر لابردنی من. ئەو زۆری پێ ناخۆش بووە. گوێیان لێ نەگرتووە. وتی:
" –غەدریان لێکردوویت."
کە قسەکانی تەواو کرد وتم:
" –تەواو.؟"
وتی:
" –بەڵێ."

وتم:
" -من یەك پرسیارم هەیە."
وتی:
" -فەرموو."
وتم:
" -لە سەر چی منیان لابردووە.؟"
وتی:
" -لە سەر رووداوەکەی جەزای عەلی کاتب."
وتم:
" -باشە ئەوە چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەبوو.؟"
وتی:
" -من زۆر دیفاعم لێکردویت. ئەوان هەر سور بوون لە سەر ئەوە."
وتم:
" -خۆ لە سەر هیچی تر نەبووە.؟"
وتی:
" -جا کێ ئەتوانێت لە سەر تۆ هیچی هەبێت. هەر لە سەر ئەوە بووە، بەڵام من زۆر دیفاعم لێ کردویت."
منیش وتم:
" -مادەم وابوو، من بۆ خۆم شانازی بەو لابردنەوە ئەکەم. سوپاسی تۆش ناکەم، کە دیفاعت لێ کردوم. ئەگەر بمبەن بۆ ژووری ئیعدام، بە تکایەکی جەنابت رزگارم بێت، خۆم ملی پێوە ئەکەم."
وتی:
" -جا ئەوە رەئی خۆتە."
وتم:
" -تەواو."
وتی:
" -بەڵێ. ئیتر تۆ سەر تیپی (٣٣) نیت."
وتم:
" -لەو رۆژەوەی لابراوم، من سەر تیپ نیم."
وتی:
" -بێ زەحمەت مۆرەکەمان بدەنێ."
وتم:
" -فەرموو."

هەر لەوێدا دای بە شۆڕش ئیسماعیل. وەعدەکەی خۆی بردە سەر، چونکە وەعدی بە شۆڕش دابوو. ئەوان گەڕانەوە بۆ مەڵبەند. من لە ماڵی خۆم دانیشتم لە شوکێ. دەیویست ئەو مقەڕەش لاببات. لە بەر ئەوەی من لە وێ بووم. پێی وتن:

" -مقەڕەکەش بگوێزنەوە."

وتم:

" -جا بۆ نایگوێزنەوە."

نازانم بۆ چی دەیویست ئەو مقەڕە لاببات لە وێ؟ خۆ مقەڕی من نەبوو. من مەفرەزەی خۆم لەگەڵ بوو. ئەوانەی باسم کردووە، هەمووی راستیەو یادگاری رۆژانی پێشمەرگایەتیمە. تێنەگەیشتم مەلا بەختیار بۆ رای وابوو لە سەرم. لە کاتێکدا منو ئەو، خۆشەویسترین هاوڕێی یەکتری بووین، لە رۆژانی سەختو ناخۆشیدا. لە رۆژانی خەباتی نهێنی ناو شاردا، لە ژێر رەحمەتی بەعسدا بە یەکەوە بووین. هەموو خراپی من لەگەڵ مەلا بەختیار ئەوە بوو، لە کۆنفرانسی یەکەمی کۆمەڵەدا، رەخنەم لێ گرتووە. ئیتر من هیچ شتێکم لەگەڵ ئەودا نەبوو.

## ٦٧

رۆژێ پێشمەرگەیەك لە مەڵبەندەوە هات بۆ لام، بروسکەیەکی مام جەلالی بۆ هێنام. داوای کردووە دەڵێ:

" -بە پەلە وەرە بۆ سەرکردایەتی."

بە راستی منیش نەمویست بچم، چونکە زۆر لێیان زویر بووبووم. زۆر لە برادەران پێیان وتم:

" -کاك ئاوات بۆ ناچیت بزانی چیە.؟"

وتم:

" -تازە بۆ بچم؟ خۆ ئەوان بڕیاری خۆیان داوە. ئەبوایە پێش ئەوەی بڕیار بدەن، بیان ناردایە بە دوای مندا. نەك لە سەر قسەی مەلا بەختیار بڕیار بدەن."

وتیان:

" -بچۆ، حەز ئەکەیت ئێمەش هەموو تیپەکە لەگەڵت دێین."

وتم:

" -مادام وایە، من بۆ خۆم دەچم. ئێوە بۆ چی دێن.؟"

لەگەڵ (١٤) پێشمەرگەی مەفرەزەکەی خۆمدا، بە رێکەوتم. ئەو کاتە سەرکردایەتی لە (خەتێ) بوو، لە دۆڵی بالیسان. بە چوار رۆژ گەیشتین. ئێوارە بوو، گەیشتینە ئەوێ.

هاوین بوو بەرەو پایز دەچوو. مام جەلال لە سەرو دێکەوە، لە ناو باخێکدا بوو، کە گەیشتم بە پێشمەرگەیەکم وت:

" –بە مام جەلال بڵێ ئاوات قارەمانی هاتووە."

مام جەلال وتبووی:

" –با بفەرموێ."

کە چووم، یەکسەر هات بەرەو پیرم. زۆر رێزی لێ گرتم. ناردی خێمەیەکیان بۆ هەڵدام، هەر لەو لای خۆیەوە. پێشمەرگەکان چوون بۆ لای سکرتاریەتی مام جەلال. ئێوارەبوو دوای ئەوەی ئیسراحەتمانکرد، ئەوجا کەوتە پرسیار لێم لە وەزعی خۆمو مەڵبەند. منیش وتم:

" –دەربارەی مەڵبەند، خۆتان ئەزانن. منیش بۆ خۆم دانیشتوم. لاتان نەبردووم.؟"

وتی:

" –با، بەلام ئەزانیت بۆچی ناردوومە بە دولتا.؟"

وتم:

" –نەوەلا نازانم."

وتی:

" –ئەمەوێت هەندێك پرسیارت لێ بکەم، دەربارەی رووداوەکەی جەزای عەلی کاتب."

وتم:

" –جا مام جەلال تازە چیم لێ ئەپرسیت؟ ئێوە لە سەر ئەوە منتان لا نەبردووە.؟"

وتی:

" –با، بەلام ئەمەوێت گوێم لە خۆت بێت. بۆم باسکە، بزانم چۆن بووە.؟"

منیش وتم:

" –مام جەلال جا بۆ لە خۆم ئەپرسیت؟ من پێم خۆشە جەنابت لیژنەیەکی تەحقیق بنێریت، ئەوان بچن لە رووداوەکە بکۆڵنەوە. با ئەوان بڕیار بدەن."

وتی:

" –ئاوات من زۆر باوەڕم بە قسەی خۆتە. ئەزانم تۆ پیاوێکی راست گۆیت."

منیش لە سەرەتاوە رووداوەکەم بۆ باسکرد، کە چۆن بووە. کە بۆم گێڕایەوە، مام جەلال زۆری بە لاوە سەیربوو! وتم:

" –هەموو ئامر کەرتەکانو پێشمەرگەکان ئامادە بوون بێن بۆ ئێرە، بەلام خۆم نەم هێشتووە."

وتی:

" –خۆزگە هەر هەموویانت بهێنایە بۆ ئێرە.

وتم:

" –ئەتوانیت جەنابت ئێستا بروسکەیەك بکەیت بۆ مەڵبەند. با لێپرسراوەکان بێن بۆ ئێرە، ئەو کاتە خۆت تەحقیقیان لەگەڵ بکە."

وتی:

" –مەلا بەختیار شتێکی تری باسکردووە."

منیش وتم:

" –مام جەلال من کاتی خۆی بۆم باسکردن، کە مەلا بەختیار حەز ناکات من لە وێ بم. ئەیەوێت شتێکم بۆ دروست بکات. من ناچم، بەڵام جەنابتو کاك نەوشیروان وتتان ناتوانێت هیچت بۆ دروست بکات. ئێمە بە قسەی ئەو ناکەین. ئەی بۆ ئەمەتان بە قسەکرد."

وتی:

" –جا با پێت بڵێم، ئێمە بە قسەی ئەومان نەکردووە. با راپۆرتی ئەو کۆمیتەیەت پیشان بدەم، کە تەحقیقیان لە رووداوەکە کردووە. کە راپۆرتەکەی پیشاندام، بە راستی زۆر بە ویژدان بوون، کە هەر بە لابردنم رازی بوون. وتم:

" –بە راست ئەوە هی ئەوانە.؟"

وتی:

" –بەڵێ، ئەوە هی مەڵبەندە، کە بڕیاری خۆیان لە سەر داوە."

وتم:

" –ماڵتان ئاوا بێت. بە خوا من بۆ خۆشم بومایە، هەر هیچ نەبێت ئەمکردە زیندانەوە."

ئەوەی خراپ بێ، لە راپۆرتەکەدا لە سەر من نوسرابوو. هەموو ئەندامەکانی مەڵبەند ئیمزایان کردبوو. بە راستی، کە ئەوەم بینی، هەر ئاگام لە خۆم نەما. یەکسەر دابەزیمە سەر هەموو ئەندامانی مەڵبەند. مام جەلال وتی:

" –عومەر عەزیز لە کۆبونەوەکاندا بوو، کە مەلا بەختیار ئەو هەموو قسەیەی لە سەر تۆ کرد. ئەویش یەك وشەی لە دەم نەهاتە دەرەوە، بە نا یان بە بەڵێ."

لەو کاتەشدا حەمەی فەرەج لە وێ بوو وتم:

" –کاکە حەمە تۆ خۆت هەم ئەندام مەڵبەند بوویتو هەم لەو لیژنەیەشدا بوویت، کە تەحقیقیان کردووە لە رووداوەکەی جەزای عەلی کاتب. ئەوە ولیە، کە نوسیویانە بۆ سەرکردایەتی.؟"

وتی:

" –مام جەلال ئێمە هیچی خراپمان نەنوسیووە لە سەر کاك ئاوات."

مام جەلال وتی:

" –جا چی ماوە بینووسن."

مام جەلال خۆی راپۆرتەکەی خوێندەوە. کاکە حەمە هەر چاوی بە راپۆرتەکە کەوت وتی:

" -مام جەلال ئەو راپۆرتە هی ئێمە نییە. راپۆرتەکەی ئێمە رەنگێکی تر بوو. ئەو کاغەزە نەبوو. ئەوە هەمووی هی مەلا بەختیار خۆیەتی‌و هی مەڵبەند نیە."

مام جەلال وتی:

" -ئەی ئێوە ئیمزاتان کردووە."

حەمەی فەرج وتی:

" -بە گۆڕی شەهیدان ئەوە هی ئێمە نیەو ئێمەش ئیمزامان نەکردووە."

هەروەها وتی:

" -من ئێستا لێرەم ئامادەم لە باتی هەموو برادەران بۆت ئیمزا بکەم، کە ئەوە نەمەڵبەندو نەکەسی تر ئەوەی نەدیووە. ئەوە مەلا بەختیار خۆی نوسیویەتی‌و لە باتی هەموومان ئیمزای کردووە. من ئامادەم بۆ تەحقیق. بەڵام ئێمە رازی بووین لە سەر ئەوەی نقڵی کەین بۆ ئەوەی لە دەست مەلا بەختیار رزگارمان بێت، چونکە هەموو جارێك ئەیوت:

" -یان من یان ئاوات لەم مەڵبەندە."

وتمان:

" -باشە با سەرکردلیەتی نقڵی بکەن، ئێمەش رازین هەر ئەوەندەمان لە سەر ئاوات نوسیوە. ئەویش لە تاو مەلا بەختیار، چونکە زۆر سور بووە لە سەر لابردنی."

پێم وایە مام جەلال قەناعەتی کرد، کە ئەوەی من ئەیڵێم راستە. ئەو کاتە کاك نەوشیروان لە شەڕ بوو لە دۆڵی خانەقا. بە مام جەلالم وت:

" -ئەچم سەردانێکی کاك نەوشیروان ئەکەم."

وتی:

" -منیش پێم باشە. بۆ کاك نەوشیروانیشی باس بکە."

کاکە حەمەی فەرەج وتی:

" -منیش دێم بە یەکەوە ئەچین."

کە چووین شەڕ نەمابوو. کاك نەوشیوان لە (سەر نەوس‌و بن نەوس) بوو. دوو گوندبوو لە دۆڵی خانەقا. دووسێ رۆژ لە وێ ماینەوە. بۆ ئەویشم باسکرد. کاکە حەمەی فەرەجیش هەر باسی کرد، کە چۆن مەلا بەختیار بە ناوی ئەوانەوە ئەو راپۆرتەی نوسیوە‌و ئەوان ئاگایان لێ نیە. ئیتر کاك نەوشیروان وتی:

" -ئێوە بگەڕێنەوە بۆ (خەتێ) دووسێ رۆژی تر ئێمەش دێینەوە."

من‌و کاکە حەمە گەڕاینەوە بۆ (خەتێ) دوای پێنج رۆژ کاك نەوشیروانیش هاتەوە بۆ خەتێ. ئەو کاتە کاك ملازم عومەر عاجز ببوو. نازانم لە سەر چی بوو. هات عوزرخوایی بۆ هێنامەوە وتی:

" —من زۆرم پێ ناخۆش بوو بۆ روداوەکەی جەزا، بەڵام کە مەلا بەختیار هات بۆی باسکردم، کە تۆ ئاگات لەو روداوە نەبووە. داوای لێبووردنت لێ ئەکەم."

جا ئەو کاتە ملازم عومەر نەچوو بوو بۆ سەرکردلیەتی بۆ کۆبونەوەکان. لە کانی توو دانیشتبوو لە ناوچەی مەرگە. ئەو کاتە ئەویش تازە هاتبوو بۆ سەرکردایەتی. منیش بۆ کاك نەوشیروانم باسکرد، کە مەلا بەختیار بۆچی لە سەرکردلیەتی، ئاوا باسی منی کردووە، کەچی لە گەڕانەوەیدا چووە بۆ کاك عومەری وا باس کردووە، کە من هەر ئاگام لەوە نەبووەو زۆر دیفاعیشی لێکردووم لای کاك عومەر. کاك نەوشیروان وتی:

" —بۆ کاك عومەر وتی چی.؟"

وتم:

" —من ئاگام لە هیچ نەبوو، کاك عومەر داوای لێبوردنی لێ کردم."

وتی:

" —بە راست.؟"

وتم:

" —بە خوا، ئیتر نازانم چی بووە."

وتی:

" —ئەوە، لە سەر ئەوە خیشی کردووە، داوای ئیعدام کردنی تۆو رۆستەمو عەبدولڕەحیمی کردووە."

وتم:

" —بۆ.؟"

وتی:

" —لە سەر مەسەلەکەی جەزا."

وتم:

" —ماڵی ئاوا بێت."

ئیتر کاك ملازم عومەریش لە وێ ئاشتی بۆوە لەگەڵ برادەران. لە وێ مام جەلال پێی وتم:

" —تازە وەهابمان نەقڵ کردووە بۆ تیپی سی‌و سێ، ئەگینا ئەمانگێڕلیتەوە بۆ جێگاکەی خۆت، بەڵام بچۆ بۆ تیپی (٤٧)ی پیرە مەگرون."

وتم:

" —ئەی نابێت هەر بۆ خۆم دابنیشم."

وتی:

" —دانیشتن بۆ تۆ نابێت. ئەبێت بچیت بۆ تیپی چل‌و حەوت."

وتم:

" —باشە. مادام جەنابت پێت باشە، منیش ئەچم."

وتی:
" —چەند پێشمەرگەش نەقڵ ئەبێت، لە تیپی (٣٣) لەگەڵ خۆت ببەبە."
وتم:
" —باشە."
نامەشی بۆ مەڵبەند نوسی وتی:
" —(وا ئاوات نەقڵ بووە بۆ تیپی (٤٧)ی پیرەمەگرون. چەند پێشمەرگە ئەچێت لەگەڵی، با بچێت نەقڵی بکەن لەگەڵید)."

٦٨

کاك نەوشیروان مستەفا لە بارەی روداوەکەی جەزای عەلی کاتب لە کتێبەکەیدا بە ناوی (پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن) کارەساتەکەی باسکردوە، بەڵام راستی مەسەلەکەی نەخستۆتە روو. هەر دەڵێ ئاوات وا دەڵێو مەلا بەختیاریش وا دەڵێ. من نازانم مەلا بەختیار چی بەوان وتووە؟ کاك نەوشیروان لەبەر ئەوەی بۆ مێژوو دەنوسێ، دەبوایە تەئکیدی لە روداوەکە بکردایە. ئەوەی کاك نەوشیروان نووسیویێتی، نووسراوێکی مێژووییە، کە باس لە خەڵکانی ناو شۆڕش دەکات. دەبوو هەموو خەڵێك حەقی خۆی بدایەتێ بە بێ جیاوازی. بە یەك وشە باس لە ئیشەکانی من ناکات، کە چیم کردووە بۆ شۆڕش. باس لە روداوێك دەکات لەو سنورەدا رووی داوە، کە منی لێ بووم، کە ئەو رودلوە چەند پەیوەندی بە شەخسی خۆیەوە بووە، ئەوەندەش پەیوەندی بە منەوە هەیە. لە کاتێکدا پێش ئەوەی ئەو کتێبە دەربکات، من لە ماڵی خۆیان بە ووردی راستی ئەو روداوەم بۆ باسکردووە، لە بەر ئەوەی هەر کەسێك ئەو کتێبەی کاك نەوشیروان دەخوێنێتەوە، دەبێت بزانێت من راستیم وتووە یان مەلا بەختیار. ئێستاش ئەو خەڵکانە لە ژیاندان، کە ئاگایان لە روداوەکە بووەو دەتوانن لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا بکەن.
روداوەکەی جەزای عەلی کاتب، وا لە قەڵەم دراوە، کە شەڕو ناکۆکی نێوان پارتیو یەکێتی، لەو روداوەوە سەری هەڵداوە. کاك نەوشیروان بۆ خۆی بەرەو روو ئەوەی پێ وتووم، بەڵام من بە هەموو گەلی کورد دەڵێم، کە شەڕو ناکۆکی نێوان پارتیو یەکێتی لەو روداوەوە دروست نەبووە. ئەو ناکۆکیە مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە، کە مێژوو شاهیدە. هەر لە سەرەتای دروستبوونی یەکیتیو سەرەتای دەست پێکردنەوەی شۆڕشی نوێو لە سەردەمی شەهید بوونی ئیبراهیم عەزۆو هاوڕێکانی لە مانگی ٦ی ساڵی ١٩٧٦دا، کوشتنی حەسەن خۆشناوو هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٧٧، لە دوای گەڕانەوەی برادەران بۆ ناوچەی تۆکان، کە هەر بە شەڕەوە هاتنەوە. هەروەها کوشتنی شەهید شەماڵو سەربازو شەڕی مەرگەساتی هەکاریو لە ناوبردنی هەموو

هێزی پێشمەرگە بە قاعیدو قەواعیدەوە. شەڕی ناوچەی هەولێر، پاشان شەڕەکانی پشت ئاشان‌و شەڕی دۆڵی خانەقاو شەڕی دیزڵی ساڵی ١٩٧٩و چەندین شەڕو روداوی تر، کە هەموو پێش ساڵی ١٩٨٣ بووە، کە روداوەکەی جەزای تیا رویدا. من لە ژیانمدا شەڕی کوردو کوردم پێ خۆش نەبووەو قەد رام لەگەڵ شەڕی خۆ کوژیدا نەبووە. من ئەو پاکانەیە بۆ کەس ناکەم. تەنها راستیەکان بۆ مێژووی میللەتەکەم باس دەکەم.

٦٩

ماوەیەکی پێ چوو، چووم بۆ تیپی (٤٧)ی پیرە مەگرون. ئەو رۆژەی گەیشتمە ئەوێ، چووم بۆ مەڵبەند لە سەرگەڵو. ئێوارەبوو، چوومە ماڵی کاک مستەفا چاو رەش. ئەو لێپرسراوی عەسکەری بوو. شەو لە وێ مامەوە. بروسکەیەکی سەرکردایەتی بۆ هاتبوو، کە لە رۆژی ئەوەندەی ئەوەندەدا، شەڕ لە نێوان یەکێتی‌و حکومەتدا وەستا. لە خەیاڵمدا نیە چ رۆژێکی ساڵی ١٩٨٤ بوو، کە من چووم شەڕ وەستا. بۆ بەیانی کاک مستەفا چاو رەش وتی:

" -پێویست ناکات من بێم. برادەران هەموو لە من باشتر خۆت ئەناسن. پێویست بە مەڵبەند ناکات. بۆ خۆت بچۆ کۆیان بکەرەوە."

گەڕامەوە چووم بۆ گوندی قزلەر بۆ ماڵی عەلی کەمال، لێپرسراوی دارایی تیپ. کاک مەحمود کۆمەڵە ناسراو بە (خولە کۆمەڵە) لە وێ بوو. سابیر ماوەتی معاون تیپ بوو. هەموو تیپەکەیان کۆکردەوە لە مزگەوتەکەی قزلەرو بە خێرهاتنیان لێکردم. دوای ئەوە منیش هەندێ قسەم بۆ کردن، لە بارەی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتداو دەبێت ئێمە لە کاتی گفتوگۆدا، چی بکەین؟ بە رەسمی شەڕ وەستاوە. هەر، کە شەڕ وەستا، ئێران لە سنوری مەڵبەندی یەك نزیك بۆوە. ئەو جەماعەتەی لە پارەزان‌و سنوری مەڵبەندی یەك بوون، هەموو پەڕینەوە بۆ دەوری مەڵبەندی دوو. رۆژێك وتیان:

" -با برۆینە خوارەوە بۆ دەوروبەری (کانی بەردینە)."

دێیەك بوو کارەبای تیابوو. لە سەرچنارەوە نزیك بوو. لە کاتی شەڕیشدا پێشمەرگە هاتوو چۆی کردووە، بەڵام شەو نەماونەتەوە. کە چووین بۆ ئەوێ ئەو کاتە ئیسماعیلی مەلا عەبدول، ئامر کەرت بوو لە کەرتی شەهید سەلاح. زۆر کەرتێکی رێکوپێك بوو. یەکێك بوو لە کەرتە باشەکانی تیپی (٤٧) ئێوارە لە ماڵێك بووین، من نەمدەناسین، چونکە ئەوە یەکەم جار بوو بچمە ئەو دێیە. بۆ شەوەکەی حەمامیان بۆ داخستین. خۆمان شت، تەنانەت جلەکانیشیان بۆ شتین. قاتێ جلیان بۆ هێنام بە بەرم بچوك بوو. شەو لەو ماڵە مامەوە ئیسماعیل وتی:

" -کاك ئاوات من ئەچم بۆ مزگەوت بۆ لای برادەران. تۆ هەر لێرەبە. وابزانم دوو پێشمەرگەم لابوو. بۆ بەیانی، کە دنیا روناك بۆوە، لە هەر چوار لاوە بوو بە تەقە بۆ

ناو دێ. پیاوانی ڕژێم، شەو هەر چوار دەوری دێکەیان گرتبوو. ئێمەش نەمانزانی بوو. هەر چوار دەوری دێ گیراوە. هەر لای (دۆڵە ڕوت) نەگیرابوو. لە ناو دێکەدا، بوو بە شەڕ. ئیسماعیل هات وتی:

" -کاک ئاوات چی بکەین.؟"

وتم:

" -جارێ هەر لە ناو دێکە شەر ئەکەین، کەس دەر نەچێت."

چونکە ناو ماڵەکان بۆ شەڕو هەلیکۆپتەریش باش بوو. پشتم بەو کەرتەی شەهید سەلاح قایم بوو. پێشمەرگەکانی زۆر ئازابوون. ئیسماعیل بۆ خۆشی زۆر ئازابوو. هەروەها جەزای حەلاو ئامر کەت بوو لای خۆم. هەموویان ئازابوون. ترسم نەبوو. هەلیکۆپتەر هات، ناو دێکەی داگرتەوە. ئێمەش دامانە بەر ئاڕ بیچیو بیکەیسی. شەڕ گەرم بوو. پێشمەرگە هێرشیان بۆ گردەکان کرد. هێزی دوژمن شکا. جاشو عەسکەر ڕایانکرد. پێشمەرگە زاڵ بوون بە سەریاندا. لەو لاشەوە کەرتی حەمە عەلی عوسمانی مەلاو شێخ عومەر هاتن. ئاسۆو مژدە زۆر ئازابوون. ئێمە هێزمان بۆ هات. ئەوانیش شکان. پێشمەرگە دوایان کەوتن، بۆ ناو مەعەسکەرەکانی خێوەتە. بە زۆر گێرمانەوە. شەڕێکی زۆر سەرکەوتوو بوو. جاشو عەسکەرێکی زۆری تیا کوژرا. ئیتر کردمان بە بروسکە بۆ مەڵبەندو سەرکردایەتی، بۆ ئەوەی ئاگاداری ڕژێم بکەن، کە شەڕ وەستاوە بۆ چی هێرش دەکەنە سەر پێشمەرگە؟ دوایی زانیمان ئەوە پیلانی (شێخ جەعفەری پارێزگار)ی سلێمانی بوو. ولیان زانیبوو ئیتر ئێمە ئاگامان لە خۆمان نییە، دەستێکی باشمان لێ بوەشێنن. بە پێچەوانەوە، ئێمە گورزێکی باشمان لەوان وەشاندو یەك پێشمەرگە برینداریش نەبوو. کەچی لە جیاتی دەست خۆشی کاك مەلا بەختیار وتبووی:

" -ئاوات ویستی (مفاوەزات) تێك بداتەوە."

منیش بە کاك نەوشیروانم وت:

" -باشە کاك نەوشیروان ئێمە چیمان بکردایە؟ ئەو هێزە دەوری گرتبووین. خۆ ئێمە نەچووین کەمین بۆ ئەوان دابنێین. ئەوان هاتوونەتە سەر ئێمە، لە ناوچەی خۆماندا."

وتی:

" -دەستتان خۆش بێت."

٧٠

سەرەتا، کە چوومە تیپی (٤٧) پێشمەرگەکانم نەدەناسی. زۆربەی لێپرسراوەکانم دەناسی. کاك جەبار فەرمان ئەو کاتە لێپرسراوی ڕێکخراوی کۆمەڵە بوو لە ناوچەی دوکان. کاك فەرهاد لێپرسراوی کەرتی ڕێکخستن بوو لە سنوری تیپی چلو حەت.

بۆیان باسکردم، کە کام لە لێپرسراوو پێشمەرگە زۆر چاك بووە. باسی سێ برادەریان بۆ کردم (عومەر عەرەب)و (سەلاح کونجرینی) پێیان دەوت سەلاح چاو زەقو (نەوزادی عەبدوڵڵای تەقی) بوو. وتیان ئەمانە زۆر کوڕی چاکن، زۆر ئازان. لە ناو ڕێکخستنەکانی ناو شاریشەوە بە (هیوا سوور)دا نامەیەکی ڕێکخستنیان بۆ هێنام. تیایدا بە خێرهاتنم دەکەن بۆ تیپی چلو حەوتی پیرە مەگرون. ئەوانیش تەئکید لە سەر ئەو سێ برادەرە دەکەنەوە، کە من ئاگام لێیان بێ، چونکە زۆر ئیشی باشیان کردووە لە ناو شاردا.

منیش زۆر بڕوام بە ڕێکخستن هەبوو وتم:

" —باشە، چییان بووێت بۆیان ئەکەم."

کاك فەرهاد وتی:

" —ئەگەر بتوانیت پێشیان بخەیت زۆر باشە."

ئەو کاتە لە کەرتی عەبدولڕەحمان سیتەکی بوون. عومەر عەرەب ئامر مەفرەزە بوو. وتم:

" —باشە."

لەو کاتەدا، جەباری لای کاك نەوشیروان بوو، دەیوویست بچێت بۆ دەرەوە. هەندێك چەکی لابوو. کاتی خۆی هەمووی لە سەر تیپەکانی وەرگرتبوو، کە چوو بۆ دەرەوە دای بەوان. منیش ئەو کاتە بەڵێنم دانێ، کە بیانکەم بە فەرماندەی کەرت. ناوی کەرتم لێنا. عومەر عەرەبمان کرد بە ئامر کەرت. نەوزادمان کرد بە جێگری. ماوەیەك زۆر ڕێکو پێك بوون. ئتر نازانم ئەمانە خەریکی ئەوە بوون، پۆلیسیان دەکوشتو چەکەکەیان دەبرد. دەچوونە سەر خەڵكو پارەیان لێ دەسەندن. ئەوەی، کە عەقڵم نەی دەبڕی ئەوە بوو، کە ئەوان کردبوویان. دیاربوو برادەرانی ناو شار پێیان زانیبوون. بە کاك نەوشیروانو کاك فەرەیدونیان وتبوو، کە چیان کردووە. منیش ئاگام لەوە نییە. ڕۆژێك لە سەرکردایەتیەوە بروسکەیەکیان بۆ کردم دەڵێت:

" —(خۆتو عومەر عەرەبو سەلاحو نەوزاد، وەرن بۆ ئاوەژێ)."

منیش ئەوەم بە لاوە سەیر بوو! بانگم کردن وتم:

" —چیتان کردووە وا لە سەرکردایەتییەوە بانگی منو ئێوەیان کردووە. من هیچ شك نابەم، بەڵام ئێوە چیتان کردووە پێم بڵێن؟ بۆ ئەوەی بزانم ئەگەر شتی خراپتان نەکردبێت چارەسەری بکەین.؟"

زۆر سوێندیان خوارد بە گۆڕی شەهیدان، کە ئەوان ئاگایان لە هیچ نییەو هیچیشیان نەکردووە. وتم دیارە ئاخۆ دەیانەوێت چییان پێ بکەن. هەر دەڵێن ئەمانە ئازان. چووین بۆ مەڵبەند. کاك قادری حاجی عەلی لێ بوو، ئەویش ئەوانی دەناسی. بە تایبەتی سەلاح. ئەویش پێی وتن:

" —چی بووە چیتان کردووە با پێشتر ئێمەش بزانین.؟"

چۆن سوێندیان بۆ من خوارد، ئاواش سوێندیان بۆ کاک قادر خوارد، کە ئاگایان لە هیچ نییە. ئەو کاتە مەحمود کۆمەڵەش هەر لای ئێمە بوو. وتم:

" -کاک مەحمود با بچین بۆ ئاوەژێ بۆ لای کاک نەوشیروان. ناردوویانە بە دوای منو عومەرو ئەواندا. دوایی بۆ خۆمان دێینەوە، شەو لە دوکان دەمێنینەوە. وتی:

" -باشە."

بە یەکەوە رۆشتین. لە پێشدا چووینە لای کاک نەوشیروان. ئەو کاتەماڵەکەی لە ئاوە ژێ بوو. ناوەندی کۆمەڵە لە بەردەمی کانی تودا بوو. کە چووین سەلامان کرد، بە حاڵ جوابی دایەوە. سەیر بوو بە لامەوە! زۆرم پێ ناخۆش بوو. وتی:

" -بچۆ بۆ لای کاک فەرەیدون عەبدولقادر."

کە چووین بۆ ناوەندی کۆمەڵە، لە رێگا کاک مەحمود وتی:

" -ئەوە بۆ بە مۆنی وەڵامی داینەوە؟ سەیری کردین خۆ هەر نەیووت بە خێر نەیەن.؟"

وتم:

" -منیش سەیر بوو بە لامەوە!".

خەریک بوو بگەڕێمەوە نەچم بۆ ناوەند.

کاک مەحمود وتی:

" -تۆ بچۆ بزانە ئیشیان چییە؟ بەس من نایەم خۆ من هەر لەبەر تۆ هاتوم. ئەگینا ئیشم چیە بە ئێرە، کە چووم بۆ ناوەندی، کاک فەرەیدون لە وێ بوو."

کاک نەوشیروان خۆشی هات. هەرسێکمان دانیشتین. منو کاک نەوشیروانو کاک فەرەیدون. کاک نەوشیروان ناوچەوانی دابوو بە یەکدا وتی:

" -ئەوانە خەڵکیان کوشتووە."

وتم:

" -بروا ناکەم، ئەوانە شتی وایانکردبێت."

وتی:

" -بەڵێ کردویانە."

منیش وتم:

" -من پێم وتوون. ئەڵێن هیچمان نەکردووە. ئیتر بڵێم چی بروا ناکەم."

خۆی تورە کرد هەستا. ئەو رۆیشت منو کاک فەرەیدونماینەوە. کاک فەرەیدون وتی:

" -ئەزانی کردویانە.؟"

وتم:

" -بە راستتە.؟"

وتی:

" -بەڵێ خۆشیان بانگ ئەکەم بزانە ولیە یان نا."

بانگی کردن پێی وتن، که چییان کردووه، هەموو وتیان:

" -وایە کردومانە."

ئیتر من حەپەسام! هەر لەوێدا دەستم کرد بە جنێودانیان. پێم وتن:

" -ئەی هیچو پوچانە بۆ یەك هەفتەیە من پێتان ئەڵێم چیتان کردووە؟ ئەو هەموو سوێندە بە گۆڕی شەهیدان ئەخۆن، کە ئاگاتان لە هیچ نییە."

ئیتر بە کاك فەرەیدونم وت:

" -حەقە ئەمانە ئیعدام بکرێن."

چوو بوون پۆلیسێکی هەژاریان لە بەر چەکەکەی کوشتبوو. چوار پێنج منداڵی هەبوو. ئیتر من لای خۆم دەرمکردن. چوونە مەڵبەند. ماوەیەکی کەم زیندان بوون، بەریان دانەوە کردنیان بە ئامر کەرت لە تیپی مەڵبەند. دیسانەوە چووبوونەوە بۆ ناو شار دکتۆرێکیان فڕاندبوو بۆ پارە. نازانم چۆن رزگاری ببوو لە دەستیان. سەرکردایەتی پێی زانین. وا بزانم سەلاح چاو زەق خۆی ئاشکرای کرد. گرتنیان لە بەرگەڵو زیندانی بوون. رۆژێ من رۆیشتم چووم بۆ لای فەرهاد لێپرسراوی زیندان بوو. سەیرمکرد لە وێ زیندانی بوون. بە لامەوە سەیر بوو! وتم:

" -ئەوە چی ئەکەن لە زیندان.؟"

وتیان:

" -کاك ئاوات بەڵکو فریامان بکەویت."

وتم:

" -بۆ چی فریاتان بکەوم.؟"

وتیان:

" -بەرماندە."

منیش ئەمزانی بۆ چی گیراون؟ وتم:

" -ئێوە تاوان بارن. بە خوا ئەگەر بە دەست من بێت، هەر ئێستا هەرسێکتان لە سێدارە ئەدەم."

وتیان:

" -باشە خۆ ئێمە بە تەمای تۆ بووین."

وتم:

" -ئەگەر بە تەمای من بن، حەز ئەکەم لە سێدارە بدرێن."

دوانیان کوژران. ئیتر نازانم ئەوزاد چیی لێهات.

گفتوگۆی نێوان (ی.ن.ك)و ڕژێم لە (١٩٨٣-١٩٨٤) ماوەیەکی زۆر دوورو درێژی خایاند، هەر ئەنجامی نەبوو. مەسەلەکە بێ تام ببوو. هەر ڕۆژەی ڕوداوێ ڕوی دەدا. ڕۆژێك لە سەرکردایەتی کۆبونەوەمان هەبوو. ئەو کاتە بارەگای سەرکردایەتی لە (سورداش) بوو. دوای کۆبوونەوەکە، برادەران هەموو ڕۆشتن. نازانم بۆ چی من مامەوە لای مام جەلال، درەنگ هەستام. چووین بۆ (کانی خان) بۆ ماڵی برادەرێکمان، کە لە وێ بوو. زۆر ناسیاوی (شێخ کامیل) بوو. دایم دەچووین بۆ ماڵیان. ئەو ئێوارەیەش چووین بۆ ئەوێ. کوڕێکیان هەبوو ناوی (جومعە) بوو، زۆر خۆش بوو. دایم سەر خۆش بوو. پیکابێکی پێ بوو. لە ماڵی ئەوان دانیشتبووین. شەو هاتەوە بۆ ماڵەوە، کە هاتەوە شڵەژا بوو، کە چاوی بە من کەوت، هەر هاتو یەکسەر باوەشی پیاکردم وتی:

" -ئەوە تۆیت. ! ؟"

منیش بە لامەوە سەیر بوو! وتم ڕەنگە سەرخۆش بێت. وتم:

" -بۆ چی جومعە چی یە. ؟"

وتی:

" -کوڕە لە تاسڵوجەوە بۆ تۆ ئەگریم."

وتم:

" -بۆ. ؟"

وتی:

" -سەیارەکەی تۆم دی لەم لای ماڵە جاشەکانی (تاسڵوجە)وە سوتا بوو. دوو جەنازەش لەو لاوە کەوتبوو. ئەمان وێرا سەیریان بکەین، چونکە هەموو جاشەکان لە سەر بانەکانی خۆیان دامەزرا بوون. وامزانی تۆیت. لە سەرکردایەتیش وایە هەر تۆیت، چونکە من لە ڕێ پرسیارم لە پێشمەرگە کرد وتیان کاك ئاواتە، چونکە هەر ئەو درەنگ گەڕاوەتەوە. هەموو هێزی پێشمەرگە لە (سورداش)ەوە بەرەو تاسڵوجە ڕۆیشتن. لەوانەیە ئێستا شەڕ بێت."

منیش قەد بە وێدا نەدەڕۆیشتم. هەر بە مێرگەپاندا هاتووچۆم دەکرد بۆ سورداش. ئیتر بە پەلە هەڵساین چووین بۆ سەرکردایەتی بۆ لای مام جەلال، کە چووم مام جەلال لە بەردەمی مقەڕەکەی خۆیدا پیاسەی دەکرد، کە منی بینی وتی:

" -ئەوە ئاوات تۆ لە کوێیت. ؟"

وتم:

" -مام جەلال چووم بۆ کانی خان، ئێستا برادەرێك پێی وتم ڕوداوێك لە تاسڵوجە ڕویداوە، پێشمەرگەی تیا شەهید بووە. کێ یە. ؟"

وتی:

" –من وامزانی تۆیت، بەڵام (سەید کەریمە) هەر تۆو ئەو درەنگ رۆشتن. بچۆ هەر ئەمشەو هەموو تیپەکە کۆبکەرەوە. ئەوە بروسکە دەکەم بۆ هەموو تیپەکان کۆببنەوە. ئەچینە سەر تاسلۆجە هەمووی دەڕوخێنین بە سەریاندا."

وتم:

" –باشە مام جەلال هەر ئێستا ئەڕۆم."

خێرا بە پەلە رۆیشتم، هەموو تیپەکەم کۆکردەوە. هەر ئەو شەوە گەڕامەوە بۆ لای مام جەلال وتم:

" –مام جەلال ئەوە هەموو ئامادەین."

وتی:

" –باشە بچۆ بۆ لای ملازم عومەر."

چووم بۆ لای کاک عومەر ئەویش وتی:

" –کاک ئاوات بچن بزانن بڕیار چی ئەبێت."

هەر بەو شەوە ئێمە بەرەو ئەو گوندانەی سورداش بە رێکەوتین. چاوەڕێی وەڵاممان دەکرد. دیار بوو پەیوەندییان بە رژێمەوە کردبوو. مام جەلال سورداشی چۆڵ کرد، چوو بۆ سەرگەڵو وتی:

" –شەڕ دەست پێ ئەکەینەوە."

(سەید کەریم) زۆر پیاوێکی قارەمان بوو. ملازمی عەسکەری بوو. لە شۆڕشی پێشودا پێشمەرگە بوو. لە هەرەسی ١٩٧٥ دا نەهاتبۆوە. دوایی چوو بۆ سوریا لەگەڵ حەسەن خۆشناوو ئەو برادەرانەی تر، هەر لە وێ مابونەوە. لە سەرەتای ئەم شۆڕشەوە یەکێتی بوو. لەگەڵ (کاک نەوشیروان)دا گەڕانەوە بۆ کوردستان. ماوەیەك ئامر هەرێم بوو لە (باڵەیان) دوایی بوو بە لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی سێ و چوار. دوای ئەوەش بوو بە سەرکردایەتی کۆمەڵە. ئەندامی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی بوو. زۆر دڵسۆز بوو. زۆر پیاوێکی ئازابوو. لە هیچ نەدەترسا بۆیە جاشەکان فرسەتیان لێ هێنا شەهیدیان کرد. بە بێ ئەوەی ئاگای لە هیچ بێ، لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ سلێمانی بۆ ماڵەوە هەر شۆفێرەکەی لەگەڵ بوو. جاشەکان لە سەر بڕیاری سەرانی رژێم لە کاتی گفتوگۆی ١٩٨٤دا بەرنامەیان دانا بوو، کە کەمین دابنێن بۆ ئەوەی هەر پێشمەرگەیەك لە وێوە بڕوات شەهیدی بکەن. ئەوە بوو سەید کەریمی پێوە ببوو. هەر لە کاتی گفتوگۆدا چەندین روداوی وا ناخۆش رویدا. لەوانە سەید کەریم و مامە ریشە و چەندین پێشمەرگەی تری تیا شەهیدکرا. دوو رۆژ بە سەر ئەو بارە ئاڵۆزەدا تێ پەڕی، ئەوەندەمان زانی (عیزەت الدوری) بە هەلیکۆپتەر هات بۆ سورداش. مام جەلال یش دوای ئەو چوو بۆ بەغداد. بڕیار بوو جاشەکانی تاسلوجە بەرنە عەربەت. ئەوەشیان درۆ بوو. ئێمەش هیچمان لە جاش نەکرد. ئەو کاتە (حاجی مەحمودی گەڵاڵە) مان لەگەڵ

بوو، زۆر پیاوێکی دڵسۆز بوو. هەموو کوڕەکانی پێشمەرگە بوون. یەك دوو خزمی خۆشی هەر لەگەڵیان بوو. خۆشی هاتبوو لەگەڵمان پێم وت:

" -کاك حاجی تۆ بۆ دێیت.؟"

وتی:

" -مادەم بۆ شەڕی جاشە، منیش دێم. چۆن نایەم."

بە شەو وشەی نهێنیمان دادەنا، نازانم بۆ چی رقی لە (عەلی کەمال) بوو. مامۆستا عەلی کەمال پێشمەرگەبوو لە تیپی ٤٧ کرابوو بە لێپرسراوی دارایی تیپ. ئەگەر یارمەتی پێشمەرگە بهاتایە بۆ مەڵبەند، وەری دەگرت و دەیهێنایەوە. بە پێی لیستی تیپەکە دابەشی دەکرد بە سەر پێشمەرگەکاندا. حاجی مەحمود زۆر رقی لێ بوو. برادەرانیش، کە نهێنی شەویان دادەنا، ناوی عەلی کەمالیان کردبوو بە نهێنی. ئەویش تووڕە دەبوو دەیوت:

" -مادام عەلی کەمال ناوی نهێنیە، من هەر وەری ناگرم."

بە راستی پیاوێکی باش بوو. هەتا دوا هەناسەی لەگەڵ شۆڕش بوو.

گفتوگۆ درێژەی کێشا. هەر ئەنجامیشی نەبوو. لەوە دەچوو نەیەکێتی بە راستی بێ و نەرژێمی بەعس. بە بۆ چونی من هەرچی یەکێتی بوو، دوو دڵ بوو. لە وە دەترسا عێراق بڕوخێ. ئەو کاتە شەڕ گەرم بوو لە نێوان عێراق و ئێراندا (بەرەی جوتیش) لەگەڵ ئێران بوو. ئیتر یەکێتی ئەوەندەی تر سڵی لە گفتوگۆ دەکردەوە. لە کۆبونەوەیەکدا، کاك نەوشیروان لە قاسمە رەش وتی:

" -خەتای تیپەکانی خوارەوە بوو."

ئەوە هیچ نەبوو. خۆشیان ئەوەندە بڕوایان پێ نەبوو. هەر وایان دەزانی عێراق دەڕوخێ، چونکە ئەو کاتە ئەوانیش بە عێراقەوە تیادەچن. هەر زۆری ئەوە بوو هەر دوو لا بڕوایان بە یەك نەبوو. بۆیە گفتوگۆ سەری نەگرت و نەگەیشتە ئەنجام.

دوای ئەوەی گفتوگۆ هیچ ئەنجامێکی نەبوو، شەڕ لە نێوان رژێمی (بەعس)و (یەکێتی)دا دەستی پێکردەوە. ئەو کاتە مقەڕمان لە (باڵخ) بوو. لە ١٩٨٥/١/٢٤ مامە ریشە شەهیدکرا. بۆ شەوی دواتر مام جەلال لە سەر جیهازبوو وتی:

" -مامە ریشەیان شەهید کردووە."

تورە ببوو هاواری دەکرد:

" -لێیان بدەن لەم بەعسیە فاشستانە."

ئیتر ئەوەی بە دەمیا دەهات جنێوی بە بەعس دەدا. منیش لە ژوورێکی تردا بووم. عەدەدجیهازەکە بانگی کردم وتی:

" -کاك ئاوات گوێ بگرە مام جەلال ئیعلانی شەڕی کردەوە. دەڵێت:

" -ریشەیان شەهید کردووە."

لەو کاتەدا قادری حاجی عەلی لە مەڵبەندبوو. بروسکەیەکم بۆ کرد وتم:

" –ئێمە چی بکەین.؟"
وتی:
" –کاك ئاوات ئەبێت زۆر کۆنترۆڵی پێشمەرگەکانی خۆتان بکەن، کە بە هیچ شێوەیەك نەجوڵێن هەتا خۆمان پێتان ئەڵێین."
ئیتر زۆر تەئکیدی ئەوەی لێ کردم، کە نابێت لە خۆمانەوە هیچ بکەین، هەتا فەرمانمان بۆ نەیەت لە کاك قادرەوە. لە باڵخ هەموو تیپەکەم کۆکردەوە. هەر چاوەڕێی جوابی کاك قادرم دەکرد. ئەویش دەڵێت:
" –بە قوربانە مەیەڵە هیچ بکەن."
منیش بە زۆر دەستم بە سەردا گرتبوون، کە هیچ نەکەن، هەتا ئاگادارمان دەکەنەوە. شەوێك کاك قادر نامەیەکی بۆ ناردم دەڵێت:
" –(بە قوربانە بە پەلە خۆت‌و تیپەکەت بگەنە سەرکردایەتی. مام جەلال داوای تیپێکی باشی کردووە. ئێستا هیچ تیپێك وەك ئێوە ئامادە نییە. بە پەلە بڕۆن بۆ سەرکردایەتی.)"
ئەو کاتە سەرکردایەتی لە ئاوەژێ بوو. منیش بە پەلە هەموو تیپەکەم کۆکردەوە بەرەو سەرکردایەتی. لە وێ وتیان بچن بۆ (شارستێنە) ئاگاتان لەو جادەیە بێ. لەوانەیە رژێم لە وێوە پەلاماری سەرکردایەتی بدا. وریابن نەوەك رێگای (سێدەر)و (شارستێنە)مان لێ بگیرێ. ئەو جادەیەی، کە لە دوکانەوە دەهات بۆ (مەرگە). ئێمەش چووین لە گوندی شارستێنە مقەڕمان دانا. لە وێ بەو شاخەوە دامەزراین. زۆر سارد بوو، هەر خەریکبوو رەق ببینەوە. هەر بە شاخەکەوە بووین، وتمان نەوەك شەو حکومەت سەرکەوێت بۆ ئەو شاخەی (شارستێن)ە. دووسێ جار حکومەت هەوڵیدا سەرکەوێ، لێماندان. هەر نەمان هێشت بیگرێ. جارێکی تر پەلاماری سێدەری دا، هەر نەمان هێشت. جارێ لە دۆڵی خوار گوندی (سێدەر) شەڕێکی زۆر باشمان کرد. تا سەر جادەی قیر شکاندمانن. ئوتومبیلێك‌و چەندین چەکمان گرت. ئیتر شەوو رۆژ لە سەر شاخی (قەرەست)و لە دوکانەوە تۆپ بارانی ئێمەیان دەکرد. ئەو گوندانە هەموو چۆڵیانکرد. هەر ئێمە لە دێکەدا مابووین. سەیرمکرد هەموو هێزی پێشمەرگەیان کۆکردبۆوە شەوی ١٤\١٥/٢/١٩٨٥ پەلاماری شاخی (دابان)و (هەلاج) یاندا. هەرچی موعەسکەرو رەبایەی جەیشی شەعبی هەبوو گرتنیان. ئێمە لە وێ نەبووین وا بزانم هەندێ برادەری لێ بوو. لەوانە کاك مەحمود کۆمەڵەو کاك سەلاح چاوشین لەگەڵ ملازم عومەرو ئەو پێشمەرگانەی لە وێ بوون. کۆیان کردبوونەوە بەشدارییان کردبوو. منیش زۆرم پێ ناخۆش بوو، چونکە سنوری تیپەکەی من بوو. ئێمە لە پێشمەرگەی گەرمیان زیاتر شارەزا بووین، کەچی ئێمەیان ناردبوو بۆ سەرکردایەتی. هێزەکانی تریان بۆ دابان ناردبوو. خۆ ئێمە چەندین جار لە وێ تووشی شەڕ بووبووین. حەزمان دەکرد

لەوێش بەشداری بکەین. جارێ چوومەوە بۆ سەرگەڵو، کاک ملازم عومەر لە وێ بوو. گلەیم لێکرد وتم:

" -کاک عومەر ئەبوایە ئێمە بەشداری گرتنی دابانمان بکردایە، چونکە سنوری ئێمە بوو."

وتی:

" -کاک ئاوات فەرقی چی یە؟ ئێوە چەند ڕۆژە لە وێ لە شەڕدان. ئەوەی ئێوە پێویست تربوو. بەرگری کردن لە سەرکردایەتی زۆر پێویستە. ئەو کاتە ئێوە ئامادە بوون. بۆیە ئێوەمان بانگ کرد بۆ سەرکردایەتی."

لەگەڵ (قادری حاجی عەلی)ش بە هەمان شێوە باسمانکرد. دوای چل ڕۆژ ئێمەیان گۆڕی، تیپەکەی سەعیدی حەمە زیاد گەیشتن. تیپێکی بە توانابوون. هێنایان بۆ جێگاکەی ئێمە. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ سنوری خۆمان. بیستبووم کەمنیان لە سەر تیپی (٤٧) لابردووە. لە کاتی گەڕانەوەمدا بۆ سەرگەڵو، چووم بۆ مەڵبەند. شەو لای کاک قادری حاجی عەلی بووم پێم وت:

" -بیستومە منتان لابردووە."

وتی:

" -بڕوا بکە شتی وا نییە."

وتم:

" -خۆ ئاساییە من ئەوەندەم بە لاوە گرنگ نییە."

وتی:

" -خۆ ئەگەر وا بێت پێم ڕاتەگەیاندی. قابیلە چی تیایە."

بەڵام ڕاستی پێ نەوتم، چونکە پێیان وتبووم ئەمزانی. دڵنیا بووم، کە لایان بردووم. کاک نەوشیروان ڕەئی لە سەرم لە تیپی چلو حەوت باش نەبوو. کاک نەوشیروان وای دەزانی من دیفاعم لە عومەر عەرەبو ئەوان کردووە. لە کاتی گفتوگۆدا بەوە ناوم دەرکردبوو، کە زۆر دەچووم بۆ ناو شار. لە ڕاستیشدا وا نەبوو. هەر دوو بۆچونەکە هەڵە بوو. من دیفاعم لە عومەر عەرەبو ئەوان نەکردبوو. وەک لە پێشتر باسمکرد. لە بەر ئەوەی من نەمدەزانی ئەوان ئیشی خراپیان کردووە. بۆ ئەوەی، کە گوایە من زۆر ئەچم بۆ سلێمانی ئەوەشیان وا نەبوو. من نەمدەزانی کێ بوو بەردەوام بە درۆ دەچوو بۆ لای کاک نەوشیروانو ئەوان باسی منی دەکرد، کە گوایە لە (سلێمانی)م. لە کاتی گفتوگۆدا من لە ماڵی خۆمدا بووم، لە شوکێ لە شارباژێڕ. ڕۆژێ چووم بۆ لای (عەلی بچکۆل). ئەو کاتە ئەو لێپرسراوی مەڵبەند بوو وتم:

" -کاک عەلی ئەمەوێت بچم سەردانێکی منداڵەکانم بکەم لە شارباژێڕ. وتی:

" -باشە بڕۆ."

پێم وت:

" –مقەڕی مەڵبەند وا لە شوکێ. هەر ئیشێك هەبوو ئەتوانی بروسکەیەك بکەیت بۆ مەڵبەندی یەك. ماڵەکەشم هەر لە نزیکی مقەڕەکەیە، یەکسەر پێم ئەڵێن."
وتی:
" –زۆر باشە."
هەر لای ئەو گەڕامەوە، یەکسەر چووم بۆ شوکێ بۆ ماڵەوە، کە چووم بۆ مقەڕی مەڵبەند، (ڕەفعەتی مەلا) لە وێ بوو. هەندێك لای ئەو دانیشتم وتم:
" –کاك ڕەفعەت ئەوە من لە ماڵەوەم. بە برادەرانم وتووە لای خۆمانەوە هەر ئیشێکیان بە من بوو، بە ئێوە بڵێن. هەر شتێك بوو، بنێرە بە شوێنمدا."
وتی:
" –باشە."
(حەمە عەلی عوسمانی مەلا)شم لەگەڵ بوو. بە ئوتومبیلەکەی ئەو چووم. دوای نیوەڕۆ بوو. هەمووی دوو سەعات لە ماڵەوە نەبووم. کاك ڕەفعەت پێشمەرگەیەکی نارد بە دوامدا. چووم وتی:
" –کوڕە گوێم لێیە مام جەلال کردوویەتی بە هاوار بە سەر عەلی بچکۆل دا. ئەڵێت ئاوات قارەمانی وا لە سلێمانی مقەڕی داناوە. بە فەرمانی کێ چووە، ئێوە ناردووتانە.؟"
کاك عەلیش دەڵێ:
" –ئێمە نەمان ناردووەو ئاگامان لێی نیە. منیش لێرەوە وەڵامم داوەتەوەو وتومە کوڕە فەقیرە لای ئێمەیە لە ماڵەوەیە."
وتم:
" –بە ڕاستتە.؟"
وتی:
" –بە خوا."
لە داخاندا هەر ئەو ئێوارەیە یەکسەر چووم بۆ لای مام جەلال وتم:
" –مام جەلال من کەی چووم بۆ سلێمانی هەتا لە وێ مقەڕ دابنێم. من هەر ماڵیشم لە سلێمانی نییە. ئەمە چ پیاو چاکێ بۆی باس کردویت."
وتی:
" –ئاوات لە سلێمانیەوە هاتوون باسی تۆیان کردووە، کە گوایە بیست ڕۆژە بە پەنجا پێشمەرگەوە لە سلێمانیتو یەك گەڕەکت گرتووە. ڕۆژانەش خەڵك دێن بۆ لات."
وتم:
" –مام جەلال باشە من پەنجا پێشمەرگە لە کوێ جێ بکەمەوە لە سلێمانی، کە من ماڵم لە وێ نییە."
ئەویش وتی:

" –باشە ئەم سەگ بابانە بۆ درۆ ئەکەن."
کاك نەوشیروان لە سەر من زۆر ڕەئی خراپ بوو. کاك قادری حاجی عەلیش تازە ببوو بە لێپرسراوی مەڵبەند. ئەوەندەش بە یەکەوە نەبووین تا من بناسێت. ئەوان چیبیان وتبوو. ئەمیش هەر ئەوەی لە سەر بوو ڕازی ببێت. من نازانم بۆ چی پێیان نەدەووتم، کە لە تیپی (٤٧) لایان بردووم. گەڕامەوە بۆ مقەڕ لە باڵخ نەچوومەوە بۆ لای تیپەکە هەر لێشم نەپرسییەوە. هەتا ڕۆژێ (شەوکەتی حاجی موشیر) هات بۆ (باڵخ) بۆ ماڵەوە، پێی وتم:
" – شۆڕشیان ئیسماعیلیان لێرە داناوە."
وتم:
" –زۆر باشە ئەوە مۆرەکەتان بیبەرەوە."
وتی:
" –ئەی نایەیت لەگەڵمان.؟"
وتم:
" – بۆ چی بێم.؟"
بەڵام کاك شەوکەت وتی:
" –کاك قادر وتویەتی کاك ئاوات ئەوکاتەی، کە ڕیشە شەهید بووە، هیچ دەوری نەبووە."
ئەو قسەیەم زۆر بە لاوە سەیر بوو! ئەو خۆی دەیان بروسکەی بۆ دەکردم بە قوربان‌و بە ساقە نەیەڵی لە سنوری خۆماندا هیچ ڕوو بدا. ئیتر دەوری چی باس دەکا.
هەر لە گوندی باڵخ مامەوە. ڕۆژێ مام جەلال هاتە خوارەوە بۆ دۆڵی جافایەتی. لە وێ سەردانی (مامۆستا شێخ عیزەدین) لە گاپیلۆن کرد. منیش چووم بۆ لای. کۆمەڵێ لە خەڵکی گوندی باڵخ. هاتن بۆ لام وتیان:
" –ئەچین بۆ لای مام جەلال پێی ئەڵێین نابێت ئاوات بگوێزرێتەوە لە ناوچەکەی ئێمە."
وتم:
" –زۆر سوپاستان ئەکەم، من ئەوە قبوڵ ناکەم. ئەچن بۆ سەردانی مام جەلال باشە. بەڵام باسی ئەوە ناکەن، کە من بۆ نقڵ بووم، چونکە ئەوە بڕیاری شۆڕشە من گوێ نادەمێ. خۆیان بۆ کوێ دام بنێن، یان دام ئەنێن ئارەزوی خۆیانە، بەڵام ئەگەر باسی منی کرد، ئاوات چۆن بووە لەگەڵتان‌و ڕەئتان چییە لە سەری، ئەو کاتە بە ئارەزوی خۆتان دەتوانن وەڵام بدەنەوە. خەڵکی ناوچەکە زۆر لێم ڕازی بوون. حەزیان دەکرد هەر لە وێ بم. بە ڕاستی لە هەر ناوچەیەك ئیشم کردبێ، زۆر ڕێزی خەڵکم گرتووە زیاد لە سنور. خەڵکیشم ئازار نەداوە. خۆشم بە سەر خەڵکدا بانەداوە. ئەو ناوچانە خۆیان دەکەم بە شاهید، کە ئیشم لێکردووە. ئەوەی خەڵکی گوندەکان بۆ پێشمەرگەیان

کردووە، باوکو دایك نەیان کردووە. شۆڕش زۆر قەرزاری گوندەکانە، چونکە بە بێ لادێ شۆڕش ناکرێ. ئەو راستیەش دوای ئەنفال ئیسپات بوو، کە وایە. کە چووم بۆ لای مام جەلال لێی پرسیم وتی:

" –ئاوات چی ئەکەیت.؟"

وتم:

" –هیچ. ئێوە لاتان نەبردووم.؟"

وتی:

" –لەوانەیە بتنێرم بۆ جێگایەکی تر."

وتم:

" –ئارەزوی خۆتان نییە.؟"

وتم:

" –مام جەلال ئەمجارە ئەگەر ئیش بکەم، لە سنوری مەڵبەندی یەك نەبێت، ئیش ناکەم."

وتی:

" –باشە بچۆ بۆ سنوری مەڵبەندی یەك، هەتا ئیشێکت بۆ دادەنێین."

لەو کاتەشدا خەڵکی ئەو گوندانە چوون بۆ لای مام جەلال. (حاجی ئیبراهیمی باڵخی)شیان لەگەڵ بوو. حاجی ئیبراهیم وتی:

" –مام جەلال گلەیمان هەیە لێت."

مام جەلال وتی:

" –بۆ کاك حاجی.؟"

وتی:

" –بۆ چی ئاواتتان لە ئێمە دورخستۆتەوە؟ زۆر پیاوێکی باش بووە. زۆرمان پێ ناخۆش بوو نەقڵتان کرد.؟"

مام جەلال وتی:

" –زۆر سوپاستان ئەکەین. مادەم ئێوە ئەوەندە لێی رازین، ئەوە سەر بەرزییە بۆ ئێمەش. پێویستیمان پێیەتی بۆ جێگایەکی تر."

وتم:

" –مام جەلال من ئەچم بۆ بەری قەرەداغ. لە وێ دادەنیشم. ئەگەر ئیشتان بە من هەبوو، دەتوانن ئاگادارم بکەنەوە."

وتی:

" –باشە ئاگات لە خۆت بێت."

ماوەیەکی پێ چوو،ماڵو مقەڕەکەم کۆکردەوە. بە پێشمەرگەکانم وت:

" -من ئەچم دائەنیشم. کێ ئەیەوێت نقڵ بێت بۆ هەر جێگایەکی تر، بە ئارەزوی خۆتان ئەتان نێرم."

هەندێکیان هەر لە تیپی (٤٧) مانەوە. هەندێکی تریان داوای تیپەکانی تریان کرد. ١٠ پێشمەرگەیان لەگەڵ خۆم مانەوە. زۆریان هەر خزمی خۆم بوون.

رۆژێ چوومە دۆڵە روت. دوای نیوەڕۆ بوو. بە پێشمەرگەکانم وت:

" -سوار بن با برۆین."

وتیان:

" -بۆ کوێ ئەچین.؟"

وتم:

" -ئەچین سەردانێکی (کوێخا حسین) ئەکەین لە گوندی هەناران."

کە رۆشتین یەکسەر چووم بۆ گوندی (قولەرەیسی) بەرامبەر سەرچنار. چووینە ماڵی حەمە جاف. وتم:

" -کاکە حەمە ئەمەوێ بپەڕمەوە بۆ بەری قەرەداغ."

وتی:

" -جا بەم نیوەڕۆیە.!؟"

وتم:

" -بەڵێ."

وتی:

" -خەتەرە."

رۆژی هەینی‌و بەهار بوو. دوو پێشمەرگەم نارد بە بێ چەك بە تراکتۆرێ وتم:

" -بچن هەتا بەری (قلیاسان) بزانن لە سەر جادەی دوڕیانی باخی بەختیاری سەیتەرە نییە؟ ئەگەر نەبوو، زوو بگەڕێنەوە."

چوون، هاتنەوە وتیان:

" -کاك ئاوات سەیتەرەی لێ نییە. هەموو سلێمانی لە سەیرانە، رێ بەرناکەوێت."

وتم:

" -با برۆین."

پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو ناوی (شیروان) بوو. سایەقی چاك بوو وتم:

" -شیروان تۆ ئوتومبیلەکە لێ ئەخوڕیت. هەر کەسێ ئەگەر رێگاشی لێگرتیت، تۆ ناوەستیت. هەر لێ ئەخوڕیت. ئەگەر تەقەشیان لێکردی، تۆ هەر لێئەخوڕیت‌و ناوەستی. مەگەر بکوژرێی. گەر بێت‌و بوەستی، خۆم ئەتکوژم، چونکە بێتو بوەستی، هەموومان تیا ئەچین. تۆ هەر لێ خوڕە. یان دەرئەچین یان هەموومان ئەکوژرێین."

بە بەردەمی رەبایەکەی بەرامبەر کارگەی چیمەنتۆی سەرچناردا، چووینە خوارەوە بۆ سەر جادەکە بەرەو قلیاسان. رێگا زۆر قەرەباڵغ بوو. لەوە دەچوو بماننناسن. زۆر

سەیریان دەکردین. لێیان روون نەبوو. ئێمەین، یان نا. ئەوەی دەی ناسین، سەیر بوو بە لایانەوە، کە بۆ چی هاتووین بۆ ئەو ناوە!. تۆ بڵێیت هاتبێتینەوە بۆ ئەوەی تەسلیم ببینەوە؟ هەر لە جادەی کەرکوك سلێمانی پەڕینەوە بەرەو قلیاسان، کەوتینە ناو قەرەباڵخییەکەوە. رێگا نەبوو برۆین. سەیرمکرد ئوتومبیلێکی لاندگرۆزەر لە دوامانەوە بوو، پڕ بوو لە چەکدار. قاتیان لەبەردابوو. لەوە دەچوون (موخابەرات) بن. زۆر لێمان نزیك ببوونەوە. هەر سەیریان دەکردین. منیش وتم:

" -شێروان لێخوڕە. ئەوە هەستیان کردووە."

بە پێشمەرگەکانیشم وت:

" -کەس سەیریان نەکات. با هەست نەکەن."

دوو پێشمەرگەی گەرمیانمان لەگەڵ بوو. یەکی قاتێك جلی بەڵەك بەڵەکیان لەبەردابوو. لە دواوە بوون. هەر خێرا خێرا دەیان وت:

" -کاك ئاوات تەقەیان لێ بکەین.؟"

وتم:

" -تەقە لە چی ئەکەن واز بێنن. زۆر سەیریان مەکەن. ئەگەر بە تەواوی پێیان زانیین، ئەو کاتە چار نییە."

ئەوەندەش قەرەباڵخ بوو، رێگا نەبوو لێمان بێنە پێشەوە. ئێمەش رێمان نەبوو دەرچین لێیان دوور کەوینەوە. ئەوان لە سەر جادەکە لایاندا بۆ ئەوەی پێشمان بکەون، بچنە بەردەممان رامانبگرن. وتم:

" -شێروان لادە لە سەر جادەکە. برۆ بەرەو عەواڵو کۆستەی چەم."

هەموو سەیریان دەکرد. شێروان لە جادەکە لایدا. ئەوەندە بە خێرایی ئوتومبیلەکەی لێ دەخوڕی، من بۆ خۆم عەرزم نەدەبینی، وادەزۆیی. کردبووی بە تەپو تۆزێك، دیار نەمابووین. دەمێك بوو باران نەباری بوو. هەر نەیانزانی چۆن دەرچووین. چووینە گوندی (جێشانە) هێشتا تۆزی رێگاکە نەرەویبۆوە، دەرچوو بووین. بێتوو ببوایە بە شەڕ کەسمان دەرنەدەچووین. ئەو شەوە چووینە گوندی داراغا.ماڵی پورم لە وێ بوو. دانیشتین وتیان:

" -ئەوە لە کوێوە هاتوون.؟"

وتم:

" -لە قلیاسانەوە."

وتیان:

" -چۆن بەو رۆژە لە وێوە هاتوون."

کە بۆم باسکردن چۆن پەڕیوینەتەوە، چوون بە گژما وتیان:

" -جا بۆ چی وات کردووە، لە خۆت بێزاریت.؟"

بۆ بەیانی چووم بۆ قەرداغ، چوومە گوندی قارەمان.دووسێ شەو لە وێ بووم. وتم:

" –بە نیازم لێرە دابنیشم."

وتیان:

" –بە خوا نایەیتە ئێرە، چونکە ئێرە زۆر لە قەرەداغەوە نزیکە. تۆش بێیت، ئێمە چۆڵی ئەکەین، چونکە ئێرە بە کەڵکی تۆ نایەت."

ئیتر وتم:

" –بابە نایەمە ئێرە."

ئەو کاتە کاک حەمەی فەرەجو عەبدولڕەحمانی کوڕی، لە گوندی هۆمەرامان بوو. چووم بۆ سەردانی ئەوان وتی:

" –ئەبێت بێیتە ئێرە."

وتم:

" –باشە."

عەبدولڕەحمان جێگاکەی خۆی چۆڵ کرد بۆ ماڵەکەم. هەر لە پەنای ماڵەکەشیدا ژوورێکی گەورەی لێ بوو، کردم بە مقەڕ بۆ پێشمەرگەکان. چووینە گوندی هۆمەرامان، لە وێ ماینەوە. ئەو ماوەیەی لە وێ بووم زۆر خۆش بوو. ئیشم نەبوو. بۆ خۆم هەر خەریکی سەردانی گوندەکانی قەرەداغ بووم. خزمو ناسیاوەکانم بە سەر کردەوە. هەر ڕۆژەی لە دێیەك بووین. ڕۆژانەش خەڵك دەهات بۆ لای منو عەبدولڕەحمانی کاکەحەمە. زۆر خۆشمان دەبردە سەر. عەبدولڕەحمان زۆر پیاوێکی ڕێکو پێكو زۆر قارەمانیش بوو. ئەوەندە ڕێکو پێك بوو، بە ڕاستی نازانم چۆن وەسفی بکەم. دوایی لە یەك دابڕین. وام دەزانی برایەکی زۆر خۆشەویستم لێ دور کەوتۆتەوە. ڕۆژێ لە سەرکردایەتیەوە بروسکەیەکیان بۆ کرد، کە بچێ بۆ لای باوکی. ئەو کاتەش باوکی چووبوو بۆ سەرکردایەتی. ئەمیش زۆر بێ تاقەت بوو نەی دەزانی چی بووە. هەر وەختەبوو شێت ببێ. ئیتر بە یەکەوە چووین بۆ گوندی (کانی سپیکە) لە وێوە ناردی بە دوای خزمێکی خۆیدا، شێخ نوری ناو بوو. چوون بۆ سلێمانی لە وێشەوە بۆ سەرکردایەتی، کە چووبوو، کاکە حەمە بریندارببوو. قاچیان بڕیبۆوە. ئیتر نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ قەرەداغ. ماڵەکەشیان بردەوە بۆ ئەوێ. ئەو ماوەیە منیش زۆر بێ تاقەت بووم بۆی. ئیتر هەر لە وێ مامەوە.

٧٢

نیوەڕۆیەکی هاوین بوو، لە بن کەپرەکە دانیشتبووم. خێزانەکەم چووبۆوە بۆ سلێمانی بۆ کڕینی هەندێك پێداویستی. پێشڕەوی لەگەڵ خۆی بردبوو. هیواو ئاشتی لای من بوون. لە ناکاو شەش هەلیکۆپتەر لە دیوی سەنگاوەوە خۆی کرد بە دیوی قەرەداغ دا. ڕووی نەکردە لای ئێمە. بەرەو سەر ئاسمانی ناحیەی قەرەداغ ڕۆشتن. لە ئێمە

ونبوون. تۆزێکی پێ چوو. کاتێکمانزانی لە پڕ چوار هەلیکۆپتەر بە ساروخ و شەستیر، دایان گرتینەوە. بۆردومانەکە بەرەو ماڵی ئێمەو مزگەوتەکەو مقەڕی پێشمەرگەکان بوو، کە لە تەنیشت یەکەوە بوون. هەلیکۆپتەر ناو دێکەیان ئاگر باران کرد. دێکە لە تۆزو دوکەڵ و خۆڵدا، دیار نەمابوو. بۆردومانەکە بۆ ماوەی (٢٥) دقیقە بەردەوام بوو. بە پێشمەرگەکانم وت:

" —کەس تەقەیان لێ نەکات. خۆتان باش حەشار بدەن، تا بەرتان نەکەوێت. ئێستا تەقە بکەین وازمان لێ ناهێنن. یەك نەفەریش لە گوندەکەدا شەهید بێ، ئەیکەن بە تاوانی ئێمە. ئەڵێن ئەگەر ئێوە نەبوونایە هەلیکۆپتەر بۆ لە دێکەی ئێمە ئەدا."

هەر واش بوو لەبەر ئێمە لە گوندی هۆمەرامانی دا، باش بوو تەنیا یەك پیاو بریندار بوو بە ناوی حاجی حەمە شەریف، گوندەکە چۆڵ بوو. هەموو خەڵکی ئاوایی لە دەرەوەی دێ سەرقاڵی ئیشوکار بوون. دوایی لە هەموو دێکانی ترەوە دەهاتن بۆ هەواڵ پرسینمان. چاویان لێ ببوو وتوبیان رەنگە لە هۆمەراماندا یەك نەفەر نەمابێ.

زۆری پێ نەچوو، رژێمی بەعس پەلاماری مەڵبەندی یەکی دا لە شارباژێڕ. لە بەر شەڕی ئێران، ناوچەی شارباژێڕ زۆر بچوك بوو بۆوە. ناچار مەڵبەند پەڕینەوە بۆ بەری قەرەداغ. ئەو کاتە کاك (جەبار فەرمان) لێپرسراوی مەڵبەند بوو. سامان گەرمیانی لێپرسراوی عەسکەری بوو. لە پەڕینەوەیاندا، هاتن بۆ هۆمەرامان. لە ماڵی ئێمە مانەوە. نانی نیوەڕۆیان خوارد. هێزێکی زۆریشیان لەگەڵ بوو. ئیتر کاك جەبار فەرمان وتی:

" —تۆ نابێت لێرە دانیشیت. ئەبێت بێیت بۆ مەڵبەند ئیش بکەیت."

وتم:

" —کاك جەبار وازم لێ بێنە. بۆ خۆم دانیشتووم. با ماوەیەك پشو بدەم. خۆ یەکێتی لە سەر من پەکی نەکەوتووە."

وتی:

" —بەڵێ، پەکی کەوتووەو ئەبێت لەگەڵ ئێمە ئیش بکەیت."

وتم:

" —تۆ جارێ خۆتان بچن جێگای خۆتان دابمەزرێنن، ئەوجا بیری لێ ئەکەمەوە."

وتی:

" —باشە."

من و کاك جەبار پەیوەندیمان خۆش بوو. حەزی دەکرد ئیش بکەم. پێی ناخۆش بوو من لە وێ دانیشم. ئەوان رۆیشتن چوون لە (بەلەك جاڕ) مقەڕی مەڵبەندیان دامەزراند. کاك جەبار فەرمان لە ئیشوکاری پێشمەرگایەتیدا زۆر جدی بوو. ماوەیەکی پێ چوو، (بەکری حاجی سەفەر)و کۆمەڵێ پێشمەرگە، ئەوانیش چوونە گوندی (سێوسێنان) (مەلا بەختیار)یش چووبوو بۆ گوندی (تەکێ) ئەو کاتە ئەویش ئیشی نەدەکرد، لەوێ

دانیشتبوو. (شێخ عەلی)ش هەر لە سێوسێنان بوو. ئیتر قەرەداغ ببوو بە جێگای ئەوانەی، کە تووڕە ببوون. ئیشیان نەدەکرد. گوایە لە کۆمەڵە رازی نین. جارێ شەڕ دروست ببوو، لە بەینی پێشمەرگەکانی لای (بەکری حاجی سەفەر)و پێشمەرگەکانی تیپی (٥٥)ی قەرەداغ (مەنسوری ئەنوەر بەگ) رابەر سیاسی تیپی (٥٥) بوو. خەریکبوو شەڕەکە گەورە بێت، ئیتر باش بوو، نەیان هێشت گەورە ببێت. دیاربوو مەڵبەندیش پێی وتن لێتان قبوڵ ناکەین. ئێوە دانیشتوون ئاژاوە دروست بکەن. ئیتر ئاگاداری سەرکردایەتیانکرد. ناردیان بە دوای کاک بەکرو شێخ عەلی دا.

٧٣

شەوێ سەیرمانکرد، ئوتومبیلێ هات. پێشمەرگەکانی لای من چوونە رێگاکەیان، یەکێك هاواریکرد:

" -من شێخ عەلیم."

نزیك بوومەوە، وتی:

" -ئاوات من شێخ عەلیم."

ئیتر بە پێشمەرگەکانم وت:

" -بگەڕێنەوە."

کاك عەلی هات وتی:

" -من ئەچم بۆ سەرکردایەتی، رامکردووە بۆ ئەوەی مەڵبەند نەمانگرێت."

منیش وتم:

" -شێخ عەلی کێ ئێوە ئەگرێت.؟"

دوایی وتم:

" -باشە، لەوانەیە منیش بێم."

وتی:

" -باشە بە یەکەوە ئەچین."

لەو کاتەشدا، عەبدولڕەحمانی کاکە حەمەی فەرەج، نامەیەکی بۆ ناردبووم. لە نامەکەدا دەڵێت:

" -ئەگەر یەکێك هەبوو، بەڵکو ئوتومبێلەکەم بۆ بنێریت، زۆر سوپاست دەکەم."

منیش وتم:
" –زۆر باشه، ئوتومبیلەکەش بۆ عەبدولڕەحمان ئەبەم، سەردانێکی کاکە حەمەش ئەکەین."
(مام جەلال)یش جوابی بۆ نارد بووم، کە بچم سەردانێکیان بکەم. بە یەکەوە کەوتینە ڕێ، بەرەو سەرکردایەتی. ئەو کاتە سەرکردایەتی هەندێکیان هاتبوونە (بەرگەڵو).
مام جەلال لە بەرگەڵو بوو. ئوتومبیلەکەی کاکە حەمەشمان برد. ئێوارە لە جادەی کەرکوك سلێمانی پەڕینەوە. شەو چووینە (هەنارانی سەرو) شەو لە ماڵی کوێخا حسێن ماینەوە. بۆ بەیانی چووین بۆ لای مام جەلال بۆ بەرگەڵو. ئەو ئێوارەیە لای مام جەلال بووین. قسەم لەگەڵ کرد، مام جەلال وتی:
" –ئیتر تەواو ئەبێت ئیش بکەیت. ئەوا سێ و چوار مانگە ئیسراحەتت کردووە."
وتم:
" –باشە جەنابت چۆن ئەڵێیت، با وا بێت."
وتی:
" –کاکە ئەوەش ئێتەوە بۆ ئێرە کۆبونەوەمان هەیە. جێگایەکت بۆ دائەنێین. بچۆ بۆ ئەوێ."
لەو کاتەشدا دوو جێگا بۆ سەر تیپ لە تیپی (٥٥)ی قەرەداغو تیپی مەرگە هەبوو.
ماوەیەك لەو ناوە مامەوە. سەردانی کاکە حەمەی فەرەجم کرد، ئوتومبیلەکەشم بۆ عەبدولڕەحمان برد. زۆر سوپاسی کردم وتی:
" –هیچمان بۆ نەدەکرا بە بێ ئوتومبیل. باش بوو بۆت هێناین، زۆر ماڵت ئاوا بێت."
پاشان وتی:
" –بە تەمام ئەگەر باوکم بۆ ڕەوانە بکرێت، دێمەوە بۆ لای تۆ. ئەگەر ئیشت کرد، منیش هەر لەگەڵ تۆ ئەبم. ئەگەر ئیشت نەکرد، هەر بە یەکەوە ئەبین، بەڵام دڵنیام نایەڵن دانیشیت. بە هەر حاڵ من بۆ هەر دوو حاڵەکە. تۆ لە هەر جێگایەك بوویت، هەر دێمەوە بۆ لای تۆ. زۆرم پێ خۆشە بە یەکەوە بین."

٧٤

سەرکردایەتی لە (یاخسەمەر) کۆبوونەوە. مام جەلال لەوێ مقەڕی دانا. پێیان وتم:
" –بچۆ بۆ مەرگە."
وتم:
" –ناچم بۆ مەرگە."
(جەماڵی حەمەی خوا کەرەم) یان دانابوو بۆ تیپی (٥٥)ی قەرەداغ. منیش وتم:

" –بۆ مەرگە ناچم، ئەگەر بۆ سنوری مەڵبەندی یەك ئەڵێن، ئەوە ئیش ئەكەم. ئەگینا ئیش ناكەم، بۆ خۆم دانیشتووم."

رۆژێك سامان هات بۆ لام وتی:

" –منیان ناردووە بۆ لات، كە پێت بڵێم، ئەبێ ئیش بكەیت."

وتم:

" –ئاخر ئیش ناكەم. خۆ بە زۆر نییە."

وتی:

" –ئاخر بڕیار وایە، هەر كەس ئیش نەكات، ئوتومبیلو مەفرەزەكەی لێ ئەسێندرێتەوە."

وتم:

" –باشە، ئەگەر بوو بە بڕیار لە هەموو ئەوانی تریان سەندەوە، ئەوا منیش نەپێشمەرگەو نەئوتومبێلم ناوێت. با بمكوژن. بە تەنیا لەگەڵ ماڵو منداڵەكەم لە دێیەك دائەنیشم. چی ئەبێت با ببێت."

بەڵام سامان وتی:

" –برای ئازیز چۆن شتی وا ئەكەیت. بۆ چی ئیش ناكەیت.؟"

وتم:

" –پێیان بڵێ، ئەگەر ئەڵێن، ئەچم بۆ مەڵبەندی یەك. ئەگەر نا، بۆ هیچ جێگایەكی تر ناچم."

سامان گەڕایەوە. پێی وتبوون، كە من چیم وتووە. كاك نەوشیروان وتبووی:

" –باشە، با ئەو بچێت بۆ تیپی (٥٥)ی قەرەداغ. با جەمال نەچێت."

(جەبار فەرمان)و ئەوانیش، پێیان خۆش بوو من بچم بۆ تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ. دایان نام بۆ تیپی (٥٥). لەگەڵ جەبار فەرمانو ئەواندا، گەڕامەوە بۆ قەرەداغ. جەبار فەرمان وتی:

" –زوو وەرە بچۆ بۆ تیپەكە."

لەبەر ئەوەی تیپی (٥٥) زۆر شێوابوو بە سەر یەكدا. هەر كەس بۆ خۆی بوو. كەس نامەی كەسی نەدەخوێندەوە. ماوەیەك (حامیدی حاجی غالی) سەرتیپیان بوو، دوای ئەو بە ماوەیەك، سەردار ناوتاقی جێگری تیپ بوو. سەرپەرشتی دەكردن. ماوەی هەفتەیەك لە ماڵەوە بووم، ئەوجا چووم بۆ مەڵبەند. ئەوانەی، كە خۆیان ناونابوو (ئاش)[51] زۆریان پێ ناخۆشبوو من چووبووم بۆ تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ. ئەوان بە تەمای جەمالی حەمەی خواكەرەم بوون، چونكە جەمال لەگەڵ ئەوان بوو. منیان زۆر لا خراپ بوو. كە چووم بۆ مەڵبەند، سامان مقەڕەكەی لە (تەكێ) بوو. چووم بۆ لای

[51] - ئاش: ڕێكخستنێكی تازە بوو، لە ناو كۆمەڵەدا بە نهێنی ئیشیان دەكرد. بە ناوی (ئاڵای شۆڕش) مەلا بەختیار سەركردەیان بوو.

سامان. لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندبوو. (مەلا بەختیار)یش، بە ماڵو مقەڕەوە، لە وێ بوو. لەگەڵ سامان چووین بۆ سەردانی وتی:

" —کاك ئاوات ئەڵێن بوویت بە سەرتیپی (٥٥)."

وتم:

" —بەڵێ."

وتی:

" —توخوا تازە تۆ ئەکەن بە سەر تیپ."

وتم:

" —کەی ئەوە کێشەیە."

وتی:

" —حەق نیە تۆ تازە سەر تیپی بکەیت."

وتم:

" —من مەسئولیەتم لا گرنگ نییە. هەتا بڕوام بە یەکێتی بێ، لە سەر تیپی کەمتریش بێت، ئەیکەم، کە بڕواشم پێ نەما، بمکەن بە سەرکردایەتیش نایکەم."

وتی:

" —تۆ زۆر بە تەحەمووڵی. سەرکەوتوو بیت."

وتم:

" —زۆر سوپاس."

ئەو لەبەر ئەوە پێی ناخۆش نەبوو، کە من غەدرم لێکراوە. بەڵکو ئەوەی پێ ناخۆشە، ئەو دەیویست کاك جەمال ببوایە بە سەر تیپی (٥٥)، چونکە تیپی پەنجاو پێنجی بە ماڵی خۆیانی دەزانی. بە چوونی من، لێیان تێکچوو. لە بەر ئەوەی دوو کەرتی زۆر باشی تیپەکە، بە پێشمەرگەو لێپرسراوەوە، هی ئەوان بوو. تیپەکەش خۆی چوار کەرت بوو. ئەوان بە نهێنی ڕێکخستنێکی تازەیان دروستکردبوو. لە ژێر ناوی (ئاڵای شۆڕش) دا. سەرکردایەتییەکیان هەبوو، پێکهاتبوون لە کۆمەڵێ برادەر. ئەمانە لە کۆمەڵە رازی نەبوون. گوایە کۆمەڵە لە خەتی مارکسی لایداوە، بووە بە ڕێکخستنێك لە خەتە ڕاستەکەی خۆی لای داوە. کۆمەڵە دەیزانی، کە شتێکی وا هەیە؛ بەڵام ئەوان هەر حاشایان لێ دەکرد. تا ئاخر جار سەرکردایەتی یەکێتی (مەلا بەختیار)ی بانگ کرد، ووتیان خۆتان ئاشکرا بکەن. مەلابەختیاریش ئیعترافی کرد، ڕاستە، کە ئێمە ڕێکخستنێکین بە ناوی ئاڵای شۆڕشەوە.

کە چووم بۆ لای کاك جەبار فەرمان وتی:

" —کەست ناوێت. خۆت ئەیان ناسیت."

سەردار ناوتاقی پێشمەرگە بوو لای خۆم لە سەرەتای شۆڕشەوە. ئەو لەو تیپەبوو. زۆری پێ خۆش بوو، کە من چووم. کەرتی ڕێکخستن هەموو کادرەکانی لەگەڵ

ماڵەکانیان لە دووکان بوون. دوکان دێیەکی ناخۆش نەبوو. ناوەڕاستی ناوچەکەبوو. خۆم ئەوێم هەڵبژاردبوو بۆ مقەڕی تیپ. بە سەردارم وت:

" -مقەڕەکە ئەگوێزمەوە بۆ دیوی دووکان."

وتی:

" -ئارەزوی خۆتە."

دووسێ شەو لە ماڵی سەردار ناوتاقی لە گوندی (سێوسێنان) بووم. لە پێشا هەموو لێپرسراوی تیپەکەم لە ماڵی (مەلا ئەحمەدی دسکەرە) لە گوندی دوکان کۆکردەوە. ئەو کاتە مەلا ئەحمەد کادری کۆمەڵە بوو لە کەرتی رێکخستنی کۆمەڵە. دواتر هەموو تیپەکەم لکۆکردەوە. مەلا (ئەحمەدی کەلاری) لێپرسراوی کەرتی رێکخستنی کۆمەڵە بوو. هەموویان بێ تاقەت ببوون. ئیتر زۆرمان قسەکرد لە بارەی تیپەکەوە. زۆر تەشجیعم کردن وتم:

" -ئەبێت تیپ چالاکی هەبێت."

بە تایبەتی ئەوانەی ئامر کەرت بوون، پێم وتن:

" -هەرچی لەوەوپێش بووە، من حەقم نیە چی بووە، بەڵام لەم رۆوە لاپەڕەی نوێ بۆ هەمووتان ئەکەمەوە."

ئیتر من لە دوای ئەم کۆبوونەوەیە، بڕیاری خۆم ئەدەم لە سەر هەر برادەرێك مەسئول بێت لە تیپەکە. لەوەو پێش من مەسئول نەبووم چۆن ئیشتان کردووە."

تیپی پەنجاو پێنج چوار کەرت بوو. ئامر کەرتەکان ئەمانە بوون:

مەولود گوڕپانی ئامر کەرتی یەك بوو. سەلامی فەقێ عەلی ئامر کەرتی دووی شارەزور بوو. رەئوفە کەڕ ئامر کەرتی سێ بوو. ئەحمەد ریشە ئامر کەرتی چوار بوو. ئەوەی تۆزێ چالاکی هەبوو، کەرتی دوو بوو لە شارەزور. کەرتی سێ‌و چواریش هەموو خەریکی جەولەکردن بوون لە ناوچەکەدا. ئەحمەد ریشە خۆی زۆر ئازابوو، بەڵام گوێیان بە هیچ نەدەدا، چونکە ئەوان خۆیان بە (ئاش) دەزانی‌و خۆیان بە پێشمەرگەی یەکێتی نەدەزانی. واش بوو. سەلامی فەقێ عەلی‌و ئیبراهیم عزیز، کە جێگری کەرت بوون، ئەوانیش هەر ئاش بوون. کەرتی دوو، گەورەترین کەرتی تیپەکەبوو. هەموویان بە پێشمەرگەو لێپرسراوەوە، ئاش بوون. ئەوەی ئاش نەبووبێت، لای خۆیان دەریان کردبوو. هەموو کەرتەکەیان کردبوو بە ئاش. دوای ئەوان کەرتی یەك بوو. هەموویانم کۆکردەوە، بە یەکەوە جەولەم پێکردن. بڕیارمدا، پێم وتن:

" -لەمەو دوا ئەبێت چالاکی بکەن."

پێشم وتن:

" -هەر ئامر کەرتێك چالاکی نەبێت، لای ئەبەم. دوایی گلەیی مەکەن."

جارێك كەرتی چوارو سێ چووبوون بۆ بەری زمناكۆ. سەردار ناوتاقی چووبوو لەگەڵیان، رەبايەيەكی عەسكەری لێبوو، گرتبوويان. دەستكەوتيان دوو قەناسەو حەوت كڵاشنكۆف بوو.

٧٥

كۆمەڵە ئاگادار بوو، كە رێكخراوێكی نهێنی بە ناوی (ئاڵای شۆرش)ەوە لە ناو كۆمەڵەدا هەيە، بەڵام ئەوان هەر حاشايان لێ دەكرد. ماوەيەكی پێ چوو، ئاش خۆيان ئاشكرا كرد. رايانگەياند، كە ئەوان رێكخستنێكی جياوازن لە كۆمەڵە. مەلا بەختيار چووبوو بۆ كۆبونەوەی سەركردايەتی، لە وێ پێی راگەياندبوون، كە ئەوان رێكخستنێكن بە ناوی (ئاڵای شۆرش)ەوە. دەيانەوێت خۆيان ئاشكرا بكەن‌و جيابېنەوە. لەگەڵ يەكێتی وەك جەبهە ئيش بكەن. وەك شۆرش گێران. ئەوانيش پێيان وتبوون:

" -باشە، بەڵام ئەبێت خۆتان ئاشكرا بكەن. هەر كەسێك لەگەڵ ئێوەيە، با خۆی ئاشكرا بكات."

مەلا بەختيار گەرايەوە بۆ قەرەداغ، بۆ ئەوەی ئيعلانی رێكخراوەكەی خۆيان بكات. ئەوەی سەر بەوانە جيابنەوەو بچن بۆ لای مەلا بەختيار. زۆر كەس پەيمانی بە مەلا بەختيار دابوو، كە لەگەڵيان بێ. زۆر دڵيان بەوە خۆش بوو. هەتا مەلا بەختيار وليكرد، لە سەركردايەتيەوە بڕياريان دابوو، كە هەمووويان بگرن. (شەوكەتی حاجی موشير)و (مام رۆستەم)يان لە سەركردايەتی يەوە ناردبوو بۆ گرتنی مەلا بەختيار. لەو كاتەشدا، (حاميدی حاجی غالی)و (وەهاب) لە قەرەداغ لە گوندی (شيوی قازی) دانيشتبوون. لە سنوری تيپی (٥٥)ی قەرەداغدا. بە (شەوكەت)يان وتبوو، ئەوانيش بانگ بكا. هەر چواريان پێكەوە هەڵسن بەو كارە. چووبوون لەگەڵ مەڵبەنديشدا قسەيان كردبوو، كە ئەوان تەدەخول نەكەن. پێشمەرگەيان بدەنێ. سەركردايەتيش نامەی بۆ مەڵبەند ناردبوو، كە بۆ خۆيان تەدەخول نەكەن. بەڵام (شەوكەت)و ئەوان، چييان دەوێ بۆيان جێبەجێ بكەن. لە سەركردايەتی، (شێخ عەلی)و پشكۆيان گرتبوو. بروسكەشيان بۆ (شەوكەت)و ئەوان كردبوو، كە لای خۆيانەوە دەست پێ بكەن. شەو من لە دووكان بووم، كاتێكم زانی دوو ئوتومبيل هات، لە پشت ماڵی ئێمەوە وەستان. پێشمەرگەيەك هات وتی:

" -ئەوە كاك شەوكەت‌و كاك وەهاب‌و كاك حاميدو مام رۆستەمن."

چووم بۆ لايان. سەيرمكرد وەزعيان باش بوو. بە تايبەتی مام رۆستەم‌و كاك وەهاب. وتيان:

" -ئەوا ئەچين بۆ گرتنی مەلا بەختيار، تۆش ئاگاداربە. بچۆ لای خۆتان، ئەوەی شكت لێيەتی، چەكی بكە. بە تايبەتی سەلام‌و ئيبراهيم‌و ئەحمەد ريشە."

وتم:

" –باشه گوێ مەدەنە ئێمە."

ئەوان رۆیشتن. منیش چووم بۆ لای برادەران، هەموویانم کۆکردەوە. ئیبراهیمو سەلامم بانگ کرد، پێم وتن:

" –جارێ چەك دابنێن لای ئێمە، چونکە مەلا بەختیارو هەموو برادەرەکانتان گیراون."

زۆر تێکچوون وتیان:

" –کاك ئاوات ئاگات لێمان بێت. ئێمە چەندین ساڵە پێشمەرگەین، ئێستا مەمان شکێنن. ئێمە هیچ نەبووین."

پێم وتن:

" –راستە ئێوە پێشمەرگەی زۆر قارەمانن. خوا ئەوە بگرێت، کە خۆشیو ئێوەشی وا لێکرد. من پێتان ئەڵێم ئێوە رێزی زۆرتان لای من هەیە، چونکە ئێوە پێشمەرگەی قارەمان بوون. ئێستاش ئەوە چەکەکانی خۆتان، با هەر بە خۆتان بێت، بەڵام جارێ لەگەڵ خۆم بن، هەتا بزانین وەزعی مەلا بەختیار چۆن ئەبێت."

ئەوان لەگەڵ خۆمدابوون، بروسکەیەکی جەبار فەرمانم بە دەست گەیشت، دەڵێ:

" –(کاك شەوکەتو ئەوان هەر چیەکیان کرد، تۆ حەقت نەبێت. چییان پێ وتی، وا بکە، بەڵام وریابە.)"

(شەوکەت)و ئەوان ئەو شەوە رۆشتبوون بۆ مەڵبەند. پێش ئەوەی بچن بۆ مەڵبەند (بێستونی مەلا عومەر) یان ناردبوو بۆ لای مەلا بەختیار، کە رابکا، چونکە دەیگرن. نازانم (شەوکەت) ئاگای لەوە بوو یان نا. برادەرانی تر خۆیان بە هەموو کەسیان وتبوو ئەچین بۆ گرتنی مەلا بەختیار، بۆ ئەوەی را بکا. (جەبار فەرمان) لەوان وریاتربوو. هەر زوو مەفرەزەیەکی ناردبوو بۆ ئەوەی ئاگادار بن، هیچ نەکەن هەر چی بوو. (جەبار فەرمان) ئاگادار بکەنەوە. مەلا بەختیار خۆی کۆکردبۆوە بڕوا. لە پێشەوە کۆمەڵێ پێشمەرگە بە رێ دەخا، بەڵام پێشمەرگەکانی لای (جەبار)و (سامان)، ئاگاداری (جەبارفەرمان) دەکەن، کە وا مەلا بەختیار خەریکی راکردنە. هەندێ پێشمەرگەی بە رێ خستووە، دەوری (٢٥) پێشمەرگەن. ئەوانیش وتوبیان:

" – واز لەوان بێنن، ئێوە بزانن خۆی چی ئەکات؟ ئاگاتان لە خۆی بێت، بەس مەیەڵن خۆی بڕوات."

برادەرانیش خۆیان لە وێ خەوتبوون. (شەوکەت) بە جدی بوو، دەیوویست بیگرێ، ئەگینا (وەهاب)و (حامیدی حاجی غالی)و (مام رۆستەم) حەزیان دەکرد (مەلا بەختیار) رابکا، چونکە ئەوان تاقەتیان نەبوو. دەمەو بەیان (جەبار فەرمان)و (سامان) خۆیان چووبوون دەوری ماڵی (مەلا بەختیار)یان گرتبوو، نەیانهێشت رابکا. بۆ بەیانی برادەرانی تر چووبوون گرتیان. دوایش ئەو پێشمەرگانەی، کە بە رێی کردبوون، شەو

چوون له (چەمی سمۆر) هەموویان چەك كردن. (بەكری حاجی سەفەر) زۆر هەوڵی دابوو بۆ ئەوەی بەری بدەن. وایزانی بوو هەر بە ئەمری خۆیان گرتوویانە. بە٠ (بەكر)یان وتبوو ئەوە بڕیاری سەركردایەتیە، هی ئێمە نییە، بەڵام هەر لەگەڵیان بوو. ئیتر هێنایان بۆ شیوی قازی بۆ ماڵی (حامیدی حاجی غالی). منیش، كە چووم، (مەلا بەختیار) جنێوی دەدا بە ئارەزوی خۆی. دەیوت:

" -جاشەكانی جەلال تاڵەبانی."

كەس نەی دەوت بۆ وا دەڵێی. ئیتر ئەو شەوە چووبوون بۆ ئاوایی بۆ ماڵی شێخ دلێری شێخ مستەفا. من نەچووم. مام ڕۆستەم بە منی وت:

" -كاك ئاوات من بۆ خۆم لەگەڵ كاك نەوشیروان قسەم كردووە دەربارەی سەلامو ئیبراهیم. وتی با بێن بۆ لای خۆم. تۆ چەكەكانیان بەرەوە با بچن بۆ لای كاك نەوشیروان."

وتم:

" -زۆر باشە، با بچن."

بەڵام، كە بینیان مەلا بەختیار گیراوە، ئیتر بۆیان دەركەوت وەزع خراپە دەیانگرن. من لە گوڵ كاڵترم پێ نەوتن. زۆرم ڕێز لێگرتن، پێم وتن:

" -خۆتان پێتان چۆنە بچن بۆ لای كاك نەوشیروان؟."

وتیان:

" -زۆر پێمان باشە."

زۆر دڵنەوایم كردن وتم:

" -بچن، من دڵنیام كاك نەوشیروان زۆر ڕێزتان لێ ئەگرێت. هەر چییەكتان بووێت بۆتان ئەكات. چەند پێشمەرگەشتان ئەوێت لەگەڵ خۆتان ببەن هەتا ئەچنە سەركردایەتی."

وتیان:

" -زۆر سوپاسی تۆ ئەكەین. كەسمان ناوێت. خۆمان ئەڕۆین. پێشمەرگەمان بۆ چییە.؟"

وتم:

" -كەیفی خۆتانە."

وتیان:

" -ئەمڕۆ ئەڕۆین."

ئەوان ڕۆیشتن. منیش كەرتەكەیانم كۆكردەوە، زۆر قسەم بۆ كردن پێم وتن:

" -ئەو برادەرانە چوون بۆ سەركردایەتی، ڕەنگە چەند ڕۆژێكی تر بێنەوە."

برادەرێكیان هەبوو ناوی (كوردۆ) بوو، خەڵكی گوندی زێگوێز بوو. ئامر مەفرەزەیان بوو. ئەوم دانا بۆ سەرپەرشتیان. هەموویان پێیان باش بوو. وتیان:

" –ئەچینەوە بۆ دیوی شارەزور بۆ ناوچەی خۆمان."
وتم:
" –باشە برۆن."
بەڵام سەلام‌و ئیبراهیم سێ‌و چوار رۆژبوو رۆشتبوون. تووماس نەچوو بوون بۆ سەرکردایەتی. قەراریان کردووە، ئەوان لە شارەزور چاوەڕێی کەرتەکە ئەکەن تا لەوێ یەك بگرنەوە. دوای نیوەڕۆ بوو، ئەوانیش چووبوونەوە بۆ دیوی شارەزور. بەیانی زوو هەواڵم بۆ هات وتیان:
" –کەرتی شارەزور ئەمشەو چوونەتە زەڕایەن تەسلیم بە حکومەت بونەتەوە."
پێشمەرگەیەك نەچووبوو لەگەڵیان. ئەوانیش چەکەکەیان لیَ وەرگرت بوو. بە کاملی بە خۆیان‌و هەموو چەکەکانیانەوە چووبوونەوە بۆ لای رژێم. زۆر ناخۆش بوو، چونکە ئەوان هێزی تیپەکەبوون. لە روی چەك‌و پێشمەرگەشەوە. (٤٢) پێشمەرگە بوون. باشترین چەکیشیان پێ بوو. چوون تەسلیم بوونەوە. ئەحمەد ریشەو ئەوانیش چووبوون بۆ ئێران. ئیتر تیپی (٥٥) هەڵوەشایەوە. هەموو تیپەکەم کۆکردەوە، ماوەیەك هەر خۆم سەرپەرشتی هەموو تیپەکەم دەکرد. کۆمەڵێ چالاکی باشمان کرد، تۆزێ ورەی تیپەکەمان بەرز کردەوە.
لە بەر ئەوەی ئەو ماوەیەی، کە خۆم لەگەڵیان بووم، دەمزانی ئاستی ئامر کەرت‌و ئامر مەرەزەکان‌و ئاستی پێشمەرگە لە هەموو رویەکەوە چۆنە. دیسانەوە هەموو تیپەکەم دووبارە رێکخستەوە. زۆری ئامر کەرتەکانم گۆڕی‌و ئامر کەرتی تازەم دانا. بە بێ ئەوەی گوێ بدەمە زوبر بوونی کەس، گۆڕانکاریم لە تیپەکەدا کرد. هەژار دەرەویانی لە گەرمیانەوە خۆی نقڵ کرد بۆ لای ئێمە. ئەومان کرد بە ئامر کەرتی شارەزور. ئەو حەوت پێشمەرگەی ئازاو رێکوپێکی لەگەڵ بوو. کۆمەڵێك پێشمەرگەی باشم بۆ نقڵ کردن (فەریقە سور) لەگەڵ خۆم بوو، ئەویشم کرد بە جێگری کەرت لەگەڵ هەژار دا. فەریقە سور پێشمەرگەیەکی زۆر دێرین بوو. کەرتی شارەزور، بوو بە کەرتێکی زۆر باش. ئیتر تیپ گۆڕانکارییەکی زۆر باشی بە سەردا هات. پێشتر تیپێکی زۆر هەڵوەشاو بوو. هیچی بە سەر هیچەوە نەمابوو. رۆژانە چالاکی زۆر باشمان دەکرد. ئامر کەرتەکانیش زۆریان تازە بوون. بە تایبەتی هەژار زۆر چالاك بوو. بە ماوەیەکی کەم، کەرتەکەیان بوو بە باشترین کەرت لە هەموو رویەکەوە. زۆر لە جاران باشتر بوو.
ماوەیەکی پێ چوو (جەبار فەرمان) ناردی بە دوامدا، وتی:
" –ئامادەبن ئەچین بۆ سەرکردایەتی بۆ پلینۆمی کۆمەڵە."
هەموو بە رێکەوتین بەرەو سەرکردایەتی. گەیشتینە بەرگەڵو. مقەڕی کاك نەوشیروان لە وێ بوو. مقەڕی ناوەندی کۆمەڵەش هەر لە بەرگەڵو بوو. هەموو مەسئولینی کۆمەڵە لە وێ کۆبووینەوە. کۆبوونەوە دەستی پێکرد. شەوو رۆژ بۆ یەك خولەکیش حکومەت لە تۆپ باران نەدەوەستا. هەر خەریکبوو لە دەنگی تۆپ مێشکمان دەتەقی. بە

بەردەوامی، هەر لە کارێزەوەو لە دۆڵی سورداشەوەو لە دوکانەوەو لە سورە قەڵاتەوە تۆپ بارانی دەکردین. زۆر ناخۆش بوو. پلینۆمەکەمان ناو نابوو (پلیتۆپ) ئیتر لەو پلینۆمەدا موناقەشە زۆرکرا لە سەر ئاش‌و وەزعی کۆمەڵە. ئەو کاتەش ئەو برادەرانە گیرابوون. مەلا بەختیارو شێخ عەلی‌و پشکۆ. ئەوان سەرکردایەتی ئاش بوون. مەلا بەختیار پێشتر سەرکردایەتی کۆمەڵەبوو دەرکرا. (ئازاد هەورامی) نامەیەکی نوسیبو بۆ پلینۆم، کە ئەویش وازی لە سەرکردایەتی هێناوە. نەهات بۆ پلینۆم وتی:

" —من ئەچمە دەرەوە."

ملازم عومەریش هەر نەهات. ئەویش وازی لە کۆمەڵە هێنا. لە جێگای ئەوان چوار برادەری تر بوون بە سەرکردایەتی. حەمە تۆفیق یەکێکیان بوو. دکتۆر خەسرەو دووهەمیان بوو. دوانەکەی تریان عومەر فەتاح‌و دلێر ئەحمەد شوکری ناسراو بە (سلیم) بوون. لە پلینۆمەکەدا موناقەشە لە سەر چارەنووسی ئاش کرا، کە چیان بۆ بکەن‌و چیان لێ بکەن. وتیان:

" —بڕیاری کۆنفرانسی (سێ)ی کۆمەڵە چییە، بۆ ئەوانەی، کە (خەت مایل) ئیش لە ناو کۆمەڵەدا بکەن بۆ رێکخستنێکی تر.؟"

وتیان:

" —ئیعدام."

بەڵام ئیعدام زۆر قورس بوو. بە گشتی بڕیار درا جیا بکرێنەوە. ئەوانەی سەرکردایەتی نین، ئەو بڕیارەیان بە سەردا جێ بەجێ نەکەن، بەڵام ئەوانەی سەرکردایەتین ئەو بڕیارە بیانگرێتەوە. بە زۆربەی دەنگ بڕیارەکە پەسەندکرا، بەڵام لە موناقەشەکاندا بڕیارەکەیان گۆڕی بەوەی ئیعدام نەکرێن، بەڵام سیاسیەن ئیعدام بکرێن. وتیان:

" —ئەبێت هەموو ئەندامێکی پلینۆم ئەو بڕیارە ئیمزا بکات."

هەموو ئیمزامانکرد. دوای ئەوە (قادری حاجی عەلی)و (شۆڕش حاجی) بڕیارەکانی پلینۆمیان برد بۆ (مەلا بەختیار). پێیان وتبوو:

ئەوە بڕیاری پلینۆمە."

ئەویش بڕیاری دابوو بەس نەیکوژن چیی لێ داوا بکەن، ئامادەیە جێبەجێی بکا.

پلینۆم کۆتایی هات. ئیتر بڕیاربوو بگەڕێینەوە. کاک جەبار فەرمان وتی:

" —من نایەمەوە."

ئەو لە ناوەندی کۆمەڵە مایەوە. ئێمەش گەڕاینەوە بۆ مەڵبەند. ماوەیەکی پێ چوو، کاک شەوکەت نەقڵ بوو بۆ مەڵبەندی یەک. بوو بە لێپرسراوی مەڵبەند.

ساڵی ١٩٨٦ لە تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ زۆر بە باشی ئیشم کردو مامەوە. تیپێکی زۆر باش بوو. ببوو بە یەکێك لە هەرە تیپە باشەکانی مەڵبەندی یەك. شەوێ تیپەکەم کۆکردەوە چووین بۆ گرتنی ربایەیەك لە پشت گوندی (سوێراوە) دەوری بیست پێشمەرگەم هەڵبژارد لە هەژارو چەند برادەرێکی تر. دوو پێشمەرگەم لەگەڵ بوو هەردووکیان برابوون. شەو یەکێکیانم جیاکردەوە بۆ شەڕەکە، ئەوی تریان وتی:

" —منیش دێم."

وتم:

" —کاکە، دوو برا نابێت بە یەکەوە بێن. بۆ جارێکی تر تۆ ئەبەم."

کردی بە بۆڵە بۆڵ وتی:

" —هەر یەم."

وتم:

" —هەر نایەیت."

وتی:

" —مادەم وایە من هەر لەم تیپە نابم."

وتم:

" —کاکە گیان خەمت نەبێت، وعدت ئەدەمێ بۆ دەیان شەڕی تر ئەتبەمو شەهیدیش ئەبیت."

نەمبرد. شەو، کە چووین بۆ سەر ربایەکە، بۆمان نەگیرا. بۆ بەیانی گەڕاینەوە. رۆژی دوایی چووین لە سەر رێگای (قەرەدغ—سلێمانی) دامەزراین، بۆ گرتنی رێگاکە. لە پشتی گوندی باخان دامەزراین. بەیانی قافڵەیەك لە بەینی قەرەداغو سلێمانی هات. شەر دەستی پێ کرد. لە سەعاتی یەکەمدا ئەو پێشمەرگەیە بریندار بوو، کە دەیوت یەم بۆ شەڕ. ناوی (موشیر) بوو کوڕی پیاوێکی زۆر دڵسۆزبوو، زۆر برادەرم بوو. کۆنە دۆستی حیزبی شیوعی بوو. دوو کوڕەکەی ناویان (موکەڕەم)و (موشیر) بوون. ئەو شەوە موشیر بە زۆر دەیویست بێت بۆ شەڕی رەبایەکە، کردی بە بۆڵە بۆڵ. منیش هەر لە خۆمەوە هات بە دەممدا وتم شەهید دەبیت. کەچی بۆ رۆژی دوایی بریندار بوو. زۆر حاڵی خراپ بوو. بە پەلە بە سەیارە ناردم بۆ مقەڕی خۆمان وتم:

" —جارێ بیبەن بۆ لای دکتۆرەکەی خۆمان، دوایی بیبەن بۆ مەڵبەند."

شەڕەکە زۆر گەورە بوو. لە قەرەداغو سلێمانیەوە هێزمان بۆ هات. ئێمەش لە بەینی هەر دوو هێزەکەدا بووین. نەمان هێشت بێنە پێشەوە. شەڕەکە زۆر قورس بوو. لە مەڵبەندەوە داوایانکرد هێزمان بۆ بنێرن. وتمان پێویستیمان بە هێز نییە، چونکە زۆر موسەیتەر بووین بە سەر شەڕەکەدا. جاشێکی زۆر کوژرا. دوو ئوتومبیلمان سوتاند.

دەوری (١٠)جاشیشمان بە دیل گرت. ئەو ڕۆژە نەمانهێشت قافلەی حکومەت بە جادەی قەرەداغ– سلێمانیدا بڕوات. لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو، کە ئێوارە گەڕاینەوە، هەواڵی موشیرم پرسی وتیان:

" –نەگەیشتۆتە مەڵبەند شەهید بووە."

ئەوەندەم پێ ناخۆش بوو، ئەو هەموو سەرکەوتنەم لە بیر چۆوە. بردبوویانەوە بۆ گوندەکەی خۆیان لە دەلوجە، لە وێ بە خاکیان سپارد هەر. لە وێش پرسەکەی بۆ گیرا. باوکی لە سلێمانیەوە هاتبوو بۆ پرسەکەی، کە منی بینی، هات بەرەو پیرم ئەم لاولای ماچکردم. ئەو دڵخۆشی منی دەدایەوە دەیوت:

" –من شانازی بەوەوە ئەکەم، کە میللەتەکەم لێم ڕازی بێت، بەوەی کوڕی من پێشمەرگەی ئەوان بووە. ڕاستە کوڕی منە، بەڵام کوڕی شۆڕش بوو. من سەر خۆشی لە ئێوەو کورد ئەکەم."

نەمدەزانی چی وەڵام بدەمەوە. ئەوەندە پیاوێکی قارەمانو خۆ ڕاگر بوو. ئەو لە من باشتر بوو. بە ڕاستی خۆم بەغیلیم پێ دەبرد. دەموت خۆزگە کورد هەمووی وا دڵسۆزی میللەتەکەی دەبوو. ئەگەر وا بوایە، زۆر دەمێك بوو کورد دەوڵەتی خۆی هەبوو. ئێستاش تا دوا هەناسەم هەڵوێستی ئەو پیاوەم هەر لە یادە. قەت لە بیرم ناچێتەوە.

٧٧

نزیکی جەژنی قوربانی ١٩٨٦ بوو. بە هەموو برادەرانم وت:

" –کێ ئەچێتەوە بۆ ماڵەوە با بچێت."

هەژاریش تازە ژنی لە گوندەکەی خۆیان مارە کردبوو، پێم وت:

" –بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، هەتا دوای جەژن."

وتی:

" –باشە."

کەچی لە بری ئەوەی بڕواتەوە بۆ ماڵەوە، (١٠) پێشمەرگەی بردبوو، چووبوو بۆ سلێمانی. وتبووی:

" –ئەمشەو دەچین بۆ سلێمانی."

بە دزی منەوە چووبوون. دەیزانی ئەگەر من بزانم، نەمدەهێشت بچن. پێشمەرگەکانی بردبوو وتبووی:

" –ئەمشەو لە ناو شاردا ئەبێت بە تەقە. ئەزانین لە چ ماڵێکدا تەقە ئەکرێ. هەر کاتێك بوو بە تەقە ئەچینە سەریان."

که چووبونەوە بۆ سلێمانی، چوو بوونە گەڕەکی (خەبات) چوار پێشمەرگەیان کردبوو بە کەمین. خۆیو فەریقە سوورو ئەرسەلان بە یەکەوە چووبوونە ماڵێ. پرسیاریان لە ماڵەکە کردبوو. کاتێکیان زانیبوو هەموو کۆڵانەکانیان لێ گیرابوو. ئیتر لە هەموو لایەکەوە ببوو بە تەقە. بە پەلە لە ماڵەکە دەرچوو بوون، هەژار بەرکەوتبوو. هەر لەوێدا شەهید ببوو. فەریقو ئەرسەلان هەر ئەوەندەیان پێکرابوو نەیەڵن تەرمەکەی هەژار دەست دوژمن بکەوێ. بە شەڕ دەریان کردبوو. تەرمەکەیان دوور خستبۆوە لەو جێگایە. بردبوویان بۆ ماڵێکی خزمی خۆی. لە وێ شاردبوویانەوە. شەش پێشمەرگەکەی تر، کە دایاننابوون بە کەمین، هەر شەشیان شەهید بوون. لە کۆڵانەکاندا کەوتبوون هەتا بەیانی. یەکێك لەو شەهیدانە (موکەڕەم)ی برای شەهید موشیر بوو، کە هەمووی ماوەیەکی کەم بوو شەهید بووبوو. ئەوی تریشیان برای (حەمە عەربەتی) بوو. کوڕێکی پورزای منیش، کە پورزای فەریقە سووریش بوو، هاتبوو بۆ لایان، ئەویش شەهیدبوو. ناوی (بەختیار) بوو. قوتابی زانکۆبوو. ئەویش هەر رێکخستن بوو. بەوەوە بوون بە هەشت پێشمەرگە. بە داخەوە ئەو پێشمەرگە قارەمانانە شەهید بوون. ئەو شەوە جاشەکان گەورەترین زیانیان لێدابن. ئازاترین ئامر کەرتو شەش پێشمەرگەی زۆر قارەمانیان شەهید کردین. ئەوە گەورەترین زیان بوو، لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ کەوت. ئێمە ئاگامان لێ نەبوو، کە چووبوونەوە بۆ سلێمانی. لە دوکان بووم، کاتی نیوەڕۆ بوو. نامەیەکم بۆ هات، کە خوێندمەوە نامەی فەریقە سوور بوو دەڵێ:

" -(شەو چووین بۆ سلێمانی. لە ناو شاردا، کاك هەژار لەگەڵ شەش پێشمەرگەی تردا شەهید بوون.)"

کە نامەکەم خوێندەوە، وشك بووم. یەکسەر بە پەلە رۆیشتم بۆ شارەزور، کە چووم، فەریقە سوورو برادەرەکانی لە گوندی (شەمە) بوون. لە وێ رووداوەکەیان بۆ گێڕامەوە چۆن بووەو چۆن شەهید بوون. وتیان:

" -هەژارمان لە ماڵێك شاردۆتەوە. لەوانەیە دەریان کردبێت بۆ دەرەوە."

ئەو رۆژە زۆر رۆژێکی شومو ناخۆش بوو. هەر ئەوەندەبوو لە داخاندا خۆم ئینتحار بکەم. بە راستی هەژارو ئەو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵیدا شەهید ببوون، زۆر ئازابوون. ئازاو قارەمانی وا کەم بوون. بە تایبەتی هەژارم ئەوەندە خۆش دەویست. قەد براشم ئەوەندە خۆش نەدەویست. هەر لە شارەزور گەڕامەوە، چووم بۆ گوندی (دەرەویان) هەتا ئێمە چووین، تەرمەکەیان بە دزییەوە هێنابۆوە. سێ رۆژ لە ماڵی خۆیان بووم، لەگەڵ براکانی. جاران لەگەڵ هەژاردا دەچووینەوە بۆ ماڵیان، ئێستا دەچم بۆ پرسەکەی. زۆر شتێکی ناخۆش بوو. خێزانەکەشیان زۆر رێکوپێك بوون. لە وێ گەڕامەوە، چوومەوە بۆ (دەلوجە) بۆ پرسەی موکەڕەم، کە چووم باوکی لە وێ بوو. ئەمە لە ماوەی یەك مانگدا دوو کوڕی ئازاو نەبەردی شەهید بوو. کارەسات بوو.

شتێکی زۆر ستەم بوو نەمدەزانی چی بڵێم. بە ڕاستی باوکیان زۆر وورەی بەرز بوو. دەیگوت:
خۆم ئەبم بە پێشمەرگە."

کورد پیاوی وای تیابوو. خەڵك بەو ڕۆحیەتەوە لەگەڵ شۆڕشدا بوو. زۆری وامان هەبوو. بە داخەوە، ڕەنگە ئێستا هەر دیار نەبن. ئەو هەموو جاشانەشمان هەبوو ڕاوی پێشمەرگەیان دەکرد. لە دوای ڕاپەڕین وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون. لەم شۆڕشەدا کارەساتی وایان دەخوڵقاند، چەندەهای وەك هەژارو هاوڕێکانی بە دەستی ئەو خائینانە شەهید بوون. کەچی لە دوای ڕاپەڕین تەرازوی هاوکێشەکان گۆڕا. حیزبەکان لە نێوان خۆیاندا کەوتنە ململانێی یەکتری، لە سەر ئەوەی کام لایەن دەتوانن زیاتر خائین لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە. بە جۆرێك جیاوازی نەما لە نێوان پێشمەرگەو خائیندا. لە هەندێ حاڵەتدا، خائینەکان زۆر لە پێشتر بوون لە وانەی نیشتمان پەروەر بوون. وەك دزو خاوەن ماڵی لێ هاتبوو. بە پێچەوانەی شۆڕشی جەزائیرەوە، کاتێك شۆڕشەکەیان سەرکەوتنی بە دەست هێنا، ئەو خائنو خۆ فرۆشانەی، کە هەم ئاهەنگ بوون لەگەڵ داگیرکەرەکانیاندا، لە وڵاتەکەیان دەرکردن. بەڵام بە داخەوە لە کوردستانی ئێمەدا بە پێچەوانەوە، میللەت فرۆشانو کۆنە بەعسی بە دەسەڵاتترن لە پێشمەرگەی دێرین. ئەوانەی، کە قوربانیان داوە پشت گوێ خراون. ئێستا چاوەڕێی دەستی خۆ فرۆشانن واستەیەکیان بۆ بکەن. کە بێتە سەر حساب، دەڵێن ئەوان خاوەن ئەزمونو خاوەن شەهادەن. بەڵام ئەوانەی، کە پێشمەرگەو نیشتمان پەروەرن شەهادەیان نییە. لە دنیادا گەورەترین شەهادە وەتەنیەتو خزمەتکردنی نەتەوەو وڵاتە. لە کۆمەڵگای ئێمەدا شەهادەی خیانەت گرنگترە لە شەهادەی وەتەنیەت. بە داخەوە میللەت چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد. بە شەهیدبوونی ئەو هاوڕێیانەم، وەك شێتم لێ هاتبوو. زۆر بێ تاقەت ببووم. زۆرم کارەساتی دڵتەزێنو ناخۆشی لەو جۆرەم بینی بوو، بەڵام ئەم کارەساتە زیاد لە سنوور کاری لێ کردبووم. دوو شەهیدیان هەر یەکەی برایەکی تریان شەهید ببوو. هەژاریشم زۆر خۆش دەویست. بە تەمای زەماوەندبوو. ئێمەش وەفای خۆمان بۆ هاوڕێکانمان ئەوە بوو، زیاتر دڵسۆزی بێ بۆ گەلو شۆڕشو درێژە دان بە ڕێبازەکەیانو تۆڵە کردنەوە بێت لە دوژمن. بیرم کردەوە بچینە سەر مۆڵگەی ئەو جاشانەی، کە ئەو تاوانەیان کردبوو. چیمان پێکرا، بیکەین. دوایی لێکم دایەوە، ئەگەر بچینە سەر ئەوان، هەر دەبێت کورد بکوژین. ڕاستە ئەوانە زۆر تاوانبار بوون، بەڵام کێ ئەو تاوانەی پێ کردوون؟ پێم باش بوو ئەگەر بۆمان بکرێ چالاکییەك بکەین، کاریگەری هەبێ بۆ سەر ڕژێمو دەوڵەت، چونکە ئەوان زۆر جاشیان بە لاوە گرنگ نەبوو. سەد جاشیان بە قەد عەسکەرێکی عەرەب بە لاوە گرنگ نەبوو. منیش بڕیارمدابوو لە پێش ئەوەی چلەی ئەو شەهیدانە ساز بکرێت، دەبێت تۆڵەی شەهیدان بکەینەوە. خۆ هەرچییەکمان بکردایە هەر تۆڵەی

ئەوان نەبوو. هەر باش بوو، ئەگەر گورزێکی باش لە دوژمن بوەشێنین، پێش ئەوەی بچین بۆ یادی چل ڕۆژەی ئەو شەهیدە قارەمانانە.

دوای نیوەڕۆبوو، بە برادەرانم وت:

" -ئێوە بچن بۆ دیوی شارەزور."

پێشم وتن سەعات چەند لە کوێ بن. بەڵام پێم نەوتن بۆ کوێ دەچین‌و بۆچی دەچین. هەر ئەوەندە نەبێ وتم ئێوە سەعات ئەوەندە لەوێ ئامادەبن. دوای نیوەڕۆ بوو، لە مقەڕ لە گوندی دوکان ئەوانم بە ڕێکرد. خۆشم لەگەڵ دە پێشمەرگەدا بە ئوتومبیل بەرەو گوندی قارەمان چووم. بە پێچەوانەی ئەوانەوە خۆم ڕۆیشتم. بۆ ئەوەی کەس هەست نەکا بۆ کارێ دەچین. هاوین بوو، مانگی حەوت بوو. چوومە گوندی قارەمان. لە وێ یەك سەعات ماینەوە. لە وێشەوە بە ڕێ کەوتم بەرەو شارەزور. لە (گڵە زەردە) چوومە خوارەوە بۆ گوندی (سەوبیست) چوومە ماڵی (عومەری حەمە سەعید) لە وێش چایەکمان خواردەوە. عومەر زۆر تێم ئاڵا، کە دەبێ ئێوارە لای ئەو بین. پێم وت:

" -زۆر سوپاس. ئەم ئێوارەیە مەوعیدم هەیە، بەڵام تۆ ئەگەر دەتوانیت ئوتومبیلەکەم بۆ بەرە بۆ گوندی (زڕگوێز)."

وتی:

" -ئەوە ئاسانە، بە سەر چاو."

چونکە دەبوایە ئوتومبێلەکەی بە سەر جادەی قیردا ببردایە بۆ ناو دێکە. ئوتومبیلەکەش پیکابێکی عەسکەری بوو. سەر جادەکەش ئەمبەرو ئەو بەری ڕەبایەی جەیش بوو. هەر لە بەر دەمی گوندی (زڕگوێز)دا، یەك ڕەبایەی گەورەی لێ بوو. دەبوو بە پاڵ ڕەبایەکەدا بڕۆشتایە بۆ ناو گوندەکە. گوندەکە هەر (٣٠٠) مەتر لە جادەکەوە دوور بوو. خۆمان بە پێ ڕۆشتین بۆ ناو گوندی زڕگوێز. هەر نیو سەعات لە یەکەوە دوور بوو. خۆمان بە پێ چووینە ناو دێکەوە. هەموو ئاواییەکە باخ بوو. زۆر دیار نەبووین. پشتی دێکەش شاخ بوو. ئەگەر شتێك ببوایە، دەمانتوانی بە شەڕ دەربچین. نزیکی ئێوارەش بوو. دوو سەعات ڕۆژی مابوو، چووینە ماڵی (عەلی ئاغا)ی زڕگوێز. زۆر پیاوێکی باش بوو. ناسیاوی خۆم بوو. کوڕێکیشی پێشمەرگە بوو بە ناوی جەمال. ئەو کاتە لە تیپی (٥٧) هەموویان یەکێتی بوون. چوومە سەر بانەکەی ئەوان بە دووربین سەیری ئەو موعەسکەرانەی سەر جادەی عەربەت-سلێمانیم کرد، بۆ ئەوەی بزانم یەکێ لەو موعەسکەرانەی سەر جادەکە دەست نیشان بکەم، تا شەو پەلاماریان بدەین. هەرچی سەیرمکرد موعەسکەرەکان زۆر گەورەن. ئێمەش بە هەمووی دەوری (١٠٠) پێشمەرگە دەبووین. هەر لە عەربەت دەرچووی، موعەسکەر بوو، هەتا ناو شاری سلێمانی. هەر هەمووشی بە دەم یەکەوە بوون. دانەیەکیان لە بەر چاوم بچوك بوو. لە پشتی (دەمرکان)ەوە بوو، لە بەینی دوو موعەسکەری تردابوو. لەبەر ئەوەی لە ناو دۆڵێکدابوو، باش دیار نەبوو. وامزانی ئەوە لە هەموویان بچوکترە.

به بۆچوونی خۆم دەتوانین کۆنترۆڵی بکەین. بڕیارمدا ئەگەر هەر هەمووشمان شەهید ببین، هەر دەبێت ئەم شەو پەلاماری ئەو موعەسکەرە بدەین. یان دەیگرین یان ئێمەش وەك هەزارو هاوڕێکانی شەهید دەبین. لەو کاتەدا من سەیری ئەو ناوەم دەکرد، عەلی ئاغا هاتە سەربانەکە وتی:

" -کاك ئاوات بۆ خاتری خوا دەست لەم رەبایانە مەدەن. بە خوا ئەم جارەش هەموو دێکە ئەسوتێنن."

منیش وتم:

" -کاك عەلی ئاغا مەترسە. بە خوا دەست لە یەك رەبایە نادەین. سەیری ئەوبەرەوە ئەکەم."

زۆر ترسا، بڕوای نەدەکرد. هەر وای دەزانی بۆ ئەو ربایەیەی بەردەمی دێکەی ئەوان چووینەتە ئەوێ، چونکە پێشوتر چووبوینە ماڵی ئەوان، شەڕێکمان لە سەر جادەی دارە رەش لەو لای دێکەی ئەوانەوە کردبوو. دەیزانی بۆ شەڕ دەچین بۆ ئەو ناوە. سوێندم بۆ خوارد، کە لەو ناوە هیچ ناکەین. زۆری پێ نەچوو، کاك عومەریش ئوتومبیلەکەی بە برادەرێکدا بۆ ناردین. لەوێ بڕیاری گرتنی ئەو موعەسکەرەم دا. (لوقمان شاسوار)یشم لەگەڵ بوو. ئەو رابەر سیاسی بوو. پێم وت:

" -ئەو مەعەسکەرم دۆزیوەتەوە، ئەمشەو ئەچین بۆ ئەوەیان."

بە لایەوە سەیر بوو! وتی:

" -جا چۆن بەو پەلە پەلە ئەگیرێ.؟"

وتم:

" -بکەوێتە بەیانی ناگیرێ، چونکە هەموومان لەم دیوی شارەزورەوەین. لەبەر ئەوە هەر ئەمشەو باشە."

پێم وت:

" -وەرە سەیرکە. ئەچین بۆ ئەو مەعەسکەرە."

وتی:

" -جا کاك ئاوات ئەوە چۆن ئەگیرێت. بە خوا بڕوا ناکەم.!؟"

وتم:

" -تۆ باسی مەکە. بۆی ئەچین، یان سەرکەوتن یان تەرمی هەموومان لە سلیمانی بە سەر جادەکاندا رائەکێشن. لەو دوو رێگایە زیاتر نییە. خۆ یەکێکیان هەر بە دەست ئەهێنین."

ئێوارە لە ماڵی کاك عەلی ئاغا نانمان خوارد. شەو بە ئوتومبیلەکە رۆیشتین بەرەو ئەو جێگایەی، کە لەگەڵ هێزەکەدا دیاریمان کردبوو. لە سەر چەمی تانجەرۆ لە خوارووی (دەمرکان)ەوە، گەیشتین بە هێزەکە. هەموو لە وێ بوون. ئەو کاتە ئامر کەرتەکان مەلا ئەحمەدی دسکەرەو عەبدوڵڵا دسکەرەیی‌و رەئوفە کەڕو فەریقە سور بوون.

فەریقە سور لە جیاتی شەهید هەژار سەرپەرشتی کەرتەکەی دەکرد. کوڕێکی ترمان هەبوو ناوی عادل بوو، ئەویش ئامر کەرت بوو. کاک ئاسۆی شێخ نوریش لێپرسراوی کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەو لوقمان شاسواریش رابەر سیاسی تیپ بوو. جەماله سورو بەکری حاجی قادری ئاوەکەڵەیی‌و جەلال کوڵکنی معاون تیپیشمان لەگەڵ بوو. زۆر بڕوام بە تیپەکە بوو. ئەو ماوەیەی بە یەکەوە بووین، ئیشی زۆرمان کردبوو. وەك تیپ چیمان بویستایە دەمانکرد. بۆ هەموو شەڕەکان خۆمیان لەگەڵ بووم. لەبەر ئەوە زۆر بڕوام پێیان بوو، کە خۆم بۆ هێرشکردن دادەنا لە پێشەوە، کێ لە رووی دەهات بڵێ نایەم. چوومە ئەوێ، هەموو ئامر کەرت‌و معاون کەرت‌و ئامر مەفرەزەکانم لەگەڵ کاك ئاسۆ کۆکردەوە. لە وێ پێم وتن:

" –ئەزانن بۆ چی هاتووین بۆ ئێرە.؟"

وتیان:

" –نە وەڵا نازانین بۆ چی کۆبوینەتەوە.؟"

وتم:

" –خۆتان ئەزانن بڕیارماندابوو پێش ئەوەی چلەی شەهید هەژارو هاوڕێکانی ساز بکرێ، ئەبێ ئێمە ئیشێکی گەورە ئەنجام بدەین، کە شایەنی ئەوە بێت لە چلەی شەهیداندا باسبکرێ. خۆم جێگایەکم دیاری کردووە، ئێستا ئەچین بۆی."

وتیان:

" –کوێیە.؟"

وتم:

" –ئەو موعەسکەرەیە، کە لە پشتی (دەمرکان)ەوەیە." زۆر سەیر بوو بە لایانەوە!

هەموو وتیان:

" –ئەوە بە راستتە.!؟"

وتم:

" –ئەی خۆ بە درۆم نییە، بۆ چی.؟"

وتیان:

" –کاك ئاوات ئەو موعەسکەرە چۆن ئەگیرێت ئەمان بینیوە. چۆن لە خۆمانەوە بچین.؟"

پێم وتن:

" –ئەوە بڕیارە موناقەشەی مەکەن. کێ نایەت، جیا بێتەوە بڵێ من نایەم. ئەبێت بشڵێت ناوێرم بێم. ئیتر لە سەری مەڕۆن."

که وام وت، زانییان بواری ئەوە نییە موناقەشەی لە سەر بکەن. بە ناچاری وتیان:

" –باشە."

بەڵام پێم وابوو لە دڵی خۆیاندا گاڵتەیان بە گرتنی دەهات. ناحەقیشیان نەبوو. پێشم وتن یان دەبێت بیگرین یان دەبێت هەمووممان بکوژرێین. ئەوە نییە بچین ماوەیەك تەقەی لێبکەین بڵێن ناگرێت. یان شەهیدبوون یان گرتن.
هێزەکەم دابەشکرد. پەنجا پێشمەرگەم دیاری کردبوو بۆ هێرش کردن بۆ سەر موعەسکەرەکەو خۆم قیادەم دەکردن. کەرتێکم نارد بۆ سەر موعەسکەرەکەی لای راستی ئەو موعەسکەرەی، کە دەچووینە سەری بە لای عەرەبەتەوە تەقە بکەن بۆ ئەوەی نەتوانن یارمەتی موعەسکەرەکەی لای ئێمە بدەن. موعەسکەرێکی تر هەبوو لای چەپییەوە لە بەری سلێمانی. گردێ لە پشت دێکەی (دەمرکان)ەوە بوو موسەیتەر بوو بە سەر ئەو موعەسکەرەی لای چەپی ئێمەوە. ئەو شوێنەی ئێمە بۆی دەچووین، لە بەینی دوو موعەسکەری تردابوو. دەبوایە تەقەمان لە هەردووکیان بکردایە بۆ ئەوەی سەریان لێ تێك بچێ‌و بزانن دەچینە سەر ئەوان. پێم وتن:
" –هەر ئێمە تەقەمان دەست پێکرد، ئێوەش دەست پێ بکەن. هەر تەقە لە ناو موعەسکەرەکە بکەن."
ئەو گردەی پشتی دەمرکان رەبایەیەکی کۆنی لێ بوو، دەیان وت مینی لێیە. پێشمەگەریەکمان هەبوو بە ناوی ئەرسەلان کوڕی فایەق نەمەڵی بوو. زۆر ئازاو قارەمان بوو. کاتی خۆی جارێك بریندار ببوو. پارچەیەك لە سەری دابوو وەزعی جار جار خراپ دەبوو. وتم:
" –ئەرسەلان تۆ بچۆ بۆ سەر ئەو گردە، تەقە لە موعەسکەرەکە بکە."
وتی:
" –باشە من ئەچم."
کە گەیشتینە بەردەمی گوندەکە، لە گوندەکەوە تەقەیان دەکرد. هاوارم کرد وتم:
" –گەر تەقەمان لێ بکەن، گەڕاینەوە لە ئێوە ئەدەین."
ئەو کاتە تازە چەکیان وەرگرتبوو. پێش ئەوە (عومەری حاجی مەحمود دەمرکانی) جوابی بۆ ناردبووم، کە حکومەت داوای لێکردووە چەك هەڵبگرێت. بەڵام دۆستی خۆمان بێت. ئاسۆی شێخ نوریو هەندێك پێشمەرگەم دانا، بە دیار تەرەکتۆرەکانەوە، کە پێی هاتبووین. هەر کەس چوو بۆ ئەو جێگایەی، کە بۆم دیاری کردبوون. ئەو (٥٠) پێشمەرگەیەی، کە دیاری کرابوون بۆ هێرش کردن، لە گەڵ خۆمدا چووین بۆ موعەسکەرەکە. تا نزیك بووینەوە. ئینجا پێم وتن:
" –ئەوە موعەسکەرەکەیە. نەهێنییەکەشمان (تۆڵە) یە."
چالاکیەکەمان بە ناوی (تۆڵەی هەژارو هاوڕێکانی) بوو. پێم وتن:
" –لە کاتی هێرشەکەدا بە راکردن خۆتان بگەیەننە سەریان."
شوێنەکەی ناو دۆڵ بوو. هەردوو بەری موعەسکەربوو. ئێمەش بە پانتایی موعەسکەرەکە، بۆیان چووین خۆم لە ناوەڕاستەوە بووم. باقی هێزەکە لە شانی

چەپو ڕاستی خۆمەوە بوون. بۆ ئەوەی ئاگام لە هەموویان بێت. بە ڕاستی مسئولەکانو پێشمەرگەکان زۆر ئازاو بە جەرگ بوون. یەکسەر بە تەقەو هاوار هێرشیان بۆ ناو موعەسکەرەکە کرد. لە ماوەی یەك چارەکدا خۆمان بە ناو موعەسکەرەکەدا کرد. ئەوان هەر فریا نەکەوتن هیچ بکەن. تۆزێ تەقەیان کرد. ئێمە بوارمان نەدان لە بەرئەوەی هاوینیش بوو، بە یەك جار هەموو ناوچەکەو موعەسکەرەکە، بوو بە ئاگر. لە ئەنجامدا زۆر لە جەیشەکە ڕلیانکرد، موعەسکەرەکەیان بە جێ هێشت. دەوری (١٠) سەربازمان لێگرتنو هەندێکیشیان کوژران. ئێمە لە خۆشی ئەوەی ئەو موعەسکەرە گەورەیەمان گرتبوو، نەماندەزانی چی کۆبکەینەوە، چونکە زۆر گەورەبوو. مقەڕی دوو فەوج بوو. لە سەرەتادا وام دەزانی لە هەموویان بچوکترە. ناو دۆڵ بوو لە دوورەوە هەمووی دیار نەبوو. بە پێچەوانەوە لە هەموویان گەورەتربوو. پێشمەرگەکان هەر هاواریان دەکرد:

" -کاك ئاوات چی لەم هەموو چەکە بکەین."

بە سەدان چەكو بە دەیان مەرجەبی تیابوو. ئەو هەموو لۆرییە عەسکەرییەی تیابوو، کەس نەیدەزانی بیان خاتە ئیش. پێشمەرگەیەکمان هەبوو بە ناوی (سوهاد) وتی:

" -کاك ئاوات من لە جەیشدا شۆفێری ئیڤابووم. وتم:

" -باشە بڕۆ. هەر دانەیەکیشیان بخەرە ئیش باشە. پڕی ئەکەین لە چەك."

ئیڤای خستە ئیش. پڕمانکرد لە کلاشنکۆف. لە بەر ئاگرو تەقینەوەی ناو موعەسکەرەکە، نەماندەزانی چی بکەین؟ خەمی ئەوەشم بوو، درەنگ بوو. خەریك بوو ڕۆژ دەبۆوە. بێتوو ڕۆژ بوایەتەوەو دەرنەچووینایە، هەموو تیا دەچووین، چونکە لە سەر جادەی عەربەت-سلێمانی بوو. لەو دەشتەدا هیچمان بۆ نەدەکرا. وتم:

" -پەلە بکەن."

لۆرییەکمان پڕکردبوو. وتم:

" -سوهاد یەڵلا لێ خوڕە."

" -بەلام نەمان دەزانی ڕێگای سەیارە لە کوێوەیە. لەبەر ئاگرو دوکەڵ، چاومان لە هیچ شوێنێکەوە نەبوو. سوهاد سەیارەکەی لێ کوژایەوە. هەر خەریکبوو، بۆی نەخرایەوە ئیش. خەریکبوو ڕۆژ دەبۆوە. بۆ ئانجەرۆش یەك سەعاتو نیوو دەبوو. پێم وت:

" -دابەزە سایەقی نازانی، با هەمووشمان لێرە نەگیرێین."

زۆر هەوڵی دا، بۆی نەخرایەوە ئیش. جەماله سورو ماجید فەیلیشمان لەگەڵ بوو. لە هێرشەکەدا پێشمەرگەیەکمان برینداربوو. هەر زوو بە دوو پێشمەرگەدا بە ئوتومبیلەکەی خۆم ناردمەوە بۆ دیوی قەرەداغ. باش بوو نەبریندار نە شەهیدمان پێ نەبوو. نا چار پێشمەرگەکانمان کۆکردەوە، وتم:

" –چەند تفەنگتان بۆ هەڵدەگیرێت، بیکەنە شانتان، با بڕۆین درەنگە. ئەوەی ماوە ئاگری پێوە بنێن با بسوتێ."

پڕبوو لە شتی یەکجار زۆرو دەگمەن. بە دوو هەزار پێشمەرگە هەڵنەدەگیرا. هەر پێشمەرگەیەك سێ چوار کلاشنکۆفیان هەڵگرت. یەك چەکی دژە ئاسمانی گەورەی تیابوو. خۆم‌و دوو پێشمەرگە ئەوەمان بە راکێشان دەرکرد، هەتا ناو چەمی تانجەرۆ.
لوقمان سەیارەیەکی لە جۆری (مسیۆ بۆشی) دەخولانەوە دەیوت:
" –کاك ئاوات با بیبەین."

وتم:
" –کورە داینێ، مردوت مرێ. لە کوێوە ئەیبەیت. دابەزە دوو چەك هەڵگرە، وا رۆژ بۆوە."

ئەوەی مابوو ئاگرمان پێوەنا. ئەوجا خۆشمان بە پەلە بەرەو تانجەرۆ دەرچووین بۆ لای برادەران، کە لای تراکتۆرەکان دامان نابوون. گەیشتینە لای جەماعەت دنیا تەواو روناك بۆوە. ئەوەی باش بوو بەرەوخوارکە بوو. ئەگینا چەکی دژە ئاسمانیەکەمان بۆ را نەدەکێشرا، چونکە زۆر گەورە بوو. کە گەڕاینەوە لای تراکتۆرەکان، ئەو هەموو چەك‌و شتانەمان پێ بوو. ئەوانەی لە وێ جێمابوون، لە خۆشیدا نەیاندەزانی چی بکەن؟ خاوەن تراکتۆرەکان لە ئێمە زیاتر لە خۆشیدابوون. بە پەلە هەمووومان سەرکەوتین. بە خاوەن تراکتۆرەکانم وت:
" –لێخوڕن با دەرچین. هەر هیچ نەبێت با بگەینە دێیەك."

چونکە دەشت بوو، زۆر خەتەر بوو بۆ هەلیکۆپتەرو فڕۆکەی (پیلاتۆز)[52] .باش بوو گەیشتینە بناری شاخ، ترسمان نەما. ئەگەر فڕۆکەش بێت گرنگ نییە، چونکە لە ناو دێ بووین. گوندی دەربەند فەقەرە، بناری شاخ بوو. خۆشمان چەکی باشمان پێ بوو. بە تایبەتی بۆ هەلیکۆپتەر. چوار چەکی (بی کەی سی)مان هەر لە موعەسکەرەکە گرتبوو. خۆشمان دوانمان هەبوو. (بی کەی سی) زۆر چەکێکی بە کاربوو. باشترین چەك بوو بۆ پێشمەرگە. بۆ دوای نیوەڕۆ گەڕاینەوە گوندەکەی دوکان. هەموو گوندەکانی بناری شارەزور پێشوازیان لێ کردین. گەورەو بچووك بەرەو پیرمان هاتن، چونکە ئیشی وا گەورەیان نەبینیبوو. کە گەڕاینەوە بۆ بارەگای قیپ، هەموو خەڵکی دێکە هاتن بۆ لامان، پیرۆزباییان لێ دەکردین. زۆریان پێ خۆش بوو. خۆم ماڵەکەشم لە گوندی دوکان بوو. لە بارەگا عەدەدجیهازەکە وتی:

---

52 - پیلاتۆز جۆرە فڕۆکەیەك بوو کۆن بۆ مەبەستی کشتووکاڵ بەکار هاتووە، بەڵام حکومەتی عیراق گۆڕیبووی بە شێوەیەك، کە بۆ مەبەستی جەنگی بەکاری بهێنێ‌و لە بەرزییەوە بپێکێ.

" –کاك ئاوات مەکتەبی سیاسیو مەڵبەندو مام جەلال، هەموو داوای ئەنجامی شەڕەکە ئەکەن. منیش پێم وتوون کاك ئاوات هێشتا نەگەڕاوەتەوە. من نازانم چۆنە. هەر ئەوەندە ئەزانم دوو مەقەڕ فەوج گیراوە. ئیتر نازانم چۆنە."
وتم:
"– باشە ئێستا زانیاریی تەواو دەربارەی چۆنیەتیی شەڕەکەو دەستکەوتەکانیان ئەدەینێ."
هەموو زانیارییەکمان دا بە مەکتەبی سیاسیو مەکتەبی عەسکەریو مەڵبەند."
ئیتر دوای ئەوە، بە دەیان بروسکەی پیرۆزبایی سەرکەوتنمان بۆ هات لە مام جەلالو کاك نەوشیروانو دکتۆر فوئاد مەعصومو ملازم عومەرو کاك کۆسرەتو مەکتەبی سیاسیو عەسکەری مەڵبەندەکانو دیهاتەکانی دۆڵی بالیسان. سنووری مەڵبەندی سێ لە هەموو لایەکەوە بروسکەی پیرۆزباییان بۆ ناردین. لەو کاتەشدا لەگەڵ ئێراندا پەیوەندیمان خەریك بوو باش دەبوو. ئەوە زۆر کاریگەری سیاسیو عەسکەری هەبوو لەو کاتەدا. مام جەلال زۆری پێ خۆش بوو. ئێرانیەکان هاتن بۆ مەڵبەندی یەكو سەردانیان کردم. یەکێکیان وتی:
" –حەز ئەکەین ئەو جێگایەمان پیشان بدەی، کە گرتبووتان."
کە پیشانم دان، زۆریان پێ سەیر بوو!
یەکێکی تریان وتی:
" –چۆن ئێوە توانیوتانە بە یەك تیپ، ئەو مەعەسکەرە گەورەیە لەو شوێنەدا بگرن؟."
چونکە زۆر نزیکبوو لە سلێمانیو عەربەتەوە. دەیان مەعەسکەرو رەبایەی لە دەور بوو، بەلام ئەوان قەد لەو بڕوایەدا نەبوون پێشمەرگە پەلاماری موعەسکەرێکی وا بدا. پێشتر زۆر رەبایەمان گرتبوو هەر لە شارەزور، بەلام مەعەسکەری وا، نەگیرابوو. بە تایبەتی جەیش. بە راستی ئەوەی ئێمە کردمان زۆر لە خۆبردووانە کردمان. زۆر سەرکەوتوو بووین. هەرگیز خۆم بە تەمای ئەو ئەنجامە نەبووم، وام دانابوو بە لای کەمەوە رەنگە زۆرمان لێ شەهیدبێ، بەلام وا دەرنەچوو. بە پێی ئەزمونی پێشمەرگایەتیم، شەڕ وەك قومار وایە، ناتوتنی بڵێی لە سەدا سەد سەرکەوتوو دەبی یان نا، بەلام بوێریو نەترسی دەوێ. دەبێ سەرەتا بڕیار بدەیتو پلانێکی بۆ دانێیت. لە هەموو رویەکییشەوە دراسەیەکی باشی ئەو ئیشە بکەی. دەبێ لە شەڕدا دکتاتۆریەت بە کار بهێنی. ئەوە رەئی خۆمە.

کۆتایی مانگی پێنجی ١٩٨٦ لە مەڵبەند کۆبوینەوەو رومان کردە گەرمیان. شەوکەتی حاجی موشیرو محەمەدی حاجی مەحمودو ئاغای رەحیمیش ئێرانی بوو هات. چووین بۆ سەر (قادر کەرەم) هێزەکەمان بۆ سەر ئەو جێگایانە دابەشکرد، کە دامان نابوو بۆ رەبایەکانی دەوری شار. موعەسکەرێکی لێ بوو، بە سەر شارو هەموو ناوچەکەدا دەیڕوانی. منو مام رۆستەم چووین بۆ سەر ئەو موعەسکەرە. موعەسکەرەکە لایەکی شاخ بوو. رێگای هیچ نەبوو ئەمان دەتوانی لە وێوە بۆی بچین. لایەکی تریشی تەلبەندبوو. هەمووشی بە مین چێنرابوو. بەر دەمیشی بەرەو رووی شار بوو. لە پشتەوە، یەك رێگای سەیارە هەبوو، دەچوو بۆ ناو موعەسکەرەکە. ئەو رێگایەش یەك رەبایەی گەورەی لە سەر دروست کرابوو. لە سەر ئەو رێگایەی، کە دەچوو بۆ ناو موعەسکەرەکە، لە وێوە نەبولیە، بوار نەبوو بۆی بچین. تیپی (٥١)و (٥٧) لەو ناوە شارەزا بوون. هێزێکی باشمان دانا بۆ ئەوەی لەو رێگا بچوکەوە هجومی بۆ بکەین. لەوە زیاتر چار نەبوو. برادەرێك هەبوو ناوی عەسکەر بوو، زۆر پیاوێکی شارەزاو ئازابوو، ئەو کاتە ئامر مەفرەزەبوو لە تیپی ٥١ی گەرمیان. خەڵکی ئەو ناوە بوو. زۆر قارەمان بوو. وتی:

" -کاکە گیان من ئەزانم ئێستا ئێوە ئەچنە سەریان، بەڵام، کە زانیان مەترسیان لە سەر دروست ئەکەن، رائەکەن بەرەو ناو شار."

پێش ئەوەی بگەنە ناو شار. یەك فەوج عەسکەری تر لە بەینی موعەسکەرو شارەکەدا بوو. ئەو موعەسکەرە زۆر کۆن بوو. هەر لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلولەوە هەبوو. خانوویان هەبوو. پڕ بوو لە دەبابەو تۆپی گەورە. لە وێوە رۆژانە ناوچەکانیان تۆپ باران دەکرد. عەسکەر وتی:

" -من یەك مەفرەزە ئەبەم، ئەچمە بەینی هەردوو موعەسکەرەکەوە، کە ئێوە لێتان دان، رائەکەن بەرەو ناو شارو موعەسکەرەکەی تر. لەو بەینەدا هەموویان ئەگرین، یان ئەیان کوژین."

وتمان:

" -باشە."

ئەومان نارد بۆ ئەوێ. باقی هێزەکەی تر، هەر کەسە چوون بۆ جێگای دیاری کراوی خۆیان. ئێمەش هێزێکمان جیا کردەوە بۆ پەلاماردانی موعەسکەرەکە. بە ئاڕ بی جی‌و هاوەن‌و بیکەیسی دامان گرتەوە. بەو رێگا بچوکەدا، کە دەچوو بۆ ناو موعەسکەرەکە، هێرشمان کرد. لە ماوەیەکی کەمدا دەستمان گرت بە سەر موعەسکەرەکەدا. لە ئەنجامدا هەندێك کوژران‌و ئەوانی تر رایانکرد. کە چووینە ناو موعەسکەرەکە، ئەوەندەمانزانی کاك عەسکەر هاتەوە. دەوری بیست جاشی گرتبوو. لەوانەی، کە رایان

کردبوو. باقی هێزەکەی تر هیچیان پێ نەکرابوو. هەروا گەڕابوونەوە. هەر ئەوەی ئێمە گیرا. شەو گەڕاینەوە بۆ گوندی (قەیتول) گوندێکی زۆر گەورە بوو. هەموو هێزەکە لە وێ ماینەوە. بۆ بەیانی دەوری نیوەڕۆ چوار تەیارە لە جۆری (پیلاتۆن) هاتنە سەر گوندەکە. گوندەکەی بە ساروخ داگرتەوە. ئێمەش لە هەموو لایەکەوە تەقەمان لێ کردن، بەڵام سوودی نەبوو. زۆر لە بەرزییەوە بۆردومانیان دەکرد. لە ئەنجامدا یەك هاوڵاتی شەهیدبوو. چەندین پێشمەرگەش بریندار بوون. لەوانە پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەی من، کە ناوی (مەلا ستار) بوو. منو حەمە رەشو هێمنو چەند برادەرێك لە خانویەکدا بووین، پێشمەرگەیەك هات بۆ لام وتی:

" –کاك ئاوات پێشمەرگەیەکی لای تۆ زۆر حاڵی خراپە. فریای کەوە، لە وانەیە بمرێت."

بە پەلە چووم بۆ لای، کە سەیرمکرد، پارچەیەك لە سەری دابوو، بەڵام خەتەر نەبوو. بە پەلە ناردم بۆ نەخۆشخانە. گەڕاینەوە بۆ مەڵبەند. ئەو شەڕەمان زۆر سەرکەوتوو نەبوو، چونکە هەموو جێگاکان نەگیران. هەر ئەوەی منو مام رۆستەم گیرا. ئەوەش کەم بوو بۆ ئەو هێزە، بەڵام لەو کاتەدا، باش بوو بۆ لێدانی قادر کەرەم.

٧٩

لە سەرەتای مانگی٦ ی ساڵی ١٩٨٦دا، لە سەرکردایەتیەوە داوایان لە مەڵبەند کرد، کە وەك مەڵبەند چالاکیەکی گەورە ئەنجام بدەن. کاك شەوکەت ئەوکاتە لێپرسراوی مەڵبەندبوو. ناردی بە دوای هەموو سەرتیپەکاندا لە مقەڕی رێکخراوی کۆمەڵە. لە گوندی (ئەستێڵی سەرو) کۆبوینەوە. ئەو کاتە ئاسۆی شێخ نوری لێپرسراوی رێکخراوی کۆمەڵە بوو. لە کۆبوونەوەکەدا، هەموو رێکەوتین لە سەر ئەوەی ناحیەی قەرەداغ بگرین. جێگەکەمان دیاریکرد. تیپەکەی ئێمەیان دانا بۆ ناو شارەکە. وتم:

" –باشە."

باقی تیپەکانی تر، بۆ دەرەوەی قەرەداغو رێگای قەرەداغ–سلێمانی. وامان دانا وتیان:

" –پێش جێ بەجێ کردن، هەرکەس بچێت دراسەی خۆی بکات."

وتمان:

" –باشە."

هەموو رۆشتین. دوو سێ رۆژی پێ چوو جوابیان بۆ ناردم، کە واز لەوە بێنم. چووینەوە بۆ مەڵبەند، وتیان:

" –وازمان لە قەرەداغ هێناوە، چونکە نزیك مەڵبەندە. بارودۆخی ناوچەکەش تێك دەچێت."

وتیان:
" -ئەچین پەلاماری ناحیەی سەنگاو ئەدەین. خەڵکمان ناردووە، بچن دراسەی باشی ناو شارەکەو رەبایەکانی دەورو بەری بکەن، کە هاتنەوە ئەوجا ئەتێرین بە بواتاندا. خۆتان ئامادە بکەن و پێشمەرگە کۆبکەنەوە."
وتمان:
" -باشە."
دوای چوار پێنج رۆژ، ناردیان بە دواماندا. چووین بۆ مەڵبەند وتیان:
" -دراسەی باشمان کردووە. زۆر لە بارە بۆ گرتنی."
هەموو کۆبووینەوە بەرەو گەرمیان رۆشتین. ئەو کاتە سامان لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەند بوو وتی:
" -شینەی حەمە رەشمان ناردووە، چۆتە ناو شار هەمووی دراسە کردووە. زۆر باشە."
پێم وت:
" -کاک سامان دەورو بەری رەبایەکان (مین)ی تیا نییە.؟"
وتی:
" -نە ء برای ئازیز. ئەمینی لێیەو ئەدەوروبەری تەلبەندە. دەورو بەری موعەسکەرەکە هیچی لێ نییە."
تەئکیدم لێ کردەوە، وایە؟ وتی:
" -بەڵێ، شینە بۆ خۆی چووە."
وتم:
" -وا بێ باشە."
هەموو چووینە گوندی هەنارە. هەنارە بە شاخی سەگرمەوە بوو بە رووی سەنگاودا. لە هەنارەوە سەنگاو لە بەر دەستابوو. هەموو ناو شارو موعەسکەرو زۆربەی رەبایەکان دوور بوو، بەڵام دیار بوو. ئیتر هەر لە وێ شوێنەکانیان دیاریکرد. بە منیان وت:
" -کاک ئاوات تۆ لەگەڵ کاک دلێر جاف بچۆ بۆ موعەسکەرو رەبایەکانی دەورو بەری."
ئەو سەرتیپی (١٥)ی شارەزور بوو. منیش پەنجاو پێنجی قەرەداغ. من سەرپەرشتی هەمووی بکەم. وتم:
" -باشە."
مام رۆستەم هاوەنێکی (١٢٠) ملم ی پێ بوو. وتی:
" -من ئەچم بۆ ئەو دێیە، بە هاوەن موعەسکەرەکەتان بۆ کاول ئەکەم."
خۆی نەیدەتەقاند. عەدەدی لەگەڵ بوو. من گاڵتەم لێ دەهات، چونکە دەمزانی هیچی لێ نازانن. ئەو برادەرەی، کە دەیتەقاند (مامۆستا جەلال جەوهەر) بوو. پێشوتر

خولێکی بچوکی بینی بوو، بەڵام هیچ نەبوو. شەوکەتو سامان لەگەڵ تیپەکانی گەرمیان. وتیان:

" -ئێمە ئەچین بۆ ناو شارەکە."

وا بڕیار بوو، کە لە ناو شارەوە تەواو بوون، بەرەو موعەسکەرەکە بێن. ئێمەش، کە هەموو رەبایەکانمان گرت، پەلاماری موعەسکەرەکە بدەین. ئەوان لە ناو شارەوە، ئێمەش لە دەرەوە. لە گوندی هەنارەوە ئەوان جیابوونەوە. رۆیشتن بەرەو گوندی کربچنە. لە وێ بۆ ناو شار. ئێمەش هەر لە هەنارە ماینەوە. مام رۆستەمیش بە خۆیو مەفرەزەی هاوەنەوە رۆشتن. وا بڕیار بوو مام رۆستەم بە تۆپ موعەسکەرەکە وێران بکات، ئەوجا ئێمە پەلاماری بدەین، بەڵام وایان دانا، ئێمە زوتر دەست پێ بکەین بۆ ئەوەی، کە ئێمە لە رەبایەو موعەسکەرماندا، جاشەکانی ناو شار دێن بە هانای موعەسکەرەکەو رەبایەکانی دەرەوە. ناو شار چۆڵ بێت. ئەوانیش خۆیان بکەن بە ناو شاردا. بە کاک دلێر جافم وت:

" -کاک دلێر تۆ خۆت شارەزای تیپەکەی خۆتی (٥٠) پێشمەرگە هەڵبژێرە لەگەڵ خۆت بۆ هێرش کردن."

منیش بۆ خۆم (٧٠) پێشمەرگەی زۆر ئازاو لێزانم هەڵبژارد، لەگەڵ ئامر کەرتەکان بۆ هێرش کردن. باقی پێشمەرگەکانی ترمان لە هەنارە بە جێهێشت. دوو سەعاتی رۆژی مابوو لە رەبایەکان نزیك بووینەوە. پێش موعەسکەرو رەبایەکان دەشتاییەك بوو. هیچ شتێ نەبوو خۆتی لە بندا بشاریتەوە. لە هەنارە دەچوویتە خوارەوە، دۆڵو شیو بوو. دیار نەبووین هەتا نزیك رەبایەو موعەسکەرەکە بووینەوە. بۆ پەلاماردانی موعەسکەرەکە، دەبوایە بچویناییەتە دەشتەکەوە. موعەسکەرو زۆربەی رەبایەکان لە دەشتەکەدا بوون لە پشتی شارەکەوە. لە بەردەمی شاخی سەگرمەدا بوو. ئێمە تەواو خۆمان نزیك کردەوە لە رەبایەکانەوە. سەعاتێك رۆژی مابوو، پەلاماری رەبایەکانماندا. لە ماوەی نیو سەعاتدا، هەموو رەبایەکانی دەورو بەری موعەسکەرەکەمان گرت. دەورو بەری رەبایەکان (مین) رێژ بوو. حەوت پێشمەرگە لەگەڵ من بوون، بە مین شەهید بوون. خۆم کەوتبوومە ناو یەك شەبەکەی مینەوە. نەمدەزانی چۆن خۆمی لێ رزگار بکەم. هەر دەجوڵامەوە، پێشمەرگە هاواری دەکرد:

" -کاک ئاوات ئەوە مینە، ئاگادار بە."

باش بوو زۆربەی مینەکان دیار بوون. هەمووشی لە جۆری مینی (ڤالمارا) بوو، کە دەتەقیەوە، لەتو پەتی دەکردی. ئێمەش رەبایەکانمان گرت، خۆمان گەیاندە موعەسکەرەکە. گوێمان بە شەهیدو بریندار نەدا. هەر هێرشمان بۆ موعەسکەرەکە دەکرد. کە چووین، موعەسکەرەکە دوو جۆر تەلبەندی هەبوو. جۆرێکیان لە تۆپە گەورەکان بوو، کە هیچی لێ رزگار نابێت. لەو دیویشەوە تەلە بەرزەکان بوو. ئەوجا لە دوای ئەو هەموو تەلبەندەشەوە، چوار دەوری موعەسکەرەکە بە خۆڵ هەڵدرابۆوە. بە

حاڵ لولەی تۆپی دەبابەکان دیار بوو. ئێمەش لە بن ئەو تەلانەدا گیرمانخواردبوو، هیچمان پێ نەدەکرا. نەشماندەتوانی بگەڕێینەوە. گەر بگەڕاینایەتەوە، کەسمان دەرنەدەچووین. لە بەر ئەوەی ناوچەکە دەشت بوو. نزیك بوو ڕۆژبێتەوە. ئەوانیش بیانزانیایە، ئێمە پاشەکشە دەکەین و تەقە لە سەریان کەم دەبێتەوە، ترسیان نەدەما، بۆمان دەهاتنە سەر لێواری خۆڵی موعەسکەرەکە، بە ئارەزوی خۆیان لێیان دەکوشتین. ئێمە نەمانهێشت سەر دەربێنن (٤-٥) مەتر دوور بووین لێیانەوە. ئەوان لەو دیوی تەل و خۆڵەکەوە، ئێمەش لەم دیویەوە بووین. نەئەوان دەیان توانی سەر بەرز بکەنەوە، نەئێمەش. ئەوان باشبوون لە بن خۆڵی موعەسکەرەکەدا بوون. ترسیان نەبوو. ئێمەش وەزعمان زۆر خراپ بوو. ئێمە هیچ نەبوو خۆمان بدەینە پاڵی. بە تەمای مام ڕۆستەم بووین، هەر گوێمان لە دەنگی یەك هاوەنیش نەبوو. باشبوو دنیا تاریك بوو. بە تەمای ناو شار بووین، لە ناو شاریش تەقە نەما. جیهازێکی بچوکمان پێ بوو، هەرچی هەوڵماندەدا، بۆمان وەرنەدەگیرا. کاك دلێریش هەر هاواری ناو شاری دەکرد دەیوت:

" -کاك ئاوات چی بکەین؟ ئەوان لەناو شارا هیچ دیەنگێکیان نیە. لە هیچ جێگایەکی ترەوە تەقە نەماوە. ئێمە چۆن دەرچین.؟"

وتم:

" -کاك دلێر گیان با مقاوەمە بکەین، هەتا تۆزێکی تر بزانین برادەرانی ناو شار نایەن بەرەو لای ئێمە."

وتی:

" -کاك ئاوات ئەوە بە راستتە؟ بە خوا یەك پێشمەرگە نەماوە لە ناو شار. ئەوە لە خەیاڵی خۆت دەربکە. هەوڵی ئەوە بدە چۆن هێزەکە دەرباز ئەکەیت لەم بن موعەسکەرە؟ درەنگە وا ڕۆژ ئەبێتەوە. کەسمان لەم دەشتەدا دەرناچین."

پێم وت:

" -بوەستە من ئێستا هەر چۆنێك بێت، ئەچمە دواوە. بزانم لەگەڵ برادەراندا پەیوەندی ناکەم."

وتی:

" -باشە بەڵام وریای خۆت بە."

وەك باران گوللەیان بە سەردا دەبارانین. ترسیان نەمابوو. ئەوان بە سەرماندا زاڵبوون. بە هەزار حاڵێك خۆم گەیاندە دیوی چەمەکە. گوللە نەی دەگرتمەوە. چەمو دۆڵ بوو. لە وێوە مام ڕۆستەمم وەرگرت وتم:

" -ئەوە لە کوێیت خوا ماڵت کاولکات.؟"

وتی:

وەڵڵا وام لە هەنارە، ئەچم بۆ لای کاك شەوکەت و کاك سامان."

وتم:
" –ئەوان لە کوێن.؟"
وتی:
" –ئەوان وان لە کربچنە. دێکەی شێخ محەمەد. لە وێوە قسەیان لەگەڵ من کردووە. ئەی ئێوە لە کوێن.؟"
وتم:
" –ئێمە هێشتا واین لە بن موعەسکەرەکەدا گیرمانخواردووە."
وتی:
" –چۆن، هێشتا پاشەکشەتان نەکردووە."
وتم:
" –نەوەڵا، ئێمە هەر چاوەڕێی کاك شەوکەتو کاك سامان بووین، ئاگادارمان بکەنەوە."
وتی:
" –ئەوان دەمێکە گەڕاونەتەوە. من قسەم لەگەڵ کردون، وان لە گوندی کربچنە. وا منیش ئەچم بۆ لای ئەوان. ئێوەش بە پەلە پاشەکشە بکەن، چونکە درەنگە."
گەڕامەوە بۆ لای کاك دلێر پێم وت:
" –یەك یەکو دوو دوو پاشەکشە بکەن. بیکەن بە تەقەی زۆر لە موعەسکەرەکە، هەتا پاشەکشە ئەکەن."
بە زەحمەتێکی زۆر رزگارمانبوو. هەموو هێزەکەمان گەیاندە ناو دۆڵەکە، ئیتر گوللە دەوری نەمابوو. ئینجا بە گوللە هاوەن دایانگرتینەوە. زۆر خەتەر بوو. باشبوو بەر نەکەوتین. حەوت پێشمەرگەمان شەهید بوون ئەوی لە بیرم مابن ئەمانە بوون: شەهید شەفیق تلەزەیتی، شەهید جەمال سالح، شەهید باقی حاجی عەزیز ئەویەری، شەهید بەکرە ڕیشە دوایی بە برینداری لە ئێران شەهید بوو. بەداخەوە ناوی ئەوانی ترم بیر نەماوە. لەگەڵ پێنج بریندار. هەموویانمان بەرەو گوندی هەنارە دەرکرد. بەیانیەکەی گەیشتینەوە هەنارە. کە هاتینەوە، هەموو خەڵکی گوندەکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئێمە بوون. یەك نەفەر نەنووست بوو. هەموو لێمان کۆبوونەوە، وتیان:
" –ئەوە ماون؟ بە خوا ئێمە وتمان کەستان ناگەڕێنەوە. لە خوا بە زیاد بێت دەرچوون."
وتیان:
" –باشە ئێوە بۆ بەو ڕۆژی نیوەڕۆیە ملتان نا بەرەو ئەو دەشتە، بۆ ناو ئەو هەموو ڕەبایەو موعەسکەرە. هەمووی مین ڕێژ بوو. هەر زۆر باشە، کە بەو شێوەیە دەرچوون. ئێمە هەر بە تەما نەبووین کەستان بە ساغی بێنەوە."

ئێمە دەوری حەوت رەبایەمان گرتبوو. ئەگەر موعەسکەرەکە وا نەبوایە، هەر یەکسەر دەمان گرت. رێگا نەبوو بچینە ناوی. بۆ بەیانی چووم بۆ لای کاك شەوکەتو ئەوان لە کربچنە. ئەوان سەلامەت بوون. مدیر ناحیەکەیان هێنابوو لەگەڵ هەندێك ئەوراقی ناحیەکە. پێم وتن:

" -کە خۆتان پاشەکشەتان کرد، بۆ ئێمەتان ئاگادار نەکردۆتەوە."

وتیان:

" -بە جیهازەکە زۆرمان هەوڵدا. بۆمان وەرنەگیرا، بەڵام ناحیەکەو موعەسکەرەکەو مەرکەزی شورتە نەگیرا. گەڕاینەوە. ئیتر بەو جۆرە شەڕەکە کۆتایی هاتو گەڕاینەوە.

زۆری پێ نەچوو، شەڕی قەیوان ماوەت دەستی پێکرد. حکومەت لە چەند لایەکەوە پەلاماری دۆڵی جافایەتی دا، بەرەو گاپیلۆنو مالومەو قەیوانو سەفرەو زەروونو وڵاخ لوو. شەڕەکان زۆر گەرم بوو سەرکردایەتی داوایان لە هەموو مەڵبەندەکان کرد هێزیان بۆ رەوانە بکەن. زۆری تیپەکانی مەڵبەندی یەکیش چوون. کۆتایی پایزی ساڵی ١٩٨٦ بوو. بەرەو زستان دەچوو. حکومەت لە هەموو قۆڵەکانەوە بەردەوام هێرشی دەکرد. هاتوچۆی نێوان سەرکردایەتیو ئێران لە رێگای سەفرەو زەروونەوە بوو. ئێرانیەکان بە ئاشکرا سەردانی سەرکردایەتیان دەکرد. حکومەتی عێراقیش بەوە زۆر ئیزعاج بووبوو، دەیویست ئەو رێگایە بگرێ.

سامان ماوەیەك لەگەڵ تیپەکانی گەرمیاندا، لە دەورو بەری وڵاخ لو بوو. دوای ئەوە ناردیان بە دوای تیپەکانی ئێمەدا. من لە تیپی (٥٥) بووم. پێش ئەوەی خۆم بچم، نیوەی تیپەکەمان لە وێ بوون. جەلال کوڵکنی یاریدەدەری من بوو، ئەو لەگەڵیاندا چووبوو. لە سەرکردایەتییەوە ناردیان بە دوامدا. چووم بۆ سەرکردایەتی. ئەو کاتەی من چووم، (شەوکەتی حاجی موشیر) لەوێ بوو، کە چووم مام جەلال مقەڕی لە یاغسەمەر بوو. کۆبوونەوەی لەگەڵ ئێرانیەکاندا هەبوو. کە چووم بۆ لای، وتیان:

"- مام جەلال لە کۆبوونەوەدایە."

کاك سامانو کاك شەوکەت چوون پێیان وت:

" -ئەوە کاك ئاوات هاتووە."

زۆری پێ نەچوو، مام جەلال لە کۆبوونەوەکە هاتە دەرەوە. لەو کاتەدا، منو کاك شەوکەتو کاك سامان بە یەکەوە پیاسەمان دەکرد، مام جەلال هات بەرەو پیرم، ئەملاو ئەو لای ماچکردم. زۆر رێزی لێ گرتم. زۆر مەدحی کردم. چووینەوە بۆ ماڵی خۆیان نانمان خوارد. هەندێك نامەو شتومەکی لە برادەرانی دەرەوە بۆ هاتبوو. لەوانە، مەکینەیەکی ریش تاشینی تیابوو، دای بە من. ئێستاش وەك یادگاریەك هەر ماوەمەو هەڵم گرتووە. ئەو کاتە سامان لەگەڵ خێزانەکەیدا، چوو بۆ ئێران. ئەوان ئاڵوگۆڕیان پێکرا. من چوومە ئەو شوێنانەی، کە ئەوان پێشوتر لێی بوون. هەر لە وێ جەلال کوڵکنیان کرد بە سەر تیپی (١٥)ی شارەزور. هەر خۆم سەر تیپی تیپی (٥٥)ی

قەرەداغ بووم. تیپی مەڵبەند کاك کەمال شاکربوو. من سەرپەرشتی هەر سێ تیپەکەم دەکرد. جەبهەی (دڕێ)و (قامیش) هەتا (سەفرەو زەرون) عائیدی مەڵبەندی یەك بوو. من لە (قامیش) بووم. تیپی(٥٥)م لە جەبهەی پێشەوە دانا. خۆشم لە (برزودو بالۆسە) لەگەڵیاندا بووم. بالۆسە بە سەر سەری دڕییەوە بوو. قوتەیەکی زۆر بەرزە. شوێنەکەی بچوکە هەر جێگای یەك رەبایەیە. وەك کلیلی ناوچەکە وایە، موسەیتەرە بە سەر دیوی ماوەتو بە سەر (دۆڵ بێشك)و بە سەر جادەی ماوەت-سلێمانیدا دەڕوانێ. ئەو زنجیرە شاخە لە وێوە دەست پێدەکات هەتا دێتەوە سەر ئاوی (هەرزنە) ی بەینی ئێرانو عێراق، بەرامبەری ماوەت. پشتی ئەویش دۆڵی سەفرەو زەرونە. شاخی ئاسۆس دەکەوێتە پشتی کانی توو، دیوی مەرگە. دێتەوە سەر ئاوی هەرزنەو عیساوێ. لای باشوریشەوە، دێتەوە بەرامبەری بەرگەڵوو باغسەمەر. لە لایەکی ترەوە، دەچێتەوە بەرامبەری قەلادزێو دەربەندی رانیە. زۆر کوێستانە. زۆر سارد بوو. ئێمە وەك مەڵبەندی یەك لە بالۆسەوە گرتبوومان هەتا سەر ئاوەکەی (تەیەت) بەینی عێراقو ئێران. ئەو شاخە لە بەینی سەرکردایەتیو ئێراندا تەماس بوو. بازرگانیەکی زۆریش لەو خەتەوە دەکرا. داهاتێکی باشبوو بۆ یەکێتی. شوێنێکی ستراتیژی بوو. حکومەتی عێراق دەیویست ئەو خەتە نەهێڵێت. لە کۆتایشدا هەر گرتی. من لە قامیش بووم، رۆژێك جیهازیان بۆ کردم وتیان:

" -لە وێوە برادەرێك دێت. ئەبێت تەئمینی ئەو رێگایە بکەیت."

منیش زانیم ئەو کەسەی، کە دێ (مام جەلال)ە. هەر ناوچەی ولاخ لو مابوو، گیرا. شەو پێشمەرگەم لێ دامەزراند، هەتا لای کەڵکی قامیش. ترسمان لە دۆڵ بێشك بوو خەتەر بوو. خۆم چووم بۆ (دۆڵ بێشك)، زۆر بە قایمی گرتمان. شەو مام جەلال گەیشتە ئەوێ. لە وێوە دەچوو بۆ ئێران. بە درێژای رێگا مام جەلال قسەی بۆ دەکردم. پێشمەرگەکان کۆمەڵیان دەکرد، گوێیان بۆ قسەکانی مام جەلال رادەگرت. مام جەلال وتی:

" -ئاوات پێشمەرگەی گەرمیان لە رێگا وا ئەڕۆن. ؟"

وتم:

" -مام جەلال ئەیانەوێت گوێیان لە قسەکانی جەنابت بێت."

ئەویش وەستاو پێی وتن:

" -برادەرینە مژدەتان ئەدەمێ، ئاگری ئەم نەورۆزە لە کەرکوك ئەکەینەوە."

منیش وتم:

" -مام جەلال من بە قەشقۆڵیش رازیم."

وتی:

" -من رازی نیم. ئەچینە کەرکوك."

مام جەلالمان لە کەڵکی قامیشەوە بە ئوتومبێل بە ڕێ کرد بۆ سەفرەو زەرون. کاک جەبار فەرمانیش لێپرسراوی ئەو خەتە بوو، بە ڕێی کرد بەرەو ئێران.
زۆری پێ نەچوو، حکومەت هێزێکی یەکجار زۆری هێنابوو بۆ جەبهەکان. ئەو کاتە وڵاخ لو و پشتی وڵاخ لوش، هەر بە دەستی پێشمەرگەوە بوو. حکومەت لە کونە ماسیو کارێزە بوو. شاخی بەری دۆڵ بێشکیش بە دەست حکومەتەوە بوو. بەری وڵاخ لوو (حەسەن بەگ) بە دەست پێشمەرگەوە بوو. جەبهەی وڵاخ لو بە دەست مەڵبەندی دووەوە بوو. کاک حامیدی حاجی غالی مەسئولی عەسکەری مەڵبەندی دوو بوو. لێپرسراوی ئەو جەبهەیە بوو. بەری قامیش هەتا دەچووەوە عیساوێو سەفرەو زەرون، بە دەست مەڵبەندی یەکەوەبوو. من مەسئولی بووم. ڕۆژێك لە ماوەتەوە خەبەریان بۆ ناردم وتیان:
" –ئەم شەو حکومەت هجومتان بۆ ئەکات."
خۆشمان بینی بوومان، چەند هێزی هێنابوو لە ماوەت کۆی کردبۆوە. لە سەرکردایەتیشەوە ئاگاداریان کردمەوە، کە وا ئەم شەو حکومەت پەلاماری ناوچەکانی ئێوە دەدات، بە تایبەتی بالۆسە. زۆر وریابن. لە مەڵبەندی دووەوە هەر ئاگاداریان کردم. بالۆسە کلیلی ناوچەکە بوو. ئەگەر بالۆسە بگیرایە، هەموو ناوچەکە تەواو دەبوو. هەر جەبهەی سەفرەو زەرونو وڵاخ لوش شکستی دەهێنا، بۆیە بە هەموو لایەك تەئکیدیان لە بالۆسە دەکردەوە. من ئەوێم زۆر قایم کردبوو. جگە لەو گوللە ئاڕ بیجیو تەقەمەنیانەی، کە هەمان بوو، زۆری تریشم کڕی بوو، بردمە سەنگەرەکان. ئەوەندە نارنجۆکو گوللەی ئاڕ بیجیم لە ناو سەنگەرەکاندا دانابوو. ڕەبایەکانی حکومەتیش ئەوەندەی تیا نەبوو. ئەو ڕۆژە سێ جار ئاگاداریان کردم، کە لە سەدا سەد ئەم شەو حکومەت پەلاماری دەدات. هەمووشی هێزی تایبەت (قوات خاصە) بوو هێنا بووی بۆ ئەو هجومە. دڵنیا بووم، کە ئەم شەو هجوم دەست پێ دەکات. دەمزانی دوژمن بۆ (حسن بەگ)یش هجوم دەکا هەر بۆ لای ئێمە نیە. ئەو هێزەی، کە هێنا بووی، یەکجار زۆر بوو. هەر لە قەڵاچوالانەوە هەتا ماوەت، دەبابەو کەتیبەی مەدفەعیو جەیش بوو. پێشمەرگەیەکم نارد بۆ لای کاک حامیدو ئەوان لە وڵاخ لو بۆ هەندێك گوللەی ئاڕ بیجی. زۆریشم هەبوو، بەڵام وتم با هەر زۆر بێت. نامەشم بۆ نوسین وتم:
" –(حکومەت پەلاماری ئێوەش ئەدات، زۆر وریا بن. بە تایبەتی (حەسەن بەگ) زۆر قایم بکەن.)"
دیار بوو زۆر گوێیان نەدابوێ. پێشمەرگەکە هاتەوە وتی:
" –ئەوان ئەڵێن ئێوە وریا بن، خەمی ئێمەتان نەبێت."
وتی:
" –کاك شۆڕش ئیسماعیلو کاك حامیدی لێ یە."

کاك شۆڕش ئەو کاتە سەر تیپی (٤٧) بوو. لای خۆمانەوە هەموو هێزەکەم دامەزراند بوو. جێگایەك نەمابوو قایمی نەکەم. ئەوەی شکم لێ بوو، کە حکومەت هجومی لێوە دەکات، زۆر بە چاکی گرتبووم.
شەڕ بەم جۆرە دەستی پێکرد:
لە سەعات هەشت دا، تۆپ باران دەستی پێکرد. وەك باران راجیمەو تۆپی گەورەو تۆپی دەبابە دەباری بە سەرماندا. دواتر بە سێ چوار جۆر هاوەنی (١٢٠ملیم) هاوەنی (٨٠ ملیم) هاوەنی (٦٠ ملیم) تۆپ بارانیان کردین. گوللە هاوەنیش لە هەموو چەکەکانی تر خەتەرتر بوو بۆ ناو سەنگەرەکانمان. باران کوێ بگرێتەوە، ئەویش دەیگرێتەوە. یەك سەعات بەو شێوەیە کوتاینی، ئەوجا هێواش بۆوە. تۆپەکانی دوورخستەوە. دیار بوو هجومی پیادەی دەست پێ دەکرد. ئەو شەوە، هەشت جار هجومی گەورەی بۆ بالۆسە کرد، هەر هەشت جارەکە شکا. ئێمە خۆمان ئامادەکردبوو، کە هێزەکانیان دەگەیشتنە سەر سەنگەرەکان، ئەوجا بە رومانەو ئارپی جیوو بیکەیسیو کلاشنکۆف دامان دەگرتنەوە. زۆریان لێ کوژرا. هەر لە پەنا سەنگەرەکانی خۆماندا، تەرمی چەندین ئەفسەر کەوتبوو. سوپای دوژمن زۆر خراپ شکا بوون. بۆ بەیانی، یەك سەربازی کورد لە ناو بەردو دارەکاندا دەستی بەرز کردەوە، هاتە دەرەوە وتی:
" —من کوردم. ئەم شەو لەگەڵ ئەو هێزەدا بووم. کە شەو هێرشەکە دەستی پێ کرد، خۆم شاردەوە."
لێمان پرسی:
" —ئەم هێرشەی حکومەت چۆن بووە.؟"
وتی:
" —گەورەترین هێزی هێناوە. ئێمە لە بەسرەوە هاتووین. لە جەبهەی ئێرانەوە ئێمەیان گێڕاوەتەوە. هەموو (قوات خاصە) ین. پێیان وتووین:
" —ئەو شوێنە (بالۆسە) یەو پاسداری پێوەیە."
" —من وامزانی راستە. هەتا بەیانی، کە گوێم لێ بوو ئێوە بە کوردی قسە ئەکەن، ئەوجا زانیم درۆ ئەکەن پێشمەرگەی پێوەیە."
وتی:
" —گرتنی بالۆسەیان زۆر لا مەبەستە. بە ئێمەیان وتووە ئەبێت هەر بیگرن. زۆریشیان لێ کوژراوە، بۆیە وازیان هێنا. نەیان توانی بیگرن."
بە راستی ئەو پێشمەرگانەی، کە لە بالۆسە بوون، زۆر ئازاو چاو نەترس بوون. هەموویانم هەڵبژاردبوو، چونکە دەمزانی حکومەت زۆر هەوڵی ئەوێ دەدات. هەر ئەوێشی بگرتایە، جەبهەی هەردوو ناوچەکە شکستی دەهێنا. باش بوو بە ئازایەتیو قارەمانێتی پێشمەرگەکان، نەمان هێشت بیگرن. مەکتەبی سیاسی زۆر سوپاسی

پێشمەرگەکانیان کرد بۆ ئەو قارەمانێتیەی، کە تۆماریان کرد. لوقمان شاسوارم نارد بۆ ولاخ لو وتم:

" -بچۆ بۆ لای کاك حامیدو ئەوان، بزانە ئەم شەو وەزعی لای ئەوان چۆن بووە.؟"

ئێوارە هاتەوە وتی:

" -ئەزانی لای ئەوان پێشمەرگەی کەم لە حەسەن بەگ بووە. دووسێ پێشمەرگە بریندار بووە، هێزیشیان بۆ نەناردوون گێراوە. دەیان وت:

" -ئەم شەو هێرشی بۆ ئەکەینەوە. بەڵکو بیگرینەوە."

زۆرم پێ ناخۆش بوو. زۆر جێگایەکی گرنگ بوو. دەمزانی تازە ناگیرێتەوەو جێگای تریش دەگرن، چونکە حکومەت جێ پێی خۆی لە سەر شاخ کردەوە. هەر واش بوو، بۆیان نەگیرایەوە. ئیتر وازیان لە بالۆسە هێنا. شەوو رۆژ تۆپ بارانی دەکردین. شەوێکیان چەند پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەی خۆم لە بالۆسە شەهید بوون. یەکێکیان (وەستا تایەر) بوو. ئامر کەرتی تیپ بوو. پێشمەرگەیەکی دێرین و ئازاو قارەمان بوو. زۆر ناخۆش بوو بۆ من، چونکە ماوەیەك بوو زوير ببوو، لە گوندی (شەمە) لەگەڵ منداڵەکانیدا دانیشتبوو. من چووم هێنامەوە بۆ لای خۆم، کردم بە ئامر کەرتی تیپ. لەگەڵ خۆم بردم بۆ ئەو شەڕە، لە وێ شەهید بوو. زۆرم خەفەت پێ خوارد. هەر لە بیرم ناچێتەوە، چونکە لە بەر من هاتەوە بۆ پێشمەرگایەتی. شەوێك حکومەت پەلاماری ولاخ لوی دایەوە. هەر لە ئێوارەوە، دڕندانە وەك بارانی بەهار بە تۆپ کوتای. تیپی (٢١) و تیپی (٢٥)ی لێ بوو، لەگەڵ کەرتێکی تیپی (٥٧) ئامر کەرتەکەیان ناوی (شێخ وریا) بوو، کوڕی (شێخ رەشید) بوو. زۆر قارەمان بوو. ئەو لە سەنگەری پێشەوە بوو، کە پەلاماریان دابوون. یەکسەر ئەو شەهید ببوو. کەرتەکە ورەیان روخا، چونکە هەرکە مەسئولەکەیان شەهید بووبوو، شکا بوون. ورەیان نەمابوو. باقی هێزەکەش خۆیان پێ نەگیرا، هەموو شکان. تەنانەت لە دوورەوەش کەس لە دەنگی تۆپ باران خۆی پێ نەدەگیرا. حکومەت لە شەڕی ئێرانیشدا، قەد ئەو ئیمکانیاتەی بە کار نەهێنا بوو. هێزەکە شکان. شەو هاتن بە سەر ئێمەدا رۆشتن بەرەو سەفرە. زۆری پێ نەچوو، سەیرمکرد (عەلی بچکۆل) هات لە دواوە بۆی باسکردم چۆن شکاون؟ دوژمن بەردەوام هەر تۆپ بارنی دەکردین. بە تایبەتی ئەو هێزەی مەڵبەندی دوو شکان، بەرەو سەفرە هاتن. حکومەت دەیزانی بەرەو کوێ پاشەکشەیان کردووە. ئێمە مقەڕی تیپمان لە گوندی قامیش بوو. ژوورێکمان هەبوو بۆ ئیسراحەت، بەڵام ئەو شەوە بە خەستی تۆپ بارانی ئەو شوێنەیان دەکرد، کە رێی پاشەکشەی ئەوان بوو. بەرەو سەفرەو زەرووین. ئێمە هەموو لە سەنگەردا بووین، بەڵام پێشمەرگەیەك بە ناوی هاوڕێ خەڵکی گوندی دەرەویان بوو، نەمزانی لە ژوورەوەیە. تۆپ بەر ژوورەکە کەوتبوو، روخاندبوی بە سەریدا. ئەوەندە ماندو ببوو، خەبەری نەبووبۆوە. منیش چووم بۆ سەیری ژوورەکە، بزانم پێشمەرگەی تیا شەهید نەبووە؟ شەوێکی زۆر تاریك بوو، نەشم

دەتوانی لایت هەڵبکەم. دەستم گێڕا، پێشمەرگەیەك لە ژێر روخاوی ژوورەکەدا بوو.
دەستم دایەو راموەشاند. بە شلەژاوی چاوی کردەوە وتی:
" -کاك ئاوات چییە. ! ؟"
منیش پێم وت:
" -هەتیو ئەوە ماوی. ! ؟"
وتی:
" -چی بووە. ! ؟"
وتم:
" -باشە سەر هەڵبڕە، بزانە چی رووی داوە. ؟"
کە سەری هەڵبڕی وتی:
" -ئەوە بۆ خانوەکە روخاوە. ؟"
ئەمەندە ماندو بوو، ئەو هەموو تۆپ بارانە، کە وەك بارانی بەهار دەباری بە سەرماندا، خەبەری نەبووبوەوە. منیش پێم وت:
" -خۆزگەم بە خۆت."
شەوێ بوو لە هەرە شەوە سەختو ناخۆشەکان. کەش‌و هەواش زۆر سارد بوو. هەموو ئەو شاخەش بەفربوو، نە ژوورێکمان هەبوو نە چادرێ، هەموو لە بەر ئەو بەفرو سەرمایە بووین، کە بەرۆژیش دەیبەستیت، نەك شەو. ئێمە بەو جۆرە سێ مانگ بەو شاخەوەبووین. سەرەڕای ئەو هەموو جۆرە تۆپانەش. بە بەردەوامی تۆپبارانیان دەکردین. ورەیان بە پێشمەرگەکان بەردا، دەیان وت:
" -با ئێمەش پاشەکشە بکەین، چونکە ئەوێ گیراوە، کەوتوینەتە ناوەڕاستەوە. ئیتر ئێمە ناتوانین لێرە بمێنینەوە."
لایەکمان ماوەتو ئەملاشمان (ولاخ لوو) بوو گیرا. کەوتبووینە ناوەڕاستەوە. نەمهێشت پاشەکشە بکەن وتم:
" -عەیبە، ئێمە هەموو ئەو ئازایەتیەمان تۆمار کردووە، ئێستا بە بێ شەڕ چۆڵی بکەین. ؟"
چووم بۆ لای کاك جەبار فەرمان پێم وت:
" -ئیتر وەزعی جەبهەکە خراپە. خەریکە ئەڕوخێ. ئێمە پشتمان گیراوە، کەوتوینەتە ناوەڕاستەوە. بەس یەك لامان ماوە، ئەویش سەفرەیە."
کاك جەبار وتی:
" -نەء هیچ نییە. هەر لە وێ بن."
ماینەوە. بە دەست تۆپ بارانەوە وەزعمان زۆر خراپ بوو، چونکە دوژمن لە هەموو لایەکەوە موسەیتەر بوو بە سەر سەنگەرەکانماندا. لەو ماوەیەدا، حەوت پێشمەرگەمان بە تۆپ باران شەهید بوو. زۆر ناخۆش بوو. ئێمە هیچ کاردانەوەیەکمان نەبوو. هەر

دەبوایە چاوەڕێی ئەوە بین، کەی تۆپ دەدا بە سەرماندا. هەر ڕۆژەی پێشمەرگەیەک، یان دوو پێشمەرگە، بە تۆپ باران شەهید دەبوو. نەشم دەهێشت پێشمەرگە لەگەڵ شەهیدەکاندا بڕوا. هەموو شەهیدەکانم نارد بۆ سەفرە لەوێ بە کاتی بیان نێژن. کەی هەلومەرجەکان گونجا، تەرمەکان دەربهێنرێنەوەو بگوێزرێنەوە بۆ ئەو شوێنانەی، کە کەس‌و کاریان پێیان گونجاوو شیاوە. ئەوەندە پێشمەرگەمان شەهیدبوو، گۆڕستانێکمان دروست کردبوو. ڕۆژێ چووم بۆ سەفرە، کاک سامان لە ئێرانەوە گەڕابۆوە. (جەبار فەرمان) لە وێ نەبوو. نازانم بۆ کوێ چووبوو. بروسکەیەک بۆ من‌و سامان لە سەرکردایەتیەوە هات، دەڵێ:

" -وا وەفدێکی ( پ، د، ک) هاتن بچن پێشوازیان لێ بکەن‌و بە ڕێیان بکەن بۆ یاخسەمەر."

ئەو کاتە تازە مام جەلال لە ئێرانەوە گەڕابۆوە. ئێمەش لەگەڵ سامان لە ناو سەفرەدا چاوەڕوانی ئەو وەفدەی پارتی بووین. سەیرمکرد هەلیکۆپتەر لە سەر شاخی (گۆجاڕ) نیشتەوە. زۆر بە لامەوە سەیر بوو!، چونکە گۆجاڕ زۆر جێگایەکی بەرز بوو. کەوتبووە پشتی گەورە دێوە. مقەڕی حزبی دیموکراتی ئێرانی لێ بوو. گۆجاڕ موسەیتەر بوو بە سەر ناو دۆڵی سەفرەو زەرون‌و سەر شاخی قامیش‌و بزوردو بالۆسەدا. دوژمن پشتی لە هێزەکانی ئێمە گرتبوو. لە سەر گۆجاڕەوە، بە هاوەن بواریان نەدەدا یەک کەس سەر هەڵبڕێت لە گۆجاڕو بالۆسەدا. تەواوی جەبهەکە شکستی هێنا. زۆر خەتەر بوو بۆ ئێمە. کە ئەوەم بینی وتم:

" -کاک سامان سەیرکە هەلیکۆپتەر لە کوێ هێزی دابەزاند."

بە پەلە بروسکەمانکرد بۆ سەکردایەتی‌و مەڵبەندی دوو. مەڵبەندی دوو وتیان:

" -گۆجاڕ تیپی (٢١)و (٢٥)ی لێیە."

وتمان:

" -تەئکید بکەن، چونکە بە بەر چاوی خۆمانەوە هەلیکۆپتەری حکومەت هێزی تیا دائەبەزێنێ."

وتیان:

" -نەخێر وانیە. کاک قادر خۆشی چووە بۆ سەر گۆجاڕ."

ئەو کاتە کاک قادری حاجی عەلی لێپرسراوی مەڵبەندی دوو بوو. من زۆر توڕە بووم وتم:

" -دیارە یەکێتی هەلیکۆپتەری هەیە، ئێمە نەمانزانیوە."

من دڵنیا بووم ئەوان ئاگایان لە گۆجاڕ نەبوو. زۆر توڕە بووم. ئێمەی لێ بووین. فریای خۆمان نەکەوین، پشتمان لێ گیراوە. هێزەکەمان تیا دەچوو. بۆ ئێوارە زانیان ڕاستە گیراوە. پێیان وتین:

" -ڕاستە گیراوە."

تومەس کاک قادر بە تیپی (٢١)و تیپی (٢٥)ی وتووە:

" -برۆن بۆ سەری گۆجاڕ."
ئەوانیش وتوویانە:
" -باشە."
بەیانی بە رێی کردوون، خۆشی دوای نیوەڕۆ لەگەڵ پێشمەرگەیەکدا، سەر دەکەوێت بۆ لایان، کە نزیك سەر شاخ دەبێتەوە، سەیر دەکەن جەیشی لێیە. ئەو پێشمەرگەیەی لەگەڵیدا بوو (عومەر چاوشین) ئامر کەرت بوو. زۆر پێشمەرگەیەکی دێرین و ئازاش بوو. لە راپەڕینەکەی (١٩٩١) دا لە رێی کەرکوك شەهیدبوو. دەڵێت:
" -کاك قادر بە خوا ئەوانە عەسکەرن."
لێیان نزیك بووبوونەوە، سەیر دەکەن هەموو شاخەکە گیراوە یەك پێشمەرگەی لێ نیە. بە پەلە رایانکردبوو، کە دێنە خوارەوە، سەیر دەکەن تازە پێشمەرگە بەتەمان بچن. پێیان وتبوون:
" -بۆ کوێ ئەچن، حکومەتی لێ یە."
(قادری حاجی عەلی)و (عومەر چاوشین) هەر بە رێکەوت دەرچوو بوون. ئەوجا سەرکردایەتی وتی راستە گۆجاڕ گیراوە. سەفرە چۆڵ بووبوو. بازاڕو دوکانی لێ نەمابوو. دوژمن شەوو رۆژ تۆپ بارانی دەکرد. هەر مام حەمیدی لێ بوو، مەسئولی گومرگ بوو. ناردمان خواردنی بۆ برادەران دروستکرد. وەفدەکەی (پ، د، ك) مان برد بۆ ئەوێ نانیان خوارد. من گەڕامەوە بۆ لای برادەرانی خۆمان لە قامیش. پاش دوو رۆژ، تیپی (٥١، ٥٧) هاتن ئێمەیان گۆڕی. هەتا ئێمەی لێ بووین، نەگیرا. ئەو شەوە چووینە سەفرە، تەرمی پێشمەرگە شەهیدەکانمان دەرهێنایەوە. هێشتا وڵاخ داری لێ بوو. وڵاخمان بۆ بە کرێ گرتن، بە رێم کردن، بەڵام رێی وڵاخ لووو گەورەدێ نەمابوو. سەرکەوتین بۆ دۆڵی (شێم حەمەد) دەچووەوە بەرامبەری بەرگەڵو. ئەو دۆڵە کوێستانە، رێگایەکی زۆر سەخت بوو. هەموو بە بەفر داپۆشرا بوو. پێشمەرگەکانم بە رێکردو خۆم لەگەڵ (٣٠) پێشمەرگە مامەوە لای جەبار فەرمان و کاك سامان. تیپی (٥١) چووە برزودو بالۆسە. مەحمود سەنگاوی سەر تیپیان بوو. تیپی (٥٧) چووە سەفرەو زەرون. ئازاد سەر تیپیان بوو. بە (جەبار فەرمان)م وت:
" -کاك جەبار بە قسەی من ئەکەیت، برزودو بالۆسە چۆڵ بکەن. با بێنە پشتی سەفرە لای ئاسۆسەوە، چونکە تازە ئەو جەبهەیە شکستی هێناوە زۆر خەتەرە. ئەو تیپە تیا ئەچن. حکومەت خۆی ئامادەکردووە بۆ پەلاماردانی برزودو بالۆسە. لە وێشەوە بۆ دۆڵی سەفرەو زەرون."
وتی:
" -وانیە."
پێم وت:

" -کاك جەبار من وا ئەڕۆم، ئەو تیپە زۆر زەرەر ئەکات. پێشمەرگەش زۆر شەهید ئەبێت. یەك دەقە مقاوەمەت ناکەن، چونکە دواوەیان گیراوە."
بە هەر حاڵ، وتی وانیە. دوو ڕۆژ مامەوە لایان، هیچ نەبوو. دیار بوو خۆیان ئامادەکردبوو بۆ پەلاماردانی سەفرەو زەرون. جەبار فەرمان لە ناو سەفرەدا مقەڕێکی دروست کردبوو. ژێرەکەی حەشارگە بوو. زۆر قایم بوو، تۆپ کاری لێ نەدەکرد. گەڕامەوە، شەو گەیشتمە سەرگەڵو. شەو لە وێ بووم، کاك نەوشیروان لە وێ نەبوو. سەفەری کردبوو، چووبوو بۆ دەرەوە. مام جەلال لە یاغسەمەر بوو. بە پێشمەرگەکانم وتبوو:
" -ئێوە بڕۆن، لە دۆڵە روت چاوەڕێم بکەن."
مام جەلال جوابی بۆ ناردم، کە بچم سەردانی ئەو بکەم، ئەوجا بگەڕێمەوە. منیش (ئاسۆی شێخ نوری)و (لوقمان شاسوار)م لەگەڵ خۆم برد. چووم بۆ لای مام جەلال. بە هۆی گەڕانەوەی لە سەفەرەکەی، بەخێرهاتنەوەم لێ کرد. ئەویش زۆر سوپاسی خۆ راگری‌و قارەمانێتی پێشمەرگەکانمانی کرد، وتی:
" -ئێمە زۆر سوپاسی تۆ ئەکەین، کە گەڕامەوە ناو سەفرە، دیم گۆڕستانێکتان دروست کردبوو. نەتهێشتبوو جەبهەکە چۆڵ ببێ. ئەوە قارەمانێتی تۆیە، چونکە لە حاڵەتی وادا، هەر شەهیدێ دوو پێشمەرگەشی لەگەڵ بڕۆشتایە، جەبهەکە چۆڵ ئەبوو."
منیش پێم وت:
" -زۆر سوپاس مام جەلال. ئەوە ئەرکی سەر شانی خۆمانە."
دوای ئەوە دەنگو باسی سەفەرەکەیم لێ پرسی. زۆر لێی رازی بوو. دووربینێك‌و سەعاتێکی لە ئێرانەوە هێنابوو، بە دیاری دای پێم. هەر لە رێگا دووربینەکەم دا بە لوقمان. دواتر سەعاتەکەشم لە دەرەویان دا بە شەوکەتی حاجی موشیر. پێش ئەوەی خواحافیزی بکەین، مام جەلال وتی:
" -بە خوا ئاوات ئەم سەگبابانە بیان هێشتایە ئەم زستانە لێرە بین. باش بوو."
منیش ئەوەم لە بیر مابوو، کە لە کاتی رۆشتنیا وتی:
" -نەورۆز ئاگر لە کەرکوك ئەکەینەوە."
پێم وت:
" -مام جەلال، دیاربوو قسەکەی من بوو، کە وتم من بە لای خۆمان رازیم بۆ ئاگری نەورۆز."
وتی:
" -نەء، ئێستاش هەر سورم لە سەر قسەی خۆم. لە کەرکوك ئاگری نەورۆز ئەکەینەوە."

به راستی مام جەلال زۆر پیاوێکی بەورە بوو. من لە مێژووی شۆڕشدا، ئەوەتەی ئەوم ناسیوە، لە هەموو کاتێکدا قەد بە رووخاوی نەبینیوە. زۆر بە ئازایی دیومە. جاری وا بووە، تەیارە بۆردومانی کردووە، هاتووە کردویەتی بە دەنگە دەنگ بە سەر پێشمەرگەدا. بۆ خۆتان ناشارنەوە. کەچی خۆی لە دەرەوە وەستاوە. من بۆ خۆم چەندین جار ئەوەم لە مام جەلال بینیووە. نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی مام جەلال خوارد. پێش ئەوەی خواحافیزی بکەین، پێی وتم:

" – چ داواکاریەکتان هەیە پێم بڵێ، با بۆتانی جێ بەجێ بکەم."

منیش وتم:

" –مام جەلال تەنها خۆشیت، یەك داوام هەیە لە جەنابت. برادەرێکمان هەیە ناوی رەئوفە کەرە. زۆر پیاوێکی قارەمانە. زۆر کەسێکی رێکوپێکە. پێشمەرگەیەکی دێرینە. چەندین ساڵە هەر ئامر کەرتە، مەغدورە."

وتی:

" –ئەگەر خۆشت پێت باشە، هەر لە ئێستاوە بیکە بە جێگری تیپ."

وتم:

" –زۆر سوپاس مام جەلال. داواکەم هەر ئەوە بوو."

خواحافیزیمان کردو بەرەو دۆڵە روت بە رێکەوتین. خەبەرمان بۆ هات حکومەت پەلاماری سەفرەو زەرونی داوە. هەر دوو شەو دوای ئێمە، پەلاماری دابوو. شەو تیپی (٥١) بە پەرێشانی دەرچووبوون (٩) پێشمەرگەیان شەهید بووبوو. تەرمەکانیشیان گیرابوو. نازانم خۆشیان چۆن دەرچوو بوون. کە پەلاماریان دابوون، لە ماوەی یەك سەعاتدا، هەتا زەرون نەوەستابوون. جەبار فەرمانو سامان گەرمیانیو ئازادی سەگرمە، شەو چووبوون بۆ ئەشکەوتەکانی شاخەکە. لە مقەڕ نەنوستبوون. کە بەیانی رۆژ بووبۆوە، سەیر دەکەن لە دەوری مقەڕەکەی جەبار فەرمان تەقەیە. سەیریانکردبوو، عەسکەر لە ناو بازاڕەکەی سەفرەدایە. هەر، کە شەو پەلاماریان دابوون، پەرتەوازەیان کردبوون. هەموو رایانکردبوو بەرەو پشتی (کانی توو) رزگاری حاجی کایل، کە فەرماندەی کەرتی جەباری تیپی ٥٧ی سەگرمە بوو، لە زەرونەوە پەڕیبۆوە بۆ بەری ئێران. دوای مانگێك لە سورێنەوە هاتەوە بۆ قەرەداغ. ئەو هەموو پێشمەرگەیە بە خۆڕایی شەهید بوون. ئەگەر جەبار فەرمانو ئەوانیش، شەو مقەڕەکەیان بە جێ نەهێشتایە، خۆشیان دەگیران. ئیتر نازانم کامیان وتبووی باشەو لێرە نەنووین، بچین بۆ شاخ. بە رێکەوت رزگاریان ببوو. دوایی خەتای (مەحمود سەنگاوی)یان گرتبوو. گوایە مقاوەمەتی نەکردووە. نەك (مەحمود سەنگاوی)، هەر فەرماندەیەکی تریش بوایە، لەوە خراپتر دەبوو، چونکە جەبهەکە شکستی هێنابوو. لە جیاتی پێشمەرگەش هەمووی دەبابە بوایە، نەیان دەتوانی هیچ بکەن، چونکە چوار

دەوریان گیرابوو. تەنها دۆڵی سەفرە مابوو، ئەویش لە ژێر رەحمەتی شاخی گۆجاڕدابوو. عەسکەرییەن جەبهەکە سقوتی کردبوو. لە گۆجاڕەوە بۆی دابەزیبوون.

٨٠

١٢/٢١/ ١٩٨٦ بوو. شەوکەتی حاجی موشیر ناردی بە دوامدا، کە چووم بۆ مەڵبەند وتی:
" –با پێکەوە بچین بۆ دیوی گەرمیان، پەلاماری ناحیەی سەنگاو بدەین. بزانین نایگرین."
وتم:
" –باشە."
زۆربەی تیپەکان کۆبووینەوە، چووینە دەورو بەری دەرەویانو جافەران. پێویستیمان بە شارەزا هەبوو بۆ ناو شارەکە. لەو کاتەدا شەهید (حەمە رەش) زۆر شارەزا بوو. ئەو لە سەرکردایەتی بوو. بیرمان لێ کردەوە، بنێرین بە دوای شەهید حەمە رەش دا. چووینە گوندی جافەران. لەو کاتەدا (ئازاد قەرەداغی) لە وێ بوو. چووینە لای. هەر لە وێ بروسکەیەکمان کرد بۆ سەرکردایەتی. وتمان:
" –پێویستمان بە حەمە رەشە."
وتیان:
" –باشە بۆتان ئەنێرینەوە."
دوای نیوەڕۆ بوو، بروسکەمانکرد. بۆ رۆژی دوایی، هەر لای ئازاد قەرەداغی بووین. بۆ عەسر حەمە رەش خۆی کرد بە ماڵی کاك ئازاد دا. لە وێ دانیشتبووین، بەخێر هاتنمان کردەوە. ئازاد قەرەداغی وتی:
" –ئەوە کاك حەمە رەشە، کە دوێنێ بروسکەتان بۆ کرد.؟"
وتمان:
" –بەڵێ ئەوە کاك حەمە رەشە."
حەمە رەش زۆر پیاوێکی ئازاو قارەمان بوو. زۆر بە هیمەت بوو. لە رۆژانی شەڕدا، قەد نەمدی بۆ جارێکیش بە شەڕێ بڵێ ناکرێ. بۆ هەر جێگایەك بچووینایە، ئەو دەیوت:
" –من ئەچم ئەیکەم."
بە داخەوە لە راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ لە ناو دوزخورماتودا بریندارکراو دواتر دوا هەناسەی سپارد. بەمەش گەورەترین زیان لە کوردو یەکێتی نیشتمانی کەوت. کاك ئازاد قەرەداغی وتی:
" –بە راستی ئەوە هێزە ئێوە هەتانە. پێشمەرگەی ئێوە قارەمانە. دوێنێ بروسکەتان بۆ کاك حەمە رەش کردووە، ئەم رۆ گەیشتۆتە لاتان. بڕوا بکەن ئەوە دووسێ مانگە

لێرەم بە بێ پێشمەرگە. خزمەکانی خۆم حیمایەم ئەکەن. هەر بروسکە ئەکەم بۆ مەفرەزەکەی خۆم بگەڕێنەوە بۆ لام، دێنە سەر شاخی سورێن‌و سەیری دیوی شارەزور دەکەن، یەکسەر دەگەڕێنەوە بۆ دیوی ئێران. دەڵێن کاک ئازاد بە هیچ شێوەیەك ڕێگە نییە بگەڕێینەوە. ناتوانین، چۆن بێینەوە؟ ئەی باشە ئێوەش دوێنێ بروسکەتان بۆ کاك حەمە رەش کرد، بە یەك شەو هاتەوە لای ئێوە. ئەی بۆچی ڕێگا هەیە، بۆ هێزەکانی ئێوە، بەڵام بۆ ئەوانەی ئێمە نیە. خۆ ئێوە بە ئاسماندا نافڕن. بە ڕاستی هێزی یەکێتی قارەمانە."

ئیتر هێزەکان کۆبونەوە، کەوتینە ڕێ بەرەو دیوی سەنگاو. چووینەماڵی شەهید حەمە رەش، لە گوندی کربچنە. لەوێ بوو. لە وێوە بە ڕێکەوتینەوە، چووینە (سەر قەڵا) دێکەی شێخ رەشید. شەو لە وێوە هێزەکانمان دابەشکرد. چۆن بچینە ناو شار؟ ئەم جارەش وەك هەمان جاری پێشو داماننان. لە پێشەوە ناو شار بگرین، ئەوجا لە شارەوە پەلاماری ئەو موعەسکەرە بدەین، کە لە دەرەوەی شارەکەدا بوو. هێزەکەمانکرد بە دوو بەش. بەشی یەکەم، سەر لە ئێوارە بچنە ناو شار، چییان پێ کرا بیکەن. بەشی دووەم، بچنە ناوەوە. شەهید حەمە رەش بەشی یەکەم بوو. چووە ناو شار. لەگەڵ هێزێك هەندێ رەبایەی دەرەوەی‌ی شاریان گرت‌و چوونە ناوەوە. دوای ئەوە باقی هێزەکە لەگەڵ من‌و کاك شەوکەت بوون. لە قەراغی شار لە دەوری ماڵەکان بووین، چاوەڕێی جوابی بەشی یەکەممان دەکرد. وتیان:

" –ئێمە گەیشتینە ناو شار."

بەڵام لەو شەڕەدا، گوللە وەك باران لە هەموو لایەکەوە دەباری. ئێمەش لە دوای ئەوان باقی هێزەکە خۆمانکرد بە ناو شاردا. من هەر لە دوورەوە ناحیەی سەنگاوم دی بوو. شەوکەتی حاجی موشیریش هەر وەك من شارەزای سەنگاو نەبوو، بەڵام پێشمەرگەی شارەزامان لەگەڵ بوو. چووینە ناو شارەوە لەگەڵ هێزەکەی تر یەکمان گرتەوە. ئەو کاتەش هەموو رەبایەکانی ناو سەنگاو بە پیسترین جاش تەنرابوو. شەڕ لە هەموو لایەکەوە دەستی پێ کردبوو. ڕۆژ بۆوە. تا بەیانی زووربەی ناو شار پاك کرایەوە لە جاش‌و موخابەرات‌و پیاوی ڕژێمی بەعس. شەڕ هەر گەرم بوو. هەموومان دابەش بووین، بە جیهاز ئاگامان لەیەك بوو. لە ماڵەکاندا نانمان دەخوارد. شەڕی ناو شاریش وەك شەڕی دەرەوە نەبوو. ئەوە بۆ یەکەم جار بوو، من شەڕی ناو شار بکەم. هەتا دوای نیوەڕۆ ناو شارمان بە تەواوی پاك کردەوە. هەرچی رەبایەی تیابوو، هەمووی گیرا. هەموو ماڵە جاشەکان گیراو سوتان. هەموو خۆیانکرد بە موعەسکەرەکەدا. ئێمەش بە ئارەزوی خۆمان بە ناو شاردا دەگەڕاین. زۆر بە لامەوە سەیر بوو، ئەو ڕۆژە تەیارە هەڵنەسا! هێزێکمان ناردبوو بۆ سەر جادەی (چەمچەماڵ–سەنگاو) بۆ ئەوەی نەیەڵن هێز لەوێوە بێت بۆ یارمەتی سەنگاو. راجیمەیەکمان لە دەرەوەی شار دانابوو، بۆ ئەوەی لە موعەسکەرەکەی پێ بدات. تۆپێکی ١٠٦ ملیمان لە سەر جێبێك دانابوو.

ئەویش هەر لە دەرەوە بوو. مەرکەزی پۆلیس مابوو لە ناو شاردا، زۆر قایم بوو. ئاربیجی کاری تێ نەدەکرد. بە تەمابووین دوای گرتنی موعەسکەرەکە، ئەوجا بگەڕێینەوە، بە ( ١٠٦) ەکە لێی بدەین. ئەگەر موعەسکەرکە بگیرایە، هەر خۆیان تەسلیم دەبوون، ناوچەی گەرمیان رزگاربوو، بەڵام ناو شارو دەوروبەری سەنگاو حکومەتی تیدا نەمابوو. لەگەڵ رەبایەکانی سەر جادەی سەنگاو– چەمچەماڵ. ئێوارە بوو لەگەڵ کاك شەوکەت یەکمان گرتەوە. هێزەکەمان کۆکردەوە بۆ ئەوەی پەلاماری موعەسکەرەکە بدەین. لە هیچ جێگایەك تەقە نەمابوو. ئەوەی مابوو هەر مووعەسکەرەکە بوو. ئەوانیش تەقەیان نەمابوو. خۆیان متکردبوو تەسلیم ببن. هێزەکەمان دانابوو لە بن موعەسکەرەکەدا، بە راجیمەش لێمان دەدا. بەتەما بووین ئیتر پەلاماریان بدەین. منو کاك شەوکەت وەستا بووین لە کۆڵانێکدا قسەمان لەگەڵ برادەران دەکرد. دەمانوت:

" هێواش کەن بادنیا تاریك بێت، ئەوجا پەلاماری بدەن."

ئیتر هەر خەڵك بوو لە دێهاتەکانەوە دەهاتن بۆ ناو شار. خەڵکی ناو شاریشماڵەکانیان دەردەکرد بۆ دێهاتەکان. هەر ئەودەمە کاك سامانیش لە گوندی براوەل دانیشتبوو. بۆ حاڵو ئەحواڵی ئێمە هاتبوو. وەستا بووین هەموو قسەمان دەکرد بە یەکەوە، لە پڕ ناقیلەیەك خۆی کرد بەو کۆڵانەدا، کە ئێمەی لێ بووین. هەر هەموو پەشۆکاین، نەماندەزانی چی بوو، چونکە ئێمە بە تەمای ئەوە نەبووین حکومەت بێ. ناقیلەکەش سەری لێ شێوابوو، نەیزانی بوو ناو شار هەمووی گیراوە. خۆی دەکرد بە هەر کۆڵانێکدا، پێشمەرگەی تیابوو. پێشمەرگەش وەك ناقیلەکە سەری لێ شێوا بوو. ئیتر گەڕایەوە خۆیکرد بە موعەسکەرەکەدا. ئێمەش وامانزانی هێزی حکومەتە گەیشتە ناو شار. بە پەلە چۆڵمانکرد. بە هێزەکەشمان وت:

" –چۆڵی بکەن واز بێنن بگەڕێنەوە."

ئیتر شارمان چۆڵکردو گەڕاینەوە. تومەس هەر ئەو ناقیلەیە بووە لە دەست هێزەکەی خۆمان دەرچووە. بەرەو سەنگاو دەرچوو بوو. ئێمەش وامانزانی رێگا چۆڵ بووە. لەو شەڕەدا زۆر سەرکەوتو بووین. هەموو ناو شارو ئەو هەموو رەبایەو ماڵە جاشەمان گرت. لە ماوەی شەو و رۆژێکدا شارەکەمان ئازادکردو خستمانە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە. بەوەش گەورەترین گۆڕانکاریمان لە شێوەی شەڕەکاندا دروستکرد. خۆشمان بە سەلامەتی گەڕاینەوە. شەڕێکی زۆر سەرکەوتو و بێ زیان بووین. لە بیرم نیە شەهیدمان بووبێ. بۆ بەیانی حکومەت هاتەوە ناو سەنگاو، چۆڵی کردو شارەکەی هەموو رووخاند.

ساڵی ۱۹۸۷بوو. هەر لە ناحیەی سەنگاو گەڕاینەوە، نەمهێشت پێشمەرگەکان بڵاوە بکەن. تیپەکەی خۆمان چووین بۆ سلێمانی. پێشمەرگەیەکمان هەبوو، ناوی عومەر بچکۆل بوو وتی:

" -جێگایەکی باشم دۆزیوەتەوە لە گەڕەکی (سەر کارێز)."

شوێنەکە ڕەبایەیەکی گەورە بوو. شەوانە هەرچی ئالیاتی شۆفڵو میکانیکی دائیرەی ئیشغالو ڕێگاو بان هەبوو، لە وێ کۆ دەبوونەوە. وتمان هەر هیچ نەبێت گەر بۆشمان نەگوێزرێتەوە، دەیسوتێنین. ڕەبایەکە زۆر گەورەبوو. هەمووی عەسکەری بوو. ئێوارە چووینە (بەردە کەڕ)ی نزیك تانجەرۆ نانی ئێوارەمان خوارد. من لە ماڵی برادەرێك بووم ناوی کاك مستەفا بەردە کەڕی بوو. زۆر کوڕێکی باش بوو. زۆری پێ وتم:

" -کاك ئاوات مەچن زۆر خەتەرە. هەمووی عەسکەرو ڕەبایەیە. بە شەویش هەموو ئەو ناوە کەمینە. تۆ زۆر غەدر دەکەیت خۆت بۆ هەموو جێگایەك ئەچیت. تۆ چۆن ئەچیت بۆ ناو شار."

زۆری پێ وتم هەر هیچ نەبێت خۆت مەچۆ پێم وت:

" -کاك مستەفا بۆ خۆم نەچم؟ فەرقی منو پێشمەرگە چییە؟"

وتی:

" -ڕاستە. بەڵام تۆ سەر تیپیت. ئەگەر تۆ شتێکت لێ بێت، وەزعی هەموو تیپەکە تێك ئەچێت. تۆ خۆت ئەزانیت دوژمن دایم محاوەلەی مەسئول ئەکات. مەسئول شتێکی لێ بێت هێزەکە ئەشکێت."

وتم:

" -کاك مستەفا سوپاس. من ئەگەر بۆ خۆم نەچم، پێم وایە پێشمەرگە ئەڵێت ئێمە ئەنێرن بۆ شەڕو خۆیان لە دورەوە سەیر ئەکەن. من نامەوێت کەس وام پێ بڵێت. کە من خۆم لەگەڵیان بم، ئیتر کەس ناتوانێت قسە بکات. چەند شەڕمان کردوە، بە بێ خۆم نەبووە. زۆربەی جاریش خۆم بۆ هێرشکردن داناوە. ئەوە هەموو تیپی (٥٥) ی قەرەداغ خۆیان شاهیدن."

کاك مستەفا وتی:

" -ڕاستە، بەڵام من ئەوە بە باش نازانم."

دیار بوو دڵسۆز بوو بۆم، چونکە زۆری خۆش دەویستم. ڕۆیشتین لە تانجەرۆ پەڕینەوە. لە گوندی ژاڵەوە لە جادەی عەربەت-سلێمانی پەڕینەوە بەری قرگە. کەوتینە سەر جادەی کۆنی عەربەت-سلێمانی. چووینە (کانی با) لە وێوە نزیك بوو. لە وێ هێزەکەمان دابەشکرد بۆ سەر ئەو ڕەبایەیەی، کە بڕیار بوو بۆی بچین. شوێنەکە زۆر قایم بوو. لە هەموو لایەکەوە بە شۆفڵ خۆڵی بۆ هەڵدرا بۆوە. کەوتبووە ژێر خۆڵەوە. باقی هێزەکەمان دابەشکرد بۆ کەمین. وتمان ئەگەر لە هەر لایەکەوە هێزیان بۆ هات، بواریان پێ نەدەن. پەلاماری ڕەبایەکەمان دا. لە سێ لاوە بە ئاڕ بیجیو

رومانە رەبایەکەمان داگرتەوە. لە هەموو لایەکەوە بوو بە تەقە. لە هوانەو تانجەرۆشەوە، تۆپ بارانیان دەکردین. لە ناو شاریشەوە هێز هات بۆمان. دووسێ پێشمەرگشمان بریندار بوو. ئەمان توانی بە تەواوی دەست بە سەر رەبایەو جێگاکەدا بگرین. زۆربەی شۆفڵو سەیارەکان سوتان. عەسکەرێکی زۆریش کوژرا. زەرەری زۆرمان لێدان، چونکە دوو ڕۆژ ئەیان هێشتبوو کەس بچێت بەو ناوەدا. پەکی سایەق‌و کرێکارەکانیش کەوتبوو. لە بەر بریندارەکان ناچار بووین بگەڕێینەوە، چونکە زۆر دوور بوو. بریندارەکان وەزعیان زۆر خراپ نەبوو. بە پێی خۆیان دەڕۆیشتن. یەکێ لە بریندارەکان عومەر بچکۆل بوو. کوڕێکی ئازا بوو. لە دێیەك دانیشتبوو. نازانم بۆ چی زویر ببوو. هەر بۆ شەڕ دەهات لەگەڵمان. بە داخەوە، کەس نەیزانی چی بە سەر هات. چوو بوو بۆ ناو شار ون بوو. ئەمانزانی چی بە سەر هات‌و چۆن گیراوە، بەڵام هەر حکومەت گرتی کوشتی، چونکە پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمان بوو. خۆی سەر بە خۆ بوو، بۆیە کەس نەیزانی چۆن بێ سەرو شوێنیان کرد. گەڕاینەوە. هەتا گەیشتینە تانجەرۆ، ڕۆژ بۆوە لە جادەی قەرەداغ–سلێمانی پەڕینەوە، خەریکبوو خۆر دەکەوت. گەیشتینەوە گوندی بەردەکەر. لە وێ تەرەکتۆرمان گرت بۆ دیوی قەرەداغ. شەڕەکە دەنگێکی زۆری دابۆوە. ئەو کاتە گەورەترین هجوم لە سەر سەرکردایەتی بوو. هەموو هێزی پێشمەرگە سەرقاڵی شەڕی سەرکردایەتی بوون. ناو شارەکان بۆ خۆیان ئیسراحەتیان کردبوو. پێشمەرگە نەیدەتوانی بچێتە ناو شار. ئەوەی ئێمە کردمان، زۆر باش بوو بۆ ورەی خەڵك‌و ترسانی دوژمنیش. سەرکردایەتیش زۆریان پێ خۆش بوو. هەر گرتنی سەنگاویش بۆ ئەوە بوو تۆزێك فشار لە سەر سەرکردایەتی کەم بێتەوە. بەڵام حکومەت هەر گوێی نەدەدایە. کە سەفرەو زەرونی گرت، ئیتر وەستا، چونکە ئەو خەتەی زۆر لا مەبەست بوو. تاکە ڕێگا بوو لە نێوان ئێران‌و کوردستاندا.

ئەو ماوەیە، شەوکەتی حاجی موشیر لێپرسراوی مەڵبەندی یەك بوو. سەرکەوتو بوو. زۆری پێ نە چوو، ئەویشیان نەقڵ کرد. جەبار فەرمان هات دەورو تەسلیمی لەگەڵ کرد. شەوکەتی حاجی موشیر لە مەڵبەند نەمابوو. ڕۆژێ شەوکەت هات بۆ ماڵی خۆمان لە گوندی دوکان (ئاغای رەحیمی)و (حەمەی حەمە سەعید)ی لەگەڵ بوو. ئەو کاتە حەمەی حەمە سەعید لە گوندی هەوارە کۆن بوو، لە بەری هەورامان. جێگری سەر تیپی (١١)ی هەورامان بوو. مقەڕیان لە هەوارە کۆن بوو. نیوەڕۆ لە ماڵی ئێمە نانیان خوارد. کاك شەوکەت وتی:

" –تەندروستیم باش نییە، لایەکم لە ئیش کەوتووە. داوام کردووە بۆ چارەسەر بچم بۆ ئێران. بۆ نایەیت بە یەکەوە بچین."

منیش وتم:

" -زۆرم پێ باشه، ئەگەر ئاغای رەحیمی ئەتوانێت شتێکمان بۆ بکات. لە سەرەتای دەست پێکردنی شەڕی عێراق-ئێران لە ساڵی ١٩٨٠ تا ئێستا، برایەکم بێ سەرو شوێنە. نازانین چی بە سەر هاتووە. ئاغای رەحیمی ئەتوانێت هەوڵمان بۆ بدات.؟"
ئاغای رەحیمی وتی:
" -بە سەر چاو. من ئەتوانم لە هەموو ئەو جێگایانەی، کە دیلی عێراقی لێیە، پرسیارت بۆ بکەم. مەسئولی ئەو دیلانە برادەری خۆمە."
وتم:
" -باشە، خۆ ناتوانم لە خۆمەوە بێم. ئەبێت سەرکردایەتی مۆڵەتم بدات."
ئەو کاتە مام جەلال لە وێ بوو. کاک نەوشیروان لە دەرەوە بوو. کاک شەوکەت وتی:
" -خۆت جیهازت لایە، بچۆ بروسکەیەکی بۆ بکە، ئێستا وەڵامت ئەداتەوە."
وتم:
" -باشە."
بروسکەیەکم کرد بۆ مام جەلال پێم وت، کە دەمەوێت بچم بۆ ئێران. ئەویش خۆی لە وەزعی من ئاگادار بوو، وتی:
" -زۆر باشە بچۆ، منیش پێم خۆشە بەڵکو رەحیمی بتوانێت شتێکت بۆ بکات."
بروسکەیەکیشم کرد بۆ کاک جەبار فەرمان بۆ مەڵبەند. ئەویش پێی باش بوو. دوای نیوەڕۆ لە گوندی دوکانەوە کەوتینە رێ بەرەو شارەزور. منو کاک شەوکەتی حاجی موشیرو حەمەی حەمە سەعیدو دوو سێ پێشمەرگەو دوو ئامر کەرتمان لەگەڵ بوو. کاک شەوکەت ئارامی کوڕیشی لەگەڵ بوو. ئەو دوو برادەرەی کاک شەوکەت هێنا بوونی، خەڵکی دەورو بەری ئاڵانو حاصل بوون. دوو پێشمەرگەی ئازا بوون. (ئەحمەد سۆیلەمیش)و (محەمەد تۆفیق) بوو. هەردووکیان فەرماندەیی کەرت بوون. بۆ شارەزایی هاتبوون لەگەڵمان، بۆ ئەوەی رەوانەمان بکەن. شەو لە جادەی دەربەندیخان-عەربەت پەڕینەوە بۆ بەری ئاڵانو حاصڵ. لە بەرئەوەی رێگاکە زۆر دوور بوو، وا بڕیار بوو ئەو شەوە لە ئاڵانو حاصڵ بمێنینەوە، بەڵام هەر هەمان شەو، لە بەحرەکە پەڕینەوە بۆ بەری هەڵەبجە. کە چوینە ئاڵان، بڕیار وابوو لە ماڵی کاک ئەحمەدو ئەو برادەرەی تر بمێنینەوە. لە وێ نانو چامان خوارد. شەو کاک شەوکەت وتی:
" -بە خوا لێرە نامێنینەوە. وا باشە بڕۆین بۆ ئەو بەر."
منیش وتم:
" -کاک شەوکەت من خۆم داوەتە دەست جەنابت، موناقەشەی ناکەم. خۆت چۆنی بە باش ئەزانیت، وا بکە."
زۆر هیلاک بووین، بەڵام لە بەر ئەوەی من پێشوتر خۆم دەستم بەوە چزابوو. لەبەر برادەرێك، کە هیلاك ببوو، بۆ بەیانی رو بە رووی چ کارەساتێك بووینەوە، قەد گوێم لە

هیلاکی نەبوو. وەك پێشینان دەڵێت (دوور بڕۆو سەلامەت بە) منیش دەمزانی کاك شەوکەت خاوەن ئەزمونی زۆرە. ئەو چی بڵێت من بەڵێم لە سەر بوو. وتی:
" —ئەڕۆین لێرە نابین."
ڕۆشتین چووینە سەر بەحرەکە. بەلەمێکمان پەیداکرد. بە دوو جار پەڕینەوە بۆ بەری هەڵەبجە. ڕێگاش زۆر قوڕو ناخۆش بوو. بە تایبەتی، کە پەڕینەوە بەری (دووجەیلە) هەمووی کێڵرا بوو. زۆر ناخۆش بوو، هەتا ئەژنۆمان دەچوو بە قوڕدا. دوو برادەرەکە گەڕانەوە بۆ دێکەی خۆیان. ئەوان ماڵو منداڵەکەشیان لە وێ بوو. ئێمەش ڕۆشتین لەو دەشتەوە. گڵۆپی کارەبای دووجەیلە، دەیدا لە چاومان. بە شەوارەی خستبووین. لە هەموو لایەکیشەوە تەقەیان دەکرد، چونکە ناو دووجەیلە زۆربەی جاش بوون. دەیان ڕەبایەی جاشی لێ بوو. دامان بە لای دووجەیلەدا، لە جادەی هەڵەبجە—سەید سادق پەڕینەوە بەری تەپی سەفا. لە وێ کاك شەوکەت وتی:
" —ئێوە بڕۆن بۆ بەشارەت —دێکەی کاك حامیدی حاجی غالی— من ئەچم بە سەر پێوە سەردانێکی باوکم ئەکەم. وەزعی خراپە."
ئەو چوو بۆ گوندی (تەپی سەفا) وتی:
" —منیش دوایی دێم بۆ لای ئێوە."
من هیچ شارەزا نەبووم. حەمەی حەمە سەعیدو ئەو برادەرانەی، کە لەگەڵی بوون، شارەزا بوون. ڕۆیشتین بەرەو بەشارەت. گەیشتینە بەشارەت، لە وێ لە ماڵی خزمەکانی کاك حامید دابەش بووین. هەموومان هەشت نۆ کەس دەبووین. من لەگەڵ کاك حەمەی حەمە سەعیدو مام هادی، چووینە ماڵی خەزوری کاك حامید. دیار بوو کاك شەوکەت ئەویش خۆیو ئارامو دوو پێشمەرگەی لەگەڵ بوو، چوو بوونە ماڵێکی تر. دەبوایە کەس نەزانێت، چونکە خەتەر بوو. کەشف بووینایە، تیا دەچووین. لە ڕژێمەوە نزیك بوو. هەتا گەیشتینە دێی بەشارەت، ڕۆژ بۆوە. ئەوەندە هیلاك بوو بووین، لە پێ کەوتبووین. لە دوکانی قەرەداغەوە دەرچووین، گەیشتبووینە بەردەمی خورماڵ بەو قوڕو ناخۆشیە. ئێمە بەتەما بووین بە دوو قۆناغ بگەینە ئەوێ، بەڵام بە یەك شەو ئەو ڕێگا دوورەمان بڕی. زۆر هیلاك بووین. لە وێ نوستین. مام هادی هەر نەخەوت. بەیانی دەوری سەعات هەشتو نیو بوو، بوو بە تەقوتۆق. لە شارەزورەوە گرمەگرمی دەبابەو هەلیکۆپتەر دەهات. خاوەن ماڵەکە چوو بوو بۆ هەڵەبجە. هاتەوە وتی:
" —لە جادەی سەید سادقو هەڵەبجەوە بە جاشو جەیشو دەبابە، هجومە بۆ سەر بەحرەکە. ئیتر نازانم ئیخباری ئێوەیە، یان شتی تر بووە. لە جادەی دەربەند عەربەتیشەوە بەرەو ئالانو حاصڵ هجومی کردووە."
کە وایوت، من لە دڵی خۆمدا وتم:
" —لە سەدا سەد بۆ ئێمەیە."

ئێمە لە سنوری هجوم دەرچوو بووین. خەمی دوو برادەرەکەی ترم بوو. وتیان:
" –هیچ نییە."
ئەویش وتی:
" –هەر بۆیە گەڕامەوە، پێتان بڵێم، کە هجومەکە ئەو بەرە. وریا بن مەیەنە دەرەوە."
لە دڵی خۆمدا وتم:
" –بۆ کوێ دێینە دەرەوە، خوا خوامە بخەوم."
جار جاریش مام هادی هەر دەی پرسی:
" –کاک ئاوات سەعات چەندە.؟"
زۆر سەیر بوو بە لامەوە بۆ ئەوەندە پرسیاری سەعات دەکات!؟ بە حەمەی حەمە سەعیدم وت:
" –ئەوە چیە؟ مام هادی بۆ ئەوەندە پرسیاری سەعات ئەکات.؟"
وتی:
" –ئەوە حسابی کاتەکە ئەکات، بزانێت رۆژ زووە یان نا."
ئینجا تێگەیشتم مام هادی بۆ ئەوەندە پرسیاری کات دەکات. بوو بە سەعات پێنج، وتی:
" –کاک ئاوات سەعات چەندە.؟"
وتم:
" –سەعات پێنجە."
دەستی کرد بە پێکەنین وتی:
" –تەواو."
وتم:
" –چی تەواو.؟"
وتی:
" –ئیتر ترسمان نەما. حکومەت نایەت."
وتم:
" –بۆ لە بەیانییەوە بە تەمای هاتنی حکومەت بووی.؟"
وتی:
" –ئەرێ وەڵڵا."
ئێوارەکەی نانمان خوارد، کاک شەوکەت هات بۆ لامان وتی:
" –زوو برۆین باشە. رژێم بەیانی بۆ ئەمبەر هجوم ئەکات."
بە کاک شەوکەتم وت:
" –باشە چۆن بوو بریارت گۆڕی، وتت با لێرە نەمێنینەوە. خۆ ئەگەر لە وێ بووینایە بە تەئکید تیا ئەچووین."

وتی:
" —له خۆمەوە هات بە مێشکمدا لە وێ نەمێنینەوە خەتەرە. نەوەك ئیخباریمان بکەن، چونکە خەڵك زانیویەتی ئێمە بەرەو ئالان‌و حاصلێ چووین."
وتم:
" —کاك شەوکەت بە خوا تۆ ئەزانیت لە چ رۆژێکدا ئەمریت. وەعد بێ تۆ بۆ مردن بچیت، من خۆم ئەدەمە دەستی تۆ ناشترسم. دڵنیام، کە هیچم لێ نایەت. بە خوا هەر کەسێکی تر بوایە لە وێ ئەمایەوەو بۆ خۆی تیا ئەچوو."
دوایی خەبەرمان بۆ هات، هەرچی کون‌و کەلەبەری شارەزور بووە، هەموویان پشکنیوە. تومەس چەند رۆژێك پێش هاتنی ئێمە (محەمەدی حاجی مەحمود) لەگەڵ ئێرانیەکاندا، هەندێك گوللە راجیمەیان هێناوە لە شارەزور شاردویانتەوە. یەکێك لەو پێشمەرگانەی ئاگای لێ بووە، چۆتەوە بۆ لای حکومەتی عێراق خەبەری لێ دابوو. بۆ ئەوە گەڕا بوون. ئیتر نازانم بەوەیان زانیبوو، یا هەر بۆ ئێمە دەرچوو بوون. بەڵام هەر کامێکیان بوو بێت، ئەگەر وریایی کاك شەوکەت نەبوایە، ئێمە تیا دەچووین. دوایی ئەو دوو برادەرەم دییەوە، بۆ یان گێڕامەوە چیان بە سەر هاتووە. وتیان:
" —هەتا ئێوارە لە ناو ئاودا خۆمان شاردۆتەوە. دەبابەیەك بە سەر سەرمانەوە بوو، کە عەسکەرەکان رویان ئەکرد بەو لاوە، سەرمان ئەهێنایە دەرەوە، کە رویان ئەکرد بۆ لای ئێمەوە، خۆمان نقوم ئەکردەوە. بەو حاڵە رۆژمان ئاوا کرد. جێگای وا گەڕاون، خەڵکی گوندەکەی خۆشمان نەیان زانیوە. هەر لە خوا پاڕاوینەتەوە، کە ئێوەمان لەگەڵ نەبووە. بۆ خۆمان ئەمان وت، بە خوا ئەوانمان لەگەڵ بوایەو شتێکیان بە سەر بهاتایە، ئەیان وت دەستی خۆیانی تیا بووە. ئەگەر خۆشمان تیا بچوینایە هەر ئەو حسابەیان بۆ ئەکردین. هەر ئەمان وت، باش بوو ئەوان رۆیشتن. قیرو سیا لە خۆمان."
بە رێکەوتین بەرەو هەوارە کۆن. هەوارە کۆن لە بەردەمی تەوێڵەدا بوو، لە سەر سنور. ئەو کاتە مقەڕی (حیزبی دیموکراتی ئێران) هەموو لەو ناوەدا بوون لە ناو دۆڵێکدا. ناوچەکەش هەمووی حکومەتی عێراقی لێ بوو. لە سەر شاخی شنروێ رەبایەی عێراقی لێ بوو. لە وێوە زۆر دوور بوو، چونکە نەمان دەتوانی راست بۆی بچین. دەبوایە بە شاخی شنروێ دا هەڵگەڕاینایە، لە وێوە دیسانەوە دابگەڕێینەوە بۆ مقەڕەکانی خۆمان. زۆر ناخۆش بوو. بە هەر حاڵ، بۆ بەیانی چەوینە مقەڕەکانی خۆمان. ئەو شەوە گەیشتین، بۆ بەیانی خەبەرمان بۆ هات، کە حکومەت ئەمبەری جادەکەشی پشکنیوە، کە ئێمەی لێ بووین. وتمان:
" —لە سەدا سەد بۆ ئێمە بووە ئەو هجومە."
ئیخباری ئێمەیان کرد بوو، بۆیە وا کێو ماڵی سەراپا شارەزوریان کرد. شەو لەوێ ماینەوە ئیسراحەتمان کرد. بۆ رۆژی دوایی، بەرەو ئێران بە رێکەوتین چووینە سەر ئاوەکەی سیروان. لە وێ دەبوایە یەك یەك بە حەبل بپەڕینایەتەوە. حەمەی حەمە

سەعید بۆ خۆیانی دروست کردبوو. جار جار پێشمەرگەیان دەنارد بۆ ئازوقە بۆ دیوی ئێران. پێش ئەوەی لە ئاوەکە بپەڕینەوە، (ئاغای رەحیمی) بروسکەیەکی کرد بۆ ئەوەی ئوتومبیلمان بۆ بێت. هەتا ئێمە لە ئاوەکە پەڕینەوە، دوو لاندگرۆزەر بۆ سەر جادەی شێخان هات. دوای پەڕینەوە لە ئاوەکە، هەتا گەیشتینە سەر جادەکە، هەورازێکی زۆر ناخۆش هەبوو. جادەی عەسکەری بوو. زیاتر بۆ سوپای پاسداران بەکار دەهات. دوای نیوەڕۆ بوو گەیشتینە سەر جادە. لە وێوە بە رێکەوتین بۆ (کرمانشاه) شەو گەیشتینە کرمانشاه. ئاغای رەحیمی بردینی بۆ ئوتێلێکی زۆر خۆش. منو حەمەی حەمە سەعید لە ژوورێك بووین. کاك شەوکەتو ئارامی کوڕیشی لە ژوورێکدا بوون. ئەو دوو پێشمەرگەیەی لەگەڵ کاك شەوکەت بوون، لە ژوورێکدا بوون. ئەو کاتە (نمایندە)ی خۆشمان لە کرمانشاه بوو. کاك رەفعەتی مەلا لە وێ مەسئولی پەیوەندییەکان بوو. عەلی کەمالو مەحمود خۆشناو لە وێ بوون. شەو ئاغای رەحیمی رۆیشت. برادەرانی خۆمان هاتن بۆ لامان. دووسێ رۆژ لە وێ ماینەوە. ناخۆش نەبوو. رۆژانە هەموو خەڵك شاریان چۆڵ دەکرد دەچونە دەرەوەی شار، لە ترسی تەیارەی عێراقی. زۆربەی رۆژ تەیارەی عێراقی لە ناو شاری دەدا. دوای دووسێ رۆژ وتمان:

" —ئێمە ئەچین بۆ تاران."

کاك شەوکەت بۆ عیلاج هاتبوو، منیش بۆ هەواڵی براکەم. کاك حەمەی حەمە سعید هەر لەگەڵ ئێمە بوو. لە کرمانشاه ئوتومبیلێکی مارسیدسیان داینێ، لەگەڵ شۆفێرێکو دوو حیمایە. هەروەها وەرەقەیان بۆ کردین بە ئازادی بە هەموو ئێراندا بگەڕێین. خۆشیان مەسرەفیان بۆ دەکردین. لە تاران چووین بۆ لای دکتۆر. کاك شەوکەت چوو بۆ لای دکتۆری تایبەتی. چەند دکتۆرێکی بینی وتیان:

" —هیچ نییە، هەر ماندوبوونە."

جارێکی تر چووین بۆ لای دکتۆرێکی تایبەت بە فەقەراتو ئێسقان. منیش دایم پشتم زۆر ئازاری دەدام، گوێم نەدەدایە. دەموت هی تاقمەکەیە، بۆیە دێشێ. کاك شەوکەت وتی:

" —تۆش بۆ فەحسێکی خۆت ناکەیت؟ فرسەتە جارێکی تر بۆت رێناکەوێت."

وتم:

" —باشە."

هەرسێکمان چووین بۆ لای دکتۆر، فەحسێکی کردین. بۆی نوسین بۆ ئەشیعە. چووین ئەشیعەمان گرت. ماوەی هەفتەیەکی بۆ دانایین. چووینەوە بۆ لای دکتۆر بۆ نەتیجەی فەحسەکەمان. کە چووین دکتۆرەکە بە کاك شەوکەتی وت:

" —تۆ زۆر باشی."

بە کاك حەمەی حەمە سەعیدی وت:

" —تۆش باشیت."

هاته سەرەی من وتی:

" —تۆ توشی فەقەرات بویت. پێویستیت بەوەیە بە لای کەمەوە سێ مانگ لە ژێر چارەسەردا بیت."

بە لامەوە سەیر بوو! دکتۆرەکە وای لێکردم، ئیتر هەر لە وێ نەیەمەوە. پێم وت:

" —من لە عێراقەوە هاتووم بۆ ماوەیەکی کەم. زیاتر ناتوانم لێرە بمێنمەوە."

وتی:

" —کەیفی خۆتە. تۆ زۆر وەزعت خراپە. ئەبێ ئاگات لە خۆت بێت. من هەندێك عیلاجت بۆ ئەنوسم، بەڵام ئەوە بە تەنیا بەس نییە. پێویستیت بە چارەسەری سروشتی هەیە هەموو رۆژێك بۆ ماوەی سێ مانگ."

ئەوەش بە من نەدەکرا، خوا خوام بوو بگەڕێمەوە. گەڕاینەوە بۆ ئوتێلەکە وتیان:

" —ئێمە بە زۆر پێمان وتیت بۆ نایەیت فەحسێك بکەیت، کەچی تۆ نەخۆش دەرچوویتو ئێمە لە تۆ باشتر بووین."

ماوەیەك لە وێ لە ئوتێل (حەوێزە) ماینەوە. زۆر خۆش بوو. یەکجار ئاغای رەحیمی هاتەوە بۆ لامان بۆ ئوتێلەکە وتی:

" —پرسیارم کردووە بۆ براکەی تۆ، ئەڵێن ئەو ناوە لای ئێمە نییە."

ئیتر تەواو ئیشم نەما، چونکە هەر بۆ ئەوە چوو بووم بۆ ئێران. هێشتا لە وێ بووین شەڕی (بەصرە) لە باشوری عێراق دەستی پێکرد بە ناوی (کەربەلای پێنج ) لای خۆیان شەڕێکی زۆر گەورە بوو. رۆژانە لە تەلەفزیۆندا دەمان بینی، بە هەزاران دیل لە جەیشی عێراقی دەگیران. بە سەدان ئەفسەری گەورەی تیا بوو. وتمان تەواو وەزعی عێراق خراپە. وا نزیکی شاری بەصرە بوونەتەوە. تازە بەصرە گیرا. دوای دوو رۆژ (عەدنان خەیروڵا) چوو بوو بۆ جەبهەکە، بە چەکی (کیمیایی) لە سوپای ئێرانیان داو ئیبادەی کردن. هەموو شوێنە داگیرکراوەکانیان دیسانەوە گرتەوە. بە هەزاران پاسدار کوژران. ئەو چەکە نەبوایە حکومەتی عێراقی هیچی پێ نەدەکرا. دڵمان خۆش بوو. وتمان وا بڕوات رژێمی عێراق دەڕوخێت، بەڵام چەکی کیمیاوی فریای کەوت. لە وێ ماوەیەك ماینەوە. لەوێشەوە چووین سەردانێکی شیمالی ئێرانمان کرد. بە راستی وەك بەهەشت وایە. زۆر وڵاتێکی خۆشە. مرۆڤ نازانێ چۆن وەسفی بکات. ئەو ماوەیە زۆر خۆش بوو. لە وێ دەگەڕاین. دوایی گەڕاینەوە بۆ شاری سنە، لەوێشەوە چووین بۆ لای برادەرانی حیزبی سۆشیالیست لە ناوچەی مەریوان. لە گوندی (دزڵی) شەوێك لای ئەوان بووین، بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ سنە. لەوێشەوە من گەڕامەوە بۆ کرمانشاە، کە چووم بۆ ناو شارەکە، چی ببینم؟ هەر لەو شارەی پێشو نەدەچوو، کە من بە جێم هێشت بوو. هەر هەموو ناو شارەکە روخا بوو بە سەر یەکدا وەك کەلاوە وابوو. ئەو شارە جوانە هەمووی روخابوو. رێگا نەبوو بچیتە ناو بازاڕەکانی. چوومەوە بۆ ئەو ئوتێلەی، کە لێی بووین. داری بە سەر بەردەوە نەما بوو، هەر هەمووی روخا بوو. ناو

شار چۆڵ بوو. تاکە تاکە نەفەرت دەبینی هاتوو چۆی دەکرد. وەزعێکی زۆر ناخۆش بوو. تەکسیەکم گرت چوومەوە بۆ ماڵی عەلی کەمال. ماڵەکەیان لە ناو بازاڕەکەوە دوور بوو. کە چووم وتم:
" –ئەوە شار بۆ وای لێهاتووە.؟"
وتی:
" –لەم ڕۆژانەدا (٣٠) تەیارەی عێراقی ناو شارەکەی بۆردومان کرد. بەسەدان خەڵکی کوشت."
ئەو شارە جوانە، دەتوت دەیان ساڵە کەلاوە بووە. زۆر دڕندانە بۆردومانیان کردبوو. ئیتر دوو شەو لە وێ بووم. لەگەڵ حەمەی حەمە سەعید یەك شەو لە پاوە ماینەوە. پاوە شارێکی زۆر خۆشە. وا بە شاخێکەوە. هاتینەوە بۆ هەوارە کۆن بۆ مقەڕەکەی ئەوان. دوو سێ شەو لای ئەوان مامەوە، دوایی بە شارەزوردا گەڕامەوە بۆ قەرەداغ.
حەمە وتی:
" –ئەگەر دەتەوێت با لە ڕێگای جاشەوە بە ئوتومبیل بتنێرمەوە."
ئەم وێرا وتم:
" –کاکە حەمە گیان با هەر بە پێ بڕۆین."
خۆشنی لەگەڵم هاتەوە هەتا گوندی دوکان، کە ماڵەکەی خۆمی لێ بوو. کاك شەوکەت هەر لە ئێران مایەوە، نەگەڕایەوە بۆ کوردستانی خۆمان. لە ئێران ئیشوکاری یەکێتی دەکرد. کە هاتمەوە کاك قادری حاجی عەلی بووبوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی یەك. دوای دووسێ ڕۆژ لەگەڵ حەمەی حەمە سەعید چووین بۆ مەڵبەند، بۆ بەخێر هاتنی کاك قادری حاجی عەلی. شەوێك لای کاك قادر ماینەوە. کاکە حەمەش ئیشوکارەکانی خۆی لەگەڵ کاك قادر تەواو کرد. بە یەکەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆمان لە دوکان. دوو شەو لە وێ ماینەوە، ئەوجا کاکە حەمە گەڕایەوە.

٨٢

ماوەیەکی پێ چوو، وتیان سەرکردایەتی دەڵێ دەبێ سەر تیپەکان ئاڵوگۆڕ بکەن، هەر کەس لە تیپەکەی خۆیەوە بۆ تیپێکی تر بگۆڕێت. بە نسبەت منەوە زۆر ئاسایی بوو. پێم وتن بۆ کوێ ئەڵێن ئەچم. وا بزانم ئەوەی نارازی بوو، کاك ئازادی سەگرمە بوو. ئاڵو گۆڕەکەش بەم شێوەیە بوو:
تیپی (٥٧) یان کرد بە دوو تیپ، تیپی (٥٩)ی حەمرینیان لێ جیا کردەوە. ئیتر کاك ئازاد وازی لە ئیش هێنا، لە گوندی مێوڵی دانیشت. ئەو کاتە (کاك مەحمود سەنگاوی) سەرپەرشتی تیپەکەی دەکرد. (هێمنە ڕەش) بوو بە سەر تیپی (٥٩)ی حەمرین، لە تیپی (٥٧)و تیپی (٥١) تیپی (٥٩) یان دروستکرد. هێمن زۆر پیاوێکی چالاك بوو.

ناوچەکەشیان زۆر خۆش بوو. ناوچەی جەباری هەمەوەندو بەشێکی قادرکەرەم هەتا دەچووەوە چەمچەماڵو ناوچەی قەرە حەسەن، هەمووی سنوری ئەو تیپە بوو. هێشتا ئەوە جێ بەجێ نەکرابوو، کە سەر تیپەکان ئاڵو گۆڕ بکەن. ناردیان بە دوای هەموو تیپەکانی مەڵبەندا. کاك قادری حاجی عەلی خۆی زوتر چوو بوو بۆ سەرکردایەتی، لە وێ کۆبونەوەیان هەبوو. هەموو تیپەکانی مەڵبەندی یەك چووین بۆ سەرکردایەتی. ئەو کاتە (شێخ جەعفەر) لە مەڵبەندی سێ وە نەقڵی مەڵبەندی یەك بوو. بوو بە لێپرسراوی عەسکەری ئەوێ. کاك سامان گەرمیانیو مام رۆستەم هەردووکیان دانیشتبوون. نازانم لە سەر چی تووڕە بووبوون، ناردیان بە شوێن ئەوانیشدا. ئەوانیش هاتبوون بۆ سەرکردایەتی، کە چووینە سەرکردایەتی، سەیرمانکرد مەڵبەندی سێ هەموویان لە وێ بوون. مەڵبەندی دوو ئەوان هەر خۆیان لە وێ بوون. کە چووینە ئەوێ، کاك قادر بە منی وت:

" -تۆ خۆت سەرپەرشتی تیپی (٥٥) بکە."

من ئەو کاتە لە وێ نەمابووم، بەڵام هێشتا نەچوو بوومە هیچ جێگایەکی تر. ئەو کاتە رەئوفە کەڕ جێگری تیپ بوو. من هەر خۆم لەگەڵیان بووم. کاك قادر وتی:

" -بەتەماین ئەم ناوچەیە پاك بکەینەوە، چونکە وەزعی سەرکردایەتی لە مەترسی دایە. ناوچەکە زۆر بچوك بۆتەوە."

ئەو کاتەش مام جەلال لە وێ بوو. کاك نەوشیروان لە دەرەوە بوو. چووین سەیری ئەو جێگایانەمان کرد، کە بۆ مەڵبەندی یەکیان دانابوو. زۆر جێگایەکی قایم بوو. هەر تیپەی جێگای خۆی بۆ دیاری کرابوو. مەڵبەندی یەك بۆ بەری کەڵکی قەیوانو شاخی دوو برا، بەرەو ئەزمڕ لەگەڵ شاخە سورو خەجە لەرزۆکو شاخی کۆڕەنگ پشتی کارێزە دانرا بوو. مەڵبەندی دوو لەگەڵ مەڵبەندی سێ، ئەم شوێنانەیان بۆ دیاری کرا بوو. گوندی گاپیلۆنو شاخی گۆجارو گوندی ولاخ لو و گوندی باڵخە بەرەو کارێزەو پیر ئەلیاسو تیپی ٢٣ی سورداش لای ئێمە بوو. تیپی سورداش سەر بە مەڵبەندی دوو بوو. تیپی مەڵبەندی دوو هەندێکیان بۆ سپیلك ناردبوو، کە بە پشتی شەدەڵەوە بوو، بۆ رەبایەکانی (قوڵە پوشینە) دامێنی پیرەمەگرون. بۆ ئەوەی حکومەت وابزانێت ئەو هێزە هەر بۆ پەلاماری ئەو رەبایانەی کەڵکی پیرەمەگرونە. ئەوان دوو شەو پێش ئێمە پەلاماری رەبایەکانی پشتی (شەدەڵە) یان دابوو، هەموویان گرتبوون. دواتر ئێمە دەستمان بە هێرش کرد. تیپی ٥٥ بۆ کەڵکی قەیوانو بەری قزلەر. دوو رەبایەی گەورە بوو، زۆر روتەن بوو. یەکێکیان لە پشتی گوندی چاڵگەوە بوو، ئەوی تریان لە سەر کەڵکی قەیوان. خۆم بە رۆژ لەگەڵ کاك قادرو شێخ جەعفەر، چووین سەیرمانکرد، تیپی ٥٧ سەر تیپەکەی مەحمود سەنگاوی بوو. تیپی ٥١ عادل شوکر سەر تیپی بوو. تیپی ١٧ی زمناکۆ دلێر جاف سەر تیپی بوو. ئەوان بۆ ئەو بەری شاخی دوو برا بەرەو جادەی ئەزمڕ (شێخ جەعفەر)و (مەحمود سەنگاوی)و (جەمیل هەورامی)و (دلێر جاف)

بوون. تیپی ٥٩ سەر تیپەکەی هێمنە رەش بوو، بۆ خەجە لەرزۆکو پشتی گاپیلۆن. تیپی ٥٣ی شیروانە سەر تیپەکەی حەمە رەش بوو، بۆ شاخی کۆرەنگ پشتی کارێزە. ئەو تیپەی مەلبەندی دوو لەگەڵ مەلبەندی یەکدا بوون. تیپی ٢٣ سەر تیپەکەی حەمەی تەیب بوو. ئەوانیش بۆ شاخە سور. مەلبەندی دوو بۆ ناو بالخو پیر ئەلیاس. مەلبەندی سێ بۆ شاخی گۆجارو ناو گوندی ولاخ لوو. شەرەکە بەم جۆرە دەستی پێ کرد:

١٣-١٤ی مانگی چواری ١٩٨٧، سەعاتی سفریان دانا. هەر کەس لەو سەعاتەدا پەلامار بدات. من تیپەکەم کرد بە دوو بەشەوە. خۆم چووم بۆ ئەو رەبایەیەی پشتی چالگە وتیان:

" -ئەوەیان زۆر بە هێزە."

جێگاکەشی زۆر روت بوو. ئەوی تریان رەئوفە کەرم بۆ نارد لەگەڵ هێزێکی تردا. مەلا ئەحمەدی دسکەرەو دێو حەسەنم لەگەڵ بوو. پێشمەرگەیەکی تیپی سی‌و سێشمان بۆ شارەزایی لەگەڵ بوو. کاک مەحمود کۆمەڵە، ئەو کاتە لە گوندی قزلەر بوو. ئەو دەلیلی بۆ هەموو هێزەکان پەیدا کرد. ئەو شەوە هەر تیپە چوو بۆ جێگای خۆی. لەگەڵ پەلاماری یەکەمدا، ئێمە رەبایەکەی خۆمان گرت. ئەو پێشمەرگەیەی، کە بۆ دەلیلی هاتبوو لەگەڵمان، شەهید بوو. ئەوە زۆر ناخۆش بوو. لە هەموو لایەکەوە بوو بە تەقە. ئیتر من زۆر گوێم نەدایە هەتا ماوەیەک، ئەوجا جیهازەکەم کردەوە پەیوەندیم بە کاک قادرەوە کرد پێم وت:

" -ئێمە رەبایەکەی خۆمان گرتوە."

کاک قادر هاواری لێ هەلسا وتی:

" -بە راستە.؟"

وتم:

" -بە خوا."

ئیتر لە خۆشیدا نەیدەزانی چیمان پێ بڵێت، وتی:

" -یەک سەللە فیشەکی گڕدار بکەن بە ئاسماندا."

منیش بە مەلا ئەحمەدم وت:

" -یەک سەللە گڕدار بکەن بە ئاسماندا."

ئیتر کاک قادر یەک سەر بە مام جەلالی وت ئەوە رەبایەکەمان گرت. پێم وایە یەکەم رەبایە ئێمە بووین گرتمان. چوار پێنج جاشی تیا کوژابوو. جا رۆژی پێشو شوانی دێکەی چالگە چووبوو بۆ لای جاشەکان وتوبیان:

" -ئێمە هەموو خزمی یەکین. ئەگەر پێشمەرگە ئازان، با بێنە سەرمان. بزانە چییان لێ ئەکەین."

خەڵکی دێکە پێیان وتم:

" –كاك ئاوات بە قوربانە زۆر وریای خۆتان بن. ئەو جاشانە زۆر بێ ناموسن. لەوەتەی هاتوون شەو نایەڵن کەس بنووێت. نایەڵن کەس بچێت بۆ نزیکی رەبایەکە."

بە چارەکە سەعاتێ گیران، ئەوانی تریش رایانکرد. ئەو شەوە لە ماوەی دوو سەعاتدا (١٢٠) رەبایەو موعەسکەر گیرا. ئەوەی حکومەت بە سێ مانگ گرتبووی، ئێمە بە یەك شەو هەموومان گرتەوە. ئەو شەوە هەتا سەر جادەی ئەزمڕ پاك کرایەوە. مەڵبەندەکانی تریش هەموو شاخی گۆجاڕو ناو باڵخو ولاخ لویان گرت. بۆ بەیانی هەموو ناوچەکە پاك کرایەوە. ناویان نا (داستانی رزگاری) بڕیار بوو ئێمە بۆ ماوەیەکی کەم تیا بمێنینەوە. نزیکەی دە رۆژێك ماینەوە، بەلام لەو مانەوەیەدا زۆرمان زیان لێ کەوت، چونکە حکومەت گەورەترین هجومی بۆ کردینەوە، بە هەموو جۆرە چەکێکی قورس و سوك و چەکی کیمیاویشی بە کاردەهێنا. لە ئاسمانیشەوە بە تەیارە لێی داین. ئەو جێگایانەی گیرا بوون، پێشتر خۆیانی تیا بوون هەمووی (رەسەد) کرا بوو، بە تۆپ لێی ئەدا پێشمەرگەی شەهید دەکرد. ناچار زۆربەی ئەو شوێنانەمان چۆڵ کردەوە، کە گیرا بوون. ئێمە بەرامبەر حکومەت هیچ کاردانەوەیەکمان نەبوو. رۆژێکیان پێشمەرگەیەك لە لای شێخ جەعفەرەوە هات بۆ لام، ئەم بەرەوبەر بووین. ئەوان لە بەری شاخی دوو براو ئەزمڕ بوون، من لە بەری قزلەر بووم. هجوم لە سەر تیپی (٥٧) و (٥١) بوو. لە ئەزمڕەوە حکومەت هجومی بۆ دەکردین بۆ گرتنەوەی. دیار بوو فشارێکی زۆریان لە سەر بوو. پێشمەرگەکە هات وتی:

" –كاك ئاوات برادەران فشارێکی زۆریان لەسەرە، حکومەت هێزێکی زۆری بۆ هێناوە. کاك سەربەست و دوو پێشمەرگە شەهید بوون و بەجێماون. ئێستا برادەران هێرش دەکەن بۆ ئەوەی تەرمەکانیان دەر بکەن. کە وای وت، هەر وەخت بوو شێت ببم. هەواڵێکی زۆر دڵتەزێن بوو. سەربەست ئامر کەرت بوو لە تیپی (٥٧) کوڕی مامم بوو. زۆرم خۆش دەویست. کوڕێکی رێکو پێك و زۆر ئازاش بوو. چەندین جار لە شەڕدا بریندار ببوو. پێشمەرگەیەکی دێرین بوو. هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە، زۆر منداڵ بوو هاتە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی بۆ لای من لە قەرەداغ. حەزم نەدەکرد بێتە دەرەوە. بە دزی منەوە چوو بوو بۆ گەرمیان بۆ لای مەفرەزەکانی گەرمیان بۆ لای سیروان. رۆژێك ناردم بە دوای مەفرەزەکەی سیرواندا، کە هاتن سەیردەکەم سەربەستیان لەگەڵ بوو، پێشمەرگە بوو. وتم:

" –ئەوە لە کوێوە هاتوویت.؟"

وتی:

" –نەموێراوە بێم بۆ لای تۆ. زانیومە ئەم نێریتەوە، بۆیە چووم بۆ دیوی گەرمیان. وتومە ماوەیەك لەوێ ئەبم، ئیتر تازە نامنێریتەوە."

ئەو کاتە تەمەنی هەژدە ساڵ بوو تازە ناوی بۆ عەسکەری هاتبۆوە. حکومەت بڕیارێکی دەرکردبوو، لە جیاتی عەسکەری دەتوانیت ببیت بە پۆلیس بۆ ماوەی دوو

ساڵ، که هاتبوو چەکەکەشی هێنابوو. حکومەت پارەی چەکەکەیان له باوکی سەندبوو، چونکه باوکی کەفیلی بوو. منیش وتم:

" -مادەم تۆ هاتویت، ئەبێت نموونەی پێشمەرگە بیت."

به راستی نمونەی پێشمەرگەی قارەمان‌و نمونەی دەست پاکی‌و داوێن پاکی بوو. خۆشەویست ترین پێشمەرگەی تیپەکەی بوو له ناوچەی بازیان‌و قەرەداغ. شەهید بوونەکەشی زۆر کاری تێکردم. نەمدەزانی چۆن دەری ببڕم، چونکه به حوکمی ئەوەی مەسئول بووم، ڕۆژانه پێشمەرگە لەگەڵمدا شەهید دەبوو. به جیهاز لەگەڵ شێخ جەعفەر قسەمکرد وتم:

" -ئەوە سەربەست شەهید بووە.؟"

وتی:

" -نەء، به خوا تۆزێك بریندار بووە."

منیش دڵنیا بووم، که شەهید بووەو تەرمەکەشی به جێماوە. ئەوان محاوەلەی ئەوە دەکەن تەرمەکەی دەر بکەن. منیش پێم وت:

" -کاك شێخ جەعفەر من دڵنیام لەوەی شەهید بووە. زۆر سوپاست ئەکەم، گەر بتوانن تەرمەکەی دەست حکومەت نەکەوێت."

ئەو هەر دەیوت وانیه بریندارە. دواتر هجومیان بۆ کردبوو تەرمەکانیان دەرکردبوو. دوایی بۆیان باسکردم چۆن شەهید بووە. ئاواتی پورزای لەگەڵ بووە. ئەویش معاون کەرت بوو، بریندار ببوو. به برینداری به جێمابوو. ئەوان چوو بوون هێرشیان کردبوو جاشەکانیان شکاندبوو. خۆی به خەستی بریندار بوو بوو. ئاواتی پورزای دەرکردبوو. به زۆر پێشمەرگەکانی ئیزن دابوو وتبووی:

" -به جێم بێڵن با ئێوەش شەهید نەبن. من تازە شەهید ئەبم."

ئەوانیش به جێیان هێشتبوو، شەهید بووبوو. دوژمن نەگەیشتبوونە سەری، برادەران هێرشیان بۆ کردبۆوە دەریان کردبوو، که چووبوونە سەری دوا هەناسەی سپارد بوو. من له سەر شاخ بووم، برادەران جیهازیان بۆ کردم وتیان:

" -کاك ئاوات ئەوە تەرمی شەهید سەربەستمان هێناوەتەوە، چی لێ بکەین."

منیش وتم:

" -باشە ئامادەی بکەن."

مەفرەزەکەی خۆم ناردە خوارەوە، سەلاحە بچکۆل‌و فایەقی برام لەگەڵ ناردن وتم:

" -بڕۆن بیبەنەوە بۆ قەرەداغ."

پشتم به سەلاح زۆر قایم بوو. زۆر پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمان بوو. خۆم هەر له سەر شاخ نەهاتمە خوارەوە. ناردمەوە بۆ قەرەداغ. ئەو کاتە ماڵی باوکی له گوندی دۆڵان بوو. ژنی هێنابوو، کچێکی هەبوو ناوی (دەشنێ) بوو. بردبوویانەوە بۆ گوندەکەی خۆمان له( قارەمان) له وێ به خاکیان سپارد بوو.

دوایٍ چوار پێنج ڕۆژ، هەواڵ لە هەڵەبجەوە هات، کە شەپۆلێکی گەورەی خەڵکی هەڵەبجە خۆپیشاندانیان کردووە. برادەرانی حیزبی سۆشیالیست لە سەر شاخی (فەقێرە)ی قەرەداغ بە جیهازێکی بچوکەوە دەقە بە دەقە هەواڵەکانیان بۆ نقڵ دەکردین. دەیانوت:

" –ئەوە دەبابە گیرا، ئەوە هەڵەبجە گیرا، ئەوەندە جاش هاتە ناو هێزەکانی پێشمەرگەوە."

ئەمە وای لێ کردین، بە پەلە فریا بکەوین هێز بەرین بۆ ئەوەی حکومەت دەست نەگرێتەوە بە سەر هەڵەبجەدا. هەموو دەقەیەك مام جەلال دەیوت:

" –چی بووە، بارودۆخ چۆنە.؟"

ئێمەش هەواڵەکانمان لە مام عەبدول خالقەوە وەردەگرت. ئەو لەگەڵ هێزەکانی خۆیان پەیوەندیان هەبوو. مام جەلال پەلەی بوو هێزەکانی مەڵبەندی یەك بگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە. پێش ئەوەش مام جەلال داوای لە برادەران کردبوو بچن پەلاماری سەفرەو زەرونو حسن بەگو برزودو بالۆسە بدەن. لە دوای ئەو هەموو شەڕو شۆڕەو چەندین ڕۆژ بەرگری کردنە، هێزەکان تەواو ماندو بوون. هیچمان پێ نەدەکرا. ئەو جێگایانەی، کە باسیشم کرد، زۆر قایم بوون. گرتنی ئاسان نەبوو. مام جەلالیش هەر کۆبوونەوەی لەگەڵ مەسئول مەڵبەندو مەکتەبی عەسکەری دەکرد دەیوت:

" –بچن ئەو جێگایانە بگرن."

ئەوانیش دەیانزانی زەحمەتەو ناکرێت. بە مام جەلالیشیان نەدەوت مام جەلال ئەوە ناکرێت. یەکەم جار پەلاماری ئەوێیان بدایە، دەکرا، بەڵام دوای ئەوە نەدەکرا، چونکە پێشمەرگە هیلاك ببوو. چەند ڕۆژ بوو لە شەڕدا بوون. ڕۆژێك کاك کۆسرەت ڕەسولو کاك قادری حاجی عەلیو ملازم عومەرو هەموو مەسئول عەسکەریەکانیان کۆکردەوە، بپرسن بزانن ئەو شەڕە دەکرێ یان نا. چووین لە گەورە دێ کۆبونەوەیەکمان کرد. ئەو کاتە (حیزبی دیموکرات) بارەگاکانیان لەو ناوە بوو. دوای کۆبەنەوەکە هەموو ڕەئمان ئەوە بوو، کە ئەو شەڕە ناکرێت. لە بەر ئەوەی پێشمەرگە زۆر ماندووە. یەکەم جار بوایە دەکرا، بەڵام ئێستا ناکرێ. گەر بشچین پەلاماری بدەین، ناگیرێ. ڕەنگە زەرەری زۆرتر بێ لە قازانج. بۆیە نەکردنی باشترە. چووبوونەوە ڕەئی ئێمەیان بە مام جەلال ڕاگەیاند. دواتر نازانم مام جەلال چی پێ وتبوون. هەر لەو کاتەی (داستانی ڕزگاری) دا، کاك وەهاب لەگەڵ شۆڕش ئیسماعیلو هێزێکی مەڵبەندی دوو، چووبونە بەری شار بازێڕ. ئەوانیش پەلاماری ڕەبایەکانی گۆیژە لە پشتی خانووە قوڕەکانیان دابوو، هەموویان گرتبوو. دوایی پەڕیبونەوە بۆ بەری قەرەداغ. (جەبار فەرمان)یش لە قەرەداغ بوو. ئەوانیش ئەو هێزانەی مەڵبەندی یەك لەوێ مابوون، لەگەڵ ئەو هێزەی وەهاب، هەموویان کۆکردبوونەوە. پارتیو حیزبی شیوعیو حیزبی سۆشیالیست. بە هەموویان پەلاماری ناحیەی قەرەداغیان دابوو، قەرەداغیان پاککردبۆوە هەتا شاخی

سولیاوه. هەر بورجەکەو رەبایەکانی شاخی سولیاوه مابوو، ئەوانیش شەڕێکی زۆر باشیان کردبوو. رژێم سەری لێ تێکچوو بوو. ئەو هێرشە گەورانەی کرابووە سەر، هەمووشی سەرکەوتوو بوو. دوای گرتنی قەرەداغ، وەهاب گەڕایەوە بۆ مەڵبەندی دوو. کاک جەبار فەرمانیش چووبوو بۆ ئەو شەڕەی هەڵەبجە. زۆری پێ نەچوو راپەڕینەکەی هەڵەبجە دامرکایەوە. ئەوەی لە خۆی ترسا، رایکردە دەرەوە. یەک دوو فەوجی (خەفیفە) رایانکرد. لەوانە (حەمە مۆریاسی) بە خۆیی و فەوجەکەیەوە هاتەدەرەوە. لە رەد فیعلی ئەوەدا، رژێم پەلاماری مەڵبەندی یەکی دا. هەر لە شاخی بەرانانەوە گرتبووی هەتا دەچێتە دارە رەش لەگەڵ بورجەکەدا لێکی دابۆوە. جگە لەوەی شاخی گڵەزەردەو پشتی داراغاو جێشانەو دار مازەڵەو قوتەی کڵاوگورگ–بەرزترین لوتکەی شاخی دار مازەڵەیە– کۆنە رەبایەی ساڵی ١٩٦٤ی گرتبوو. بە مەش زاڵبوو بە سەر قەرەداغ و شارەزوردا. ئەو زنجیرە شاخەی هەموو گرتبوو. هەر لە بەرانانەوە هەتا دەگاتە دارە رەش و پشتی گوندی سوێراوە. هەمووی کردبوو بە رەبایە. لە بناری شاخیشدا لە داراغاو گۆپیتەو دەربەندی زڕگوێز، مەعەسکەری دانابوو.

٨٣

لە مەڵبەندی یەکەوە بڕیاریان دابوو، من بە زووترین کات بگەڕێمەوە. کاک قادر وتی:
" –کاک ئاوات تۆ بگەڕێرەوە."
لەو کاتەدا، من کرام بە مەسئول عەسکەری مەڵبەند. منو شێخ جەعفەرو مام رۆستەم کراین بە مەسئول عەسکەری مەڵبەندی یەک. ئەو ڕێگایانەی، کە جاران لێوەی دەهاتین، هەر هەمووی گیرابوو. نەماندەزانی کوێ چۆڵە لێوەی بپەڕینەوە. من شەهید هیوا باڕۆیم لەگەڵ بوو. زۆر شارەزابوو. تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ و تیپی پەنجاو حەوتم لەگەڵ خۆم برد. کاک قادر وتی:
" –بە قوربانە زوو بڕۆن. چۆن ئەپەڕنەوە، ئەبێ بپەڕنەوە. باز بدەن."
ئێمەش لە (دۆڵە روت)ەوە گەیشتینە (گردە بۆر) ئێوارە چوینە (قەرەچەتان) هیوا باڕۆیی خەڵکی ناردبوو بۆ ئەو ڕێگایەی دەورو بەری (ئەڵڵایی) تا بزانن رەبایەی تازەی لە سەر ڕێگاکە دانەناوە. هاتنەوە وتیان:
" –هەر لە سەر شاخەکان رەبایەی داناوە."
بە ڕێکەوتین بەرەو کەنە سورە. لە وێوە کەوتینە پشتی موقەڕی جاشەکان لە تاسڵوجە. بە لای کۆمەڵگای ئەڵڵایی دا رۆشتین چووینە بەردەمی سەیتەرەکەی تاسڵوجە. بە دیوی ئەڵڵایی دا بە بەردەمی ئەواندا رۆیشتین. حەرەسەکان هاتووچۆیان دەکرد. ئێمە زۆر بە بێ دەنگی دەڕۆیشتین. چووینە دیوی ئەڵڵایی. لە وێوە کەوتینە بنار شاخ. هەموو بە بناری شاخەکەدا رۆشتین بەرەو (باڕۆیی) سەر شاخ هەمووی

گیرابوو. بۆ نان‌و چای بەیانی چووینە گوندی باڕۆیی، دێکەی شەهید هیوا. گوندەکە هەمووی چۆڵیان کردبوو. لە وێ بە جیهاز لەگەڵ کاک قادر قسەمکرد پێم وت:

" –ئێمە گەیشتین."

پێشم وت، کە ئێستا لە کوێین‌و بۆشم باسکرد کوێ گیراوە. ئەویش وتی:

" –هەر لەو ناوە بن. چاوەڕێی ئێمە بکەن، مەیەڵە پێشمەرگە بۆ هیچ شوێنێك بڕوات. چاوەڕێمان بکەن."

ئێمەش هەر لەو دێیانە ماینەوە، هەتا ئەوانیش گەڕانەوە لەگەڵ باقی هێزەکەدا. هەموو هێزەکان یەکمان گرتەوە. لە وێوە چووین بۆ ماڵی باوکی شەهید سەربەست لە گوندی گەڕەزیل. تازە پورزایەکی شەهید سەربەست بە ناوی (قارەمان) لە شاخی گڵەزەردە شەهید بوو بوو. لە وێ پرسەیان بۆ دانابوو هەر لە ماڵی شەهید سەربەست پرسەکەیان بۆ دانابوو، کە چووین دوای نیوەڕۆ بوو. ئێمە لە ماڵی مامم دانیشتبووین، ئەوندەمان زانی چوار هەلیکۆپتەر هات. یەکسەر ناو گوندەکەیان بۆردومان کرد. نازانم چۆنیان زانی ئێمە لەوێین، دێکەیان داگرتەوە. لە هەموو دێکەوە پێشمەرگە تەقەی لێ دەکردن. ساروخێك لە ماڵی شێخ مارفی دا. شێخ مارف پیاوێکی باش بوو. ماڵەکەی وەك مقەڕ وابوو دایم پێشمەرگەی لێ بوو. کوڕێکیشی شەهید بووبوو بە ناوی (لەتیف) زۆر پێشمەرگەیەکی ئازابوو. کەس لە ئێمە بەرنەکەوت. پارچەیەك بەر باڵی غەریبی برام کەوت بریندار بوو. ئەو لە ژوورێکی تربوو، ئێمە لە دەرگای حەوشەکەدا بووین سەلامەت بووین. ئەویش برینەکەی باش بوو. بە پەلە ناردمان بۆ لای دکتۆر بۆ گوندی باخی سەرو. لە گەڕەزیلەوە هەر چارەکێ دەبوو. هەر لەوێ پرسەکەمان تەواوکرد، ڕۆشتین بۆ گوندی تیمار.

تیمار لە گەڕەزیلەوە زۆر دوور نەبوو. لە وێ کۆبووینەوە، بڕیارماندا هیچ کەسێکمان نەگەڕێتەوە بۆ مقەڕ، هەتا ئەو ناوە پاك نەکەینەوە. پەلاماری ئەو شاخانە بدەین، کە لە لایەن حکومەتەوە گیرا بوون. جەبهەکەمان بەم جۆرە دابەش کرد:

من چووم بۆ جەبهەی لای سوێراوەو قارەمان‌و کانی سپیکە. تیپی ٥٥و تیپی ١٧ی زمناکۆو تیپی مەڵبەند. حەفدەی زمناکۆ دلێر جاف سەر تیپی بوو. پەنجاو پێنج سەر تیپی بۆ دانەنرا بوو، هەر خۆم سەرپەرشتیم دەکرد. هەر جێگری هەبوو، ئەویش رەئوفە کەڕ بوو. تیپی مەڵبەندیش مەلا ئەحمەدی کەلاری بوو. سەرپەرشتی هەر سێ تیپەکەم دەکرد. تیپی ٥١ی گەرمیان‌و تیپی ٥٣ی شیروانە شێخ جەعفەرو کاك قادری حاجی عەلی سەرپەرشتیان دەکرد. بۆ گڵەزەردەو دەوروبەری شاخی گڵە زەردە. مام رۆستەم‌و کاك عومەر فەتاح لەگەڵ تیپی٥٧ و ٥٩ کاك مەحمود سەنگاوی‌و هێمنە رەش سەر تیپیان بوون، ئەوان بۆ پشتی داراغاو قەڵا سورەو جێشانەو باڕۆیی. سەعاتی سفرمان دانا، لە یەك سەعاتدا لێیان بدەین. بۆ ئێوارەکەی من لەگەڵ هێزەکەی خۆم چوومە گوندی قارەمان. لەوێوە جێگاکانم بۆ دیاری کردن‌و تەوزیعم کردن. تیپی ١٧ی

زمناکۆم نارد بۆ پشتی سوێراوە. تیپی٥٥ی قەرەداغم کرد بە دوو بەش، بەشێکیان بۆ پشتی کانی سپیکە، رەئوفە کەرم لەگەڵ ناردن، لەگەڵ دوو ئامر کەرت. یەکێکیان ناوی عەبدوڵڵا رەباتی بوو، زۆر قارەمان بوو. ئەوی تریان شەهید فەریق بوو. بەشی دووەمیانم نارد بۆ ناو دەربەندی زرگوێز، مقەری فەوجی لێ بوو. ئەو بەشەیان مەلا ئەحمەدی دسکەرەو دێو حەسەن بوون. مەلا ئەحمەدی کەلاریش لەگەڵ خۆم بوو، بۆ سەر لوتکەی (کلاو گورگ) بۆ ناوەڕاستی جەبهەکە، کە بە سەر هەموو جەبهەکەدا زاڵبوو دەیڕوانی بە سەر ناوچەی قەرەداغو شارەزووردا. زۆر لوتکەیەکی بەرز بوو. رەبایەیەکی زۆر کۆن بوو. هەر لە ساڵی ١٩٦٤دا، کە ناوچەی قەرەداغ گیراوە، ئەو کرابوو بە رەبایە. هەر مابوو تێك نەدرا بوو. شارەزام بۆ ئەوانی تر پەیدا کرد. ئێمە هەر خۆمان بووین، مەلا ئەحمەد وتی:

" —کاك ئاوات ئەی شارەزا بۆ ئێمە."

وتم:

" —خۆم شارەزام، کەس بە قەد خۆم شارەزا نییە. ئیتر کەسمان بۆچی یە.؟"

وتی:

" —بە خوا نابێت تۆ خۆت بێی."

وتم:

" —بە خوا خۆم دێم. هەردووکمان بە یەکەوە ئەبین بۆ ئەوەی ئاگام لەوانی تریش بێت."

زۆر هەوڵیدا من نەچم بۆ سەر رەبایەکە. وتم:

" —هەر دێم، چونکە ئێوە شارەزا نین."

شەو بە ڕێکەوتین بۆ ئەو جێگایانەی دیاریمان کرد بوون. سەعاتی سفرمان دانابوو بۆ لێدان. جا ئەو کاتە هیوای کوڕم عەدەدجیهاز بوو لەگەڵ خۆمدابوو. لە قارەمان جێم هێشتبوو، پێم وت:

" —تۆ لێرەبە لەگەڵ هەندێك پێشمەرگەو دکتۆر، بۆ ئەوەی هەر بریندارو شەهیدمان هەبوو، بینێرینەوە. ئەویّ مقەڕی دواوە بوو. هەر لە قارەمان دوورنەکەوتبووینەوە، هیوا جیهازەکەی کردەوە وتی:

" —پەنجاو شەش دەنگوباس چی یە.؟"

منیش پێم وت:

" —هەتیوو دایخە، خۆ جاریّ هێشتا من لە تۆ دوور نەکەوتومەتەوە. کەی شەڕ دەستی پێکرد، ئەوجا جیهازەکە بکەرەوە."

جیهازەکەی من بە ناوی ٥٦ بوو. هەر کەس لە مەسئولەکان رەقەمی خۆی هەبوو. هیوا منداڵ بوو، بەڵام زۆر وریاو بزێو بوو حەزی لە شەڕ دەکرد. حەزی دەکرد بۆ هەموو شەڕەکان بێت لەگەڵمان. تەنها بۆ ئیشی جیهاز باش بوو.

١٩٨٧/٥/٢١ بوو. هەر کەس لە جێگای خۆی نزیکبووبۆوە. لە سەعاتی سفردا بوو بە تەقە. ئێمە پەلاماری رەبایەکەی کڵاوگورگمان دا. لە ماوەیەکی کەمدا گیرا. پێشمەرگەیەکی قارەمان شەهید بوو. بەڵام، کە چووینە ناو رەبایەکەوە، بە راستی خۆم لێی دەترسام. قەد بڕوام نەدەکرد ئەوەندە سەخت بێ. مەگەر هەر پێشمەرگەی قارەمانی یەکێتی بتوانێ ئەو جێگایە بگرێ. زۆر قایم بوو. وابزانم یەکەم رەبایەبوو گیرا. لە هەموو لایەکەوە ئاگر باران بوو. هەموو جێگاکان لە قۆڵی جەبهەکەی ئێمەوە لە ماوەی چەند سەعاتێکدا گیرا. دلێر جافو ئەوان جێگاکانی خۆیان گرت. مەلا ئەحمەدو دێو حەسەن، ئەوانیش مقەڕ فەوجەکەی ناو دەربەندیان گرت، بەڵام جەبهەکەی لای رەئوفە کەڕ مابوو، کە هەموو جێگاکان گیرا ئەوانیش گرتیان. دووسێ شەهیدیان دابوو، لە ناو شەهیدەکان عەبدوڵڵا رەباتی تیابوو، فەرماندەی کەرت بوو. عەبدوڵڵا پێشوتر لە شەڕێکدا بریندار بووبوو. مۆڵەتی وەرگرتبوو بۆ چارەسەرو پشو، کە زانی شەڕە، بەو بریندارییە وتی:

" –بەشداری ئەم چالاکیە گەورەیە ئەکەم."

زۆر گەنجێکی ئازاو دڵسۆز بوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو، کە وتی ئەو برادەرانەمان شەهید بووە. حەزم دەکرد هەر نەیان گرتایەو ئەو کوڕە چاکانە شەهید نەبوونایە. (رەئوفە کەڕ) زۆر نەگبەت بوو. هەرچی جارێك بۆ هەر جێگایەك چووبێ، بە بێ شەهیدو بریندار نەگەڕاوەتەوە. نازانم بۆ وا بوو؟ بۆ هەر چی جێگایەك چوو بێت، زۆربەی پێشمەرگە ئازاکانم لەگەڵ دەنارد، کەچی هەر سەرکەوتوو نەدەبوو. خۆشی زۆر پیاوێکی ئازاو قارەمان بوو. کۆمەڵێك پێشمەرگەمان هەبوو لە تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ، خەڵکی ئەو بەری سیروان بوون. هەر هەموویان زۆر قارەمان بوون. زۆریان شەهید بوون. رەئوف لەوانە بوو. خەڵکی گوندێکی ئەو بەری سیروان بوو. (مەحمودی مامە عەزە) یەکێ بوو لەوانەی دواتر لە شاڵاوی تۆڵەی ٣١ی ئاب دا شەهیدکرا. زۆر ئازا بوو. نامیق هەر لەوان بوو. زۆر ئازابوو شەهید بوو. ئامر مەفرەزە بوو لە تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ، هەروەها (شەهید تەنیا) یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی تیپی ٥٥ لە شەڕێکدا لای زڕگوێزەڵە شەهید بوو. شەهیدەکان زۆرن ناوەکانیانم لە بیر نەماوە. بە راستی هەموویان ئازاو دڵسۆز بوون بۆ شۆڕش. ئازادی مامە عەلە فەرماندەی کەرت بوو. زۆر ئازاو قارەمان بوو. ئەویش هەر لەگەڵم دا لە سەفرە شەهیدبوو. نازانم باسی کامیان بکەم. من ناتوانم باسی ئەو هەموو قارەمانو دڵسۆزییەی ئەو هەموو پێشمەرگە گیان بازانەی یەکێتی بکەم.

ئەو شەوە، هەر لە پشتی زڕگوێزەوە هەتا بەرانانمان بە بەر چاوی هەموو خەڵکی سلێمانیەوە لە جاشو عەسکەر پاککردەوە، مانگی پێنج بوو. وتیان:

" –هەموو خەڵکی سلێمانی چووبوونە سەر بانەکان تەماشایان دەکرد."
شەڕەکە بەرامبەری سلێمانی بوو. بە جوانی دیار بوو. هەر هەموو شاخەکانمان پاك کردەوە. لە بنارەکەو لە بەردەمی گڵەزەردەدا، یەك موعەسکەری زۆر گەورەی لێ مابوو. لە تەرەفەکەی ئێمەدابوو. لە ناو گوندی (گۆپیتە) دا. گوندەکە چۆڵ بوو بوو، هەر لە ناو خانوەکانی گوندەکەدا بوون. ئەو گوندانەی بنارەکە هەموو رایانکردبوو. هێشتا خانوەکانیان نەڕوخاندبوو، چونکە تازە هەموویان گرتبوو. ئێمە هەموو هێزەکانمان لە وێ نەمابوون. ئەوان هەموویان گرتبوو. لە لای شێخ جەعفەرو مام رۆستەم لە بناری داراغاو جێشانە مقەڕی فەوجی جاشەکانی لێ مابوو. بۆ رۆژی دوایی چوومە خوارەوە بۆ لای کاك قادری حاجی عەلی لە گوندی تیماربوو. کاك عومەر فەتاح لە وێ بوو. خەڵکی گوندەکان هەموو چۆڵیان کردبوو لە ترسی تەیارە، چونکە رۆژانە هەلیکۆپتەرو تەیارەی پیلاتۆز لێی دەدا. کە چوم، سەیرمکرد لەماڵی شێخ فەرەج بوون. ماڵێکی چۆڵ بوو. خۆشی هەر لە وێ بوو. ماڵو منداڵەکانی هەموویان رایانکرد بوو. تەیارە هەر لە گوندەکانی ئەو ناوەی دەدا. هەر، کە چوومە ئەوێ دانیشتم، فڕۆکە لە ناو دێکەی دایەوە. لەگەڵ کاك قادرو برادەرەکانی تر یەکمان گرتەوە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ قۆناغی دووەم، تا پەلاماری ئەو فەوجانە بدەین، کە ماون لە بناری شاخی گۆپیتە و داراغا. بە کاك قادرو برادەرانم وت:
" –ئەگەر ئەو هێزانە لە بناری شاخ بمێنێت، وەك ئەوە وایە هیچمان نەکردبێت، چونکە هەر دوای دوو رۆژی تر دەتوانن شاخەکان بگرنەوە. لە بەر ئەوە، تا زووە پەلاماریان بدەین. ئێستا ورەیان روخاوە. هەتا خۆیان رێك نەخستۆتەوە باشە. ئەوانیش زۆریان پێ باش بوو. بڕیارماندا هەر ئەو شەوە پەلاماری ئەو مقەڕ فەوجانە بدەین، کە ماون لە بناری گۆپیتەو داراغاو جێشانە. سەعاتی سفرمان دانا بۆ لێدانیان. (شێخ جەعفەر)و (مام رۆستەم). ئەوان لە جەبهەی داراغاو جێشانەبوون. منو کاك قادر بۆ گڵەزەردەو گۆپیتە. گۆپیتە مقەڕ فەوجێکی گەورەی لێ بوو. بە دەیان دەبابەی تیابوو. هەمووشی عەسکەر بوون. من پێش کاك قادر گەڕامەوە بۆ گڵەزەردە، بۆ ئەوەی هێزی بۆ کۆبکەمەوەو بچین تەماشای بکەین، بۆ ئەوەی بەرنامەی گرتنی بۆ داڕێژین. ئەو جەبهەیەی منی لێ بووم، ئەم تیپانەی لێ بوو:
تیپی ٥٥ی قەرەداغ، تیپی ١٧ی زمناکۆ، تیپی مەڵبەند، تیپی ٥٣ی شیروانەو تیپی ٥١ی گەرمیان، منو شەهید حەمە رەشو شەهید دلێر لەگەڵ سەلامی کوێخا عەزیز. سەلام جێگری تیپی ١٧ی زمناکۆ بوو. کۆبووینەوە لە بارەی شەڕەکەوە بۆیان دووام وتم:
" –ئێوە زۆر قارەمانانە ئەو شەڕە گەورانەتان کردووە. بە راستی جێگای رێزی یەکێتی نیشتمانی یە. ئێمە ئەو هەموو سەرکەوتنە گەورانەمان بە دەست هێناوە، هێشتا ئەو جێگایانە ماوە، کە لە بناری شاخەکەدایە. ئەگەر ئەوە نەگرین، هەروەك

ئەوە وایە هیچمان نەکردبێت. بەیانی چۆڵی بکەین، بۆی سەردەکەونەوە. یان ئەبێت هەموو هێزەکەمان بکەین بە حەرەسیات بۆ ئەم شاخە، یان ئەبێ پاکی بکەینەوە."
چووین لە پشتی ئاڵیاوەوە سەیری موعەسکەرەکەمانکرد، زۆر گەورە بوو. دەبابەی زۆری تیابوو لەگەڵ تۆپی قورس. هەموو عەسکەر بوون. دلێر جاف وتی:
" –کاک ئاوات ئەوە بە راستتە ئەڵێی ئەچین بۆ گرتنی ئەو موعەسکەرە.؟"
وتم:
" –ئەی کاک دلێر خۆ بە گاڵتەم نیە، ئەبێ ئەم شەو بیگرین."
وتی:
" –بە خوا ئەوە بە هەموو مەڵبەند ناگیرێت."
وتم:
" –کاک دلێر وانیە، من پێم وایە زۆر بە ئاسانی ئەیگرین، چونکە ئەوان ورەیان روخاوە، ئێستا هەر بچینە سەریان، رائەکەن."
زۆر موناقەشەمانکرد. ئەو هەر سور بوو لە سەر رەئی خۆی، کە ناگیرێ. منیش وتم:
" –کاک دلێر ئەوە موناقەشەی ناوێ. هەر ئەبێت بچینە سەریان بیگرین. ئەوە بڕیارە. من بۆ موناقەشە نەم ناردووە بە دوای ئێوەدا. پێتان ئەڵێم ئەمشەو ئەبێت بیگرین. ئیتر بیر لە موناقەشە مەکەرەوە."
شەهید حەمە رەش وتی:
" –کاک ئاوات هەر ئێمە بۆ خۆمان ئەچین. با تیپەکەی ئەوان نەیەن."
کاک دلێر وتی:
" –بۆ کاک حەمە رەش ئێمە ناوێرین.؟"
منیش وتم:
" –کاک دلێر تۆ زۆر پیاوێکی ئازاو قارەمانی، نازانم بۆ چی ئێستا ئەو هەموو موناقەشەیە ئەکەیت."
وتی:
" –کاک ئاوات من بە دڵنیایی یەوە پێت ئەڵێم ناگیرێت، هەر پێشمەرگە بە کوشت ئەدەین."
زۆر باسی ئەوەی کرد، کە ناگیرێ. من زۆر لێی تورە بووم پێم وت:
" –تۆ مەیە. لەگەڵ تیپەکەی ئێوە ئەچم."
ئەوەی زۆر پێ ناخۆش بوو. قادری حاجی عەلیش هات بە سەردا وتی:
" –ئامادە بوون.؟"
وتم:
" –کاک دلێر عەقڵی نایبڕێ، ئەڵێت ناگیرێت."
ئەویش لێی تورە بوو. دلێر وتی:

" –وا ئەزانن من ئەترسم؟ باشە ئەوە من ئەڕۆم، خۆ ئەزانم ناگیرێ، بەڵام هەر ئەچم."
ئەو دوو تیپەمان نارد، لە دوو لاوە پەلامارماندا. هەر، کە بوو بە تەقە، بڕوا ناکەم معسکەرەکە نیو سەعات مقاوەمەیان کردبێ. هەر هەموویان رایانکرد. ئەو هەموو دەبابەیە رایکرد بەرەو تانجەرۆ. لە ماوەی یەك سەعاتدا، دەستگیرا بە سەر ئەو هەموو هێزەدا. لەو کاتەدا (دلێر) زۆر دڵخۆش بوو، لە خۆشیدا لە جیهازەکەدا هەلهەلەی لێ دەدا. وتی:
" –کاك ئاوات چۆنمان گرت."
وتم:
" –کاك دلێر نەموت ورەیان نەماوە."
کاك دلێر لە خۆشیدا نەی دەزانی چی بکات. شەڕەکە لە فیلمێکی سینەمایی دەچوو. پێشمەرگە بە راکردن دوای دەبابە کەوتبوو. ئەو هەموو دەبابەو تۆپە قورسانە بەرگەی یەك سەعاتیان نەگرت. هەر هەموو رایانکرد. ئەو هەموو تەقەمەنیو سەیارانەیان بە جێ هێشت. شەڕێکی زۆر خۆش بوو، بەڵام لە پڕ دەنگی کاك دلێر نەما. وتمان:
" –ئەوە چی بوو دەنگ نەما.؟"
دوای چەند چرکەیەك، پێشمەرگەیەك لە جیهازەکەدا وتی:
" –کاك دلێر بریندار بووە."
زۆر ناخۆش بوو وتم:
" –وەزعی چۆنە.؟"
وتی:
" –خراپە."
دیار بوو یەك سەر شەهید ببوو، چونکە هەر بەرکەوتو دەنگی نەما. ئیتر زۆر ناخۆش بوو. ئەو هەموو سەرکەوتنەمان لە بیر چۆوە. شەهید بوونی کاك دلێر زۆر ئازاری داین. بە تایبەتی منو کاك قادر زۆرمان پێ ناخۆش بوو، چونکە هەردووکمان لێی تووڕە بووین. زۆر پیاوێکی قارەمان بوو. زۆر پێشمەرگەیەکی دڵسۆز بوو. لە بنەماڵەیەکی هەژار بوو. زۆر خۆشەویست بوو لە ناو خەڵکدا. بە داخەوە شەهید بوو. دەسەڵات نەبوو. بە دەیانی وەك کاك دلێر لەم شۆڕشەدا شەهید بوون.
بە هەزاران چەكو تەقەمەنی، ئەو هەموو سەیارەو شتومەکە لە ناو موعەسکەرەکەدا بوو، ئاگرمان پێوە ناو سوتانمان. ئەو شەوە گەڕاینەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ. بۆ بەیانی گەیشتینەوە گوندی تیمار. بەیانی زوو تەیارە هاتەوە سەرمان. باشبوو هێزەکەمان بڵاوە پێ کردبوو بۆ سنورەکانی خۆیان.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٧ دا (قادری حاجی عەلی) ناردی بە دوامدا، کە چووم، وتی:
" –ئیشێکی زۆر باشم دۆزیوەتەوە لە سنوری مەڵبەندی دوو لە (ئاغجەلەر) برادەرانی خۆمان بۆیان دۆزیوینەتەوە."
وتم:
" –چی یە.؟"
وتی:
" –یەك فەوجی جاشە. چەند دۆستێکی خۆمانی لێ یە، بوون بە جاش لەو فەوجەدا. هاتوون ئەڵێن وەرن ئەچین ئەیگرین."
منیش وتم:
" –جا راست ئەکەن.؟"
وتی:
" –بەڵێ، ئەوە دوو برادەریان هاتوون، خۆشیان دێن لەگەڵمان."
وتم:
" –باشە با بنێرین بە دوای تیپەکاندا کۆیان بکەینەوە."
دووسێ تیپمان کۆکردەوە بەرەو سنوری تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بە رێکەوتین. بەپێ دە سەعات دەبوو. مانگی حەوتو هەشت بوو، زۆر گەرم بوو. رۆشتین گەیشتینە نزیکی ئاغجەلەر. ئەو دوو برادەرەی، کە لەگەڵمان بوون، وتیان:
" –ئەوە فەوجەکەیە."
ئەو رەبایەیان پیشاندایین، کە خۆیانی تیابوون. وتیان:
" –ئێمە هەموومان رێکخستنی کۆمەڵەین لەو رەبایەداین. ئیجازەمان وەرگرتووە بۆ ئەوەی بێین پێتان بڵێین ئەتوانین لەگەڵ پێشمەرگەدا هەموو فەوجەکە بگرین. هەموو هێزەکە ئەچینە ئەو رەبایەیەی ئێمەوە. لە وێشەوە پەلاماری فەوجەکە ئەدەین."
وتمان:
" –زۆر باشە، چۆن بچین تاقی بکەینەوە.؟"
بە کاك قادرم وت:
" –من ئەچم لەگەڵ ئەو دوو برادەرە. هەر چەندە هیچیان ناناسم، ئێوە ئەڵێن رێکخستنی خۆمانن."
کاك قادر وتی:
" –تۆ مەچۆ."
وتم:
" –کاك قادر من بچم باشە، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بیبینم."

وتی:
" –زۆر باشه، بەڵام زۆر وریا بە."
وتم:
" –جا وریای چی بم؟ خۆم داوەتە دەست قەزاو قەدەر."
دەمەو ئێوارە بوو، لەگەڵ ئەو دوو برادەرە بە ڕێکەوتم. دەوری دوو سەعات لەو جێگایەوە دوور بوو، کە هێزەکەی خۆمانی لێ بوو. نەدەبوو ئەو هێزە نزیك بێ، بۆ ئەوەی کەشف نەبێ. جیهازێکی دەستیم پێ بوو، کە ڕۆیشتین نزیك بووینەوە لەو ڕەبایەیەی ئەوانی تیابوون. بانگی شێوان بوو، کە گەیشتین. بەردەمی ڕەبایەکە چەمو ئاوێك بوو، لە وێوە ئاویان دەبرد بۆ ڕەبایەکە. بە کوڕەکەم وت:
" –با جارێ بچینە بن ئەو بەرزییەوە، نەوەك تەقەمان لێ بکەن."
چونکە هەر بیست مەترێك دوور بووین لە ڕەبایەکەوە. وتی:
" –نا تەقەمان لێ ناکەن، ئەزانن منم، چونکە وا بڕیارمان بووە لێرەوە من بانگیان بکەم."
وتم:
" –باشە، تۆ جارێ بانگیان مەکە، تا ئەچینە ئەو پەنایە."
چووینە پەناکەوە بانگی کردن. نازانم ئەوەی بانگی کرد ناوی چی بوو، هەر ئەوەندەمان خۆشبوو کوڕە بانگی کرد. بە جارێك ڕەنگە دە هەزار فیشەکیان پێوە نابێ. ئیتر نازانم چۆن گوللەمان بەر نەکەوت. زۆر لەوانەوە نزیك بووین. دونیا بەرەو تاریکی دەچوو، ئەگینا دەر نەدەچووین. من هەر یەك دەمانچەم پێ بوو. ئەوەی لەگەڵم بوو، هەر هیچی پێ نەبوو. دەوری نیو سەعات لەو بن کەنەدا، نەمانتوانی بجوڵێینەوە. هەر چۆنێ بوو دەرچووین دوور کەوتینەوە. جیهازەکەم کردەوە، کاك قادر لە سەر خەت بوو وتی:
" –ماوی.؟"
منیش وتم:
" –جا ئەوە مانە."
وتی:
" –کوڕە خۆ من وا شێت بووم. بە خوا بە تەمات نەمابووم. ئەوە موئامەرە بوو، هەر بۆ ئەوە بوو ئەو فێڵەمان لێ بکەن."
وتم:
" –ئەم جارەش دەرچووین. بزانین بۆ کوێی هەڵگرتووین."
گەڕاینەوە بۆ لای کاك قادرو هێزەکە. بۆمان باسکردن چۆن بووە. ئەو کوڕەی کە لەگەڵم بوو وتی:

" –ئەوە تۆ چۆن زانیت تەقەمان لێ ئەکەن؟ وتت با بچینە ئەو چاڵەوە، ئەوجا بانگیان بکە؟."

وتم:

" –هەر لە خۆمەوە دڵم خەبەری دابوو."

تومەس ئەو رەبایەیەی ئەوانیان گۆڕیبوو، جەماعەتێکی تریان بۆ هێنا بوو. هەر بە رێکەوت دەرچووین، ئەو جارەش نەکوژرام رزگارم بوو. ئیتر گەڕاینەوە هیچمان نەکرد.

(قادری حاجی عەلی)و (شێخ جەعفەر) هاتن بۆ لام وتیان:

" –با بچین سەیری ئەو موعەسکەرەی دوو دارە بکەین. لە سەر جادەی دەربەندیخان–عەربەت، نزیك میرە دێ."

ئەو موعەسکەرە زۆر کۆن بوو. لە زەمانی شۆڕشی ئەیلولەوە هەبوو. هەمووی مین رێژ کرابوو، گرتنی زۆر سەخت بوو. منیش پێم وتن:

" –بە خوا گرتنی زۆر زەحمەتە، بڕوا ناکەم بگیرێت."

کاك قادر وتی:

" –تۆ با بچین تەماشای بکەین."

منو ئەوو شێخ جەعفەر، چووین سەیرمانکرد، زۆر قایم بوو. کاك قادر وتی:

" –من تاقیبم کردووە، چەند سەربازی تیایەو چۆن ئەچینە ناو موعەسکەرەکەوە. زۆر ئاسان بۆمان ئەگیرێ."

کاك قادر لە رێگەی برادەرێکەوە زانیاری پێ گەیشتبوو، کە گوایە ئەو دەتوانێ بیانباتە ناو موعەسکەرەکەوە، بەڵام ئەو کەسە موعەسکەرەکەشی ئاگادار کردبۆوە، کە شتێکی وا هەیە، چونکە پێش ئەوەی ئێمە بچین، ئەوان ئامادەبوون بۆ ئێمە. چووین سەیرمانکرد. گەڕاینەوە، ناردمان بە دوای تیپەکانی گەرمیاندا کۆبووینەوە. هێزەکەمان دابەشکرد بەم شێوەیە:

تیپی ٥١ی گەرمیانو تیپی ٥٥ی قەرەداغو هەندێ لە پێشمەرگەکانی تیپی ١٧ی زمناکۆ لەگەڵ مندا بوون. بڕیاربوو ئێمە بچین بۆ رەبایەکانی دەورو بەری (میرە دێ)و جاشەکانی زەڕایەن. (قادری حاجی عەلی)و (شێخ جەعفەر) بچن بۆ گرتنی موعەسکەرو رەبایەکانی دەورو بەری. شەو لە گوندی سۆڵەی بەری دەربەندی خانەوە بە رێکەوتین. پێش ئەوەی بگەین، هەر لە رێگا، مارێك دای بە سەلامی کوێخا عەزیزەوە، لەو هێزەی لەگەڵ مندا بوو. پێش ئەوەی بگەینە شوێنی دیاری کراو، هەر لە رێگا ئەو شارەزایانەی لەگەڵ ئێمە بوون، رایانکرد خۆیان کرد بە ناو زەڕایەندا. ئیتر هەر ئێوارە لای ئێمەوە فەشەل بوو، چونکە دیار بوو ئەو شارەزایانە لەگەڵ جاشەکان بوون. رایانکرد جاشەکانیان ئاگادار کرد. کاك قادرو ئەوانیش هەر لە نیوەی رێگا تەقەیان لێ کرا، بە بێ ئەوەی بگەنە نزیك موعەسکەرەکە. دیار بوو موئامەرە بوو. پێشمەرگەمان زۆر لێ شەهید بوو، بە بێ ئەوەی ئێمە یەك فیشەك بتەقێنین. بەڵام لای ئێمەوە هیچ

ڕوی نەدا. ئێمە زانیمان ئەوە موئامەرەیە، چونکە هەر زوو شارەزاکان ڕایانکرد. ئەگینا ئێمەش هەموو تیا دەچووین. چەند پێشمەرگەیەك شەهید بوون. کەرتی مەحمودی مامە عەزە ئەوان پەڕیبونەوە بۆ بەری عازەبان، بۆ ئەوەی لە وێوە پەلاماری موعەسکەرەکە بدەن. ئەوانیش کەوتبونە ناو شەبەکەی مینەوە. بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ (سۆڵە) هیچمان پێ نەکرا. زۆر ناخۆش بوو.

دوای ئەوەی لە مەعەسکەری دووداره گەڕاینەوە، بەماوەیك هەر هەمان وەرزی هاوینی ساڵی ١٩٨٧. ڕۆژێك بە کاك قادری حاجی عەلیم وت:

" -با پەلاماری ئەو بورجەی دارەش بدەین."

بورجەکە لە سەر جادەی قەرەداغ-سلێمانی بوو، لە پشتی گوندی دارە ڕەشەوە. من لەگەڵ برادەرانی تیپی ٥٥ی قەرەداغ زۆرم سەیرکرد بوو، بەلام بە یەك تیپ نەدەکرا. کاك قادر پێی باش بوو، وتی:

" -با بچین سەیری بکەین."

بەیانیەك منو کاك قادرو شێخ جەعفەر، چووین لە پشتی گوندی (سوێرلوا) وە سەیرمانکرد. بڕیارماندا هێزی بۆ کۆبکەینەوە پەلاماری بدەین. ناوچەی قەرەداغ هەر هەموو سنورەکەی ڕزگار ببوو، هەر ئەو شاخە مابوو، کە دەورو بەری بورجەکە بوو. زۆر ناخۆش بوو، ئەگەر ئەوەش بگیرایە، ئیتر بە تەواوی سنوری مەڵبەندی یەك ئازاد دەبوو. موقەڕی بورجەکە زۆر قایم بوو. دەورو بەری هەمووی ڕەبایە بوو. فەوجێکی جاشی لێ بوو. هەر لە دارە ڕەشەوە، هەتا سلێمانی دەورو بەری جادەی سلێمانی، ڕەبایەو موعەسکەر بوو. هەر چواردەوریشی (مین) ڕێژ کرابوو. زۆر نەمان دەوێرا بچینە سەری پەلاماری بدەین. ناردمان هەموو تیپەکانمان کۆکردەوە. ئەو کاتە سەر تیپەکان شەهید حەمە ڕەش سەر تیپی ٥٣ بوو، عادل شوکر سەر تیپی ٥١ بوو، شەهید حەمە سەعید سەر تیپی ٥٥ بوو، مەحمود سەنگاوی سەر تیپی ٥٧ بوو، جەمیل هەورامی سەر تیپی ١٧ی زمناکۆ بوو. بورجەکە لە بەری شاخی سولیاوە بوو، لەگەڵ یەك موعەسکەردا. چەند ڕەبایەیەکیش لە دەورو بەری بوو. هێزەکەمان بەم جۆرە دابەشکرد:

منو کاك قادر چووین بۆ بورجەکەو موعەسکەرەکەو ئەو ڕەبایانەی پشتی سەرچاوەی گوندی تلەزەیت. شێخ جەعفەرو عومەر فەتاح بۆ بەری زرگوێز. ئەوان ئەم تیپانەیان لەگەڵ بوو، تیپی ٥٣ی شیروانە، تیپی ٥٧ی سەگرمەو تیپی ١٧ی زمناکۆ. ئێمەش ئەم تیپانەمان لەگەڵ بوو. تیپی ٥٥ی قەرەداغ شەهید حەمە سەعید، تیپی ٥٩ هێمن، تیپی ٥١ عادل شوکر، تیپی شارەزور جەلال کوڵکنی سەر تیپی بوو. سەعاتی سفرمان دانا، شەو پەلاماریان بدەین. ئێمە بە ڕۆژ هەموو سەر تیپەکانمان لەگەڵ ئامر کەرتەکان دا بردبوو. هەر کەس جێگای خۆیمان پیشاندا بوو. هێزەکانمان لای خۆمانەوە تەوزیع کرد. شێخ جەعفەرو ئەوانیش، شەهید حەمە ڕەشو مەحمود سەنگاوی لەگەڵ باقی

هێزەکەیان دانابوو بۆ سەر جادەی سلێمانی–قەرەداغ. وامان دانابوو، ئەگەر بورجەکە شەویش نەگیرا، بەیانی بە جێی نەهێڵین. وا بڕیارمان دابوو، کە هەر دەبێت بگیرێت. ئەوان دەبێت جادەی سلێمانی کۆنترۆڵ بکەن، نەیەڵن هێزی حکومەت بێت بە هانایانەوە، چونکە دەمانزانی لەوانەیە بورجەکە شەو نەگیرێت. زۆر قایم بوو. لە ژێر زەویدا بوو. هەر چوار دەوریشی بە رەبایەو مین گیرابوو. ئێمە لای خۆمان ئێوارەکەی لە میرپاسیی خوارو کۆبوینەوە، بەم شێوەیە تیپەکانمان تەوزیع کرد:

ئەو هێزەی لای خۆمان، تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ بۆ دیوی شارەزورو گرتنی رەبایەکانی لەگەڵ یەك موعەسکەر، کە لە بەردەمی بورجەکەدا بوو، بە دیوی شارەزوردا. تیپی ٥٩ی حەمرین بۆ پشتی بورجەکە. دوو رەبایە بوو. دوای گرتنی ئەو رەبایەیە ئەوجا پەلاماری بورجەکە بدەن. تیپی ٥١ی گەرمیان بۆ دیوی قەرەداغ، رەبایەکانی پشتی تلەزەیتو سەرچاوە. ئەوانەی شارەزا نەبوون، شارەزامان بۆ پەیداکردن. دوایی حەمە سەعید وتی:

" –کاك ئاوات شارەزا بۆ ئێمەش دابین بکە."

منیش پێم وت:

" –کاك حەمە سەعید ئێوە بۆ چیتانە؟ هەموو شارەزان. کێتان بۆ پەیدابکەم تۆ خۆت لە هەموو کەس شارەزا تری."

هەموو تیپەکە شارەزا بوون، چونکە سنوری خۆیان بوو. زۆری لێ تورە بووم. ئیتر هەر کەس چوو بۆ ئەو جێگایانەی، کە بۆی دیاری کرابوو. شەو شەڕ دەستی پێ کرد. لە چەند سەعاتێکدا تیپی ٥٥ هەموو ئەو جێگایانەی بۆی دیاری کرابوو هەموویان گرت. تیپی ٥٩ی حەمرین دوو رەبایەی پێشەوەیان گرت، چوونە سەر رەبایەی سێیەم. زۆر شەهیدیان دا. هەمووی مین رێژ کرابوو. نەگیرا. نەیان توانی بچنە سەر بورجەکە، بەڵام تیپی ٥٥ی قەرەداغ کردیان بە هەلهەلە. شەهید حەمە سەعید زۆر دڵخۆش بوو وتی:

" –هەر ئێستا ئەچین بورجەکەش ئەگرین."

ئەوان هەموو ئەو جێگایانەیان گرتبوو، کە بۆیان دیاری کرابوو. پەلاماری بورجەکەیان دا، بەڵام جێگای بورجەکە بەرز بوو، زۆر موسەیتەر بوو بە سەر ئەواندا. ئیتر لێیان دان بە رومانەو تەقەکردنەوە. کاتێکمان زانی، حەمە سەعید لێدرا. دەنگەکە نەما، زانیمان لێدراوە. کە حەمە سەعید شەهیدبوو، وەزعی تیپەکە خراپ بوو. هەر لەگەڵ شەهید حەمە سەعید چوار پێشمەرگەی زۆر ئازایان شەهید بوون. پێشمەرگەکان نەیان توانی لە بورجەکە بچنە پێشەوە. کە زانیان هێز نەما بچێتە سەر بورجەکە، زۆر مقاوەمەتیان کرد. ئەو شەوە نەگیرا. هەموو رەبایەو موعەسکەرەکان گیران. بڕیارمان دابوو چۆڵی نەکەین هەتا نەیگرین. ماینەوە هەتا نیوەڕۆ. تەیارەش بە بەردەوامی لێی دەداین بە هەلیکۆپتەرو تەیارەی پیلاتۆز. (سامێك) مان هەبوو، پێشمەرگەیەك دەورەی لە سەر بینی بوو ناوی (سوهاد) بوو. لە پشتی زرگوێز دامان نابوو. لە نیوەڕۆدا لە یەك

هەلیکۆپتەری دا، لە بەردەمی زرگوێزدا بە بەر چاوی خەڵکی سلێمانییەوە کەوتە خوارەوە. ئەوە زۆر خۆش بوو، چونکە هەر لە جێی خۆی کەوتە خوارەوە. زۆر ورەی پێشمەرگەی بەرز کردەوە. لە هیچ جێگایەکەوە تەقە نەمابوو. هەر بورجەکە مابوو، ئەویش پێشمەرگە چوار دەوری گرتبوو، لە ژوورەوە نەیان دەوێرا سەر بێننە دەرەوە. ئاوی خواردنەوەشیان نەمابوو. تەنکی ئاوەکەشیان شکابوو، ئاوی تیا نەمابوو. پێشمەرگە بە دیار بورجەکەوە بوو. جوابمان نارد بۆ شێخ جەعفەرو کاک عومەر فەتاح وتمان:

" -ئەگەر پێشمەرگەتان ئەوێت، با بۆتان بنێرین."

وتیان:

" -پێشمەرگە زۆرە، ئەگەر ئێوە پێویستیتان بە هێزە، با بۆتان بنێرین."

وتمان:

" -رێی سلێمانی زۆر قایم بکەن، بۆ ئەوەی هێز لە سلێمانییەوە نەیەت."

وتیان:

" -هێزمان زۆر داناوە. نا توانن بێن. کاک مەحمود سەنگاوی، خۆیو تیپەکەی لە سەر جادەن. پێمان وتووە، ئەڵێن هێزمان زۆرە، کەسمان ناوێت."

زۆری پێ نەچوو، کاتێکمان زانی بە جادەی سلێمانی-قەرەداغ دا دەبابە هاتە سەرەوە بۆ بورجەکە. دەبابە گەیشتە سەر بورجەکە. خەریك بوو پێشمەرگە بکات بە ژێرەوە. لەو کاتەدا، کە وتیان جادە زۆر قایمە، دەبابە گەیشتە سەر شاخ. تومەس جادەکەیان چۆڵ کردبوو، کشابوونەوە بۆ دەربەندەکەی پشتی زرگوێز. بە راستی ئەگەر تیپی ٥٧ ئەو جادەیەی چۆڵ نەکردایە، زۆر بە ئاسانی بورجەکە خۆیان تەسلیم دەبوون، چونکە هەر ئەوێ مابوو بە تەنها. ئەویش پێشمەرگە بە دەوریانەوە بوو، هەر نەیان دەوێرا لە ژوورەوە بێنە دەرەوە. کە دەبابە هاتە سەر شاخ، بە پەلە پێشمەرگە لە سەر جادەکە بڵاوەیان لێ کرد. ئەوە بوو تەنیا بورجەکە مابوو، نەگیرا. کشاینەوە دواوە. ئەو شەڕە زۆر باش بوو. بە داخەوە پێشمەرگەمان زۆر شەهید بوو. شەهید بوونی حەمە سەعید زۆر ناخۆش بوو، چونکە بریارمان دابوو بیکەین بە سەر تیپی ٥٥ی قەرەداغ. تازە دامان نابوو سەر پەرشتی تیپەکە بکات. زۆر کوڕێکی باش بوو. زۆر ئازاش بوو. خۆی هەر حەزی دەکرد سەر تیپی ٥٥ی قەرەداغ بێت. من ماوەیەك حەزم نەدەکرد بۆ تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ. ئەویش هەر لە بەر خۆی بوو. دەموت:

" -لە وێ سەرکەوتوو نابیت، بچۆ بۆ تیپەکانی تر."

دوایی منیش قەناعەتم کرد، هەر لە وێ بمێنێتەوە. بریارماندا لە تیپی پەنجاو پێنجی قەرەداغ بە سەر تیپی بیهێڵینەوە. بە داخەوە شەهید بوو.

قادری حاجی عەلی لێپرسراوی مەڵبەندی یەك بوو. منو شێخ جەعفەرو مام ڕۆستەم لێپرسراوی عەسکەری بووین. لە ساڵی ١٩٨٨ بوو. منو کاك قادرو شێخ جەعفەر لەگەڵ تیپەکان چووین بۆ سەرکردایەتی. کە چووینە ئەوێ، هەموو مەڵبەندەکان لە وێ بوون. ئەو کاتە کۆسرەت ڕەسوڵ لێپرسراوی مەڵبەندی سێ بوو. شێخ دارا لێپرسراوی مەڵبەندی دوو بوو. هەموو سەر تیپەکانیش لە وێ بوون. لە مقەڕی کاك نەوشیروان بووین. شەوو ڕۆژ حکومەت تۆپ بارانی بەرگەڵوی دەکرد. بڕیار بوو بە هەموو مەڵبەندەکان کارێکی گەورە ئەنجام بدەین. پاش ماوەیەکی زۆر لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی کارەکە، بۆیان دەرکەوت، کە ڕەنگە ئەوەی دەیکەین، زەرەری لە قازانج زیاتر بێت. ئیتر بڕیار درا هەموو مەڵبەندەکان هەر یەکەی بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان. لەو کاتەدا، برادەرێکمان هەبوو ناوی (حەمە سەعید) بوو. مام جەلال ناردبووی بە دوایدا بینێرێ بۆ ئێران، لە وێ بڕو ماڵو منداڵەکەشی بەرێت. کاك حەمە سەعید یەکێك بوو لە پێشمەرگە سەرەتاییەکان. زۆر ماندو بوو. ماوەیەك زویر ببوو، لە قەرەداغ دانیشتبوو. مام جەلال بەوە ئاشتی کردبۆوە. حەمە سەعید زۆر خۆش بڕوا بوو. ملازم عومەر دایم کڵاوی دەکردە سەری. وتمان:

" -با کڵاوێك بکەینە سەری کاك حەمە سەعید، بەڵام کەس قسە نەکات. "

ملازم عومەر چوو بۆ لای مام جەلال، لە گوندی یاخسەمەر. دوای نیوەڕۆ هاتەوە، خۆی زویر کردبوو. ئێمەش هەموو چووینە لایەوە وتمان:

" -کاك عومەر ئەوە بۆ عاجزی. ؟"

وتی:

" -کورە مام جەلال لەگەڵ ئێرانیەکاندا کردی بە شەڕ، هەموویانی سجن کرد. بروسکەشی بۆ هەموو برادەرەکانی عیلاقاتی خۆمان کرد لە ئێران، ئەڵێ چۆن خۆتان دەرباز ئەکەن بیکەن. "

وتمان:

" -ئەوە بە ڕاستە. ؟"

وتی:

" -بە خوا. "

هەندێکمان وتمان:

" -دەستی خۆش بێت. "

هەندێکیش دەیانوت:

" -ئەوە کارێکی زۆر خراپە. "

حەمە سەعید هاتە لای منەوە وتی:

" –توخوا ئەوە راستە مام جەلال کردویەتی.؟"
وتم:
" –وەڵا نازانم کاك حەمە سەعید بڵێم چی؟ مام جەلال، کە توڕەبوو وایە."
وتی:
" –کوڕە ماڵەکەشی پێ فرۆشتم."
وتم:
" –کوڕە ماڵ هیچ نییە. ماڵی پێشمەرگە چییە.؟"
ئیتر کاك حەمە سەعید زۆری پێ ناخۆش بوو. نەیدەزانی چی بکات؟ وتی:
" –خوا بەوە رەحمی کردووە مام جەلال چەکی (زەڕە)ی نییە. ئەگینا هەر توڕە بوایە ئەیدا بە وڵاتێکدا. ئەوەی باشە هیچی نییە."
ئەو شەوە حەمە سەعید هەتا بەیانی نەنوست. بۆ بەیانی مام جەلال هات بۆ لامان پێمان وت شتێکی وامان بە حەمە سەعید وتووە. چی وتبوو، بۆیان گێڕایەوە. مام جەلال وتی:
" –وەرە کاك حەمە سەعید ئەوە چیت وتووە؟ حەمە سەعید بۆ تۆ من بە شێت دا ئەنێی. من دڵسۆزی تۆم، کەچی هەموو جارێك کاك عومەر کڵاو ئەکاتە سەرت. من لە بەر تۆ ئەو ئیشەم دۆزیوەتەوە، کەچی تۆش هەر بە قسەی ئەوان ئەکەیت."
مام جەلال حەمە سەعیدی خۆش دەویست. حەمە سەعید، کە زانی مەسەلەکە کڵاوەو وا نەبووە، زۆری پێ خۆشبوو وتی:
" –کوڕە مادەم کڵاو بوو، ئەو مەسەلەیە وا نەبوو، خوای ئەکرد هەتا بنی پێم ئەهات."
زۆر خۆش بوو، ئەو کاتە بەو هەموو ناخۆشییەوە، هەمووەمان مورتاح بووین. هەموو ساتێکیش چاوەڕێی مەرگمان دەکرد، بەڵام هەر خۆش بوو.
دوای ئەوەی ئەو ئیشەی سەرکردایەتی پلانی بۆ داڕشتبوو، کۆبونەوەمان لە سەر کرد، سەری نەگرت، چونکە ئەگەر ئەنجام بدرایە، بە دەیان پێشمەرگەمان شەهید دەبوون. من وام دانابوو (٩٩٪) ی سەرکەوتوو نەدەبووین. من دوو تیپم هەڵبژارد بوو، لەگەڵ خۆم بیانبەم. تیپی ٥٩ی حەمرین‌و تیپی ٥٣ی شیروانە. دوو تیپی زۆر ئازابوون. سەر تیپەکانیشیان زۆر قارەمان بوون. شەهید حەمە رەش‌و هێمنە رەش. ئەوە بوو، بڕیار درا، کە ئەو چالاکی یە نەکرێت. هەر لەو کاتەشدا، مام جەلال سەفەری دەرەوەی کرد.
مانگی ١٢ی ساڵی ١٩٨٨ بوو، بڕیاریاندا مەڵبەندەکان بگەڕێنەوە بۆ سنورەکانی خۆیان. بە مەڵبەندی ئێمەیان وت:
" –لە گەڕانەوەتاندا پەلاماری فەوجەکەی (عومەری حەمە عەلی) بدەن، لە گوندی چەرمەگا. ئەو کاتە عومەری حەمە عەلی موستەشار بوو. نازانم لە سەر چی بڕیاری لێدانی درا. لەوەو پێش خۆی بە دۆستی مام جەلال دەزانی. لە سەرەتای شۆڕش دا

زۆر دۆستمان بوو. باسیشم کردووە، کە لەگەڵ شەهید ئارام چووینەماڵی. چەکیشی داینێ. لە گەڕانەوەماندا، چووینە حاجیاوا. گوندێك بوو. ئەو کاتە ڕۆستەمی برای دارا سەر تیپ بوو. حەمە عەلی عوسمانی مەلا، جێگری بوو. منو کاك قادری حاجی عەلیو شێخ جەعفەر، سێ قۆڵی چووینە لای ڕۆستەم لە پێش تیپەکانەوە. ڕۆستەم زۆر داوای دەکرد لەو فەوجەی عومەری حەمە عەلی بدەین. وتمان:

" –ئاخر دۆستی خۆمانە."

وتی:

" –کەی وایە؟ بە خوا لە هەموو کەس خراپترە."

بەڵام بڕیاری سەرکردایەتی بوو لێی بدەین. ئیتر هێزەکەمان گەڕایەوە، هەموو کۆبووینەوە وتمان:

" –باشە کاکە ڕۆستەم، ئەم شەو لێی ئەدەین."

شەو لێمان دان. فەوجەکە گیرا، بەڵام لەو شەڕە دا، مام هێرش جێگری سەر تیپی تیپی ١٧ی زمناکۆو چەند پێشمەرگەیەکی تر شەهید کران. ناوەکانیان نازانم. ئەوان فەوجێکی عەسکەرییان لەگەڵ بوو. مام هێرش لە فەوجی عەسکەرییەکە شەهید بوو. تەرمەکەیمان هێنایەوە بۆ گوندی (دێ لێژە). شەهیدبوونی پێشمەرگە زۆر ناخۆش بوو، کە پێشمەرگەیەك شەهید دەبوو، وەك ئەوە بوو هیچت نەکردبێ. هەر چەندە سەرکەوتنەکەش زۆر گەورە بوایە.

٨٧

لە مانگی شوباتی ١٩٨٨دا، حکومەتی عێراقی هێرشی کردە سەر ناوچەی دۆڵی جافایەتی، کە بارەگاکانی سەرکردایەتی لێ بوو. ئەو کاتە مام جەلال سەفەری دەرەوەی کردبوو، لەوێ نەبوو. کاك نەوشیروان لە وێ بوو. من ماوەیەك پێش ئەوەی هێرشەکان دەست پێ بکات، لە سەرکردایەتی بووم. گەڕامەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ. داوای هێزیان کرد. ئەم جارە شێخ جەعفەر چوو، چونکە تازە گەڕابوومەوە. ئەو کاتە منو شێخ جەعفەر لە مەڵبەند بووین، وەك لێپرسراوی عەسکەری مەڵبەندی یەك. مام ڕۆستەم لە ئێران بوو. زنجیرە هێرشی حکومەتی عێراق بۆ سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی دەستی پێکردەوە. سەرکردایەتی لە دۆڵی جافایەتی، بەرگەڵو، سەرگەڵو، یاخسەمەر بوو. ئەو کاتە بارەگای مام جەلال لە یاخسەمەر بوو. بارەگای کۆمەڵەو شۆڕشگێڕان لە بەرگەڵو بوو. هەروەها ئێزگەو ڕاگەیاندنو نەخۆشخانەی شۆڕش، هەمووی لە بەرگەڵو بوو. ئەو زستانە زۆر بە قورسی شەڕ دەستی پێکرد. شەڕەکە زۆر گەورە بوو. هێزی پێشمەرگە زۆر قارەمانانە بەرگرییان دەکرد. دیار بوو

له بەرنامەی عێراقدا بوو، کە هەر دەبێ ئەو ناوچانە بگیرێ، ئەگەر هەموو جەیشی عێراقی تیاچووبن. لەو کاتەشدا لە جەبهەکانی ئێران-عێراق سەرکەوتنی زۆری بە دەست هێنابوو. زۆربەی هێزەکانی گێڕابۆوە بۆ لێدانی پێشمەرگە. هەموو هێزی یەکێتی لەو شەڕەدابوو. هەر لەو کاتەدا هێزێکی مەڵبەندی یەك لە پەڕینەوە دا، لە سەر رێگای دوکان-سلێمانی، هێزێکی حکومەت لە دوکانەوە هاتبوون بۆ سلێمانی، کەوتبوونە ناو ئەو هێزەی مەڵبەندی یەکەوە. ببوو بە شەڕ، چوار پێنج ئەفسەری زۆر گەورە کوژران. بەختیان هەبوو زوو پێیان زانیبوون. مەسئولە گەورەکان گەڕابوونەوە. یەك (هەیئەی ئەرکان) بوون هاتبوون پلانی گرتنی سەرکردایەتیان داڕشتبوو. هەر لەو کاتەشدا تیپی ٤٧ شەڕێکیان کردبوو، بەڵگەنامە (موستەمسەك)ی زۆریان دەست کەوتبوو، کە تیایدا نەخشەیان بۆ شەڕەکە کێشابوو، کە چۆن پەلاماری سەرکردایەتی بدەن. شەڕ بە گەرمی بەردەوام بوو. رۆژێك بروسکەیەکیان کرد بۆ مەڵبەند، ئەو کاتە هەر منو کاك عومەر فەتاح لە وێ بووین. ئەو ئەندامی مەڵبەندو لێپرسراوی رێکخراوی کۆمەڵەش بوو. منیش ئەندام مەڵبەند بووم، مەسئولی عەسکەری مەڵبەندیش بووم. مقەڕی مەڵبەند لە ناو قۆپیەکاندا بوو. من ماڵو مقەڕەکەم لە گوندی گۆشان بوو. کاك عومەر فەتاح هات بۆ گۆشان وتی:

" -لە سەرکردلیەتیەوە ئەم بروسکەیەمان بۆ هاتووە، لە کاك نەوشیروانەوە."

لە بروسکەکەدا داوای ئەوەیان کردبوو، هێزێك بەرین بۆ بەری مەڵبەندی دوو لە ناوچەی (سورقاوشان) هەروەها هاوەنو راجیمەش بەرین، لە وێوە لەو هێزانەی دۆڵی دوکان بدەین، بۆ ئەوەی تۆزێك هێرش لە سەر سەرکردایەتی کەم بێتەوە. جەبهەیەکی تر دروست ببێت. تۆزێك زەخت لە سەر سەکردایەتی کەم بێتەوە، سەر لە دوژمن تێك بدەین. ئەو کاتە چەند پێشمەرگەیەکی کەم لە مقەڕی تیپەکاندا مابوون. کاك عومەر وتی:

" -من ئەچم هەندێ پێشمەرگە کۆ ئەکەمەوە."

پێم وت:

" -کاك عومەر من ئەچم، تۆ لێرەبە."

وتی:

" -ئاخر تۆ تازە هاتویتەتەوە، ماندویت."

وتم:

" -قەیناکە من ئەچم."

ئەو کاتە تیپی تۆپخانەمان هەبوو، کاك (عەدنانی حەمەی مینا) سەر تیپی بوو. ناردم بە دوایدا پێم وت:

" -بچۆ هاوەنێکی (١٢٠) ملمو راجیمەیەك بێنە لەگەڵ هەندێك پێشمەرگەدا."

به هەموومان به دەستەکەی خۆشمەوە (٣٠) پێشمەرگەم کۆکردەوە. به ڕێکەوتین بەرەو گەرمیان. چووینه ناوچەی (قەرە حەسەن) لە وێوە پەڕینەوە بۆ سنوری تیپی ٢١ی کەرکوك، چووینه گوندی (سورقاوشان) لە وێوە بروسکەیەکم بۆ کاك نەوشیروان کرد پێم وت:

" -ئێستا لە سورقاوشانین، چی بکەین.؟"

وتی:

" -هەوڵبدەن لە دواوە لەو هێزانە بدەن، بۆ ئەوەی جەبهەیەك دروست بکەن، تۆزێ فشار لە سەر سەرکردایەتی کەم بێتەوە."

بە کاك نەوشیروانم وت:

" -زۆر باشە."

منیش هەر چۆنێك سەیر دەکەم، به (٣٠) پێشمەرگەوە چی دەکرێت؟ هەندێك تۆپ بارانی دۆڵی دوکانمان کرد، بەڵام ئەو هێزەی حکومەتی عێراق، هی ئەوە نەبوو گوێ لەوە بگرن، چونکە هەر لە سلێمانیەوە هێزی حکومەت بوو هەتا ناو دوکان. به دەیان دەبابەو تۆپو راجیمە، ڕوی کردبووە سەرکردایەتی. ئاگر بارانی سەرگەڵوو بەرگەڵو و شاخەکانی دەکرد. شەڕەکە زۆر سەخت بوو، باسکردنی هەر بە دەم خۆشە. کاك نەوشیروان هەر دەیوت:

" -بەڵکو زوو لێیان بدەن."

ئەم دەتوانی پێی بڵێم جەبهەی چی دروست بکەین بە (٣٠) پێشمەرگەوە، چونکە حکومەت وەری دەگرت. لە بەر ئەوە هەر دەموت:

" -زۆر باشە."

دەمێ دەیوت:

" -بپەڕنەوە بۆ لای ئێمە."

زۆرم پێ خۆش بوو بپەڕمەوە، چونکە به (٣٠) پێشمەرگە، چی دەکرێت لەگەڵ ئەو هەموو هێزەی دوژمن؟ باش بوو (سەفینی مەلا قەرە) لە مەڵبەندی سێ وە دەوری (١٥٠) پێشمەرگەی لەگەڵ بوو. بووین بە هێزێکی باش(٥٠) پێشمەرگەی دەشتی کۆیەش هاتن لەگەڵ جێگر تیپەکەی، کە ناوی (ئەحمەد کوردە) بوو. هێزەکە بوو بە (٢٣٠) پێشمەرگە. بروسکەیان بۆ کردن، کە هەردووکیان لەگەڵ من بن، بەڵام شەڕەکە زۆر قورس بوو لە سەر سەرکردایەتی. کاك نەوشیروان بروسکەیەکی بۆ کردم وتی:

" -جارێ مەپەڕنەوە، بزانە چیتان بۆ ئەکرێ بیکەن لای خۆتانەوە."

ڕۆژێك بە سەفینم وت:

" -با بچین سەیرێکی دۆڵی دوکان بکەین، بزانین چیمان پێ ئەکرێت، تا بیکەین."

دوو قۆڵی بە ڕێکەوتین. دوو پێشمەرگەمان برد لەگەڵ خۆمان، سەرکەوتین بۆ سەر شاخی پشتی (تەلان) موسەیتەر بوو به سەر دۆڵی دوکانو قەشقۆڵی دا. وتم بزانین

جێگایەك نادۆزینەوە بۆ ئەوەی ئەمشەو بچینە سەری. سەر کەوتینە سەر شاخەکە بە دیوی (تەلان)دا. دانیشتین بە دووربین سەیری موعەسکەرەکانمان دەکرد، بزانین لە کوێوە مەجال دەبێت شەو لێی بدەین. بە بەردەوامیش هەلیکۆپتەر دەگەڕا بە سەرماندا، بەڵام ئێمەیان نەدەبینی. شەڕەکەش زۆر گەرم بوو. سوپای عێراقی لەم جەبهانەوە پەلاماری سەرکردایەتی دابوو، هەر لە سلێمانییەوە، بە تۆپو راجیمە سەرکردایەتی دەکوتا. جەبهەکە زۆر خراپ بوو. لە هەر چوار دەوری سەرکردایەتیەوە شەڕ بوو. لە جەبهەی ماوەت هەتا دۆڵی دوکانو لە دیوی مەرگەوەو دۆڵە رووتەوە، لە هەموو لایەکەوە هەر سوپای عێراقو گەلە جاش، بە تەکنەلۆژیای عەسکەرییەوە هەتا بە چەکی کیمیای هێرشیان بۆ سەر سەرکردایەتی دەکرد. ئێمەش هەر سەیرماندەکرد. هەر موعەسکەر بوو بە یەکەوە نوسا بوون. نەماندەتوانی جێگایەك دیاری بکەین، بڵێین شەو دەچینە ئەو جێگایە. لەوەدا بووین، سەفین وتی:

" –کاك ئاوات ئەوە جاشێکە، وا نزیك بۆتەوە لە خۆمان."

وتم:

" –کوا.؟"

سەیرمکرد، لێمان نزیك بۆتەوە. سەرکەوتبوو لە تەلانەوە بۆ سەر شاخ. سەفین وتی:

" –با بی کوژم."

وتم:

سەفین هەستە با راکەین. بە خوا تەنها ئەو جاشە نیە، زۆرن. با بە بێ دەنگ رابکەین دەرچین. ئەگینا دەرناچین."

ئەو دەیوت:

" –هەر ئەو جاشەیە."

من دڵنیابووم، کە جاشێ بە تەنها ناوێری بێ بۆ سەر ئەو شاخە. بە قسەی کردم، هەستاین رامانکرد. یەك هەنگاو دوور نەکەوتینەوە، کاتێکمانزانی لە هەموو لایەکەوە، سەرکەوتبوون بۆ سەر شاخو لە هەموو لایەکەوە تەقەیان لێ کردین. بە حاڵێکی زۆر خراپ دەرچووین، دوور کەوتینەوە. شوێنەکە نەدیوی بوو، سەرەو خواربوو، گوللە نەیدەگرتەوە. ئەگینا هەر دەر نەدەچووین. هەر چوارکەسیش بووین. پێشمەرگەکان زۆر دوور بوون، لە گوندی سورقاوشان بوون. هەر پێنج دەقەی تر رامان نەکردایە، بە دەست دەیانگرتین. یان سەفین تەقەی بکردایە، دەر نەدەچووین. ئێمە نەمانزانی بوو، لە هەموو لایەکەوە سەر کەوتبوون بۆ سەر شاخ. دوایی سەفین وتی:

" –باشە تۆ چۆنت زانی بۆمان سەر کەوتبوون بۆ سەر شاخ.؟"

وتم:

" –خۆم ئەمزانی جاشێك ناوێرێت بە تەنیا ئەوەندە دوور بکەوێتەوە."

گەڕاینەوە بۆ سورقاوشان بۆ لای پێشمەرگەکان. عەدەد جیهازەکە وتی:

" –کاك ئاوات ئەم بروسکەیەت لە کاك نەوشیروانەوە بۆ هاتووە."
خویندمەوە، دەڵێت:
" –بپەڕنەوە بۆ سەرکردایەتی."
بە ڕێکەوتین بەرەو سەرکردایەتی. عەدنانی حەمەی مینام بە جێهێشت بە خۆیو هاوەنو راجیمەکەیەوە، پێم وت:
" –جارێ هەر لەم ناوەبن، هەتا جوابتان لێ ئەگێڕمەوە."
لە سورقاوشانەوە خۆمان بە ڕێکەوتین بەرەو گوندی گەورە دێ. هەموو گوندەکان چۆڵ بوون. چووینە گوندی (قازان) لە وێوە لە چەرمەگاوە پەڕینەوە بەرەو گوندی زێویێ لە پیرەمەگروون. دۆڵی سورداش هەمووی موعەسکەرات بوو. خۆمانکرد بە بەینی دوو موعەسکەردا، بە بەردەوامیش قافڵە بە جادەدا هاتوچۆی دەکرد وەك ڕۆژ. بە هەر حاڵێك بوو پەڕینەوە بۆ گوندی (زێویێ)، کە چووینە مزگەوتەکە، سەیرمانکرد پێشمەرگەی لێ بوو. پێشمەرگەکان دەیان ناسیم وتیان:
" –کاك ئاوات کاك حەمە عەلی لێرەیە."
کە چووم، حەمە عەلی لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵ خۆی بوون، لە خانویەکدا بوون. زۆر پێشمەرگەی قارەمان بوون. مژدەو ئاسۆی برای، لەگەڵ چوار پێنج پێشمەرگەی خزمی خۆی بوون. لەگەڵ سەفین چووینە لای حەمە عەلی عوسمانی مەلا ناسراو بە ( حەمە عەلی بەر خانەقا). پێشمەرگەکانمان لە مقەڕ لای پێشمەرگەکانیان لە مزگەوتەکە نوستن. گوندەکە چۆڵبوو. زۆری ماڵەکان بە تۆپ باران روخابوو. شەو و ڕۆژ بە تەیارەو تۆپ لێی دەدا. هەر زوو ناوچەکە چۆڵیانکردبوو، رویان کردبووە ئێران. هەر، کە زانیبویان حکومەت نەخشەی داناوە، هەر دەبێت بیگرێت، بە خەڵکیان وتبوو چۆڵی بکەن. خەڵك ئازاد بوو بەرەو کوێ دەڕۆن. خەڵکی دۆڵی جافایەتی هەموو بەرەو ئێران چوو بوون. بە هەر حاڵ ئەو شەوە لای حەمە عەلی عوسمانی مەلا (حەمە عەلی بەرخانەقا ) و ڕۆستەمی حاجی ئیبراهیم ماینەوە، هەتا بەیانی. ئەو کاتە ڕۆستەمی حاجی ئیبراهیم سەر تیپی ئەو تیپەی خۆیان بوو، کە لەگەڵ دارای برای هاتبوونە دەرەوە. حەمە عەلی جێگری بوو. حەمە عەلی وتی:
" –کاك ئاوات ڕێگا نەماوە. چۆن ئەڕۆن بۆ سەرکردایەتی.؟"
وتم:
" –هەر ئەبێ بڕۆین، چونکە سەرکردلیەتی بروسکەیان بۆ کردوم، کە بڕۆین.".
وتی:
" –مژدەی برام لە وێیە، ئیمڕۆ دێتەوە. با بزانین لە کوێوە ڕێگا هەیە بڕۆن."
هەر دەبوو شەو بڕۆین. ئەو ڕۆژە هەتا دوای نیوەڕۆ لە وێ بووین. مژدە هاتەوە وتی:
" –کاك ئاوات بۆ کوێ ئەچن.؟"
وتم:

" –بۆ سەرکردایەتی."

وتی:

" –بە خوا ڕێگا نەماوە چۆن ئەڕۆن.؟"

وتم:

" –چار نیە، ئەگەر بە باڵ ڕۆشتووین، هەر ئەبێت بڕۆین."

وتی:

" –ئەم دوای نیوەڕۆیە جەیش هاتە ناو ماڵەکانی گوندی قزلەر."

ئەو جێگایەی ئێمە لێوەی دەڕۆیشتین، قزلەر بوو. دەبوو بە پیرە مەگروندا بچووینایەتە خوارەوە بە گوندی قزلەر دا. بۆ نەگبەتی ئەو ساڵە بەفرێکی زۆر باریبوو، پیرەمەگرون پڕ ببوو لە بەفر. ڕێ نەبوو بڕۆین. دوای نیوەڕۆ بە ڕێکەوتین لە زێوە بۆ سەر پیرە مەگرون. زۆر ناخۆش بوو. مردنمان بە چاوی خۆمان بینی تا گەیشتینە سەرەوە. زۆری نەمابوو ڕۆژ ئاوابێ. سەر شاخ زۆر سارد بوو. بە پێشمەرگەکانم وت:

" –ئێوە مەیەنە سەرەوە، با نەتانبینن."

خۆم لەگەڵ مەسئولەکان چوومە سەرەوە بە دیوی قزلەردا، کە سەیرمانکرد جەیش لە ناو ماڵەکانی قزلەردا بوون. دەبابە لە ناو ماڵەکاندا دەسوڕایەوە. گوندەکە چۆڵ ببوو. هێشتا خانووەکان نەڕوخا بوون. شاخەکە بەفر گرتبووی، هیچ بەردو دار بە دەرەوە نەمابوو، بەفر دایپۆشیبوو، نەڕێگا دیاربوو، نە بەردەکان. زۆر سفت بوو. ئەو شاخە لە کاتی خۆشی دا ڕێگاکەی زۆر زەحمەت بوو، جا بەفریش گرتبووی، حکومەتیش لە خوارەوە گرتبووی. ئەوەندەش سارد بوو، وەختە بوو هەموو ڕەق دەبووینەوە. کەرتێکی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵانمان لەگەڵ بوو، مامۆستا عادل فەرماندەیان بوو. پێم وت:

" –کاک عادل ئێوە پێش بکەون، با هێزەکەی تر دوای ئێوە بکەوێت."

وتی:

" –بە خوا کاک ئاوات ئێمە شارەزا نین."

ئەوە ڕێگای شەوو ڕۆژیان بوو، هەر لە وێوە هاتو چۆیان دەکرد، کەچی ئەو شەوە وتی شارەزانین. پێم وت:

" –بابە من بۆ خۆم پێش ئەکەوم من شارەزام."

بە سەفینیشم وت:

" –ئێوە بە دوای ئێمەدا وەرن."

بە ئەحمەد کوردەشم وت:

" –کاک ئەحمەد ئێوەش دوای کاک سەفین بکەون."

بە کاک عادلیشم وت:

" –کاک عادل ئێوە لە دوای دواوە وەرن."

وتیان:

" –باشه."

ئەحمەد کوردە جێگری سەر تیپ بوو لە تیپی ٩٣ی کۆیە. تاریکی کردبوو، بە ڕێکەوتین. لە بەر ئەوەی شاخەکە بەفر بوو، دەتوت ڕۆژە. لە خوارەوە دیار بووین. هەر کەوتینە ڕێ بە دیوی قزلەردا، لە خوارەوە بە تۆپو دۆشکە دایانگرتینەوە. ئێمە گوێمان نەدایە، چونکە هەر دەبوایە بڕۆشتینایە. چووینە ناو قەدی شاخەکە، جێگایەکی لێ بوو تۆپ نەیدەگرتەوە. بە پێشمەرگەکانم وت:

" –لە وێ چاوەڕێ بکەن، بزانین هەموو هاتوون."

لە وێ وەستا بووین. سەفین، کە لە دوای منەوە بوو بە سەلامەتی گەیشتن، بەڵام لە دوای سەفینەوە کەس دیار نەبوو بێت. زۆر چاوەڕێمان کردن، هەر نەهاتن. زانیم، کە نەهاتوون. گەڕابونەوە بە دیوی زێوێ دا، نەیان وێرا بوو بێن، کە زانیبویان تەقەیان لە ئێمە کردووە، ئەوان نەهاتبوون. لەگەڵ سەفین دا هەر بە بناری پیرەمەگروندا، ڕومانکردە (مێرگە پان)، چونکە پشتی قزلەر جەیشی تیابوو. تەقەیان لێکردین. یەک پێشمەرگە لەگەڵ مندابوو بریندار بوو. باشبوو برینەکەی زۆر نەبوو. ڕۆشتین چووینە (چۆخماخ)، کە چووینە ئەوێ، بارەگای جەبهەی مەڵبەندی خۆمانی لێ بوو. دواتر من چوومە یاخسەمەر. ئەو کاتە دانای ئەحمەد مەجید لە (مقەڕی پەیوەندیەکان) لەگەڵ ئێرانیەکاندابوو. منو سەفین لە وێ نوستین، هەتا بەیانی. بەیانی بروسکەیەکم کرد بۆ سەرکردایەتی پێم وتن:

" –ئەوە گەیشتووین، لە یاخسەمەرین."

وتیان:

" –بەرەو بەرگەڵو وەرە."

چای بەیانیمان خواردەوە، بە ڕێکەوتین بەرەو بەرگەڵو. کە چووینە ئەوێ، کاک کۆسرەتو کاک ملازم عومەری لێ بوو. کاک نەوشیروان چووبوو بۆ ئێران. وتیان:

" –بەخێر بێن، ئەبێت هەر ئەمڕۆ بە ڕێکەون بەرەو (مەرگە)، چونکە لە ڕێوە هێزەکانی حکومەت زۆر هاتوونەتە پێشەوە. لەوانەیە پشتەوەمان لێ بگرن. ئەگەر بیگرن، زۆر خەتەر دەبێت، کەس دەرناچێت."

ئەو کاتە (عەلی بچکۆل) سەرپەرشتی ئەو جەبهەیەی دەکرد. بە ڕێکەوتین بەرەو مەرگە، بۆ لای کاک عەلی. بۆ ئێوارە چووینە نزیکی. بروسکەیەکم بۆ کرد وتم:

" –وا ئێمە هاتووین، هێزێکمان هێناوە. بچین بۆ کوێ.؟"

وتی:

" –تازە ئەم شەو لەوێ بمێننەوە هەتا بەیانی."

ئەو جێگایە پێشمەرگەی لێ بوو. لای ئەوان ماینەوە هەتا بەیانی. بۆ بەیانی ڕۆژ بۆوە حکومەت هێرشی بۆ شاخی پشتی (چاڵاوا) کرد بەرامبەری بەرگەڵو. هەر ئەو شوێنە

مابوو، ئەگەر ئەوێ بگیرایە، ئیتر هەر هەموو ئەو هێزانەمان ئابلۆقە ئەدران. بە کاك عەلی بچکۆلم وت:
" -کاك عەلی ئەو شاخە کێی لێ یە، ئەوە بە هەلیکۆپتەر هێزی بۆ دائەبەزێنێ.؟"
وتی:
" -کەسی لێ نیە. تۆ ئەو هێزەی لە گەڵتن، بیاننێرە بۆ پشتیانەوە. ئەو شاخە بگیرێت، بۆ شەڕەکە زۆر خەتەر ئەبێت."
شاخەکە ناوی شاخی (کرکر)ە. یەك زنجیرە چیابوو، هەر لە گوندی (سێ درە) وە دەست پێ دەکات، هەتا دێتەوە گەورە دێ. باشبوو ئەوە مابوو، لە دوای جەبهەکەوە بوو. بڕوا ناکەم شەڕی ئێران-عێراقیش وا بووبێت. لە هەر چوار دەورەوە بە چەکی جۆراو جۆر، قورس و بچوك لێی دەدایین، بە چەکی کیمیایشەوە. جگە لە ئاگرو دوکەڵ هیچی ترت نەدەبینی. کە بە جیهاز گوێم لە وەزعی جەبهەکان دەبوو، برادەران لە بەینی خۆیاندا، کە قسەیان دەکرد، ئەوەندە بە ورەیەکی بەرزەوە قسەیان دەکرد، نەتدەزانی لە شەڕدان. ئەو هێزەی ئەو سەردەمەی یەکێتی هەی بوو، بڕوا ناکەم لە هێچ شۆڕشێکی دونیادا هەبووبێت. بە هێزێکی وا بچوك و ئیمکانیاتی کەمەوە، بتوانن بچنەوە بە گژ ئەو هێزە زۆرەی ڕژێمی عێراقدا. بچنەوە بە گژ ترسناکترین چەك، کە چەکی کیمیایی بوو. ڕو بە ڕوی سوپایەك بوونەوە، کە تەمەنی سێ چارەکە سەدەو خاوەن ٨ ساڵ شەڕی عێراق-ئێران بوو. سەفینم نارد بۆ شاخی (کرکر) بۆ بەردەمی ئەو هێزەی عێراق، بۆ ئەوەی پشت لە سەرکردلیەتی نەگیرێ. سەفین ١٥٠ پێشمەرگەی لەگەڵ بوو. بۆ خۆشی زۆر پیاوێکی بە هیمەت بوو. زۆر ورەی بەرز بوو. ئەوەی لە دورەوە ئەو شەڕەی بدیبایە، یەکسەر ورەی دەڕوخا. پێشتر باسی ئەو دوو برادەرەم کرد لەگەڵمان بوون، هەردووکیان، کە چاویان بە شەڕ کەوت، ئێمەیان بە جێهێشت و گەڕانەوە. ناحەقیان نەبوو، زۆر شەڕێکی ترسناك بوو. ئەو ڕۆژە، دوای نیوەڕۆ بوو، کاك عەلی هات بۆ لای ئێمە لە گوندی (گۆمەزەڵ) وتی:
" -بروسکەم بۆ هاتووە، ئینسحاب ئەکەین."
کە گوێم لە وشەی ئینسحاب بوو، تەزوویەك بە دڵما هات. خەریکبوو دڵم بوەستێ. ئەو بڕیارە زۆر ستەم بوو بە لامەوە وتم:
" -هەر خۆمان، یان سەرکردلیەتی.؟"
وتی:
" -هەموو هێزەکە ناوچەکە چۆڵ ئەکەین."
وتم:
" -کەی.؟"
وتی:
" -هەر ئەم شەو."

وتم:
" -جا ئەو هێزانەی خوارەوە چۆن فریا ئەکەون.؟"
وتی:
" -ئەوان هەر لە بەیانیەوە دەستیان بە پاشەکشە کردووە."
بڕیار بوو هەموو لە قوڵەکانی ئێمەوە بێن. هەر ئەو ڕێگایە مابوو، ئەویش زۆر ناخۆش بوو. چاریش نەبوو. هەر ئەوێ مابوو نەگیرێ. ئاگاداری ئەو جەبهەیەی لای خۆمانمان کرد، کە بەرەو سنوری ئێران پاشەکشە بکەن. خۆشمان ئێوارە لە گۆمەزەڵەوە بە ڕێکەوتین، بەرەو (دۆڵی شێم حەمەد) ئەو ڕێگایە دۆڵی شێم حەمەدیان پێ دەوت. زۆر دوورو درێژ بوو. لە پشتی سەفرەو زەرونەوە لە بەینی ئاسۆس‌و سەفرەو زەرونەوە بوو. کەوتینە ڕێ، بەو ڕێگایەدا ڕۆشتین. زۆر ترسناك بوو. بە یەك ڕێچکەی باریکدا بەفرەکەیان شکاندبوو. لە پێش ئێمەوە خەڵکی ناوچەکەو پێشمەرگەو پاسدار لە وێوە ڕۆشتبوون. چیم بینی؟ نازانم باسی چی بکەم؟ دیمەنێکی مەرگ ئامێز. دیمەنێك لە فیلمی سینەماشدا نەبینرابوو. لە دورەوە سەیرت دەکرد، لە لایەك ئاژەڵ بە هەموو جۆرەکانیەوە مردبوون. تێکەڵ ببوون. بزن، مەڕ، مانگا، هێستر، ماین‌و ئەسپ. لە لایەکی ترەوە پاسداری ئێرانی‌و سەربازی عێراقی ڕەق ببوونەوە. تەرمی مرۆڤو ئاژەڵ لە ناو بەفرەکەدا، هەمووی تێکەڵ ببوو بە یەکدا. دیمەنێکی ترسناك بوو، نازانم چۆن باسی ئەو مەرگەساتە بکەم، کە ئەو ڕژێمە دڕندەیە بە سەر ئەو میللەتەی دا هێنا، کە ئەو دیمەنەم دەبینی، خەریکبوو تێك بچم. چۆن ئەو میللەتە تووشی ئەم نەهامەتیە بووە.؟ ئەم میللەتە چی بە سەر هات؟ تراژیدیایەك بوو، گێڕانەوەی هەر بە دەم ئاسانە. کارەساتی وا بە سەر هیچ میللەتێکی تردا نەهاتووە. بۆ نەگبەتیش، ئەو ساڵە زستان زۆر سەخت بوو. بەفرێکی زۆر باری بوو. مەگەر هاوین بەفری تەواو بوویێ ئەو دۆڵی شێم حەمەدە. شەو دەڕۆشتین سەیرمکرد لە ناو دۆڵەکەدا ئاگر دیار بوو، کە چووینە پێشەوە، پێشمەرگە کۆمەڵ کۆمەڵ ئاگریان نابوو بە بنچکەوە. ئەو ناوە تۆزێ ڕەش بوو بۆوە، بەفری لێ نەبوو. سەیرمکرد چادرێك هەڵدرابوو. لێی نزیك بووینەوە، گوێم لە دەنگی ملازم عومەر بوو پێدەکەنی. چووینە ژورەوە سەیردەکەین، هەموو برادەران لەوێن. کاك کۆسرەت‌و کاك قادری حاجی عەلی‌و ملازم عومەرو شێخ جەعفەر بوون، کە ئەو هەموو برادەرانەم لە وێ بینی، زۆرم پێ خۆش بوو. هەموو بە سەلامەتی دەرچوو بوون. چۆڵکردنی سەرکردایەتی شتێکی ناخۆش بوو، بەڵام دەسەڵات نەمابوو. هەر دەبوو چۆڵی بکەین. لە سەر بڕیاری (صدام حسین) بوو، کە ئەگەر هەموو جەیشی عێراقی لەناو چووە، هەر دەبێت ئەو ناوچانە بگرن. ئەو شەوە هەر بە قسەی خۆش ڕۆژمان کردەوە. خۆ هەر بە پێوە بووین، چونکە زەوی هەمووی قوڕو بەفر بوو. بۆ بەیانی بە ڕێکەوتینەوە بە دۆڵی شێم حەمەد بەرەو زەرون. بۆ سەر چەمی عیساوێ. ڕێگاکە زۆر دوورو درێژ بوو. هەر نەدەبڕایەوە. زۆر ماندو بووین. پێش ئەوەی بگەینە

عیساویّ، له زەرون چادریّ هەڵدرابوو له سەر ئەو ڕێگایەی، که ئێمەی پیا دەڕۆیشتین. که چووینه پێشەوە، شێخ محەمەد سەرگەڵوویی لیّ بوو. ئیتر زۆر خۆش بوو. لەویّ دانیشتین تۆزیّ ئیسراحەتمان کرد. نانو چامان خوارد، تۆزێك ماندومان حەسایەوە. دیاربوو شێخ محەمەد ئەو ماوەیە هەر له ویّ بوو، بۆ ئیشوکاری ئەو هێزانەی، که لەوێوە پاشەکشەیان دەکرد بەرەو ئێران. دوای نیوەڕۆ به ڕێکەوتین بەرەو دیوی (ئالانی) بەشی کوردستانی عێراق. جێبێکی ئێرانی هات به دوای کاك کۆسرەتو ملازم عومەرو قادری حاجی عەلی دا وتیان:

" -ئێمه له پێشەوە ئەڕۆین بۆ ئەوەی جێگای هێزەکه دیاری بکەین. هەموو لەویّ کۆببینەوە، بۆ ئەوەی هەر کەس به لایەکدا نەڕوات."

ئەوان ڕۆشتن. ئێمەش به پیّ ڕۆشتین، بۆ عەسر چووینه (شاناخسیّ) دێیەکی ڕوخاوی ئەو ناوچەیە بوو. ساڵی (۱۹۷۷) ڕژێمی عێراق هەمووی ڕاگوێز کردبوون. هەموو هێزەکه کۆبووینەوە، دەوری (چوار پێنج) هەزار پێشمەرگه دەبووین. له وێوە ئێمه به پەله سەیارەمان پەیداکرد بۆ هێزەکانی مەڵبەندی یەك، بۆ ئەوەی زۆر نەمێننەوە له ویّ، چونکه دەمانزانی ئەگەر حکومەتی عێراق بزانێت پاشەکشەمان کردووە، له وێوە به تەیارە لێمان دەدات. وتمان با هەر هیچ نەبێت تۆزێك هێزەکه بڵاوە پیّ بکەین، له جێگایەك کۆ نەبینەوە. بۆ ئێوارە به ڕێکەوتین. منو قادری حاجی عەلیو شێخ جەعفەر شەو چووینه مزگەوتەکەی (سەردەشت) هەموو ئەو شەوە هەتا بەیانی له مزگەوتەکەدا بووین. بەیانی کاك قادر پێی وتم:

" -کاك ئاوات تۆ بچۆ بۆ لای کاك نەوشیروان پێی بڵیّ ئێمه ئەڕۆینەوە بۆ سنوری خۆمان بۆ مەڵبەندی یەك."

ئەو کاتە کاك نەوشیروان له سەقز بوو. منیش ڕۆشتم بۆ سەقز، له ویّ کاك نەوشیروانم بینی پێم وت:

" -ئێمه هێزەکەی خۆمان چووینەته قاسمه ڕەشو شێنیّو زەڵیّ. له وێوە ئەڕۆینەوە. تۆ ڕێنمایت چییه بۆمان.؟"

وتی:

" -زوو بگەڕێنەوە. به تەئکیدی حکومەت پەلاماری هەموو مەڵبەندەکان ئەدات. لەوەو پێش، هەر به سەرکردایەتیەوە سەرقاڵ بوو. ئێستا دەستی بەتاڵبووە بۆ مەڵبەندەکان."

واشبوو. هەر ئێمه هێزەکانمان بڵاوە پیّ کرد، دوای ئەوەی ڕۆشتین، (۱۲) تەیارە هاتبوونه سەر هێزەکه، دڕندانه به چەکی کیمیایی له هێزەکەی دابوو. له شاناخسیّ به دەیان پێشمەرگەی شەهیدو بریندار کرد. ئەو شەوەی من له سەقز بووم، وتیان:

" -ئێوارە تەیارە له هێزەکەی داوە به چەکی کیمیایی. شەهیدو برینداری زۆر هەیه. لەو شەهیدانه ناوی دوانیانم له بیر ماوە، یەکێکیان (حەمه ئەمینی خەجیّ)

فەرماندەی کەرت بوو. پێشمەرگەیەکی دێرین بوو. پێش ئەوەی ببێ بە پێشمەرگە، لە ناو شاری پێنجوێن دا رێکخستنی کۆمەڵە بوو. ئەوی تریان (مامۆستا رەئوف) ئەویش لێپرسراوی کاروباری کۆمەڵایەتی بوو، لە سنوری تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون. زۆر کورێکی چاك بوو. بە داخەوە ناوی ئەوانی ترم لە یاد نەماوە. کارەساتەکە زۆر ناخۆش بوو. بۆ بەیانی زوو، لە سەقزەوە گەڕامەوە بۆ سەردەشت. وتیان:

" -کاك قادرو کاك کۆسرەتو شێخ جەعفەر هێزەکەیان بە رێکردۆتەوە بۆ تۆکانو شێنێو ئەو ناوە. خۆشیان وتوویانە با بێتەوە بۆ قاسمە رەش لە وێ چاوەڕێی ئەکەین."

ئەو کاتە مقەڕێکی خۆمان لە قاسمە رەش بوو (مامۆستا نازم) لە وێ بوو. کە گەیشتمە ئەوێ، کاك قادرو کاك کۆسرەت لەگەڵ شێخ جەعفەر لەوێ بوون. وتیان:

" -هەموو هێزەکانمان بە رێکردووە بەرەو مەڵبەندی سێ لە بناری قەندیل."

ئەو شەوە لەوێ بووین. ئینجا حکومەتی عێراقی ئیعلانی کرد، کە سەرکردلیەتی گرتووە. ناوی لێنا (ئەنفالی یەك) لە دوای سێ رۆژ هاتبۆوە بارەگاکانی سەرکردلیەتی. بۆ شەوەکەی گوێمان لێ بوو، رادیۆ ئیعلانی کرد، کە سەرکردایەتی گرتووەو چونەتە سەرگەڵوو بەرگەڵوو یاخسەمەر. لە یاخسەمەر مقەڕی مام جەلالیان گرتووە. گوایە مەسئولی مقەڕی مام جەلالیان گرتووە. ئەو کاتە مەسئولی مەکتەبی عەسکەری ملازم عومەربوو. عوسمانە شێت هەبوو، خەڵکی مالومە بوو. دایم دەیوت:

" -من مەسئولی مەکتەبی عەسکەریم."

کاتێك ئینسحاب کرابوو، لەو ناوچانە، زۆر هەوڵیان دابوو لەگەڵیدا، کە بێت، نەچوو بوو. هەر خۆی لە یاخسەمەر مابۆوە لە مقەڕەکانی مام جەلال. کە جەیشەکە هاتبوون، پێیان وتبوو:

" -تۆ چیت.؟"

وتبووی:

" -من مەسئولی عەسکەری مقەڕی مام جەلالم."

ئەوانیش زۆر بێ شەرمانە، وەك مەسئولی مەکتەبی عەسکەری لە قەڵەمیان دابوو. ئیعلانی گرتنیان کرد بوو. بۆ شەوی دوایی منو کاك قادرو کاك کۆسرەتو شێخ جەعفەرو ملازم عومەر، چوار قۆڵی بە رێکەوتین بەرەو (قەلاتوکان) لە بناری قەندیل. بۆ بەیانی گەیشتین، چووینە مقەڕی گومرگی ئەوێ. هەمووی سەر بە مەڵبەندی سێ بوو. نانو چای بەیانیمان لە قەلاتوکان خوارد. دوایی بە رێکەوتین چووینە (پشت ئاشان) لەوێش مقەڕی خۆمانی لێ بوو. زۆر خزمەتیان کردین. ئەو شەوە لەوێ بووین. دەوری (٢٠) پێشمەرگەش لەگەڵ کاك کۆسرەتو کاك عومەر بوون. ئێمە کەسمان لەگەڵ نەبوو هەر خۆمان بووین. بۆ بەیانی ماینەوە هەتا نیوەڕۆ. جوابمان نارد بۆ حزبی دیموکرات بۆ ئەوەی سەردانی برادەرانی ئەوێ بکەین. وتمان ئەچین

سەردانێکیان ئەکەین، چونکە لە سەر ڕێگاکەمان بوون. دکتۆر قاسم لۆ لە وێ بوو. ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵمان بوون، لە وێ بە جێمان هێشتن. خۆمان چوار قۆڵی چووین بۆ لای ئەوان. دوو شەو ماینەوە، زۆر خزمەتیان کردین. ئەو دوو شەوە زۆر خۆش بوو. بۆ دووەم ڕۆژ وتمان:

" –ئەڕۆین."

وتیان:

" –ئەگەر ئەتوانن پێشمەرگەکان بە ڕێکەن، خۆتان دوای نیوەڕۆ بە ئوتومبیل ئەتان پەڕێنینەوە ئەو بەری (وەرتێ) لە جادەی دۆڵی خانەقا."

هەر لە جادە بەو بەرەوە، پێشمەرگەی خۆمانی لێ بوو. جادەکەش بە دەست حکومەتەوە بوو. جێگایەك نەبوو رەبایەی لێ نەبێت. هەر چوارمان سواری دوو لاندگرۆزەر بووین. سێ پێشمەرگەمان لەگەڵ بوو، لەگەڵ جیهازێکی گەورە بۆ پەیوەندی کردن. ئەو ئێوارەیە ئەم سەرو ئەو سەری دۆڵی خانەقامانکرد بە سەیارە. یەك جێگای لێ نەبوو دابەزین بپەڕینەوە. ناچار گەڕاینەوە ئەو جێگایەی، کە پێشمەرگەکانی خۆمانی لێ بوو. هەر لە بناری قەندیل بووین. حکومەت پەلاماری مەڵبەندی یەکی دا. دەمانزانی دەیگرێت، چونکە هێزی پێشمەرگەی لێ نەبوو. زۆر ناخۆش بوو. هەر لەو دێیە بووین، جیهازەکەمان دانا پەیوەندیمان لەگەڵ کاك عومەر فتاح کرد بۆ دەنگو باس. دیار بوو بارو دۆخی ناوچەی قەرەداغ خراپ بوو. زۆری گیرا بوو. هەر لەوێوە من بە کاك عومەرم وت:

" –بەڵکو ئەو ماڵو منداڵانەمان بۆ دەربکەن، بۆ ئەوەی نەکەونە تۆڕی ئەنفالچییەکانەوە. کاك عومەر وتی:

" –خەمتان نەبێت، لێرە نەماون."

ئەو گوندەی لێی بووین، نازانم ناوی چی بوو؟ ئەوەندە دەزانم لە دۆڵی خانەقا بوو لە بەری قەندیل. بۆ شەوەکەی بە پێ پەڕینەوە بۆ (وەرتێ) گوندێکی زۆر گەورەو زۆر خۆش بوو. مەقەڕی تیابوو. شەوەکەی گەیشتینە ئەوێ. ئەو شەوە لە وێ بووین، هەتا بەیانی. لە وێ چای بەیانیمان خوارد. پاشان منو کاك قادرو شێخ جەعفەر، سێ قۆڵی بە ڕێکەوتین. کاك کۆسرەتو کاك عومەر لە وێ مانەوە. زۆریان پێ وتین:

" –ئەمڕۆ بمێننەوە پشو بدەن، سبەینێ بڕۆن."

بەڵام ئێمە زۆرمان پەلەبوو، چونکە مەڵبەند زۆر چۆڵ بوو. حکومەتیش پەلاماری دابوو، دەمانزانی بارودۆخ لای خۆمان زۆر خراپە. بە سێ قۆڵی بە ڕێکەوتین. یەك نەفەرمان لەگەڵ نەبوو. هێزەکانی خۆمان زۆری بە ڕێوە بوون، بەرەو مەڵبەندی خۆمان. ئەوانیش هەندێکیان بە جێ مابوون. هەندێکیان زۆریان پەلەبوو بگەڕێنەوە لای خۆمان. بە تایبەتی ئەوانەی گەرمیان، چونکە هەموو ماڵەکانیان لە گوندەکانی گەرمیان بوون. زۆر دەمێك بوو لە شەڕەکانی سەرکردایتی بوون. ئێمەش بۆ خۆمان

زۆرمان پەلەبوو. هێزەکەمان بە جێ هێشتبوو، هەر رامان دەکرد. ئەو رۆژە لە وەرتێ وە، بۆ ئێوارە گەیشتینە خەتێ لە دۆڵی بالیسان. شەهید حەسەن کوێستانی لە مقەڕی مەڵبەندبوو. خەتێ زۆر دوور و ناخۆشە. هەر لە وەرتێ دەرچووین، بە شاخا سەر دەکەوتین هەتا خەتێ. شاخی (هەورێ) زۆر سەختە. هەمووشی بەفر بوو. زۆر ماندوی کردین. کە چووینە لای کاك حەسەن کوێستانی، زۆر ماندو بووین. لە وێ ماینەوە. بۆ بەیانی بە رێکەوتین بەرەو دەشتی هەولێر. کاك حەسەن زۆری پێ گوتین:

" -دووسێ شەو بمێننەوە ئیسراحەت بکەن."

لەوێش نەماینەوە. بەرەو دەشتی هەولێر بە رێکەوتین. ئەو رۆژە هەمووی بە رێوە بووین هەتا ئێوارە. بۆ شەوەکەشی هەر بە رێوە بووین هەتا بەیانی. بۆ بەیانی، چووینە دەشتی کۆیە. لە وێشەوە بە رێکەوتینەوە بۆ بەری گۆپتەپە. گۆپتەپە گوندێکی گەورە بوو، لە سەر ئاوی (زێ) لە بەری ئاخجەلەر. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٥ دوای ئەوەی، کە شەڕ دەستی پێ کردەوە، لە نێوان پێشمەرگەو حکومەتی عێراقدا. دوای سەرنەکەوتنی گفتوگۆی نێوانیان، بۆ یەکەم جار سوپای عێراقی، بە هێزێکی زۆر گەورەوە پەلاماری ئەو گوندەی دا. شەڕێکی تیا بەرپا کرد. ئەو کاتە نەبەز سەرتیپی تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان بوو. فەرماندەیەکی زۆر ئازاو قارەمان بوو. یەکێك بوو لە پێشمەرگەکانی سەرەتای شۆڕشی ئەمجارەمان. زۆر شەڕێکی قورس لە گوندەکەدا بەرپابوو. گوندەکەیان روخاند. تەنیا پێشمەرگەیەك شەهیدبوو بە ناوی حاکم کەمال. ئیش و کاری کۆمەڵایەتی دەکرد. زۆر پیاوێکی باش بوو. هەر لەو شەڕەدا، مام رۆستەمیش بریندار بوو. دوای ئەوە، جارێکی تر گوندەکەیان لە سەر ئاوەکە دروست کردبۆوە. هەر کۆمەڵە ماڵێك لە جێگایەك خانوویان دروست کردبۆوە. شوێنەکەیان زۆر خۆش بوو. لە وێ چووینە ماڵی برادەرێکی خۆمان. پێشمەرگەبوو بە ناوی حەسۆ، فەرماندەی کەرت بوو. نیوەڕۆ گەیشتینە لای ئەوان. لەوێ دانیشتین (رادیۆی عێراق) ئەنفالی دووی خوێندەوە. رایگەیاند، کە بارەگاکانی مەڵبەندی یەکی گرتووە. مقەڕی مەڵبەند لە ناو قۆپیەکاندابوو. مقەڕەکەی من لە گوندی (گۆشان) بوو. ناوی هەموو ئەو شوێنانەی خوێندەوە، کە گیراون. بۆمان دەرکەوت، کە مقەڕاتی خۆمان نەماوە، هەمووی گیراوە. هیچ پەیوەندییەکمان نەما بە کاك عومەرەوە، جیهازەکەیان داخستبوو. لەگەڵ کاك نەوشیروان پەیوەندیمان کرد بۆ دەنگو باس. ئەو وتی:

" -لە جێگاکەی خۆی نەماوە، بەرەو جێگایەکی تر رۆشتون."

ئیتر زانیمان مقەڕاتی مەڵبەند هەمووی بەرەوگەرمیان چوون. بە راستی رۆژێکی ناخۆش بوو، نەمان دەزانی چی رویداوەو چی بووە؟ نەئاگامان لە وەزعی پێشمەرگەبوو. نەئاگامان لە ماڵو منداڵ بوو، چونکە ماڵو منداڵیش هەر لەگەڵ خۆمان بوون. لە مقەڕەکان بوون وەك پێشمەرگە. لە وێوە بە رێکەوتین بەرەو سەر جادەی کەرکوك-سلێمانی. ویستمان بپەڕینەوە نەماندەزانی لە کوێوە بپەڕینەوە، چونکە

عەسکەری لەو جادەیەوە بە شەوو رۆژ هاتو چۆی دەکرد. جیاوازی نێوان شەوو رۆژ نەمابوو. لە رێگای پەڕینەوەماندا لە جێگایەکەوە دەمانویست بپەڕینەوە. پێش ماوەیەك خۆم لە وێوە پەڕیبوومەوە لە (بانی مقان)ەوە چوار پێنج پێشمەرگەمان لەگەڵ بوو. لە جادەکەوە نزیك بووینەوە. کاتێکمانزانی وەك بارانی بەهار گوللە بە سەرماندا باری هەر نازانم چۆن نەکوژراین. من پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو ناوی (سەلاح) بوو ناسراو بە سەلاحە بچکۆل. هەر بە پێوە وەستابوو، لە پەنای عامودێك دا، رەنگە (٥٠) فیشەکێ بەر عەمودەکە کەوتبێ. لێی تورە بووم وتم:

" —ئەوە شێت بوویت، بۆ خۆت بە کوشت ئەدەیت هەر هیچ نەبێت خۆت دانەوێنە."

هەر بە رێکەوت بەر نەکەوت. دیسان گەڕاینەوە بەرەو دواوە. ئەو گوندانەش هەموو چۆڵیان کردبوو. ئەوەندەش هیلاك بووبووین، لە پەلو پۆ کەوتبووین. یەك هەفتە بوو بە شەوو بە رۆژ بەردەوام بە رێوە بووین. دیسانەوە گەڕاینەوە بۆ دواوە، چونکە نەماندەزانی کوێ رەبایەی تیانیە. ئەمبەرو ئەو بەری جادەی کەرکوك—سلێمانی هەمووی رەبایە بوو. دەبوایە لە جادەش دورکەوتینایەتەوە. لە بەر ئەوەی بە رۆژ خەتەر بوو. بە بەردەوامی هەلیکۆپتەر بە ئاسمانەوە بوو. لە رێگا زۆر ماندو بووم. لە گیانی خۆم بێزار بووم، واملێهاتبوو، حەزم دەکرد بکوژرێمو رزگارم بێت لەو ژیانە. لە رێگا چووینە گوندێك روخابوو. من لە دواوە بووم. زۆر ماندو بووم. خۆمدا بە زەویدا. بە بێ ئەوەی کەس ئاگای لێ بێت، خەوم لێ کەوت. بەیانی خەبەرم بۆوە، کەس دیار نەمابوو. گوندەکەش تازە روخابوو. حکومەت روخاندبووی. نەمدەزانی بۆ کوێ بچم، چونکە من شارەزای ئەو ناوە نەبووم. هەر لە خۆمەوە رێگایەکم گرتەبەر. بەو رێگایەدا رۆیشتم، گەیشتمە گوندێك، سەیرمکرد گوندەکە زۆر خۆشو ئاوەدان بوو. تەماشام کرد برادەرانی لێ یە. کاك قادرو ئەوانی تر وتیان:

" —ئەوە تۆ چیت لێهات.؟"

وتم:

" —خۆم لە ناو ئەو گوندە روخاوەدا دابوو بە زەویدا، خەوم لێ کەوتبوو."

خەڵکی گوندەکە وتیان:

" —بە راستتە."

وتم:

" —بەڵێ لەوێ بووم."

وتیان:

" —بە خوا بەختت هەبوو، ئەگینا هەموو بەیانیەك، کە هەلیکۆپتەرەکان دێن لێرەوە ئەبێ ئینزالێك لە گوندەکەدا بکەن. ئەوجا ئەڕۆنەوە. چۆن ئەم بەیانیە نەهاتوون."

هەلیکۆپتەرەکان هاتن، بە سەر گوندەکەدا نەهاتن. لە دووری گوندەکەوە رۆشتن. دیار بوو بەختی من بوو، ئەگینا دەگیرام. ئەو رۆژە لە گوندەکەدا ماینەوە هەتا دوای

نیوەڕۆ. دواتر بە ڕێکەوتین بەرەو سەر جادەی کەرکوک–سلێمانی. ئەم جارە چووینەوە نزیك (قەرە هەنجیر) پەڕینەوە لەکاتی پەڕینەوەماندا هەندێك هێزی تر پەڕینەوە، ئەوان بە پێچەوانەی ڕوی ئێمەوە پەڕینەوە. ئەوان بەرەو تیپی ۲۱ پەڕینەوە. نەمانزانی پێشمەرگەی چ لایەنێ بوون. دوور بوون لە ئێمەوە. شەویش بوو. ئەو شەوە چووینە گوندی (خاڵە بازیانی) گوندی خاڵە بازیانی، چوار سەد ماڵ بوون. گوندەکەیان روخاندبوو. هەر جەماعەتێ چووبوونە ناو باخو باخاتێکەوە خانوویان دروست کردبوو. گوندێکی زۆرخۆش بوو. ڕژێمی بەعس هەمووی سوتاند بوو. ئەو شەوە، چووینە ماڵی (وەستا رەحیم) زۆر ماڵێکی باش بوون. من هەر، کە دەچووم بۆ جەولە لەگەڵ هێمنی سەر تیپی ٥٩ی حەمرین. دەچوومە ماڵی ئەوان. ماڵەکەیان وەك مقەڕ وابوو، بەردەوام پڕ بوو لە پێشمەرگە. دووسێ برابوون. زۆر خزمەتی پێشمەرگەیان دەکرد. گوندی خاڵە بازیانی زۆر دڵسۆزی شۆڕش بوون. خۆیان بە چەکی خۆیانەوە چوار سەد هێزی بەرگریان هەبوو، کە دەچووینە ئەوێ، ئیتر پێویستیمان بە پێشمەرگە نەبوو. هەموشی وەك پێشمەرگە ڕێکخرابوون. مەفرەزەو کەرتیان هەبوو. مەسئولی خۆیان هەبوو، سەرپەرشتی دەکردن. هەموو گوندەکان لەوێ هێزی بەرگری خۆیان هەبوو. ئەو کاتانەی، کە هێزی پێشمەرگە لەوێ نەدەبوو، ئەوان جێگای پێشمەرگەیان دەگرتەوە. وەك ئەوان ڕێکو پێك بوون. لە کاتی شەڕدا زۆر قارەمان بوون. ئەو شەوە لەوێ بووین، بۆ بەیانی بە تراکتۆر بە ڕێکەوتین، بۆ ئێوارە چووینە (گۆل باخی سەرو) مقەڕی تیپی ٥٩ی حەمرینی لێ بوو. کە چووینە ئەوێ لامان نەدا بۆ مقەڕ، وتیان کاك عومەر فەتاح لە (مەسۆی بەرگەچ)ە. بە ڕێکەوتین بۆ لای کاك عومەر، چووینە (مەسۆیی) عومەر فەتاح لەوێ مقەڕی دانابوو. گوندەکە چۆڵ کرا بوو، خەڵکی لێ نەمابوو. هەمووی ڕۆیشتبوون. هەر پێشمەرگەی تیا مابوو. کە چووینەوە، خەڵکی ناوچەی گەرمیان، زانیان هێزەکانی مەڵبەند هەمووی گەڕاونەتەوە. زۆر خۆشحاڵ بوون. هێزی پێشمەرگەی لێ نەمابوو. هەمووی لە شەڕەکانی سەرکردایەتی بوون. ئەو شەوە لە وێ ماینەوە. عومەر فەتاح هێرشەکانی ڕژێمی بۆ ناوچەکانی قەرداغ بۆ باسکردین، کوێ گیراوەو کوێش بە دەست خۆمانەوەیە. هەموو ناوچەی قەرەداغ گیرابوو هەتا ناو قۆپی قەرەداغ، کە مقەڕی مەڵبەندی لێ بوو. هەمووی بە دەست حکومەتەوە بوو. بناری سەنگاو هەتا (رەبات)و شاخی (ئاژداخ) گیرابوو، بە دەست حکومەتەوە بوو. هەر لەوێ بیستیشم، کە ( ئەوڕەحمانە سور) شەهید بووە، ئەو رەحمانە سور فەرماندەی کەرت بوو، خەڵکی گوندی مۆریاس بوو، هەر لە کاتی جەلالیەوە ئەمناسی. بۆ بەیانی لەگەڵ قادری حاجی عەلی و عومەر فەتاحو شێخ جەعفەر کۆبوونەوەیەکمان کرد، کە چی بکەین. ئەو کاتە هەموو هێزەکەی خۆمان نەگەیشتبوونەوە جێگاکانی خۆیان. بڕیارماندا چاوەڕوان بکەین، هەتا هەموو تیپەکان دەگەڕێنەوە جێگاکانی خۆیان، چوار پێنج ڕۆژ پشوو بدەنو سەر لە

ماڵو منداڵیان بدەن، ئەوجا کۆیان بکەینەوە پەلاماری ئەو جێگایانە بدەینەوە، کە گیراون. وتمان قۆناغی یەك بناری سەنگاوو شاخی ئاژداخ دەگرینەوە. دوای ئەوە، دەچینەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ. وامان دانابوو، دوای یەك هەفتە ئەوە بکەین. دەشمان توانی، چونکە پێشمەرگەی مەڵبەندی یەك زۆر ئازاو قارەمان بوون. سنوری خۆشیان بوو. وتیان:

" -کاك ئاوات تۆ هەر لە ئیمڕۆوە بچۆ بۆ لای تیپەکانی خۆت."

شێخ جەعفەرو عومەر فەتاح وتیان:

" -ئێمەش ئەچین بۆ (ئاوایی شێخ حسین) دووسێ ڕۆژ پشوو دەدەین، هەتا هێزەکان کۆ ئەبنەوە. تۆش بچۆ بۆ مقەڕی تیپی ٥٩ لە (گۆل باخ)."

هێشتا تیپەکان نەگەیشتبوونەوە ناوچەکە. تیپی ٥٧ی سەگرمە هەموو گەیشتبوونەوە. لە جەبهەی (دێرەشە)و (مەملەحە) دامانئابوون، چونکە لە سەنگاوەوە جادەی قیربوو بۆ (قادر کەرەم) ئەوانمان دانابوو ئاگایان لەو ناوە بێ، هەتا ئاگاداریان دەکەینەوە. ئەو کاتە هیوا باڕۆیی سەرپەرشتی ئەو تیپەی دەکرد. پێمان وتبوو زۆر ئاگاداری ئەو جەبهەیە بێ. ئەو جەبهەیەی ئەوان زۆر حەساس بوو. ڕێگای سەنگاوو قادر کەرەمی بە یەکەوە دەبەستەوە. هەموو گوندەکانی دێرەشەو مەملەحەو خوێڵێنو قەیتول، هەمووی دێهات بوو. هەر لە وێشەوە دەهاتە سەر گۆل باخ، کە مقەڕی تیپی ٥٩ی حەمرینی لێ بوو. زۆر پشت ئەستور بووین بەو جەبهەیە، چونکە تیپی ٥٧ زۆر تیپێکی باش بوون. وتم:

" -باشە منیش ئەچم بۆ مقەڕی گۆل باخ."

ئەو کاتە برادەرێك هەبوو ناوی (حاجی حەبیب) بوو. زۆر پیاوێکی دڵسۆز بوو، کە بە ڕێکەوتم، وتیان:

" -کاك ئاوات پێشمەرگەکانی خۆشت لەوێن. هیوای کوڕیشت لەگەڵ ئەوانە."

کاك حەمە جەزای برای کاك قادری حاجی عەلیو براکانی تریو براکانی منو کۆمەڵێ پێشمەرگەی موتەفەریقە، هەموو لە وێ کۆبووبوونەوە. هەر، کە وتیان کاك ئاوات هیوای کوڕتو مەفرەزەکەی خۆشت لە وێن، کاك قادر سەیری منی کرد وتی:

" -هیوای کوڕی لەوێیە.؟"

وتیان:

" -ئەویش هەر لەوێیە."

وتیان:

" -کورە هیوامان هەر بە زۆر هێناوە، نەئەهات. سەیارەکەی بە جێ نەئەهێشت، بە زۆر لێمان سەندو سوتاندمان. یەك بار چەکی مقەڕی پێ یە، لە قەرەداغەوە هێناویەتی بە جێی نەهێشتووە. وتی هەتا باوکم نەیەتەوە، فرێی نادەم. زۆر ئازلیە. گوێ بە هیچ نادات. هەر وا ئەزانێت هیچ نەبووە."

کاك قادرو شێخ جەعفەر، ئەو هەواڵەیان زۆر پێ خۆش بوو. وتیان:

" -بە خوا ئێمە لە مەڵبەندی سێ وە خەفەت ئەخۆین. پێیان وتین هیوای کوڕی کاك ئاوات کیمیایی لێی داوە."

کاك قادر دەیوت:

" -کە تۆم ئەبینی، ئەم ئەزانی چۆن سەیری دەمو چاوت بکەم. ئەموت ئەو بۆ خۆی ئاگای لە هیچ نیەو نازانێ کوڕەکەی کیمیایی لێی داوە."

وتم:

" -ئەوە بە راستانە، ئەم هەواڵەتان بیستبوو.؟"

وتیان:

" -مەڵبەندی سێ پێیان وتین با کاك ئاوات خۆی نەزانێت."

تومەس ماڵی ئێمە درەنگ رۆشتبوون. ماڵمان لە گۆشان بوو بەرامبەر ناحیەی قەرەداغ. زۆر نزیك بوو لە ناو ناحیەکەوە. بە سەیارە دە دەقیقە دەبوو. ئاخر رۆژ هەموو ناوچەکە گیرابوو، ئەوجا هیوا بە سەیارەکەی خۆم دەری کردبوون، بەرەو گوندی (دۆڵان) لەگەڵ ماڵو منداڵی کاك جەمیل هەورامیو کاك قادری حاجی عەلیو حەمە جەزای حاجی عەلی. لە تانجەرۆ کەوتبوونە ناو حکومەتەوە، برادەرێکی خۆم فریایان کەوتبوو. ئەو بە ناو لەگەڵ حکومەتدابوو. زۆر کوڕێکی چاکبوو. هەر وەرەقەی خۆشمانی پێ بوو. ناوی (حاجی فایەق) زرگوێزی بوو. دەزانم، ئەو نەبوایە، ئەوانیش وەك ئەو هەموو خەڵکەی تر، ئەنفال دەکران. ئەو پیاوانە فریایان کەوتبوو، بە لایەکی تردا دەری کردبوون. ماڵی ئێمەش هەر بە سەڵتی رایانکردبوو. هەتا جلو بەرگی خۆشیان نەهێنابوو. بەو حاڵە دەرچوو بوون. زەینەب هیوای لەگەڵ خۆی نەبردبوو. ئەو گەورە بوو، پێشمەرگە بوو. هەر دوو منداڵەکەی تری لەگەڵ خۆی بردبوو. بۆ ئەو زۆر ناخۆش بوو، لە لایەك هیچ هەواڵی منی نەدەزانی. من لە شەڕەکانی سەرکردایەتی بووم. لە لایەکی ترەوە، ئاگای لە هیوا نەبوو. بە جێی هێشتبوو، نەیدەزانی چی بە سەر دێت. منیش ئاگام لەوان نەبوو، چییان بە سەر هاتووە. دوای ئەوەی لە مەسۆی یەوە، بەرەو گۆل باخ بە رێکەوتم. ئێوارەبوو چوومە گۆل باخ. چووم سەردانی مقەڕەکەم کرد. مقەڕ پڕبوو لە پێشمەرگەی پەرتەوازە. هەندێك پێشمەرگەی تیپەکەی لێ بوو، ئەوانی تر هیچی پێشمەرگەی تیپەکە نەبوون. هەر یەکەی هی جێگایەك بوون. کۆمەڵێ پێشمەرگەی خۆشم لە وێ بوون. هیواو غەریبو فایەقی براشم لە وێ بوون، لەگەڵ کاك حەمە جەزاو عومەرو بەکری برای کاك قادری حاجی عەلی لە وێ بوون. حەمە جەزا لە مقەڕی تیپی ٥٩ی حەمرین کۆی کردبوونەوە. رۆژانە خواردنی بۆ دروست دەکردن. حەمە جەزا زۆر بە مشور بوو، کە چووم لەگەڵیان بوو، زۆرم پێ خۆش بوو وتم:

" -کاکە حەمە مادام تۆ لێرەی، زۆر باشە. ئاگات لە مقەڕو ئەمانیش بێت. ئەم هەموو پێشمەرگە پەرتەوازەیەت لە کوێ کۆ کردۆتەوە.؟"
وتی:
" -هەمووی ئیجازە بوون، کە هجومەکە دەستی پێکرد. لەملاو لەو لاوە هەمووی هاتبوون، لای من کۆ بوونەوە. ئێستاش هەر لە من دور ناکەونەوە."
وتم:
" -گوێ مەدەرێ، با هەر هەموویان لەگەڵ خۆت بن لە مقەڕ. من شەو ئەچم بۆ ماڵی کاک حاجی حەبیب تۆزێ خۆم ئەشۆمو جلەکانم ئەشۆم. بەیانی دێمەوە بۆ مقەڕ."
وتی:
" -باشە."
بە عەدەد جیهازەکەشم وت:
" -هەر چی بوو، پێم بڵێ. من وام لە ماڵی کاک حاجی."
هیواشم لەگەڵ خۆم برد بۆ ماڵی کاک حاجی. شەو وتیان:
" -کاک ئاوات جلەکانت دانێ با بۆت بشۆینو خۆشت بشۆ."
زۆر دەمێك بوو، نە خۆم نە جلەکانم نەشتبوو. زۆر چڵکن بووم. لە خۆمەوە وتم:
" -بە خوا تازە ئەم شەو نەخۆم، نەجلەکانم ناشۆم."
ئەو شەوە لە وێ نوستم. بەیانی هەستاین نانو چامان خوارد. چومەوە دەرەوە، بە دووربین سەیری دەوروو بەری ئەو ناوەم دەکرد. شاخێك لە پشت (قەیتول) ەوە بوو، نازانم ناوەکەی چی بوو، بەردەمی سەنگاو بوو، بە سەر ناوچەکەدا دەی روانی. هەروەها دەیڕوانی بە سەر جادەی سەنگاوو قادر کەرەمداو بە سەر ئەو گوندانەی ناوچەی قەیتولو هەردوو گۆل باخو دێ رەشەو خوێلێن. جێگا لەوە بەرزتر نەبوو لەو ناوچەیەدا. کە سەیرمکرد، چەکداری پێوەبوو. منیش حاجی حەبیبم بانگ کرد وتم:
" -کاک حاجی ئەو چەکدارانە کێن بەو شاخەوە.؟"
وتی:
" -ئەوە هێزی بەرگرییە."
باشترین هێزی بەرگریمان هەبوو. لە پێشمەرگە ئازاتربوون. وەك هێزی پێشمەرگە رێکمان خستبوون. مەسئولی خۆیان هەبوو. هەر کاتێك هێزی پێشمەرگە دەچوون بۆ شەڕی سەرکردایەتی، یان دەوری ناوچەکەی خۆیان، ئەوان یەکسەر جێگای هێزی پێشمەرگەیان دەگرتەوە. بۆ هەموو شەڕێکیش هەر ئامادە بوون. زۆر هێزێکی ئازابوون. خەڵکی گەرمیان بە سەرو ماڵ ئامادە بوون. هەر لەبەر ئەوەش بوو رژێمی بەعس زۆر داخ لە دڵ بوو لە خەڵکی گەرمیان. زۆر بە وەحشیانە بە ماڵو منداڵو سەروەتو سامانیانەوە ئەنفالی کردن. کە وتی ئەوە هێزی بەرگرییە، منیش زۆر بڕوام نەکرد هێزی بەرگری هەتا ئێستا بەو شاخەوە بن. حکومەت زۆربەی ناوچەکەی

گرتبوو. خەڵك سەرقاڵی ماڵو منداڵی خۆیەتی. هەر بە گومان بووم موراقەبەم دەکرد. خەڵکی گەرمیان زۆر قارەمان بوون، بەڵام، کە قەرەداغو قۆپی گیرابێ، ئیتر گەرمیان ئەو رۆڵەی لە دەستدا، چونکە پشتی لێ گیرا. هەر سەیری شاخەکەم دەکرد. ئەو هێزەی، کە دیاربوو، زیادی دەکرد. حاجی حەبیبم بانگ کرد پێم وت:

" -چەند کەسی لێیە.؟"

وتی:

" -رەنگە (١٠) کەسی لێ بێ."

وتم:

" -حاجی ئەو هێزە زۆرە هێزی حکومەتە."

بۆم دەرکەوت ئەو هێزە زۆرە هێزی بەرگری نیە. زۆری پێ نەچوو، هەموو شاخەکە بە هێز گیرا. سەیرمکرد لە گوندەکانی دێ رەشەو مەملەحەو خوێڵینەوە، دوکەڵ بەرز بۆوە. گوێمان لە یەك تەقەش نیە. زۆرم بە لاوە سەیر بوو!، چونکە تیپی ٥٧ی سەگرمە لەوێن. ئەی چۆن بە بێ تەقە حکومەت ئەو گوندانەی سوتاند، بە بێ ئەوەی هیچ بەرگرییەك بکرێت؟ زۆری پێ نەچوو، دەبابە بە جادەی سەنگاو-قادر کەرەم دا هات، بەرەو گوندی (قەیتول) قەیتول گوندێکی زۆر گەورەبوو. هەر لە سەر جادەی قادر کەرەم-سەنگاو بوو. لە گۆل باخیشەوە زۆر نزیك بوو. ئەو جێگایەی، کە مقەڕی تیپی ٥٩ی لێ بوو، زۆر نزیك بوو لە جادەکەوە. زۆر ناخۆش بوو. منیش هەر خۆم لەوێم، هیچ هێزێکی لێ نیە. لای خۆی بۆ پشودان هاتبووم. چووم بۆ لای جیهازەکە پەیوەندیم بە کاك قادری حاجی عەلی یەوە کرد. وەزعی خۆمانم پێ وت، کە چۆنەو حکومەت چۆن لە قوڵی ئێمەوە هێرشی دەست پێ کردووە. کاك قادر وتی:

" -ئەی تیپی ٥٧ی سەگرمە لە وێ نیە.؟"

وتم:

" -پێم وا نیە یەك پێشمەرگەی لێ بێ، چونکە تەقە نیە. زۆر بە خێرایی دێنە پێشەوە."

ئەو کاتە تیپی ٥٩ی حەمرین هێزەکەیان هەر بە رێوەبوو، نەگەیشتبوون. هێمن خۆشی ئەو کاتە نەگەیشتبووە لام. زۆر هەوڵمدا پەیوەندی بە هیوا بارۆیی یەوە بکەم، بەڵام دەنگی نەبوو. کاك قادریش زۆر هەوڵی دابوو، پەیوەندیان نەمابوو. دیاربوو جیهازەکەیان داخستبوو. زۆر ناخۆش بوو. هەر خۆم لە وێ بووم. هیچ پێشمەرگەشی لێ نەبوو. ئەوەی لە وێ بوو، هیچی پێشمەرگەی شەڕ نەبوون. هەر یەکەی لە جێگایەکەوە هاتبوون، لە وێ کۆ ببوونەوە. خوا خویان بوو خۆیان دەربچن. حکومەت زۆر هاتە پێشەوە. گوندەکان زۆری چۆڵی کردبوو. یەك یەك ماڵی تیا مابوو. ئەوەشی مابوو، پێم وتن خۆیان دەرباز بکەن، چونکە دەمزانی حکومەت دەیگرێ. تەجروبەی دۆڵی جافایەتیم هەبوو. هەتا نیوەڕۆ حکومەت ئەم گوندانەی سوتاند: دێ ڕەشە،

خوێڵینە، مەملەحە. لە قەیتول، کە لە گۆل باخەوە نزیك بووەوە. چووم بۆ مقەڕ بە حەمە جەزام وت:

" -کاکە حەمە تۆ هەر چۆنێك بێ، ئەم هەموو موتەفەریقەیەم لێ دوور بخەرەوە. با هەموویان نەگیرێن. خۆ کەسی هی شەڕ نیە. با هەر خۆمان بین. ئەوەی پێمان کرا بیکەین، ئەوەشی نەکرا چار نییە."

بەوانەی مقەڕیشم وت:

" -هەموو شتە زیادەکانی مقەڕ دەربکەن بۆ ئەو هەردانەی دەرەوە."

حەمە جەزا هەموویانی کۆکردەوە، بە براکانی خۆیو دوو براکەی منیشەوە. ئەوەی دەیویست نەڕوا، هەر هیوا بوو. نەدەچوو لەگەڵیاندا. دەیوت:

" -بمکوژن من ناڕۆم. هەر لەگەڵ تۆ ئەبم."

منیش هەر دووسێ پێشمەرگەم لەگەڵ مابوو، ئەویش لە کۆڵم نەدەبۆوە. بە منو حەمە جەزا چارمان نەدەکرد. نەدەڕۆیشت لەگەڵ ئەواندا. وەزعەکە زۆر ناخۆش بوو، چونکە لەو هەموو هێزە قارەمانە کەس لە وێ نەبوو. وا حکومەتیش بە ئارەزوی خۆی دێ بە دێ دێتە پێشەوەو گوندەکان دەسوتێنێو وێرانی دەکات. نزیکیش بۆتەوە لە گوندی گۆل باخی سەرو. دوو گوند بوون، هەردووکیان بە ناوی گۆل باخی سەروو گۆل باخی خوارو. زۆر لە یەکەوە نزیك بوون. من هەر بە تەمای ئەوە بووم، ئەگەر بتوانین بەو چوار پێنج پێشمەرگەیە هەندێ بەرگری بکەین، هەتا ئەو شتانەی مقەڕ دەردەکەین. ئەگینا ئەو هێزە هی ئەوە نەبوو بە چوار پێنج پێشمەرگە بەرگریان بکەین. بە دەیان دەبابەیان لەگەڵ بوو. بە هەزاران جاشو عەسکەر لە چەندین قۆڵەوە پەلاماریان دابووین. لە (٦-٧) لاوە پەلاماری ئەو قۆڵەی ئێمەیان دا. لە قادر کەرەمەوە، لە سەنگاوەوە، لە جەبارییەوە. نازانم جەبهەکە ئەوەندە فراوان بوو، یەك کەلەبەر بە چۆڵی نەمابوو. کاك قادری حاجی عەلی دەیوت:

" -تۆ بۆ خۆت ئاگات لە خۆت بێت."

زۆر خەمی منی بوو. دەیزانی هەر بە تەنیا لەوێم. باش بوو ئەوەندەمزانی، هێمن هاتەوە. ئەویش دوو پێشمەرگەی لەگەڵ بوو. بە سەر ئەو وەزعەدا هاتەوە. زۆر باش بوو، چونکە هێمن خۆی سەر تیپی ٥٩ی حەمرین بوو. زۆر قارەمانو بەورە بوو. ئیتر خەمم نەما، چونکە ئەو شارەزای ئەو ناوەبوو. منو هێمن هەردووکمان بە برادەرانی مقەڕمان وت:

" -ئێوە شتە قورسەکان دەر بکەن، ئێمە ئەچین لە پێش جەیشەکەدا دائەمەزرێین شەڕ ئەکەین هەتا شەو نایەڵین بێنە پێشەوە. ئێوە هەموو شتەکان دەرباز بکەن."

باشبوو مقەڕەکە لە ناو گوندەکەدا نەبوو. ئێمەش بە چوار پێنج پێشمەرگەوە لە بەرامبەری گوندەکە بۆیان دامەزراین. هەتا شەو ماینەوە، نەمانهێشت بێنە گوندەکەوە. مقەڕەکەمان گواستەوە. هەر ئەو شەوە چۆڵمانکرد. ئەوان رۆژی دوایی

هاتنه ناو گوندەکەوە. چوونه ناو مقەڕەکەی ئێمەوە، هیچی تیا نەمابوو. هەرچی تیابوو، هەموومان دەرکردبوو بۆ ئەو هەردانەی پشتەوە. خەڵکی گوندەکانیش، هەر چی زەخیرەو ماڵەکانیان بوو، هەموویان لەو هەردانەدا شاردبۆوە. هەردەکانی لای قادر کەرەم زۆر سەخت بوو، زەلامی شارەزاش بە ڕۆژ سەری لێ تێك دەچوو، ڕێی لێ دەگۆڕا. بۆ بەیانی لەگەڵ کاك قادری حاجی عەلی قسەمکرد. بۆم باسکرد چۆن دەرباز بووین‌و چەند کەس‌و لە کوێین. پێشم ڕاگەیاند حکومەت هەتا کوێ هاتووە. ئەویش وتی:

" -باشە ئاگاتان لە خۆتان بێت."

بەڵام دیاربوو لە هەموو لایەکەوە هجومەکە دەستی پێ کردبوو. کەس نەیدەتوانی بچێ بە هانای کەسەوە، چونکە سوپای عێراق‌و گەلە جاش لە چواردە لاوە هجومی کردبوو. لە جەباری‌و قادر کەرەم‌و سەنگاوو بناری گڵ‌و داوێ‌و کفری‌و سەر قەڵاو کەلارو باوەنورو هەردی‌و قەرەداغیش پێشتر حکومەت خۆی گرتبووی. ئیتر بە حسابی خۆی، وا ئابڵوقەی دابووین، کە هەموو پێشمەرگەو خەڵکی گوندەکان دەسگیر بکەن. ڕۆژ بە ڕۆژ شەڕەکە بە هێزتر دەبوو. بازنەی ئابڵوقەش بچوکتر دەبۆوە. هەر ناوچەی زەنگەنە مابوو، ئەویش لە زۆر لاوە حکومەت ئابڵوقەی دابوو. حکومەت بە هێزێکی زۆرەوە هجومی بۆ ناوچەی گەرمیان کرد. نزیکەی سێ سەد هەزار جاشی لەگەڵ بوو، جگە لەوەی چەندین فرقەی عەسکەرو چەندین دەبابەو مودەڕەعەو بە هەموو جۆرەکانی تەیارەو چەکی کیمیایی لە ناوچەکەی دەدا. زۆر بە دڕندانە پەلاماری ناوچەی گەرمیانی دا. کاك قادر لە مقەڕی مەڵبەندبوو لە (مەسۆیی بەرگەچ) لە لای ئێمەوە، حکومەت گەیشتبووە نزیك ئاوە سپی. لە مەسۆیی یەوە نزیك ببوەوە، کە مقەڕی مەڵبەندی لێ بوو. پەلاماری ئەو دێهاتانەی دەدا. هەمووی دەسوتاند. بەرەو ئاژداغ‌و (پێنجە نوست) لە وێشەوە بەرەو (مەسۆیی سەر چەم) دەڕۆیشت. بۆ کاك قادرو ئەوان خەتەر بوو. بە کاك قادرم وت:

" -کاك قادر هێزێك بنێرە بۆ دەوری پێنجە نوست، بۆ ئەوەی ئەو لایەمان لێ نەگیرێت. بۆ خۆشتان خەتەرە."

وتی:

" -باشە ئەوە هێزێکی برادەرانی پارتی دێ بۆ لات، کاك (قادر قادر) یان لەگەڵە."

مەفرەزەیەکیان لە لای من بوو بە ناوی (ئەحمەد سور رەباتی) ئەویش هەر دەیوت:

" -کاك ئاوات ئەم شەڕە غەڵەتە ئێوە ئەیکەن، چونکە هەموو تیا ئەچن. وا باشە هەموو هێزەکان بچینە ئێران، لە وێوە دەست پێ بکەین. بۆ ئەوەی پشتان قایم بێت. ئێستا ئەوەتا هەموو ئابڵوقە دراوین. ئەگەر زوو دەرباز نەبین، هەموو تیا ئەچین."

ئیتر چاوەڕێمان کرد. کاك قادر قادر گەیشت. خۆی هات بۆ لامان. من‌و هێمن‌و ئەحمەد رەباتی دانیشتبووین، سەیری جەیشەکەمان دەکرد، چۆن ئەو هەموو دەبابەیە ریز

بووه دێ بە دێ دەچنە ناوی ئاگری تێ بەردەدەن. ئێمەش بە هەموومان ٢٠ کەس دەبووین. بە منو هێمن ١٠ کەس دەبووین. ئەحمەد رەباتیش پێشمەرگەی خۆیان ١٢ کەس دەبوون. بە کاک قادر قادرم وت:

" -کاک قادر ئێوە چەند کەس دەبن هاتوون.؟"

وتی:

" -زۆرین."

وتم:

" -کەواتە زۆر باشە، با بچین لەو دێیە لە پشتیانەوە دابمەزرێین. لە ناو دێکەدا دەنگ ناکەین، هەتا دێنە ناو دێکەوە. ئەوجا لێیان ئەدەین. هەر هیچ نەبێت شەڕێکی باشیان لەگەڵ ئەکەین، هەندێکیان لێ بکوژین باشە."

زۆر ناخۆش بوو، بە بەر چاومانەوە دێ بە دێیان بە بێ تەقە دەسووتاند. ئێمەش کەم بووین، نەماندەتوانی هیچ بکەین. ئەوان بە سەدان دەبابەیان لەگەڵ بوو. جگە لەوەش ئەو هەموو هەلیکۆپتەرەش حیمایەی دەکردن. کاک قارد وتی:

" -هەر ئێستا تۆڵەی ئەو گوندانەیان لێ ئەکەینەوە."

وتم:

" -زۆر باشە."

زۆر بە ورەیەکی بەرزەوە قسەی دەکرد. زۆر دڵم خۆش بوو وتم:

" -ئێستا داخی دڵی خۆمان بەو جەیشە ئەڕێژین، تۆڵەیان لێ ئەکەینەوە."

کاتی خۆی بیستبووم لە شۆڕشی پێشودا، کاک قادر قادر پیاوێکی ئازا بووە. وتی:

" -با من بچم لەو دۆڵەدا کۆبوونەوەیەك لەگەڵ هێزەکەی خۆمان بکەم. ئێستا تەگبیرێك ئەکەین چۆن دابمەزرێین."

دەبوایە بچویناینە پێشیانەوە، هەلیکۆپتەر مەجالی نەدەداو گەرمیانیش روتە. وتمان:

" -باشە ئێمە وا لێرە دانیشتووین، هەتا ئێوە کۆبونەوەکە ئەنجام ئەدەن."

منو هێمن دانیشتبووین، لەگەڵ عەدەد جیهازەکەی خۆمان. جیهازێکمان پێ بوو، پەیوەندیم کرد بە قادری حاجی عەلیەوە پێم وت:

" -کاک قادر قادر گەیشتە لای ئێمە. ئیتر دوایی ئاگادارتان ئەکەینەوە لە کارەکانمان."

قادری حاجی عەلی ئازاد قەرەداغیشی لەگەڵ بوو لە مەسۆیی. قادر قادر، کە بۆ کۆبوونەوە چوو، نەگەڕایەوە. هەر نەمبینی یەوە. نەمزانی بۆ کوێ چوون؟ هەر ئەوەندە بینیم، کە لای ئێمە رۆیی وتی با بچین لەو دۆڵەدا کۆبوونەوەیەك بکەین. زۆر چاوەڕێمان کرد، نەبوون. نەمزانی لە کوێوە رۆشتبوون. لەگەڵ قادر پەیوەندیم کردەوە پێم وت:

" –ئەو برادەرە هەر نازانم چییان لێهات. برادەرێکی تریشی برد. بە تەمای ئەوان مەبە."

ماموستا عەلی گوێی لێ بوو، زۆر پەست بوو. بە هەموو جیهازەکانی وت:

" –پارتی شەڕ ناکەن، هەر خۆیان ئەشارنەوە."

کاك ئازاد قەرەداغیش لای کاك قادر بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو وتی:

" –کاکە گیان کەی وایە، بۆ چی ئەمانشکێنن."

منیش پێم وت:

" –ماموستا عەلی واز بێنە. کاتی ئەوە نیە."

ماموستا عەلی گەرمیانی زۆر پیاوێکی قارەمانو دڵسۆز بوو، بەڵام توڕەو بێ تەحەمول بوو. ئیتر شەڕەکە نزیك بۆوە لە هەموو لایەکەوە. لە (داوێ)و (بناری گل)ەوە گەیشتە هەردەکانی زەنگەنە. لە بناری گل (نازمە بچکۆل)ی فەرماندەی کەرت لە (ئاوایی شێخ حەمید) مقاوەمەیان کردبوو، هەتا خۆیو هەموو پێشمەرگەکانی لەگەڵ یەك مەفرەزەی حیزبی شیوعی شەهید کران. تەنیا دوو پێشمەرگەیان دەرچوو بوون. نازانم ئەوانیش چۆن دەرچوو بوون؟ هەموو ئێکەیان بە سەردا روخاندبوون. نازمە بچکۆل پێشمەرگەیەکی زۆر ئازاو قارەمان بوو، تازە ژنیشی هێنابوو. فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٥١ی گەرمیان. بە داخەوە هەموو شەهید بوون. لە قادر کەرەمیشەوە هاتبوون، بەرەو هەردەکانی زەنگەنە. تیپی ٥٩ هەر هەمووی پەرتەوازەبوو بوون. رزگاری حاجی کایل فەرماندەی کەرتی جەباری، یەکسەر پەڕیبۆوە بۆ سنوری تیپی ٢١ی کەرکوك لە جەبارییەوە. (عەسکەر) فەرماندەی کەرت بوو لە ناوچەی قادر کەرەم. دەوریان گیرابوو، نەیانتوانیبوو دەرباز بن. خۆیو کەرتەکەی گیران. زۆر پیاوێکی قارەمان بوو. خۆی خەڵکی دەوری قادر کەرەم بوو، زۆر شارەزاو زۆر ئازابوو. من بۆ خۆم شایەتی ئەدەم، قارەمانی وا کەم بوو. کوڕێکی جوامێر بوو. من نەم برد بۆ شەڕەکانی سەرکردایەتی، لە وێ بە جێم هێشت، چونکە یەك هەفتە بوو ژنی هینابوو. زۆرم خۆش دەویست. دواتر خۆیو ئەو پێشمەرگانەی، کە لەگەڵیدابوون، هەموویان رەمی کران، چونکە زۆر بۆی داخ لە دڵ بوون. ئەو چالاکییانەی لە دەوری قادر کەرەم دەکرا، رژێم بە هی ئەویان دەزانی. زۆریش وابوو، چونکە زۆر ئازابوو. کەرتی جەلال مەسۆیش نازانم چیان لێ هاتبوو؟ هەر نەمان بینینەوە. نەمانزانی چییان بە سەرهات. لەگەڵ سەید جەوهەر، ئەویش فەرماندەی کەرت بوو. خۆیو پێنج برای ئەنفال کران. لە ئەنفالەکاندا هەموویان فەوتان. ئەوانەی لەگەڵی بوون، زۆربەی خزمی خۆی بوون. کەرتی هەمەوەندیش، کە هەر سەر بە تیپی ٥٩ی حەمرین بوو، ئەویش هەر نەمانزانی لە کوێن؟ ئەوانیش باشترین کەرتی ئەو تیپە بوون. باقی تیپەکانی تریش هەموویان لە شەڕدا بوون. بە تایبەتی تیپی ٥٥ی قەرەداغ. لە جەبهەی باوەنور زۆر شەڕی

قارەمانانەیان دەکرد. وەزعەکە بەرەو مەترسی دەڕۆشت، چونکە تیپەکانی گەرمیان زۆریان ماڵو منداڵیان پێ بوو. بریندارێشمان زۆر هەبوو. لەگەڵ قادر قسەمکرد وتم:

" -یەکتر ببینین."

چونکە بیرمکردەوە، ئەگەر چەند ڕۆژێکی تر بمێنینەوە، لەوانەیە زۆر بە زەحمەت دەربازبین. وتی:

" -زۆر باشە وەرە بۆ ئێرە."

هێمنم بە جێهێشتو خۆم لەگەڵ عەدەد جیهازەکە ڕۆیشتین. سەیارەکەی هێمن مابوو. ڕۆیشتین گەیشتینە سەر (ئاوە سپی) باران باری بوو، لافاو هەستابوو. لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا، سەیارەکەمان چەقی. هەر چی هەوڵماندا، بۆمان دەرنەهاتەوە. ناچار بە جێمان هێشت، بە پێ کەوتینە ڕێ. عەدەد جیهازەکە، جیهازەکەی دا بە کۆڵیا. چووینە گوندی (فەقێ مستەفا) گوندێکی زۆر گەورە بوو. سەیرمکرد عومەر غەریبو برادەرانی لە وێ بوون. ماڵیشی هەر لە وێ بوو. لای ئەوان تۆزێك دانیشتم، چایەکمان خواردەوە. دوایی بە ناو دێکەدا بە ڕێکەوتم، سەیرمکرد کۆمەڵێك کوڕی گەنجی (دەرەویان)ی لێ بوو. براکانی شەهید هەژاریش لە وێ بوون. هاتن بۆ لام وتیان:

" -کاك ئاوات ئێمە چی بکەین.؟"

وتم:

" -ئەگەر بە قسەی من ئەکەن، هەر ئێستا بە ڕێکەون بەرەو دیوی قەرەداغ. خۆتان شارەزان. لەوێشەوە بە دزییەوە بچنە ناو شار، لە وێ ناتانگرن. دوایی خۆتان تەسلیم بکەنەوە."

باشبوو بە سەلامەتی دەرچوون. تۆزێك ڕۆشتم، پێشمەرگەیەك هات وتی:

" -کاك ئاوات (فایەق عوبێد ئاغای ڕەباتی) ئەڵێ ئەمەوێت کاك ئاوات ببینم."

وتم:

" -باشە با بێت."

وتی:

" -سجنە، چۆن بێت.؟"

سەیر بوو بە لامەوە! وتم:

" -بۆ چی سجنە.؟"

وتی:

" -نازانم بە ئێمەیان وتووە سجنە لای ئێوە."

لەگەڵ (لەتیف ئاغای ڕەبات) پێکەوە سجن بوون. پێم وت:

" -بڕۆ ئازادیان بکە، با بێن."

که هاتن باوەشیان پیادا کردم، بەخێرهاتنەوەیان لێ کردم. فایەق ئاغا زۆر پیاوێکی قسە خۆش بوو. کەسم بە قەد ئەو پیاوە قسە خۆش نەدی بوو. دەستی کرد بە پێکەنین وتی:

" —بەقوربان ئێمە سجن کراوین."

پێم وت:

" —کاک فایەق کێ تۆی سجن کردووە. ئەی تۆ کۆمەڵە نیت.؟"

برادەرانی کۆمەڵە، ئەوەندە چوو بوون وتبویان ئەمە ئاغایە زاڵمە. واش نەبوو. زۆر پیاوێکی کورد پەروەر بوو. خزمەتی پێشمەرگەی دەکرد. دیوەخانەکەی لە گوندی هەزار کانی، هەمیشە لانەی شۆڕش بوو. ئەو برادەرانە خۆشیان نەدەویست. دەیانوت زاڵمە. پێم وت:

" —بە راست بۆ چی سجن کراون."

وتی:

" —بە قوربانت بم (نەهەنگەکەی مەڵبەند) سجنی کردوین."

—مەبەستی لە نەهەنگەکەی مەڵبەند (عومەر فەتاح) بوو– کاک عومەر مەسئولی رێکخستنی کۆمەڵە بوو، پێی دەوت نەهەنگ. وتم:

" —لە سەر چی.؟"

وتی:

" —پێیان وتوم تۆ ئەچیت تەسلیم ئەبیتەوە، خەڵکت روخاندووە. بۆیە منو کاک لەتیفی زیندانی کردووە. کاک لەتیفیش زۆر پیاوێکی بێدەنگ بوو. ئەویش بە هەمان تاوان سجن کرابوو. منیش پێم سەیر بوو! لەو کاتەدا، وا بە خەڵك بڵێن. من بۆ خۆم هەر کەسم دیبێ، پێم وتووە چۆن دەتوانن دەرباز بن، خۆتان لێرە دەرباز بکەن. چۆن ئەمانەیان لە سەر ئەوە سجن کردووە. گوایە خەڵك دەڕوخێنن. بۆ کێ مابوو نەروخێت. چی مابوو؟ منیش پێم وتن:

" —من زۆر سوپاستان دەکەم، هەر لەم دەقەیەوە ئێوە ئازادن. کێتان بۆ دەرباز ئەکرێت، دەربازی بکەن. من بە گەورەترین خزمەت بۆتان حساب ئەکەم."

فایەق ئاغا وتی:

" —بە گۆڕی شەهیدان لەم گەرمیانە دوور ناکەومەوە. هەتا هەمووتان لە سنوری مەڵبەندی یەك دەرنەچن، ناڕۆم."

زۆریان لێ پاڕامەوە، وتم:

" —بڕۆن بزانن کێ ماوە دەرنەچووە، ئێوە دەری بکەن."

وتیان:

" —ناڕۆین، ئێستا ئەچینەوە بۆ لای ماڵو منداڵەکانمان وان لەو کونو کەلەبەرانەدا، کەسیان لا نیە. ئەگەر تۆ بەرمان ئەدەی، ئەچین بۆ لایان."

پێم وتن:
" -من پێتان ئەڵێم بڕۆن."
ئێستاش هەر ئەو قسە خۆشانەی فایەق ئاغا لە گوێمدا دەزرنگێتەوە. بەڵام بە داخەوە، بیستم وتیان کۆچی دوایی کردووە. سەد رەحمەت لەو گۆڕەی. تا ئێستا لەتیف ئاغاش لە ژیاندامماوە. دواتر رومکردە مەسۆیی. کاك قادر لە وێ بوو، پێم وت:
" -فایەق ئاغاو لەتیف ئاغای رەباتی گیرابوون. منیش هەردوکیانم ئازاد کرد. پێشم وتوون بڕۆنەوەو کێتان پێ دەرباز ئەکرێت، لەگەڵ خۆتان بیبەنەوە."
وتی:
" -باشت کردووە."
ئیتر نازانم، ئەویش ئاگادار بوو لە زیندانی کردنیان یان نا. ئەو شەوە، کاك عومەر فەتاح‌و شێخ جەعفەر هاتبوونەوە. بیرمان کردەوە چۆن ئینسیحاب بکەین. لە هەر چوار لاوە هێرشەکە لێمان نزیکبووبۆوە. بڕیارماندا بەرەو قۆپی قەرەداغ بکشێینەوە. هەموو هێزەکان بچینە ناو قۆپی، لە وێ تەگبیر بکەین، چۆن بڕۆین.
لەوێ بووین، شەهید هیوا باڕۆیی بە جیهاز پەیوەندی پێوە کردین.پێمان وت:
" -لە کوێیت. ؟"
وتی:
" -لە نزیکی ئاغجەلەر."
سەیر بوو بە لاماوە، کە بۆ چی بێ ئەوەی ئاگادری ئێمە بکات رۆیشتووە!؟ هەر لە پێش هجومەکەدا لەگەڵ تیپەکەدا، پەڕیبۆوە بۆ بەری سنوری تیپی ٢١ی کەرکوك. ئەو جەبهەیەی، کە ئەومان بۆ دانابوو، بە جێی هێشتبوو، بە بێ ئەوەی بە ئێمە بڵێت. ئێمەش بە پشتی ئەوان لە مقەڕی تیپی ٥٩ مابووینەوە، کە چی بە بێ تەقە، دەبابە هاتە سەرمان. بە پەلە رزگارمان بوو. ئەویش بۆ خۆی پەڕیبۆوە، هەر ئاگاداریشی نەکردبووین. وتیان:
" -کاك ئازادی سەرگەرمە، لەگەڵ خۆی پێی وتبوون با بڕۆین."
ئەو کاتە کاك ئازاد ئیشی نەدەکرد. لە گوندی (مێوڵی) دانیشتبوو. خۆی پەڕیبۆوە، ئەوانیشی بردبوو. ئیتر ئێمەش پێمان وت:
" -باشە بە بڕیاری کێ پەڕیتەوە، بە بێ ئەوەی هەر ئاگادارمان بکەیتەوە."
دیار بوو زانی زۆر کارێکی خراپی کردووە، پێمان وت:
" -لەوێ بە، هەتا ئاگادارت ئەکەینەوە."
هەموو هێزەکان کۆبوونەوە. بڕیارماندا چەند مەفرەزەیەك بە جێ بهێڵین لە ناوچەکەدا، باقی هێزەکە دەربکەین بۆ بەری مەڵبەندی دوو. چەند برادەرێکمان دانا بمێننەوە. لەوانە شەهید حەمە رەش‌و عوسمانی حاجی مەحمودو مەلا ئەحمەدی کەلاری‌و چەند کادرێکی تریش وتیان، ئێمەش دەمێنینەوە. من خۆم بڕیارم دابوو، لەگەڵ شەهید

حەمە رەش بمێنمەوە. شەهید حەمە رەش زۆری پێ خۆش بوو لەگەڵیان بمێنمەوە. منیش زۆرم پێ خۆشبوو هەر لەوێ بم. ئەو ئینسیحابەم زۆر پێ ناخۆش بوو. چار نەبوو، هەر دەبوایە ئەو هێزە لەو ناوە دەربازبکەین، چونکە مەترسی هەبوو. تەوق درابووین، هێزەکەش زۆر بوو، نەدەشارایەوە. بە رێکەوتین بەرەو قۆپی. هێزێکمان جیا کردەوە، لەوانەی برینداروو نەخۆش‌و خێزانەکان، ئەوان لەگەڵ کاک مەحمود سەنگاوی‌و شەهید حەمە رەش بوون. بە راستی حەمە رەش کوڕی رۆژانی تەنگانە بوو. زۆر ئازاو قارەمانانە وتی:

" –من هەموویان ئەبەم بۆ سنوری تیپی ۲۱ی کەرکوک‌و خۆم ئەگەڕێمەوە."

وتمان:

" –زۆر باشە، تۆ ئەوان بگەیەنە. ئێمە زۆر سوپاست ئەکەین."

چونکە دەبوایە ئێمە بچووینایەتەوە ناوچەی قەرەداغ، لەوێشەوە بۆ بازیان. لەوێوە بپەڕینەوە. وتمان لەوانەیە چەندین جار تووشی شەڕ ببین. ئەوان بە رێکەوتن بە بناری سەنگاودا بەرەو هەمەوەند. لە وێشەوە لە سەر جادەی کەرکوک–سلێمانی بپەڕنەوە. ئێمەش لە (بانی مۆرد)ەوە سەرکەوتین بۆ پشتی تەکێ‌و ئەستێڵی سەرو. لە ناو قۆپیەکاندا، مقەڕی حیزبی شیوعی لێ بوو. چادریان هەڵدابوو، وتیان ئازوقەشمان زۆر داناوە لەوێ. لە پشتی بانی مۆردەوە، هەندیک هێزی (بەدر) ی لێ بوو. لە ناو شاخەکەدا مقەڕیان دانابوو. کە رۆیشتین بە سەر ئەواندا، کاک قادر چوو بۆ لایان پێی وتن:

" –ئێمە ئینسحاب ئەکەین. هەندێك مەفرەزە دائەنێین، باقی هێزەکانمان ئەپەڕێنینەوە. ئێوەش وەرن با بڕۆین."

وتیان:

" –ئێمە چۆن ئێرە چۆڵ ئەکەین؟ ئێرە زۆر جێگایەکی ستراتیژییە بۆ کەرکوك. ئێمە بە جێی ناهێڵین."

کاك قادر پێی وتن:

بابە ئێمە لێرە نامێنین، ئێوە هەموو تیا ئەچن. با بڕۆین."

نەهاتن وتیان:

" –بەس ئێوە یەك جیهازمان بدەنێ، بۆ ئەوەی بتوانین پەیوەندی پێ بکەین بۆ ئێران. ئیتر هیچمان لە ئێوە ناوێت."

قادر جیهازێکی راکاڵی بۆ بە جێهێشتن. ئیتر ئێمە سەرکەوتینە سەر شاخ. هەموو ناوچەی قەرەداغ لە بەردەمماندا بوو. کە سەیرمکرد، چی ببینم؟ وێرانە، هەر هەموو ناوچەکە چۆڵ کرابوو. زۆربەی گوندەکان موعەسکەر بوو. هەندێکیان دووکەڵی لێ بەرز دەبۆوە. ئەو کارەساتەم زۆر بە لاوە ناخۆش بوو. ناخۆشترین رۆژ بوو لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا. رۆژانی ناخۆش‌و کارەساتی دڵتەزێنم زۆر دیبوو، بەڵام ئەو

دیمەنانەی ئەو ڕۆژە، زۆر ئازاری دام. مانگێك لەوەو پێش ناوچەکەم بە جێهێشت، وڵاتێکی ئازادو خۆش، پڕ لە خەڵکی ناوچەکەو ئاوەدان. ڕووماندەکردە هەر دێیەك، لە ماڵی باوکی خۆمان زیاتر بوو. کە ئاوا بەو شێوەیە بینیمەوە، زۆر دڵتەنگ بووم. چوومە بن بەردێکەوە بۆ ئەوەی کەس ئاگای لێم نەبێت، بە دزیەوە زۆر گریام. چووینە خوارەوە بۆ ناو قۆپیەکان سەیرمانکرد، دووسێ چادری لێ بوو. ئەو ڕۆژە لە وێ بڕیارماندا هێزەکە بکەین بە دوو بەشەوە. منو کاك قادری حاجی عەلی لەگەڵ نیوەیدا بین. کاك عومەر فتاحو شێخ جەعفەر، لەگەڵ نیوەکەی ترین. هێزەکە دەوری (٢٠٠٠) کەس دەبوون. بە کاك قادرم وت:

" —کاك قادر من بڕیارمداوە، لەگەڵ ئەم مەفرەزانەی ئێرە ئەمێنمەوە. تۆ لەگەڵ هێزەکە بڕۆ. من لەگەڵ حەمە ڕەش ئەبم. بڕیارمانداوە من لێرە چاوەڕێی ئەکەم، هەتا حەمە ڕەش ئەگەڕێتەوە."

وتی:

" —ئاخر چۆن ئەبێت؟ ئەم هێزە چۆن دەرئەچێت؟ ئێستا تۆ نەیەیت، پێت ئەڵێن خۆی لە هێزەکە ئەشارێتەوە. ئەگینا من خۆشم حەز ئەکەم لێرە بم نەڕۆم. دوایی هێزەکە دەرناچێت، پەرتەوازە ئەبن. ئێمەش مەسئولین لێیان، هەر چی ببێت ئەڵێن خۆیان لە هێزەکەیان شاردەوە."

وتم:

" —ئەوەنیە تۆ ئەچیت لەگەڵیاندا."

وتی:

" —من تەنیا چی لەم هەموو هێزە بکەم؟ با بچینە ئەو بەر لە وێ بزانین چۆن ئەبێت؟ منیش دێمەوە."

وتم:

" —باشە."

عومەر فەتاحو شێخ جەعفەر، شەوێ پێش ئێمە بە ڕێکەوتن. وتمان:

" —ئێمەش شەوێ دوای ئێوە دێین."

ئەو شەوە لە وێ بووین. منو کاك قادر بە یەکەوە لە خێمەیەکدا بووین. شەو لە خوارمانەوە بوو بە تەقە. کاك قادرم هەڵستاند وتم:

" —کاك قادر لە خوارمانەوە تەقەیەکی زۆرە. با وریا بین نەیەنە سەرمان."

دووسێ برادەری حزبی شیوعی لێ بوو. چووین پێمان وتن. وتیان:

" —ئەوە جاشن، وان لە بەردەمی دەربەندەکەدا. لە ترسا هەموو شەوێك لە خۆیانەوە دەست دەکەن بە تەقو تۆق."

من گومانم هەبوو لە ناکاودا لێمان بدەن. لە وەش دەترسام، کە هێزی (میلیشیا) شکا، زۆر خەتەرە. ئێمەش هێزەکەمان زۆر بێزار بوون. چەندین مانگ بوو لە شەڕی

سەرکردایەتی بوون. لە ویشەوە بۆ گەرمیان. لە گەرمیانیشەوە دیسانەوە بەرەو دواوە. زۆر مەترسی ئەوە هەبوو، کە لە ناکاو لێمان بدەن. دووسێ پێشمەرگەشمان، دووسێ رۆژ لەوەو پێش ناردبوو، بۆ ئەوەی بزانین لە کوێوە بوار هەیە بۆ پەڕینەوە. ئەوانیش هەر دەیانوت:

" –لە هیچ شوێنێکەوە بواری پەڕینەوە نی یە."

دنیایان لێ کردبوین بە چەرمە چۆلەکە. ئێمە زۆر گوێمان نەدەدا بە قسەی ئەوان. بەیانی دوای چا خواردن، چاوەڕێی ئەوە بووین، بزانین عومەر فەتاح و شێخ جەعفەر گەیشتونەتە کوێ؟ لە پڕ هەلیکۆپتەرێك بە نزمی خۆی کرد بە ناو قۆپیەکاندا. خەریکبوو دەیدا لە دارەکان. زۆر سەیر بوو بە لامانەوە! ئەمە چی بوو بەم بەیانیە خۆی کرد بەم دەربەندەدا! ؟ ئێمە خوا خوامان بوو کەشف نەبین لە کوێین، کەچی ئەو بەڵایەمان لێ پەیدابوو. خۆی کرد بە ناو (دەربەن وشك) دا، کە دەربەنی (ئەستێڵ) یشی پێ دەڵێن. لێمانەوە دیار نەبوو چی لێهات؟ (نێو حەسەن) ئامر کەرت بوو. ناردبوومانە سەر شاخەکە بۆ حەرەسیات، لەگەڵ دووسێ پێشمەرگەدا. جیهازێکی بچوکیان پێ بوو. پێمان وت:

" –حەسەن ئەو هەلیکۆپتەرە بۆ کوێ چووە.؟"

وتی:

" –چووە لە بن ئەو شاخەدا نیشتۆتەوە، شت بار ئەکات."

دوایی زانیمان، عومەر فەتاح چەك و فیشەکی تیا شاردبۆوە. دیار بوو یەکێ لەوانەی، کە ئاگای لە شاردنەوەی ئەو شتانە بوو، چووبوو ئیخباری کردبوو. هاتبوون دەیانبرد. ئێمەش بۆ دوای نیوەڕۆ کەوتینە رێ. وتیان (بەهادین نوری) لێرەیە. چووین بۆ لای، ئەویشمان لەگەڵ خۆماندا هێنا. هەر خۆی و یەك ئافرەتی عەرەبی لەگەڵ بوو. پێشمەرگەی خۆی بوو. بۆ شەو گەیشتینە پشتی جافەران، دایکردە باران. بەر پێی خۆمان نەدەبینی. زۆر ناخۆش بوو. کاك قادر لە پێشەوەبوو، من لە دوای هێزەکەوە بووم. ئەوەندە تارىك بوو، ئەوەی پێش خۆم بە باشی نەدەبینی. بارانەکەش وەك ئەوە وابوو، بچیتە بەر دوشی حەمام. ئەوەندە بە خوڕ دەباری بە سەرماندا، سەرمان لێ تێك چووبوو. برادەرێك هەبوو بە ناوی (حەمە قاشتی) جێگری تیپ بوو. لە پێش منەوە بوو. سەیرمکرد لای دابووە پەنایەکەوە، قسەی بۆ دووسێ پێشمەرگە دەکرد. منیش گەیشتمە لای وتم:

" –کاك محەمەد ئەوە بۆ لات داوە.؟"

وتی:

" –کاك ئاوات تۆ برۆ، من دێم."

وتم:

" –ئاخر وریا بن، دانەبڕێن."

وتی:
" —نەبابە دانابڕێین."
ڕۆشتم. ئیتر من نەمزانی بۆ چی دوا کەوتووە؟ من شکم بۆ ئەوە نەچوو خۆی بدزێتەوە. وتم دیارە زۆر ماندو بووە. گەیشتینە ناو دێی جافەران، کاك قادر لە سەر جادەکەی قەرەداغ—سەنگاو وەستابوو. وتی:
" —حەمە قاشتی قاچی لە جێ چووە، وتی من بەیانی دێم، ئێستا ناتوانم بڕۆم."
وتم:
" —کەی قاچی لە جێ چووە."
وتی:
" —لە شاخەکە."
وتم:
" —بە خوا لە من ساغتر بوو، لە پێش منەوە بوو. وتی تۆ بڕۆ، ئێستا منیش دێم. دوو پێشمەرگەشی لەگەڵ خۆی گل دابۆوە. مادام وای وتووە، بە تەمای مەبە. خۆی دزیوەتەوە."
هەر واش بوو. چووبوو خۆی تەسلیم کردبۆوە. دەبوایە زوو بڕۆشتینایە. لە سەر جادە بپەڕینەوە. ئەو ناوە هەمووی ڕەبایەو موعەسکەر بوو. دەبوو بۆ بەیانی بچووینایەتە دەوری (قازان قایە)، چونکە ئەو ناوە چۆڵ بوو. هێشتا دوژمن گوندەکانی نەروخاندبوو، بەڵام کەسی تیا نەمابوو. باران و قوڕێکی زۆریش بوو، هەموو پەکمان کەوتبوو. من هیواشم لەگەڵ بوو، لە دواوە بوو. پێش ئەوەی بگەینە گوندی هۆمەرامان، سەیرمکرد هیوا بە پێی پەتی هات. وتم:
" —ئەوە کوا پێڵاوەکانت.؟"
وتی:
" —بە خوا لە قوڕەکەدا بە جێما."
وتم:
" —لە کوێ.؟"
وتی:
" —نازانم، لە دواوە."
وتم:
" —بە خوا ناگەڕێیتەوە بۆی، لە کوێ بە جێت هێشتووە، بڕۆ بیهێنەرەوە. زۆر تاریکیش بوو. سەری شۆڕ کرد گەڕایەوە. دوایش بەزەیم پیا دەهاتەوە، چونکە منداڵ بوو. نازانم چۆنی دۆزیبیەوە، چوو هێنایەوە. نەیدەتوانی بە پێی پەتی بڕوات. ئاوەدانیش نەبوو هەتا جوتێکی تری بۆ بهێنین. بۆ بەیانی زوو گەیشتینە (هاڵ دەرە) گوندێکی چۆڵ بوو. ماڵەکان هەمووی مابوو. وتمان:

" -خۆتان بکەن بە ماڵەکاندا، خواردن بۆ خۆتان پەیدا بکەن. هەتا نیوەڕۆ لێرە ئەبین، بۆ خۆمان ئیسراحەت ئەکەین."
هەموو ڕۆیامان لێ داخست، خۆمان گەرم کردەوە. بەیانی وتیان:
" -دەنگی دەبابە یەت."
کە سەیرمانکرد، دەبابەو شۆفڵ لە هۆمەرامانەوە بەرەو لای ئێمە دێت، بۆ ڕوخاندنی ئەو گوندەی ئێمەی لێ بووین. بەیانی زوو بوو، تازە خۆر کەوتبوو. ئەو گوندانە زۆر دوور نەبوون لە یەکەوە، هەر نیو سەعات دوور بوون لە یەکەوە. کاک جەمیل هەورامیشمان لەگەڵ بوو، ئەو سەر تیپی ١٧ی زمناکۆ بوو ئەو کاتە. ئێمە زۆر بووین. وتمان دادەمەزرێین لە دەرەوەی دێکە لێیان دەدەین، بەڵام فیشەکی زۆرمان پێ نەبوو. هەر ئەوەمان پێ بوو، کە بە پێشمەرگەکان بوو. بیرم کردەوە وتم:
" -کاک قادر با ئەم شەڕە نەکەین بڕۆین. ئێمە ئەوەی هەمانە هەر ئەوەیە بە خۆمانە. یەك فیشەکی زیادەمان پێ نیە. بەیانی زووشە، ئەگەر خۆمان تووشی شەڕ بکەین، لەوانەیە هەتا ئێوارە بەردەوام بێت. دوایی مەگەر تفەنگەکانمان وەك گۆچان بگرین بە دەستمانەوە. کێ ئەڵێ ئێمە لەم ڕێگایە توشی چەندین شەڕ نابین. ئێمە ئەمانەوێت بە سەلامەتی هێزەکەمان دەرباز بکەین. تازە لە سەر دێی چۆڵ بۆ خۆمان توشی ئەو شەڕە بکەین، کە لەوانەیە خراپ بە سەرماندا بشکێتەوە."
وتی:
" -تۆ ئەڵێی چی بکەین.؟"
وتم:
" -ئەڕۆین بۆ قازان قایە، ئەگەر هاتن بۆ ئەوێ، لە وێ لێیان ئەدەین. دوای نیوەڕۆشە، پێم وانیە ئەمڕۆ بێن بۆ ئەوێ."
بۆ ئەوێش هەر نیو سەعات دەبوو. چوار پێنج گوندی تر هەبوون پێش قازان قایە، ئەوانیش بە بەرنامە گوندەکانیان دەڕوخاند. هەر ڕۆژەی دووسێ گوندیان دەڕوخاندو دەسوتاند. کاک قادریش پێی باش بوو. هێزەکانمان کۆکردەوە، ڕۆیشتین بەرەو قازان قایە. کە چووینە ئەوێ، سەیرمانکرد کاک عومەر فەتاح‌و شێخ جەعفەریش هاتن بۆ ئەوێ وتیان:
" -ئەڵێن ڕێگا نەماوە لە بازیانەوە. هەمووی گیراوە."
دووسێ پێشمەرگەیان ناردبوو، بۆ ئەوەی ڕێگا تاقی بکەنەوە بزانن کوێ باشە بۆ پەڕینەوە. ئەوانیش گەڕانەوە قازان قایە. حیزبی شیوعیشیان لەگەڵ بوو. لە قازان قایە نانی نیوەڕۆمان لەو ماڵە چۆڵانە خوارد. ماڵەکان هەر بۆ خۆیان بە سەڵتە خێزانی رایانکردبوو. هیچیان نەبردبوو. پڕ بوون لە نان‌و زەخیرە. دوای نیوەڕۆ کۆبوونەوەیەکمان کرد، چۆن لە جادەی کەرکوك-سلێمانی بپەڕینەوە. بڕیارماندا من‌و کاک قادرو کاک عومەر فەتاح، لە باڕۆیی‌و بازیانەوە بەرەو (ئەڵڵایی) بڕۆین. لە ئەڵڵایی

یەوە بپەڕینەوە بۆ گوندی (کەڵە شێرە) بەری چەمی ڕێزان، بەڵام زۆری هێزەکە لەگەڵ ئێمە بوو. کاک شێخ جەعفەر لەگەڵ هێزێکی تر، بڕیاربوو لە دیوی هەمەوندەوە بڕۆن. لە دەربەنی (باسەڕە)وە بچنە دیوی هەمەوەند. بە بناری هەمەوەندا بپەڕنەوە بۆ بەری ئاخجەلەر. بە برادەرانی حیزبی شیوعیمان وت:

" —ئێوەش خۆتان کوێ بە باش ئەزانن، لە وێوە بڕۆن."

هەموو خۆمان ئامادە کرد بۆ ئەوەی بە ڕێکەوین، چونکە، کە چووینە بازیان، هەر دەبوو ئەو شەوە بپەڕینایەتەوە. نەدەتوانرا بە ڕۆژ لە وێ بمێنینەوە. بوار نەمابوو. ئەگەر نەچووینایە، بۆ بەیانی تیا دەچووین. لە بەر ئەوەی ناوچەی بازیان دەشت بوو. هەمووشی بە ڕەبایەو موعەسکەر گیرابوو. بروسکەشمان بۆ هیوا بارۆیی کردبوو، کە بە خۆی و مەفرەزەیەکەوە، بێت بۆ دێکەی خۆیان لە ناوچەی بازیان بۆ شارەزایی، کە بمان پەڕێننەوە. خەریك بوو بە ڕێ دەکەوتین، دووسێ کەس لە برادەرانی حیزبی شیوعی هاتن وتیان:

" —ئێمە ناتوانین خۆمان بپەڕینەوە، چونکە شارەزا نین. ئەبێ ئێمەش لەگەڵ خۆتان بەرن."

کە وتیان شارەزا نین، بە لامەوە سەیر بوو!، چونکە بە ڕاستی خەڵکی ناوچەکەش بە قەد ئەوان شارەزا نەبوون. ئەوان بۆ ئەو شتانە زۆر لێزانبوون. کون و کەلەبەری ناوچەکە شارەزا بوون. وتمان:

" —ئەم هێزەی ئێمە زۆرە، فریا ناکەوین دەرچین. هەموو تیا ئەچین. ئێوە بۆ خۆتان بڕۆن باشترە."

وتیان:

" —ئەگەر نەمان بەن، ئێمە هەموو تیا ئەچین، ئێوەش مەسئول دەبن بەرامبەر بە مێژوو. دوایی بەیاننتان لە سەر دەرئەکەین، کە ئێوە خیانەتتان لێ کردووین."

لە دڵی خۆمدا وتم:

" —بە خوا حەقی وایە بە جێیان بهێڵین، کە ئەزانن هەمووتان تیا ئەچن، لە کوێوە بەیانمان لە سەر دەرئەکەن. مەگەر لەو دونیا بەیان دەرکەن، دەبا هەر دەری کەن."

دیار بوو کاک قادر بەزەیی پیایاندا هاتەوە وتی:

" —با بێن، یان هەموو بە یەکەوە تیا ئەچین، یان بە یەکەوە دەرباز ئەبین."

پێم وایە کاک قادر لە بەیانەکە ترسا، بۆیە وتی باشە وەرن. زۆر بووین عەسر لە قازان قایەوە بە ڕێکەوتین، بۆ ئێوارە چووینە بارۆیی. هیوا نەهاتبوو. خۆمان هەندێك پێشمەرگەمان لەگەڵ بوو، شارەزای ئەو ڕێگایە بوون یەکێك لەوانە دێو حەسەن بوو. بە بناری شاخەکەدا کەوتینە ڕێ، بەرەو ئەڵلایی. من لە ناوەڕاستدا بووم. کاک عومەر فەتاح لە پێشەوە بوو. کاک قادر لە دوای هێزەکەوە، دابەش ببووین. هەر بە ڕاکە ڕاکە بۆ ئەوەی بتوانین زوو لە جادە بپەڕینەوە، چونکە ئەگەر نەگەیشتینایە، دەبوو تەسلیم

ببینەوە. لە بەر ئەوەی لە ناو حکومەتا بوو. دەشتەکانیش موعەسکەرو ڕەبایە بوون. کاتێکمانزانی، هێز دابڕاوە. باشە بیگەیەنن یەك بەوی تر بڵێت:
" -ڕاکەن درەنگە."

لەبەرئەوەی برادەرانی حیزبی شیوعی زۆریان عەرەب لەگەڵ بوو، هەر تێ نەدەگەیشتن چییان پێ وتون. کەسیش ئەوەی لە بیر نیە، کە ئێمە عەرەبمان لەگەڵدایە. لە بەر ئەوە دادەبڕان. دەبوایە بوەستاینایە هەتا هەموو دەهاتن. تەحەمولمان نەمابوو. بێزار ببووین بە دەستیانەوە. زۆر خەڵکی پەریشیان لەگەڵ بوو، نەیان دەتوانی ڕابکەن. هەتا چووینە سەر جادەی ئەڵڵایی، خەریکبوو خۆر دەکەوت. تەواو دونیا ڕوناك ببۆوە، هێشتا زۆری هەر لە سەر جادەکە نەپەڕیبونەوە ئەو بەری جادەکە. بە سەر شاخەکەشەوە دەنگ دەهات. هەر هاوار هاواریان دەکرد:
" -ڕاکەن عەسکەری هات."

من وامدەزانی پێشمەرگەکانی خۆمانە گەیشتونەتە ئەوێو چاویان لە قافڵەیە لە کەرکوك-سلێمانیەوە هاتوون هەر دەڵێن ڕاکەن. منو کاك عومەریش لە سەر جادەکە وەستاوین، هەر بە پاڵ پێشمەرگەمان دەپەڕانەوە ئەو بەری جادەکە. لە بەینی کۆمەڵگای ئەڵڵایی‌و سەیتەرەکەی ئەڵڵاییەوە، پەڕینەوە چووینە ئەو بەری جادەکەو خۆر کەوت. ئیتر بەو شاخەدا سەرکەوتین بۆ پشتی زایەرو کڵاش کەران. لە پێشمانەوە گوێم لێ بوو هۆرەیان دەکرد. منیش دووسێ قسەم پێوتن وتم:
" -گوێ بگرە کاك عومەر، چەند بێ عارن گۆرانی ئەڵێن."

وتی:
" -بۆ تۆ وا ئەزانی ئەوانە کێ بوون لە پێشمانەوە هاواریان ئەکرد ڕاکەن جەیش هات."

وتم:
" -ئەی پێشمەرگەی خۆمان نەبوون.؟"

وتی:
" -کورە ئەوانە جاشەکان بوون. نابینی ڕەبایەکانیان لە سەر شاخەکەیە."

خۆیان هاتبوونە خوارەوە بۆ سەر ڕێی پێشمەرگەکان. زۆر سەیر بوو بە لامەوە! جاش ئەوندە پیاو بوون. بە ڕاستی ئەو جاشانە بیان ویستایە، زۆریان لێ دەکوشتین. نەشیان دەهێشت وا بە ئاسانی بپەڕینەوە. فەوجێکی زۆر باش بوون ئەو جەماعەتە. زۆریان پێڵاوەکانی خۆیان بە پێشمەرگە دا. بەهاربوو قوڕێکی زۆر بوو. باش بوو دەرباز بووین. چووینە سەر شاخەکە لە وێ هەموو خۆماندا بە زەویدا. لەو سەر عەرزە تەڕە، هەتا نیوەڕۆ خەوتین. ئەوجا هەڵساین بە ڕێکەوتین بەرەو گوندی کەڵەشێرە. گوندێك بوو لە سەر شاخەکە دەیڕوانی بە سەر چەمی ڕێزاندا. ئیتر ترسمان نەبوو. هێشتا حکومەت بۆ ئەو ناوە نەچوو بوو. زۆری گوندەکان ئاوەدان بوون. کە بینیان وا

مەڵبەندی یەکیش گیراوە، هەموو خەڵکی ناوچەکە ئەزێویان شکا. زانیان ئیتر نۆبەی مەڵبەندی دووە. ئێمەش هەموو هێزەکەمان گەیاندە سنوری مەڵبەندی دوو. چووینە گوندی عەسکەر. بەڵام ئەو هجومەی حکومەت بۆ مەڵبەندی یەك، بۆ ئەوە بوو نەیەڵن کەس دەربچێت. لە پێشدا پەلاماری ناوچەکانی قەرەداغی دا، ئەو ناوچانەی گرت، کە شاخاوی بوون. هەمووی کردن بە دیوی گەرمیاندا. ئەنفالی سێ گەورەترین زیانی لە میللەتی کورد دا. بە تایبەتی یەکێتی، چونکە خەڵکی گەرمیان زۆربەی زۆری یەکێتی بوون. زۆرترین خەڵکی ئەنفال لە سنوری مەڵبەندی یەك بوو. سنوری مەڵبەندی یەك هەمووی ئاوەدانی بوو. بە تایبەتی ناوچەی گەرمیان. رژێمی بەعس زۆر بە دڕندانە پەلاماری ناوچەکانی گەرمیانی دا. زۆر داخ لە دڵ بوو لە خەڵکی گەرمیان، چونکە خەڵکی گەرمیان کەم وێنە بوون بۆ ئازایی‌و قارەمانێتی. خۆیان هەم پێشمەرگە بوون، هەم پێشمەرگەشیان بە خێو دەکرد. بە سەروماڵیان پشتیوانی شۆڕش بوون. لە خزمەتی شۆڕشدا بوون. هەر بۆیە رژێمی بەعس تۆڵەی لێ کردنەوە. ئەو هەموو خەڵکەیان بە گەنج‌و منداڵ‌و پیرەوە لە ژێر ناوی (ئەنفال) دا بێ سەرو شوێن کرد. بە پێی ئەو سەر ژمێرەی بۆ قوربانیانی ئەنفال کراوە، چارەکە ملیونێك کەسن. بە زیندویی کراون بە ژێر خۆڵەوە. هەتا ئێستاش کەس نازانێت لە کوێ زیندە بە چاڵ کراون. رژێم سیاسەتێکی دڕندانەی بە کار دەهێنا بۆ گرتنی ئەو شوێنانە. پێش ئەوەی پەلاماری هەر جێگایەکی بدایە، پێشەکی بە راجیمەو کاتیۆشاو چەکی کیمیایی لێی دەدان، ئەوجا زۆر دڕندانە پەلاماری دەدان. پێش ئەوەی پەلاماری قەرداغ بدات، شەوێك پێش هێرشەکە، بە چەکی کیمیاوی لە گوندی سێوسێنانی دابوو (٧٥) کەسی لێ شەهید کردبوون. چەندین کەسیش بریندار بوون. چوار کەس لە گوندی جافەران، دوو کەسیش لە دووکان گیانیان لە دەستدا. دوای ئەوەی هەموو هێزەکان گەیشتینە (عەسکەرو گۆپتەپە) لە وێوە بروسکەیەکمان بۆ کاك نەوشیروان کرد. پێمان راگەیاند، کە هەموو هێزەکە دەرباز بووین، ئێستا لە ناوچەی عەسکەرو چەمی رێزان دلین. زۆری پێ خۆش بوو، وتی:

" -هێزەکەتان لە وێ مەیەڵن. بڵاوەی پێ بکەن، چونکە زانیاریم بۆ هاتووە، پەلامارتان دەدەن. هەموو هێزەکەتان تیا دەچێ. لایەکمان ئاوەکەی دووکان بوو. ئاوەکەش زۆر زۆر بوو، نەدەتوانرا بە ئاسانی بپەڕینەوە بۆ بەری کۆیە. دەبوایە چوار چوار بە کەڵەك بپەڕینەوە. لە بەر ئەوە مەترسی هەبوو حکومەت پەلاماری بدلینایە.

کاك نەوشیروان وتی:

" -سەرەی ئێوەیە هێز بنێرن بۆ بادینان."

ئەو کاتە هەر جارەی مەڵبەندێك هێزی بۆ بادینان، لەگەڵ مەسئول عەسکەرییەکدا دەنارد. ئەو کاتەش هەر منو شێخ جەعفەر لە وێ بووین. مام رۆستەم لە شاری تەبرێز بوو لە ئێران. ئەژنۆی عەمەلیات کرا بوو. وتم:

" –من دەچم هێزێکی باش دەبەم."
بڕیاربوو چەند سەر تیپێکی تر بەرم لەگەڵ یاریدەدەری پزیشکێکدا. وتیان:
" –باشە کێت دەوێت ببیە."
هەمووشی ئامادە بوون لەگەڵمدا بێن. لەوێ کۆبوینەوەیەکمان کرد، وتیان:
" –تۆ لەگەڵ کاك عومەر فتاح بچن بۆ مەڵبەندی سێ. ملازم عومەرو کاك کۆسرەت لە وێن. بچن لەگەڵ ئەوان کۆبوونەوە بکەن، وەزعی خۆمانی بۆ باسبکەن. ئێمەش لێرە هەوڵ ئەدەین مقەڕی مەڵبەند دابمەزرێنین‌و ئیعادەی هێزەکان بکەینەوە. ئەوانەی، کە دێن بۆ بادینان دەیان نێرین بۆ لای خۆت بۆ مەڵبەندی سێ."
چاوەڕێی هیوا باڕۆیی بووین، وتیان:
" –هیوا باڕۆیی لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا تەسلیم بۆتەوە."
ئێمە بڕوامان نەدەکرد. وتمان:
" –هاتۆتەوە بە دوای ئێمەدا بۆ بازیان، سوتفەی ئێمەی نەکردووە."
دووسێ ڕۆژی پێ چوو، لە سلێمانیەوە هەواڵ هات، کە هیوا باڕۆیی‌و چەند پێشمەرگەیەك تەسلیم بونەتەوە. ئەوجا زانیمان هەواڵەکە ڕاستە. عەدنانی حەمەی مینامان کرد بە سەر تیپی ٥٧ی سەگرمە. قادرو شێخ جەعفەر لەوێ مانەوە. من‌و عومەر فەتاح بە ڕێکەوتین بۆ لای کۆسرەت‌و ملازم عومەر. بەڕینەوە بۆ مەڵبەندی سێ بۆ بەری کۆیە. کۆسرەت جیهازی کردبوو بۆ تیپەکانی دەشتی هەولێر سەیارەمان بۆ بنێرن بۆ سەر ئاوەکە. دوو سەیارە هاتبوون بە دواماندا. من چوار پێنج پێشمەرگەم لەگەڵ بوو، عومەر فەتاح یش هەر ئەوەندەی لەگەڵ بوو. هیواو دوو براشم لەگەڵ بوو. کاك عومەر کافیە خانی خێزانی لەگەڵ بوو. ئەو لای قادرو ئەوان بە جێما بوو، نەهات لەگەڵ ئێمە. بە ڕاستی کافیە خان‌و ڕەحمە خانی خێزانی عومەر غەریب، زۆر ئازاو بە توانا بوون. لە ڕێ‌و ڕۆشتندا لەگەڵمان بوون، زۆر لە پێشمەرگە ئازاتر بوون. کافیە خان لە ڕێگا کۆڵێکی بە کۆڵەوە بوو، یارمەتی پێشمەرگەشی دەدا. ڕۆشتین گەیشتینە مقەڕ لە دەشتی هەولێر. معاون تیپەکەی لەوێ بوو ناوی (نورە) بوو. ئەو شەوە لە وێ بووین. ڕابەر سیاسیەکەیان بە ناوی (جەبار یاوەر) لەوەو پێش دەمان ناسی. کادری کۆمەڵە بوو لە سنوری تیپی ٤٧ ماوەیەکیش لە ناوەندی کۆمەڵە بوو. ماڵەکەشی لەوێ بەرامبەر بەمقەڕەکەبوو. من‌و کاك عومەر فەتاح‌و هیوا، لەوێ نوستبووین. ژورەکانیش دەرگای پێوە نەبوو. لە پڕ، یەك سەڵییە فیشەك لە ناو مقەڕەکەدا تەقی. خەبەرمان بۆوە ڕامانکرد بۆ مقەڕ بزانین چی بوو!؟ کە چووین سەیرمانکرد، دوو پێشمەرگە بریندار بوو لەوانەی کە لەگەڵ ئێمەدا بوون. هەردووکیان لەگەڵ کاك عومەر بوون. یەکێکیان پورزای من بوو، ناوی (تۆفیق) بوو. تازە چووبوو بۆ ڕێکخراو بۆ لای کاك عومەر. زۆر پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمان بوو. زۆر موئەدەب بوو، کە هاتە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی بۆ لای من، تەمەنی منداڵ بوو. زۆر هەوڵم لەگەڵی دا بڕولتەوە،

نەڕۆیشتەوە. هەر لەگەڵ خۆم مایەوە.ساڵی ١٩٨٤ کچێکی پوورزای خۆیم بۆ هێنا. دوو منداڵیشی هەبوو. بریندار بوو وەزعی زۆر خراپ بوو. گوللەیەك لە سکی دابوو. پێشمەرگەکەی تر لە قاچی دابوو. ئەو باشتر بوو. پێشمەرگەیەکی تریش بەرکەوتبوو، ئەو یەکسەر شەهید ببوو. رووداوەکە زۆر سەیربوو بە لامانەوە! بۆ چی لەو مقەڕە گەورەیەدا چووبونە سەر ئەو ژوورەی، کە ئەو پێشمەرگانەی ئێمەی لێ بوو؟ پرسیمان:

" -کێ بووە ئەم تەقەیەی کردووە.؟"

وتیان:

" -پێشمەرگەیەکی لێ بووە قاتێك جلی رەشی لە بەردابووە. نازانین لەگەڵ کێ بووە. ئێمەش نایناسین ئەو ئەو کارەی کردووە."

یەك مەخزەنی لە دەرگاکەوە کردبوو بە ناویانداو رایکردبوو. ئەوانیش هەموو نوستبوون. هەر دوو براکەی منیش بە یەکەوە لەو ژوورەدا بوون. ئیتر بەو شەوە پێشمەرگە دەرچوو بە دوایدا بۆ هەموو رێگاکان. دیار بوو شارەزا نەبوو، دەرنەچوو بوو. بۆ بەیانی گیرایەوە. کە هێنایانەوە لێیان پرسی:

" -بۆچی وات کردووە بۆ ئەو پێشمەرگانەت شەهید کرد.؟"

هەر لە شێت دەچوو. خەڵکی گوندی خاڵە بازیانی بوو. هێزی بەرگری بوو. نازانم بۆ چی گەیشتبووە دەشتی هەولێر. من گوێم لە قسەی نەگرت چی وتووە. هەر نەچووم بۆ لای. وتیان وتوویەتی:

" -ماڵو منداڵەکەم گیراوە، بۆیە ئەوەمکرد، کە حکومەت ماڵو منداڵەکەم بۆ بەر بدات."

بەڵام بڕوا ناکەم وا بووبێ، چونکە ئەو خۆی لەگەڵ پێشمەرگەو باقی بەرگری دێکە، لە کاتی هێرشەکەی حکومەت بۆ ناوچەکە خۆیان، بەرگریان کردبوو. ئاگایان لە ماڵو منداڵ نەبوو چییان بە سەر هاتووە؟ خۆشی نەگەڕاوەتەوە بۆ لای ماڵو منداڵ هەتا حکومەت لە بەرامبەردا پێی بڵێن ئەو کارە بکە، تا ماڵو منداڵەکەت بەر بدەین. هەر لەوە دەچوو شێت بووبێت. دەشیان وت پێشتر شێت نەبووە. ئیتر بۆ نەگبەتی ئێمە دوو پێشمەرگەی شەهید کرد. نازانم چۆن نەهاتبوو بۆ ژوورەکەی ئێمە؟ هەر بەرامبەر مقەڕەکە بووین، دەرگاشی پێوە نەبوو. ئەو پێشمەرگەیەی شەهیدبوو، هەر لەوێ ناشتمان، بەڵام تۆفیق وەزعی زۆر خراپ بوو. دکتۆریشیان لا نەبوو. هەر برین پێچێکیان لابوو. دیار بوو نەزیفی هەبوو. بەیانی فایەقی برام لەگەڵ ناردەوە بۆ دواوە بۆ لای قادرو ئەوان. ئەوان دکتۆریان لابوو. دکتۆر فایەق‌و دکتۆر جەبارو دکتۆر ناسیح، لای قادرو ئەوان بوون. خۆمان بە رێکەوتین بۆ لای کۆسرەت‌و ملازم عومەر. ئەوانیشم بە رێخستەوە بۆ دواوە. لە رێگا تۆفیق شەهید بووبوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو، چونکە هەر لەگەڵ خۆم بوو. زۆرم خۆش دەویست. ئێمەیان گەیاندە جێگایەك وتیان:

" –ئەوە ڕێگاکەیە خۆتان بڕۆن."
پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو، ئەو شارەزا بوو. هەر لە جادەی کۆیەو هەولێر پەڕینەوە، رومانکردە شاخەکە. شارەزا نەبووین نازانم کوێ بوو. کۆتایی مانگی چوار بوو. شەو دنیا زۆر سارد بوو. بە ناو گیاو قوڕدا دەڕۆیشتین، هەموو گیانمان تەڕ ببوو. لە شاخەکە چووینە خوارەوە، زۆر شەکەت‌و ماندو بووین، خۆماندا بە زەویدا، هەموو خەومان لێکەوتبوو. سڕ بووبووین، خەریك بوو رەق دەبووینەوە. هەموو هەڵدەلەرزین. بیرمان لەوە نەکردەوە ئاگرێك بکەینەوە بۆ خۆمان لە بەری دابنیشین. هیوا بەو منداڵییە چوو ئاگرێکی کردەوە. هەموومان هەستاین چووینە بەر ئاگرەکە خۆمان گەرم کردەوە وتمان:
" –ماڵت ئاوا بێت هیوا. خۆ ئێمە ئەم هەمووە عەقڵمان بەوە نەشکا ئاگرێك بکەینەوە."
دووسێ سەعات لەوێ بووین ئیسراحەتمان کرد، ئەوجا بە ڕێکەوتینەوە چووینە ئەو شاخەی پشتی هیران‌و نازەنین."
گوندێك بەو شاخەوە بوو نازانم ناوی چی بوو، وتیان:
" –مقەڕی ئاسۆئەڵمانی لێیە."
ماڵەکەشی لەوێ بوو. چووینە ماڵی ئەوان نانمان خواردو ئیسراحەتمان کرد. دوای نیوەڕۆ بە ئوتومبیل بە ڕێیان کردین بۆ هیران. چووینە هیران. زۆر دێیەکی خۆش بوو، ماڵی چوار پێنج برادەری لێ بوو. یەکێ لەو ماڵانە، ماڵی بە هرۆز قەشقە بوو. ئەو شەوە لەوێ ماینەوە. زۆر خزمەتیان کردین. ڕۆژی دوایی بە ڕێکەوتین، گەیشتینە خەتێ. لای کۆسرەت‌و ملازم عومەر. مقەڕێکی زۆر خۆشیان هەبوو لە سەر کانی‌و ئاوێکی خۆش. لەوێ هیوا نەخۆش کەوت. زۆر وەزعی خراپ بوو، هەشت ڕۆژ لە جێگادا کەوت. دکتۆری لێ بوو دەرزیی‌و دەرمانی زۆریان هەبوو. ئەو ماوەیە لەو ڕێگایە ئەوەندە هیلاك ببوو، تووشی گرانەتا بوو. لەوێ ئیسراحەتی کرد، تا چاك بۆوە.
ئەو ماوەیە لەوێ بووین. ڕۆژانە بریندارو نەخۆشەکانی مەڵبەندی یەك دەهاتن، لەوێ دەیانویست بچن بۆ ئێران. هەندێکیان ژن‌و منداڵیشیان پێ بوو. دەهاتن داوای پارەیان دەکرد. کۆسرەت پارەی دەدانێ. من پارەی یەك ژەم خواردنیشم پێ نەبوو. عومەر فەتاح لێپرسراوی دارایی مەڵبەند بوو، پارەشیان زۆر بوو، بەڵام گوێی نەدەدلینێ. ڕۆژێ ملازم عومەر پێی وتم:
" –کاك ئاوات باشە بۆ یارمەتی ئەو پێشمەرگانەی خۆتان نادەن؟ بریندارو نەخۆشن. کاك کۆسرەت یارمەتیان ئەدات. کاك کۆسرەت بە منی وتووە، کە پێتان بڵێم، پێشمەرگە داوای پارە لە من ئەکات. من لە ڕوم نایەت پێیان بڵێم من حەقی ئێوەم نیە، چونکە گوناحن. ئەوە لێپرسراوی خۆیان لێرەیە، بۆ یارمەتیان نادەن؟ من چۆن پارەی مەڵبەندی سێ بدەم بە مەڵبەندی یەك، کە خۆیان پارەیان هەیە." وتم:

" –زۆر راستە كاك عومەر. من ئاگام لێیە كاك كۆسرەت یارمەتیان ئەدات. بە خوا خۆشم یەك دینارم پێ نیە. پارە لای كاك عومەرە."

وتی:

" –بە كاك عومەر بڵێ ئەبێت لەمەو لا خۆتان یارمەتی پێشمەرگەكانی خۆتان بدەن. كاك كۆسرەت ئەڵێت من ناتوانم ئیتر یارمەتی پێشمەرگەكانی ئەوان بدەم."

بە كاك عومەر فەتاحم وت:

" –كاك عومەر یارمەتی ئەو پێشمەرگە بریندارانەی خۆمان بدە، ئەچن بۆ ئێران."

وتی:

" –باشە."

پێشمەرگە دەهات داوای پارەی دەكرد بۆ ئەوەی ولآخی پێ بگرێت. نەیدەتوانی بە پێ بڕوات. ئەویش (٥٠) دیناری دەدانێ. پەنجا دیناریش هیچی نەدەكرد. دەیانوت:

" –كاك عومەر پەنجا دینار چی لێ بكەین؟ ولآخ بە (١٠٠) دینار دەگرین، نامانباتە پشت ئاشان. چۆن بڕۆین.؟"

دەیوت:

" –هەر ئەوەیە. پارەمان نیە."

ئەوانیش دەهاتن بۆ لای من. منیش دەچووم بە كاك عومەرم دەوت:

" –كاك عومەر ئاخر بە پەنجا دینار ناگەنە ئێران. هەر هیچ نەبێت یەكی سەد دیناریان بدەرێ."

كە ئەوەش هەر هیچ نەبوو. دەیوت:

" –پارەمان نیە، بۆ ئەچن بۆ ئێران.؟"

دووسێ جار دەنگە دەنگم لەگەڵ كرد لە سەر ئەو پێشمەرگانەی، كە دەچوون بۆ ئێران. ئەو رای وابوو خەڵك هەر لە عێراق بمێننەوە، نەچن بۆ ئێران. منیش پێم وت:

" –كاك عومەر ئەو رایەی جەنابت زۆر خراپە. باشتر وایە بچن بۆ ئێران، لێرە نەمێننەوە."

ئەو ماوەیەمان زۆر ناخۆش بردە سەر .

ڕۆژێ ملازم عومەرو كۆسرەت رەسوڵ ناردیان بە دوای قادری حاجی عەلی دا وتیان:

" –وەرە بۆ ئێرە بۆ ئەوەی كۆبونەوەیەك بكەین، بزانین چی بكەین.؟"

كاك نەوشیروان لە ئێران بوو. مام جەلال لە ئەورووپا بوو. خۆیان دەیانتوانی بڕیار بدەن لە سەر هەر مەسەلەیەك، كە چی بكەن؟ كاك قادر هات بۆ مەڵبەندی سێ. شێخ جەعفەر لەوێ بوو لای هێزەكە لە سنوری چەمی ڕێزان‌و گۆپتەپەو عەسكەر. زۆری پێ نەچوو، كە كاك قادر گەیشت. هەواڵمان بۆ هات، كە حكومەت پەلاماری مەڵبەندی دوو دەدات بۆ سەر چەمی ڕێزان‌و گۆپتەپەو عەسكەر. ئەو ناوچەیەی، كە پێشمەرگەی

مەڵبەندی یەکی لێیە. بورسکەیەکمان کرد بۆ شێخ جەعفەر، کە ئاگایان لە خۆیان بێ حکومەت پەلاماریان دەدا. بە قادرمان وت:
" –کاك قادر بروسکەیەك بکە، با هێزەکە بپەڕنەوە ئەو بەر ئاوەکە بۆ دەشتی کۆیەو هەولێر. گەر دوژمن پەلامارمان بدات، ئاوەکە بوار نادات بپەڕنەوە."
فریا نەکەوتن بپەڕنەوە، حکومەت پەلاماری دان. هەندێ لە تیپەکان پەڕینەوە دەشتی کۆیە، بەڵام تیپی ٥٧ و ٥٩ دوور بوون، نەیان توانی بپەڕنەوە، ئەو بەری ئاوەکەیان لێ گیرا. هێمن بروسکەیەکی بۆ مەڵبەندی سێ بۆ کردین، لە ئێمەی پرسی، کە ئایا ئەو بەری ئاوەکە گیراوە، یان نا. ئێمە لە دۆڵی بالیسان بووین، نەماندەزانی دەشتی کۆیە گیراوە، یان نا. وتمان:
" –ئێمە نازانین."
ئەو تیپانەی دەشتی هەولێریش پەیوەندیان نەمابوو تا لەوان بپرسن. وتمان:
" –خۆتان تاقیبی بکەن: هەوڵ بدەن زوو بپەڕنەوە."
لێمان پرسی:
" –سیروانی کوێخا لە وێ نیە.؟"
وتی:
" –بە یەکەوەین."
وتمان:
" –کێ هەیە بە قەد سیروان شارەزا بێت. لەگەڵ ئەو بپەڕنەوە."
دیاربوو نەیانتوانی بپەڕنەوە، بەڵام باقی تیپەکانی تر پەڕینەوە. لە ئەنجامدا تووشی شەڕ بووبوون. چوار پێنج پێشمەرگەی تیپی ١٧ی زمناکۆو تیپی ٥٥ی قەرەداغ شەهید بووبوون. یەکێکیان ناوی (محەمەد) بوو، برای مەلا ئەحمەدی دسکەرە بوو. پێشمەرگەیەکی ئازابوو. شەڕی زۆر باشیان کردبوو، نەیانهێشتبوو هەندێك جێگایان لێ بگیرێت. ئەگینا زۆریان لێ شەهید دەبوو. کوڕێکی تر شەهید بووبوو، ناوەکەی نازانم. کاتی خۆی جاش بوو. لە کاتی گرتنی مەڵبەند، بووبوو بە پێشمەرگە. زۆر کوڕێکی چاك بوو. کەسی نەبوو. وتیان ژنو منداڵێکی هەیە. بەریان دابوو بڕواتەوە، وتبووی:
" –من ئەبم بە پێشمەرگە. جارێکی تر ناگەڕێمەوە بەردەستی ڕژێمی بەعس."
لەگەڵ براکەی مەلا ئەحمەد شەهید بوو. مەلا ئەحمەد خۆی لە شەڕەکانی سەرکردایەتی دا بریندار بووبوو لە ئێران بوو. لەو کاتەدا بۆ خۆشی گەڕابۆوە بۆ مەڵبەندی سێ. لای ئێمە بوو. نەماندەزانی چۆن پێ بڵێین؟ هەر پێمان نەوت. کە خۆی چوو بۆ سەردانی تیپەکەیان، لە وێ زانیبووی براکەی شەهید بووە. ئەو هێزانەی خۆمان ئەوەی گەیشت، لەو ناوچەیەدا بەشمان کردن، بەڵام هێمنو عەدنانی حەمەی

مینا گەڕابوونەوە بەرەو دواوە. عەدنان هەر لە وێ وازی لە تیپی ٥٧ هینابوو. خۆیو دووسێ پێشمەرگە گەڕابوونەوە بۆ گەرمیان. بە تیپەکەی وتبوو:
" -بۆ خۆتان چی ئەکەن، بیکەن."
ئەوانیش چووبوونەوە بەرەو سنوری تیپی ٥٧. ئەنوەر دۆلانیو ئاواتی حاجی حەمە ئەمینو سالار،کە رابەر سیاسیان بوو، ماوەی چوار پێنج رۆژ لەو ناوەدا مابوونەوە. ئاواتیش، دێوحەسەن ئامۆزای بوو، چووبوو تەسلیم بوو بۆوە لەوەو پێش، کە زانیبووی ئاوات هاتۆتەوە ئەو ناوە، چووبوو بۆ لای دۆزیبویەوە، ئەویشی بردبۆوە تەسلیمی کردبۆوە. ئەنوەریش لەگەڵ کاک سالار، هەردووکیان لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکدا دەوری ٢٠ پێشمەرگە دەبوون، چووبونەوە ناو شار خۆیان شاردبۆوە. لەو ماڵانەی، کە خۆیان تیا حەشار دابوو، ماڵی محمد نوری تۆفیق بوو، کاک حەمە نوری هەر لە تەمەنی گەنجێتیەوە پیاوێکی کورد پەروەر و سیاسی بووە، لە شۆڕشی نوێشدا یەکێك بووە لە پیاوە دڵسۆزەکانی یەکێتی، پیاوێکی رۆشن فکریشە. دوایی لە رێگەی جاشەوە، بە خۆیانو چەکەکانیانەوە، هێنابوویاننەوە بۆ (قەندیل). هێمن ماوەیەك مابۆوە، ئەویش تەسلیم بووبۆوە. ئەو پێشمەرگانەی، کە چووبوونەوە لەو کاتەدا، زۆربەیان کوڕی باش بوون.
کە لە مەڵبەندی (سێ) کۆبووینەوە، بە منیان وت:
" -تۆ بۆ ناچیت بۆ بناری قەندیل. لەوێوە بزانە ماڵو منداڵەکەت لە سلێمانیە لە کوێیە، بنێرە بە دوایاندا بیانبە بۆ ئێران. لەوێ جێگایان بۆ جێ بەجێ بکە. هەتا ئەو کاتە ئێمەش هێزەکەت بۆ ئامادە ئەکەین، ئەوجا بڕۆ بۆ بادینان."
وتم:
" -باشە."
بڕیاریاندا (عومەر فەتاح)یش لەگەڵ من بێ بۆ پشت ئاشان. لەوێ مقەڕ دابنێین بۆ هێزەکانی مەڵبەندی یەك. هەموو لەوێ کۆ ببینەوە. ئەو هێزەی، کە لەگەڵ من دێ بۆ بادینان، ئەوانیش هەر لە وێ کۆ ببنەوە، لەوێوە بە رێ بکەوین. منو عومەر فەتاح بە رێ کەوتین لە خەتێ وە بەرەو بناری قەندیل. بە دوو شەو پەڕینەوە لە دۆڵی خانەقا بەرەو قرناقەو پشت ئاشان. لەوێ دووسێ تیپی مەڵبەندی خۆمانی لێ بوو. کە چووینە لای ئەوان، یەك قەرەباڵغی بوو، رۆژانە بە دەیان خەڵك لە وێوە دەڕۆیشتن بەرەو ئێران. مانگی شەش بوو. بە رۆژ گەرم بوو. بە شەویش سارد بوو، چونکە قەندیل زۆر کوێستان بوو. لە وێ جوابم نارد بۆ برادەرێکی خۆم، کە ناوی غەفوری هەمزەیی بوو. بۆ ئەوەی منداڵەکانم بۆ بدۆزێتەوە، بە برادەرانی خۆیاندا بۆم رەوانە بکات. ماوەیەکی پێ چوو، رۆژێك برادەرێك هات بۆ لام وتی:
" -تۆ کاك ئاواتی.؟"
وتم:

" -بەڵێ."

وتی:

" -ئەوە منداڵەکانتە، لە سلێمانیەوە هاتوون لەو بن دارەدان."

کە چووم سەیرمکرد، لە وێ بوون. ماڵی ئەو برادەرە ئاوا بێ. دۆزیبوونیەوە بە ئوتومبیلەکەی خۆی نارد بوونی بۆ لای برادەرانی خۆیان وتبووی:

" -تەسلیمی کاک ئاوات خۆی بکەن."

بە داخەوە ئێستا شەهیدبووە. خۆشەویست ترین برادەرم بوو. بارودۆخی ئەو ناوەش زۆر شێوا بوو بە یەکدا. لە ناو ئەو هەموو قاچاخچیو خەڵکەدا. کەس بە کەس نەبوو. جاشو قاچاخچیو ئەمنو ئیستخبارات. هەمووی لەو ناوەدا تێکەڵ بووبوو، چونکە هەر ئەوێ مابوو. دوو شەو لەوێماینەوە. کافیە خانی خێزانی کاک عومەر فەتاحیش هاتبوو. کاک عومەر مقەرێکی لەوێ دامەزراند. دەبوایە من ماڵو منداڵەکەم بەرم بۆ ئێران، دیان بنێمو خۆشم بگەڕێمەوە بۆ قەندیل بۆ لای هێزەکەی خۆم، بۆ ئەوەی بچین بۆ بادینان. لەو کاتەشدا تازە حاجی بەکری برای کاک قادری حاجی عەلی لەگەڵ ماڵو منداڵەکەیدا دەیویست بچێت بۆ ئێران. وتی:

" -کاک ئاوات بە یەکەوە ئەڕۆین."

وتم:

" -باشە بزانین ولاخمان دەست ئەکەوێت."

چونکە رێگا زۆر سەخت بوو. دووریش بوو بۆ ئێران. لەوێوە دەبوو بە بناری قەندیل دا بچووینایەتەوە پشتی قەلادزێ، لەوێشەوە بۆ دۆڵە کۆکێو دۆڵە گوێزێ. دۆڵە گوێزێ سەیتەرەی ئێرانی لێ بوو. ئەو کاتە مقەڕی خۆمان لە دۆڵە کۆکێ بوو. لەوێوە وەرەقەیان بۆ دەکردین بۆ سەیتەرەی ئێران. ئەوانیش وەرەقەیەکی تریان بۆ دەکردینەوە بۆ چوونە ناو ئێران. بۆ بەیانی ولاخمان پەیداکرد. ولاخیش ئەوەندە گرانبوو، دەتوت بە تەیارە دەڕۆی. بارودۆخەکەیان قۆستبۆوە. پارەشم پێ نەبوو. بە زۆر یارمەتیەکەی خۆم لە عومەر فەتاح سەند. لەگەڵ یارمەتی ئەو دکتۆرەی، کە بڕیاربوو لەگەڵم بێ بۆ بادینان. نەیدەداینێ، دەیوت:

" -بچن بۆ لای مامۆستا نازم لە قاسمە رەش. لەوێ وەریبگرن."

مامۆستا نازم مەسئولی دارایی یەکێتی بوو. بە دوو رۆژ نەدەگەیشتینە لای. بەو حاڵە لێم وەرگرت. ئەو کاتەش یارمەتی مەسئول عەسکەری تەنها (١٠٠) دینار بوو. لەو سەد دینارە زیاتر یەك دیناری تری نەدامێ. هەر نەیوت ئاخر تۆ ماڵو منداڵت پێیە، بۆ ئێران دەچی. دوایی تۆ لە وێ بە جێیان دێڵی. یا هەر هیچ نەبێ کرێی ولاخەکەت بۆ بدەم. هەموو پارەی مەڵبەند لای ئەوبوو. لای خۆی بەینمان زۆر خۆش بوو. لە پارەی شۆڕشدا زۆر رەزیل بوو. هیوادارم ئێستاش وابێ. بە هەر حاڵ، بە رێکەوتین. زەینەب بە سەر هێسترێکەوە بوو. پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو خوشکەزای خۆم بوو. یەك داری

دا بە هێسترەکەدا، زەینەبی هەڵیدایە خوارەوە، دەستی شکا. ئیتر وەزعی زۆر خراپ بوو. هەر هاوار هاواری بوو دەگریا. زۆر ئازاری دابوو. لەو ڕێگایەش هیچ ناکرێت. لە ڕێ سەیرمکرد کاک نەوشیروان لەگەڵ مام رۆستەمو کاک ئازاد غەریب دا، بەرەو پشت ئاشان دەهاتن. لە ئێرانەوە هاتبوون. دوای ئەحواڵ پرسین، پێم وت:

" –بۆ کوی ئەچیت.؟"

وتی:

" –ئەچم بۆ لای برادەران."

پێم وت:

" –بگەڕێمەوە لەگەڵتان.؟"

وتی:

" –نەوەڵا، بچۆ ماڵو منداڵەکەت دابمەزرێنە."

پرسی:

" –ئەی تۆ ناچیت بۆ بادینان.؟"

وتم:

" –با، من بۆیە هاتووم منداڵەکانم دانێم لە جێگایەك، چونکە ئەچم بۆ بادینان."

وتی:

" –زۆر باشە. بچۆ منداڵەکان بەرە بۆ ئەو دیوو. شێخ عەبدولکەریم داناوە بۆ ئیشوکاری ماڵەکان. ئەو ببینە، جێگاتان بۆ دابین دەکات، چونکە ئیتفاقمان لەگەڵ ئێران کردووە، کە چەند ئۆردوگایەکمان بۆ بکەنەوە. شێخ عەبدولکەریم مەسئولە لەو کارە."

من بەرەو ئێران رۆیشتم، کاک نەوشیروانیش بەرەو عێراق. چووینە دۆڵە کۆکێ. پێشمەرگەیەکم نارد بۆ لای برادەرانی خۆمان، ناوەکانم بۆ ناردن. وەرەقەیەکیان بۆ سەیتەرەکەی گوێزێ بۆ کردین. دەبوایە ئەوان وەرەقەیان بۆ بکردینایە، ئەوجا دەمانتوانی بچوینایەتە دیوی ئێران. دوای نیوەڕۆ بوو، بۆ عەسرەکەی چووینە سەیتەرەکە. سەیرمکرد کاک ئازاد هەورامیش لە وێ بوو. ئەوان لە ئێرانەوە هاتبوونەوە. دەبوایە لە وێشەوە ئێران رازی بێت بۆ هاتنەوە بە دیوی عێراقدا. زۆر دەمێك بوو یەکترمان نەبینی بوو. ئەو لێپرسراوی بادینان بوو. لە وێوە گەڕابۆوە. لە سەیتەرەکە، نەیان دەهێشت کەس بڕوات. زۆر دوایان دەخستین. هەبوو دوو رۆژ لە وێ بوو. ئیتر کاک ئازاد چوو پێی وتن:

" –ئەمە ئاوات قارەمانیە مەسئولی عەسکەری مەڵبەندی یەکە. ئەڕوات بۆ بادینان، بەڵکو زوو وەرەقەی بۆ بکەن."

کاک ئازادیان دەناسی. ئەو سەرکردایەتی بوو، گەڕابۆوە. دەچوو بۆ لای برادەران بۆ مەڵبەندی سێ. یەکسەر ناوەکانیان وەرگرتو وەرەقەیان بۆ کردین. بە ئوتومبیلی

خۆشیان به ڕێیان کردین. بۆ ئێواره چووینه گوندێکی ئێران. ئه‌و گونده زۆر گه‌وره بوو. ماڵی دووسێ براده‌ری خۆمانی لێ بوو. چووینه ماڵی کاك (نزار) له گومرگ بوو. گونده‌که کاره‌باو دووکانی تیابوو. زۆر خۆش بوو. ئه‌و شه‌وه له وێ ماینه‌وه. بۆ به‌یانی به پاس به ڕێکه‌وتین به‌ره‌و شاری بانه. حاجی به‌کر وتی:

" –ماڵی حه‌مه جه‌زای برام له سه‌قزه."

من نه‌مده‌زانی سه‌قز ماڵی براده‌رانی خۆمانی لێیه. چووینه سه‌قز، ماڵی حه‌مه جه‌زامان دۆزیه‌وه. که چووینه ماڵه‌وه، سه‌یرمکرد ماڵی مه‌حمود کۆمه‌ڵه‌و حه‌مه جه‌زاو سه‌لاح کونجرین له یه‌ك خانوی گه‌وره‌دا به یه‌که‌وه بوون. ده‌توت ئوتێله. ئه‌وان زوتر چووبونه سه‌قز. هه‌ر له پێش چۆڵکردنی سه‌رکردایه‌تیدا، چونکه کاك مه‌حمود کۆمه‌ڵه سه‌ر تیپی تیپی تایبه‌تی تۆبخانه‌ی مه‌ڵبه‌ندی دوو بوو. ئێمه چووینه ماڵی مه‌حمود کۆمه‌ڵه. چوار پێنج ڕۆژ له ماڵی مه‌حمود ماینه‌وه، هه‌تا ژورێکمان دۆزیه‌وه گرتمان به کرێ. ژورێکی زۆر هه‌رزان بوو. وابزانم به (٥٠٠) تمه‌ن بۆیان گرتبووین. له جێگایه‌ك بوو، که‌سی خۆمان نه‌چووبوه ناوی. شوێنه‌که ناوی (حه‌ماڵاوا) بوو. خوا خوام بوو هه‌ر جێگایه‌کمان ده‌ست بکه‌وێت، به‌ڵام هه‌رزان بێ، چونکه پاره‌مان پێ نه‌بوو. بۆ خۆشم هیچم پێ نه‌بوو. باش بوو زه‌ینه‌ب له سلێمانیه‌وه حه‌وت سه‌د دیناری هێنابوو. بۆ ئه‌و کاته‌ش زۆر بوو. له ئێران یه‌ك دینار (٧٠) تمه‌ن بوو.

٨٨

شاری سه‌قز زۆر قه‌ره‌باڵغ بووبوو. براده‌رانی خۆمان هه‌موو له‌وێ کۆببونه‌وه، چونکه مقه‌ڕی په‌یوه‌ندیه‌کانی خۆمان له سه‌قز بوو. ئه‌و کاته دکتۆر که‌مال خۆشناو لێپرسراوی په‌یوه‌ندیه‌کان بوو. عه‌لی که‌مالو هه‌ندێ براده‌ری تریش، هه‌ر له په‌یوه‌ندیه‌کان بوون. زۆری پی نه‌چوو، ڕژێمی عێراق په‌لاماری بادینانیشی دا، هه‌مووی کردن به دیوی ئێرانو تورکیادا. که‌س له (بادینان)دا نه‌ما. هه‌تا ماوه‌یه‌کیش کۆمه‌ڵێك پێشمه‌رگه هه‌ر ون ببوون. که‌س نه‌یده‌زانی که‌وتونه‌ته کوێ. دوایی ده‌رکه‌وت چوار پێنجێکیان چووبوونه سوریاوه، ئه‌وانی تریش گه‌ڕابونه‌وه بۆ ئێران. ئیتر بادینانی منیش ته‌واو، چونکه ئه‌ویش نه‌ما.

ماوه‌یه‌ك له سه‌قز بووم، نه‌مان ده‌زانی چی بکه‌ین؟ زۆر ناخۆش بوو. هێزه‌کانی مه‌ڵبه‌ندی یه‌کیش هه‌موو له بناری قه‌ندیل کۆ ببونه‌وه، مقه‌ڕیان دانابوو. کاك قادریش له بناری قه‌ندیل بوو. شه‌هید ئازاد هه‌ورامی چووبوو بۆ ئه‌وناوه به دیوی حاجی هۆمه‌راندا، ماوه‌یه‌ك له‌و ناوه مانه‌وه. کاك نه‌وشیروانیش ئه‌و ماوه‌یه چووبوو بۆ قه‌ندیل. به‌ته‌مابوون هه‌ر له بناری قه‌ندیل بمێننه‌وه. مه‌ڵبه‌ندی سێش هه‌ر له جێگای خۆیان مابوون، جارێ به‌رگری له مه‌ڵبه‌ندی سێ بکه‌ن، نه‌یه‌ڵن دوژمن بیگرێ. هه‌ر

ئەوێ مابوو. نازانم حکومەت بۆ چی خۆی مات کردبوو بۆیان. هێزی مەڵبەندی یەکیشیان نارد بۆ ئەوێ لەگەڵ هەندێك هێزی لایەنەکانی تری کوردستان وەك حیزبی سۆشیالیستی کوردستان، کە کاك محەمەدی حاجی مەحمود خۆیو هێزەکەی چووبوون بۆ مەڵبەندی سێ. حکومەت هێزی بۆ ئامادە کردن پەلاماریان بدات. ئەو کاتەش هەر بناری قەندیل مابوو. دۆڵی خانەقاش رژێمی تیابوو. مەڵبەندی سێ گەمارۆ درابوو. ئەگەر حکومەت دۆڵی خانەقای بە تەواوی لێ بگرتنایە، نەیاندەتوانی بەرەو قەندیل پاشەکشە بکەن. هەر ئەوێش مابوو. شەڕی عێراقو ئێرانیش نەمابوو. جگە لە شارە گەورەکان بەو لاوە، هەر بە چەکی کیمیاوی ئاژەڵیشی نەهێشتبوو.

هەواڵ بۆ برادەران هاتبوو، ئەگەر دەر نەچن، وەزعەکە زۆر ترسناك دەبێت، چونکە دۆڵی خانەقاتان لێ دەگرن، ئەوجا هەروا بە ئاسانی دەر ناچن. دوا جار برادەران بڕیاریاندا بکشێنەوە بۆ بناری قەندیل. ئەوانیش هەندێك گوللە راجیمەیان هەبوو، هەموویان نابوو بە موعەسکەری عێراقەوە. ئەوسا پاشەکشەیان کردبوو بۆ بناری قەندیل. هەموو هێزی یەکێتـی لەو بنارە کۆببووبوونەوە. ئەوجا حکومەتی عێراق پەلاماری بناری قەندیلی دا. بە هەموو جۆرە چەکێك لێیدان. کاك ئازاد هەورامی لەوێ فڕۆکە لێی دابوو شەهیدی کردبوو. زۆر ناخۆش بوو. کاك ئازاد هەورامی ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیو کۆمەڵەش بوو. سەرکردەیەکی زۆر قارەمانو دڵسۆز بوو. هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە هاتە شاخ. ئەو کاتە مەسئولی کۆمەڵە بوو لە شاری کەرکوك. یەکێك بوو لە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان. لە ناو پێشمەرگەو برادەرەکانی خۆیدا خۆشەویست بوو. لە روی سیاسیەوە پیاوێکی زیرەكو لێهاتو بوو. شەهید بوونی خەسارەتێکی گەورە بوو لە یەکێتیو کورد کەوت. ئیتر تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ شاری سەقز، لەوێوە بردیانەوە بۆ هەورامان لە دیوی ئێران، دەوری (پاوە) لە گوندێکی ئەو ناوە بە خاکیان سپارد. ماڵی خزمەکانی لەوێ بوون. خۆشی خەڵکی هەورامان بوو. لە زووەوە چوو بوونە شاری کەرکوك. حکومەت لە بناری قەندیلیش دەریکردین. هەمووی کردین بە دیوی ئێراندا. ئەنفالی پێنجو شەشو حەوتیشی راگەیاند. لە مانگی نۆ بۆ دەی ساڵی ١٩٨٨ سەراپا کوردستانیان چۆڵکرد لە پێشمەرگەو خەڵکی گوندەکان. هەتا قەزاکانیش نەمان. چەند قەزایەك مابوو، ئەویش زۆر نزیك بوون لە پارێزگاکانەوە، بۆیە مابوون.

٨٩

هەموو هێزی پێشمەرگە لە بناری قەندیل، بە سنووری ئێراندا هاتنە دیوی ئێران. من ئەو کاتە هەر لە شاری سەقز بووم. کاك نەوشیروان هاتبوو بۆ سەقز. نامەیەکم بۆ نوسی تیایدا وتم:

" –(ئەوە من هاتووم بۆ ئێران ماڵەکەم دابمەزرێنمو خۆم بچم بۆ بادینان. خۆ تازە بادینانیش نەما. نامەوێت لە ئێران دابنیشم. دێمەوە بۆ لای ئێوە بۆ بناری قەندیل.)"
ڕۆژێك کاك نەوشیروان ناردی بە دوامدا. ئەو کاتە کاك دکتۆر کەمال خۆشناو ماڵەکەیو مقەڕەکەی لە سەقز بوو. کاك نەوشیروان لە وێ بوو، تازە هاتبۆوە بۆ سەقز. ئەو کاتە ئەویش لە بناری قەندیل بوو لە گوێزێ. دوای نیوەڕۆ بوو ناردی بە دوامدا وتی:
" –با بڕۆین."
ڕۆشتین بەرەو شاری (مهاباد) لەوێ بۆ (خانە) بۆ ئێوارە چووینە بناری قەندیل. ئەو شەوە لە گوندێك بووین، ماڵی برادەری خۆمانی لێ بوو. بیرم ناکەوێتەوە ماڵی کێ بوو. بۆ بەیانی چووین بۆ قەندیل. کە چووین، هەموو برادەران هاتن بۆ قەندیل. هەندێکیان لەوێ دەواریان هەڵدا. کاك نەوشیروانو کاك کۆسرەتو ملازم عومەرو کاك قادری حاجی عەلیو کاك حەمە تۆفیق هەموو لەوێ بوون. کۆبونەوەیەکمان کرد، وتیان:
" –چۆن هێزەکان تەوزیع بکەین بە سەر سنورەکاندا، بۆ ئەوەی بڵاو نەبنەوە، چونکە دیوی عێراق نەماوە."
کاك نەوشیروان لە منی پرسی وتی:
" –کوێ باشە مقەڕی لێ دابمەزرێنین، بۆ ئەوەی بتوانین بۆ ناوچەی سلێمانیو گەرمیان هاتو چۆ بکەین.؟"
منیش وتم:
" –کاك نەوشیروان ئەگەر ئێران ڕێمان بدات (بلەکێ) زۆر باشە بۆ مقەڕ، چونکە سەر سنورەو لە ناوچەی شار بازێڕەوە نزیکە. لەوێشەوە بۆ ناوچەی گەرمیان."
کاك حامیدی حاجی غالی وتی:
" –سورێن باشە."
کاك نەوشیروان وتی:
" –وایە سورێن باشە بۆ گەرمیان."
منیش وتم:
" –سورێن باش نیە."
کاك نەوشیروان وتی:
" –تۆ حەزت لە بلەکێ یە، بچۆ بۆ ئەوێ."
وتم:
" –کاك نەوشیروان خۆ من ماڵی باوکم لەوێ نیە هەتا حەز بکەم. ئەوەی من ئەی لێم وایە، لەوێوە باشە بۆ سلێمانیو گەرمیان."
وتی:
" –باشە تۆ بچۆ بۆ ئەوێ."

ئیتر بڕیارماندا مەڵبەندەکان تەوزیع بکەن. مەڵبەندی یەك بۆ سورێن، بەڵام نەیانتوانی بچن، چونکە هەمووی ڕەبایەی ئێرانی بوو. چوونە (کانی دینار) حامید بۆ ئەوێ چوو. مەڵبەندی دوو بۆ (بلەکێ) من چووم. مەڵبەندی سێ بۆ (ناوزەنگ)و دەورو بەری شێنێ. دوایش هەروەك جاران مەڵبەندەکانیان دانایەوە بەم جۆرە: .
قادری حاجی عەلی لەگەڵ شێخ جەعفەرو من، بۆ مەڵبەندی دوو لە بلەکێ. حامیدو شێخ عەلیو ئەو برادەرانەی تر بۆ مەڵبەندی یەك. حەسەن کوێستانیو برادەرانی تری مەڵبەندی سێو چوار، بۆ ناوزەنگ. ئیتر بەو شێوەیە لەو ناوچانە هەموو هێزەکانمان کۆ کردبۆوەو مقەڕمان دامەزراند.
ماوەیەك لە وێ بووم. ماڵەکەشم لە سەقز بوو. بە زۆری هەر لە بلەکێ بووم. ماوەیەکی پێ چوو. وەزعمان زۆر خراپ بوو، چونکە یەکێتی پارەی نەبوو. ژیان لە ئێرانیشدا زۆر گرانی بوو. ئەو پارەیەی دەیاندا پێمان، بەشی هیچی نەدەکرد. دەبولیە کرێی خانومان لێ بدایە. کاك نەوشیروان وتی:
" -ئەو پارەیەی، کە یەکێتی هەیەتی ئێستا، بەشی یارمەتی یەكساڵی پێشمەرگە ئەکات. بەو شێوەیەی، کە دامانناوە."
ئەو ساڵەمان بەو حاڵە بردە سەر. زۆر بێ پارە بووین. ساڵی ۱۹۸۹ بوو. مام جەلال لە دەرەوە هاتەوە پارەکەی زیاد کردەوە بۆمان. وتی:
" -پارەمان زۆرە خەمتان نەبێت."
زۆر دڵمان خۆش بوو. مام جەلال هاتەوەو کاك نەوشیروان سەفەریکرد بۆ دەرەوە. یەك دوو مانگ زۆر باش بوو. لە پڕ پارە نەما. برادەرێکمان هەبوو ناوی لوقمان شاسوار بوو، بە زۆری لەگەڵ خۆمدا بوو. زۆر هاوڕێ بووین. کاتی خۆی داوام کرد بیکەن بە رابەر سیاسی لە تیپی ٥٥ی قەرەداغ. زۆر یارمەتیم دەدا لە هەموو روویەکەوە. زۆرم خۆش دەویست، چونکە هەموو خێزانەکەیان یەکێتی بوون. کاتی خۆشی برایەکی شەهید بووبوو. زۆر ڕێزم لێ دەگرت. زۆر قسە خۆش بوو. ڕۆژێك هات بۆ لام وتی:
" -من بۆ سلێمانی ئەچمەوە، کاك نەوشیروان بە ئێش ئەمنێرێتەوە. هەر بە سەیارەش ئەچم. ڕێگاکە زۆر ئەمینە، چونکە لەگەڵ خەڵك ئەڕۆم. برازنم لەگەڵ خۆم دێتەوە. بۆ زەینەب خانیش نانێریتەوە، بە یەکەوە ئەیانبەمەوە، ئەشیان هێنمەوە."
وتم:
" -زۆر باشە. بە راستی پیاوەتیەکی باشە."
بڕیارمدا وتم:
" -با زەینەب بچێتەوە، هەندێك پارەشمان لە لای خزمان بۆ بێنێت. هەندێك شتی خۆشمان مابوو لە سلێمانی، بیانفرۆشێتو پارەکەی بێنێتەوە بیخۆین."
ڕۆشتنەوە بۆ سلێمانی. ئەو کاتەی ئەوان ڕۆشتنەوە، قەڵادزێ مابوو نەروخابوو. یەك هەفتە دوای ڕۆشتنەوەی ئەوان، هەواڵمان بۆ هات وتیان:

" –حکومەت قەڵادزێ تێك ئەدات."
هاوڕێکانی هاتنەوە، زەینەب نەهاتبۆوە. چووم بۆ لایان وتم:
" –ئەوە زەینەب کوا.؟"
وتیان:
" –چووین بە دوایدا بۆماڵی خوشکەکەی، لە وێ نەبوو. ئێمەش بە پەلە گەڕاوینەتەوە، نەمانتوانی چاوەڕێی بکەین."
زەینەب لە سلێمانی گیری خوارد، چونکە رژێم قەڵادزێی گواستەوە. رێگا نەما. جاران بە ناوی قەڵادزێوە خەڵك هاتوو چۆی دەکرد، کە ئەویش نەما، ئیتر رێگاکە گیرا. منیش لەوێ گیرم خواردبوو بە دەست منداڵەوە، چونکە هێشتا منداڵەکانم بچووك بوون. دایکیشیان لە وێ گیری خواردبوو. هەر رۆژەی لە ماڵێك خۆی دەشاردەوە. مەترسی گرتنی هەبوو. ئەگەر بگیرایە، یان ئیعدام بوو، یان زیندانی ئەبەدی بوو، چونکە هەر کەسێك لە ئێرانەوە بڕۆشتایەتەوە، یەکسەر دەگیرا. هەر نەیدەوێرا بێتە دەرەوە. هاتوو چۆشی نەبوو. تەنانەت ئەو برادەرانەی (حیزبی دیموکرات) یش نەیاندەتوانی بیگەیەننە سەر سنور. لە بەر ئەوەی ناوچەکە چۆڵ بووبوو. بۆ خۆشم باری تەندروستیم باش نەبوو، ئەژنۆم زۆر خراپ بوو. چووم بۆ تاران بۆ لای دکتۆر، وتیان:
" –ئەبێت نەشتەرگەریت بۆ بکرێت."
هاتمەوە بۆ لای برادەران پێم وتن. ئەوانیش وتیان:
" –خراپە نەشتەرگەری بۆ مەکە، چونکە ئەژنۆت سەقەت ئەبێت. خۆ دەتوانین پارەت بۆ پەیدا بکەین بۆ ئەوەی نەشتەرگەری پێ بکەیت."
ملازم عومەر وتی:
" –مام جەلال بە رێوەیە دێتەوە. لەوانەیە هەندێك پەساپۆرتو پارەشی هێنا بێت. بەڵکو بتنێرێتە دەرەوە بۆ عیلاج. چاوەڕوان بکە."
منیش وتم:
" –باشە."
زۆری پێ نەچوو، مام جەلال گەڕایەوە، هاتەوە بۆ قاسمەرەش. رۆژێك کاك وەهاب هەر لە سەقز بوو. هێشتا بۆی نەکرابوو بچێتە دەرەوە. ئەو لە زووەوە لە سەقزبوو. بەتەمای سەفەری دەرەوە بوو، هەر نەڕۆیشتبوو. وتی:
" –بۆ نایەیت بچین سەردانێکی مام جەلال بکەین. من هەندێك ئیشم بەو هەیە. تۆش لەوەتەی هاتۆتەوە، هێشتا سەردانت نەکرووە."
وتم:
" –زۆر باشە، خۆ منیش هێشتا نەچووم بۆ بەخێر هاتنەوەی."
بە یەکەوە چووین بۆ قاسمەرەش بۆ لای مام جەلال. ئەو کاتە سەرکردلیەتی مقەڕی لە قاسمەرەش بوو. بۆ ئێوارەکەی گەیشتینە قاسمەرەش. چووینە لای مام جەلال بە خێر

هاتنەوەمان کردو هەندێك لای دانیشتین. تۆزێك باسی سەفەرەکەی خۆی بۆ کردین لە دەرەوە، ئەوجا وتی:
" –بەیانی زیاتر دادەنیشین قسە دەکەین."
من ئیشم نەبوو، بەلاّم وەهاب ئیشی بە مام جەلال هەبوو، بۆ ئەوەی یارمەتی بدەن بۆ سەفەرکردنەکەی. شەو لە مەکتەبی سیاسی بووین. بەیانی گوێمان لە رادیۆ بوو، هەواڵی مردنی (ئیمام خومەینی) راگەیاند. ئەو شەوە ئێمە لە قاسمەرەش بووین، ئیمام خومەینی کۆچی دوایی کرد. مام جەلال خۆی ئامادە کرد بڕوات. بە کاك وەهابم وت:
" –ئەوە مام جەلال ئەڕوات. بڕۆ پێی بڵێ بۆ ئیشەکەی خۆت. ئەگینا بڕوات، لەوانەیە نەی بینیتەوە."
چووین بۆ لای مام جەلال، سەیرمانکرد بە سەر ڕێوەیە بڕوات. وتی:
" –ئەوە ئیمام مردووە. شەو بروسکەیان بۆ کردووم، ئەبێت نیوەڕۆ لە (کرمانشاه) بم. ئێوەش وەرن، بە یەکەوە لە ڕێگا قسەش ئەکەین."
وتمان:
" –باشە."
ئێمەش لەگەڵ مام جەلال گەڕاینەوە بۆ ئێران، بەلاّم بە چ حاڵێك گەیشتینەوە سەقز. هەر هەموو سەیتەرەکان وەها گیرا بوون، نەیان دەهێشت یەك نەفەر بڕوات. بە تایبەتی ئەوەی عێراقی بوایە. بە زەحمەتێکی زۆر چووینەوە بۆ سەقز. بۆ نیوەڕۆکەی چووینە ماڵی دلێری سەید مەجید. بە کاك وەهابی وت:
" –بڕۆ شتەکانت بێنە، خۆت ئامادەکە لەگەڵ خۆم وەرە. بەڵکو ئیشەکەت بۆ جێ بەجێ بکەین."
کاك وەهاب رۆیشتەوە بۆ ماڵەوە خۆی ئامادە بکات. بە منیشی وت:
" –تۆ بۆ نایەیت بە یەکەوە بچین بۆ کرمانشاه، خۆ ئیشت نیە.؟"
منیش وتم:
" –نە وەلاّ، باشە دێم."
منیش لەگەڵ مام جەلال رۆشتم بۆ کرمانشاه. شەو گەیشتینە کرمانشاه. ئەو کاتە مامۆستا عەبدولاّ مەسئولی پەیوەندیەکانی ئێران بوو. لەگەڵ مامۆستا دلێر لە ماڵی مامۆستا عەبدوڵلا بووین. دکتۆر کەمال خۆشناویشمان لەگەڵ بوو لەگەڵ کاك فەرەیدون عەبدولقادر. ئەوانیش هەر لەگەڵ مام جەلال بوون دەچوون بۆ پرسەی ئیمام. مام جەلال پێی وتم:
" –ئاوات تۆ بۆ ناچیت سەردانێکی دەرەوە بکەیت بۆ عیلاج. مەکتەبی سیاسی باسیان کردوویت، بتنێرن بۆ دەرەوە."
منیش وتم:

" –مام جەلال ئەوە جەنابت ئەزانێ. ئەگەر بۆم بکەن، بۆ ناچم؟ زۆر سوپاسیشتان ئەکەم."
کاك فەرەیدون عەبدولقادریش وتی:
" –مام جەلال بە راستی کاك ئاوات هەر چیەکی بۆ بکەیت، هەر کەمە."
مام جەلالیش وتی:
" –جا وایە، هەر چیەکمان پێ بکرێت بۆی ئەکەین."
بانگی مامۆستا دلێری کرد وتی:
" –کاك دلێر بە پەلە داوای لیزە پاسێك بۆ کاك ئاوات بکە، بۆ ئەوەی بتوانێت سەفەر بکات بۆ سوریا."
کاك دلێریش زۆر پیاوێکی موئەدەب بوو، زۆرم خۆش دەویست، چونکە لە تیپی ٤٧ بە یەکەوە بووین. من زۆرم رێز لێ دەگرت. مەسئولی رێکخستنی کۆمەڵە بوو لە تیپ. وتی:
" –باشە بە سەر چاو."
دوایی دلێر بە خۆمی وت:
" –کاك ئاوات بە خوا پاش یەك ساڵ بۆمان ناکەن. بۆ بە مام جەلال ناڵێیت پەساپۆرتت بۆ بکەن. ئەوە زوو تەواو ئەبێتو ئاسانترو زۆر باشترە."
من لە روم نەدەهات بە مام جەلال بڵێم لیزە پاس وا زوو ناکەن. ئیتر بە مام جەلالم وت:
" –مام جەلال بۆ پەساپۆرتم بۆ ناکەن، چونکە کاك دلێر ئەڵێت زۆر زەحمەتە لیزەپاس زۆریشی پێ ئەچێت."
وتی:
" –زۆر باشە، پەساپۆرتمان هەیە لە تاران لای (دکتۆر شالاو)ە بەو دەڵێین بۆت بکات."
دکتۆ شالاو مەسئولی تاران بوو. ئیتر هەر لە کرمانشاه بووین، هێشتا بە رێ نەکەوتبووین بۆ تاران (رەسوڵ مەمەند)و (خاڵە حاجی) ش هاتن بۆ لای مام جەلال بۆ ماڵی مامۆستا عەبدوڵلا. مام جەلالیش پێی وتن:
" –بۆ نایەن بۆ پرسەی ئیمام خومەینی.؟"
وتیان:
" –ئاخر ئێمە چۆن بێین؟ هیچمان پێ نیە پێی بێین."
وتی:
" –لەگەڵ من وەرن."
وتیان:
" –باشە."
هەر لە وێ بە منو کاك وەهابی وت:

" –ئێوه لێره بن، هەتا خۆم جوابتان بۆ ئەنێرم. با کاک رەسول‌و کاک حاجی بێن."
وتمان:
" –باشه."
چونکه، که ئەوان هاتن، جێی ئێمه نەدەبۆوه. ئێمه له وێ ماینەوەو ئەوان رۆشتن. چوار پێنج رۆژ له وێ ماینەوه. زۆر بێ تاقەت بووین، چونکه شار چۆڵ‌و هۆڵ بوو. یەك دووکان‌و بازاڕ نەبوو. ئیتر به تەلەفۆن لەگەڵ مام جەلال قسەمانکرد، پێمانوت:
" –بۆ نەگەڕێینەوه بۆ سەقز. تازه بڕوا ناکەین هیچ بکرێت."
وتی:
" –باشه بڕۆنەوه دوایی، که خۆم هاتمەوه، ئیشەکانتان جێ بەجێ ئەکەین."
ئینجا چۆن بگەڕێینەوه؟ دوو جار رۆشتین، له نیوەی رێگا دەیانگێڕاینەوه. تەلەفۆنمان کردەوه بۆ مام جەلال وتمان:
" –ناتوانین بگەڕێینەوه."
له وێوه به قەرارگای کرمانشاه یانوت، یەك مەفرزه پاسداریان لەگەڵ ناردین. بەو حاڵه هەتا چووینەوه سەقز. ماوەیەکی پێ چوو، مام جەلال گەڕایەوه. چوومەوه تا پێی بڵێم. برادەران وتیان:
" –باشه کاک ئاوات بۆ خۆت ئەچیته دەرەوه، بۆ به یکجاری ماڵ‌و منداڵەکەت لەگەڵ خۆت نابەیت."
منیش وتم:
" –من بۆ عیلاج ئەچم‌و نەگەڕێمەوه. به چی ماڵ‌و منداڵ بەرم. خوا خوامه خۆشم بنێرن."
پێش خۆم، هیوا هەڵی پێچابووم دەیوت:
" –یان ئەبێت بمنێریته دەرەوه، یان ئەڕۆم خۆم تەسلیم ئەکەمەوه."
منیش دڵنیا بووم بڕواتەوه، یەکسەر دەیکوژن. لەو کاتەشدا رۆژانه خەڵك دەڕۆیشتنەوه بۆ عێراق. یەکێتیش خەڵکی زۆری دەنارد به (زەماله) بۆ وڵاتەکان. بۆ هیوا وتیان:
" –منداڵه وەری ناگرن."
دوایی به ملازم عومەرم وت:
" –کاک عومەر من ناچم بۆ عیلاج، بەس هیوام بۆ بنێرن بۆ دەرەوه."
کاک عومەر وتی:
" –باشه کار ئاسانی بۆ ئەو هەموو خەڵکه ئەکەن، قابیله بۆ هیوای نەکەن. خۆ هیوا له هەموویان موستەحەق تره."
پەساپۆرتیان بۆ کرد. ئاراسی شێخ جەنگی وتی:

" –من دووسێ برام له سۆڤیەتە، له وێ خەڵك وەرئەگرن بۆ (پەیمانگا) شەرت نیه بۆ زانکۆ بێت. تۆ رەقەمی پاسپۆتەکەیم بدەرێ، لەگەڵ شەهادەی مەکتەب. من ئەی نێرم بۆ ئەوێ بۆ لای ئەو برایانەم. له وێ زەمالەی بۆ ئەکەن."

ئیتر باش بوو، هیوام له کۆڵ بۆوە. هەر بەتەما بوو جوابی زەمالەی بۆ بێتەوە. رۆژێك مام رۆستەمو کاك شێخ جەعفەر له سەقز بە دوامدا دەگەڕان. هاتن بۆ لام وتیان:

" –ئەوە له کوێیت ئێمە بە دواتا ئەگەڕێین. ؟"

وتیان:

" –ئێمە بە مام جەلالمان وتوە، مام جەلال ئێوە کاك ئاوات ئەنێرن بۆ دەرەوە، بۆ چی بە یەکجاری ماڵو منداڵەکەشی نەبات؟ یارمەتی بدە."

مام جەلالیش وتی:

" –زۆرم پێ خۆشە، ئەگەر حەز ئەکات بیان بات، ئێمە بۆی ئەکەین."

منیش وتم:

" –ئەوە رائەبوێرن. ؟"

وتیان:

" –بە گۆڕی شەهیدان. با بڕۆین بۆ ئەوێ."

مام جەلال له ماڵی دکتۆر کەمال خۆشناو بوو، کە چووین بۆ ماڵی دکتۆر کەمال، مام جەلال نوستبوو. کاك فەرەیدون له وێ دانیشتبوو. وتی:

" –کاکە، مام جەلال موافەقەتی کردووە. بچۆ بۆ تاران بە دکتۆر شاڵاو بڵێ پەساپۆرتێکت بۆ بکات بۆ هەموو ماڵو منداڵەکەشت."

وتم:

" –ئەی نامەیەك بۆ دکتۆر شاڵاو."

فەرەیدون خۆی نامەکەی نووسی بۆ دکتۆر شاڵاو. کاك فەرەیدون مەکتەبی سیاسی بوو. رەسمی هەموومانم برد بۆ تاران، له وێ پەساپۆرتی بۆ پڕ کردمەوە وتی:

" –بیبە بۆ کرمانشاە بۆ لای دانای ئەحمەد مەجید."

ئەو کاتە ئەو مەسئول بوو له وێ. دەبوایە له کرمانشاە موافەقەتیان بکردایە، ئەوجا له تاران دەیانکرد. دکتۆر موشیر له تاران بوو، ئەویش ئیشوکاری خۆمانی لەگەڵ ئێران دەکرد. وتی:

" –کاك ئاوات بیدە بە خۆم. کرمانشاهی ناوێ. خۆم لێرە پێیان ئەکەم."

زۆر وریابوو. بیویستایە دەیکرد. دامە دەستی پێم وت:

" –ئاخر دکتۆر موشیر دەیکەیت. ؟"

وتی:

" –جا کاك ئاوات من بۆ مامی خۆمی نەکەم، بۆ کێی بکەم. دڵنیابە زوو بۆت رائەپەڕێنم."

دامەدەستیو گەڕامەوە. ئیتر زۆر گوێم نەدەدایە. پەلەم نەبوو. هەر لێم نەپرسیەوە. لەو لاشەوە زەینەب هەر لە سلێمانی گیری خواردبوو. جار جار دەچووم بۆ قاسمەرەش، بۆ ئەوەی بزانم نەفەرێك نابێت، بینێرم بە دوایدا. دووسێ نامەشم نوسیبوو بۆ برادەرێك، کە هەوڵ بدات بۆم رەوانە بکاتەوە. لە بەختی من ئەو لە سلێمانی نەمابوو، چوو بوو بۆ بەغداد. کەسیش نەبوو بینێرم بۆ لای. پێش رۆشتنەوەی بۆ سلێمانی تەسکەرەی ژنی ئەو برادەرەم دابوویە بۆ کاتی پێویست بۆ سەیتەرەی عێراق، کە خۆی بکا بە ئێرانی بڵێ من خێزانی ئەوم. ئەو کەسە برادەرێکی ئێرانی بوو. ئیتر هەر ئەو تەسکەرەیە فریای کەوتبوو. لە پاش سێ مانگ گەڕایەوە. لە رێگا گرتبوویان، گێڕابوویانەوە بۆ رانیە. پێیان وتبوو:

" —تۆ ئێرانی نیت، خەڵکی سلێمانیت."

دوو برادەری ئێرانیشی لەگەڵ دەبێت، ئەوان وتبوویان:

" —بە خوا ئێمەش تیاچووین."

زەینەب زۆر ئازایانە وتبووی:

من ئێرانیمو ژنی فلانکەسم. هاتووم بۆ لای ئەو، لە بەغداد بووە. نەچوومو گەڕاومەتەوە ئێران. ئێوەش لە سنورەوە منتان گێڕاوەتەوە. تازە ناڕۆمەوە، ئەبێ بمبەن بۆ لای مێردەکەم بۆ بەغداد."

هەموو دەیان ناسی. ئەو برادەرە مەسئولی حیزبی دیموکرات بوو لە بەغداد. شەخسی خۆی زۆر هاوڕێم بوو. لە یەکترەوە نزیك بووین. برادەرایەتیشمان دەگەڕێتەوە بۆ پێش حیزبی دیموکرات. ئیتر زەینەبیش زۆر موسەیتەرانە قسەیکردبوو. ئەوانیش بروایان پێ کردبوو. لە پاش دوو سەعات بەریان دابوو. داوای لێبوردنیان لێ کردبوو وتبوویان:

" —بە ئێمەشیان وتووە ئەو ژنە خەڵکی سلێمانیە. بۆیە ناردمان لە سنوورەوە گێڕامیانەتەوە."

باشبوو، هەم خۆی رزگار بووبوو، هەم ئەو دوو برادەرەی، کە لەگەڵیابوون. هاتەوەو هەندێ پارەشی هێنابۆوە. ماوەیەکی زۆر هەر لە سەقز ماینەوە. کۆمەڵێك برادەری باش لە وێ بوون، رۆژانە بە یەکەوە بووین. بێتاقەت نەدەبووین. لەوانە، مەحمود کۆمەڵە، وەهاب، جەلالی حەمەی محێدین بە داخەوە شەهیدبوو. زۆر پیاوێکی باش بوو. بەختیاری برای جەلالو شێخ کامیلو حەمە جەزاو زۆر لە برادەرانی یەکێتی لەوێ بوون. ئیتر وردە وردە خەڵك سەفەری بۆ وڵاتەکانی ئەورووپاو پاکستان دەکرد. وەزعەکە بەرەو خراپی دەڕۆیشت. ئێرانو عێراق بە تەواوی رێکەوتبوون. بە تەمابوون دوورمان بخەنەوە لە سنور، بچینە ئۆردوگاوە، کە رەنگە زۆر زەحمەت بولیە بۆ پێشمەرگەی یەکێتی. یەکێتی بۆ خۆی پێی باشبوو، ئەگەر هەندێ لەو کادرانەی بتوانن بچنە دەرەوە بۆ ئەورووپا. من بۆ خۆم موعامەلەیان بۆ کردبووم بۆ دەرەوە. زۆر گرنگ

نەبوو بە لامەوە. لێم نەدەپرسیەوە. من پارەم نەبوو دەشم زانی یەکێتی پارەم بۆ نادا. دەیانوت پارەمان نییە. لە بەرئەوە خۆم لە موعامەلەکە نەدەگەیاند.
جارێ چووم بۆ قاسمەرەش بۆ لای کاک ئەوشیروان پێم وت:
" -کاک ئەوشیروان ئەتوانن یارمەتیم بدەن بۆ سەفەرەکەم.؟"
وتی:
" -ئێمە ناتوانین یارمەتی ماڵو منداڵ بدەین، چونکە ئێستا پارەمان نیە، بەڵام ئەتوانین یارمەتی خۆت بدەین."
منیش وتم:
" -کاک ئەوشیروان داوای ئەوەت لێ ناکەم یارمەتی ماڵو منداڵ بدەن. من بۆ خۆم مافی ئەوەم هەیە وەك ئەو پێشمەرگانەی، کە نەخۆشن ئەیانێرن بۆ دەرەوە لە سەر حسابی یەکێتی."
وتی:
" -مافی ئەوەت هەیە، ئەگەر بۆ گەشتو گوزاریش بچیت یەکێتی ئەتنێرێ، نەك بۆ نەخۆشی."
منیش وتم :
" -دە من هەر ئەوەندەم ئەوێت."
وتی:
" -ئەوە لە سەر من. من یارمەتی خۆت ئەدەم."
هەتا وتی:
" -روی نەبوونی رەش بێت، ئەگینا جاران بوایە، چیت بویستایە ئەماندا پێت. وەك چۆن بۆ ئەو برادەرانەی ترمان کردبوو."
رێکەوتین لە سەر ئەوەی یەکێتی پارەی سەفەرەکەی خۆم دابین بکات، ماڵو منداڵیش لە سەر خۆم. گەڕامەوە بۆ سەقز. لەگەڵ شێخ کامیل بە یەکەوە بووین. ئەو کاتە مام جەلال لە دەرەوە بوو. هەر کاك ئەوشیروان لە وێ بوو. لەو کاتەشدا کوڕێکی خزمی خۆمان ناوی زێوەری وەستا عەزیزبوو، خۆیو خێزانەکەی لە سەقز بوون. بە سەردان هاتبوو بۆ ماڵی خۆمان لەگەڵ ماڵو منداڵەکەی. ئەو لەگەڵ حیزبی شیوعی بوو. ئەوانیش بە تەمای سەفەر بوون بۆ دەرەوە، بەڵام ئەوان بە تەمابوون حیزبی شیوعی بە رێگای قاچاخ رەوانەیان بکات. کوڕێکی خزمی چوار هەزار دۆلاری بۆ ناردبوو بۆ ئەوەی سەفەری پێ بکەن، دای بە ئێمە وتی:
" -ئێمە حیزب ئەماننێرێت، تۆ سەفەری پێ بکە."
بەڵام من قبوڵم نەکرد. بە زۆر دوو هەزاری بۆ بە جێ هێشتین. برادەرێکی خۆشم هەبوو ناوی عەبدولڕەحمان قەرەداغی بوو. ناسرلو بە (گۆران قەرەداغی) لە سوید بوو. من هەر نەشم دەزانی لە کوێیە، هەر بیرم نەمابوو. رۆژێك برادەرێك هات پێی وتم:

" -کاك ئاوات عەبدولڕەحمان قەرەداغی ئەحواڵی تۆی لە من پرسی، ئەڵێت با تەلەفۆنێکم لەگەڵ بکات."
منیش وتم:
" -لە کوێ یە."
وتی:
" -لە سویدە."
ژمارەی تەلەفۆنەکەی دامێ. چووم تەلەفۆنم بۆ کرد. زۆر قسەمانکرد، چونکە زۆر برادەر بووین. لە کاتی خەباتی ناو شارەوە، لە سەرەتای شۆڕشەوە، هاوڕێ بووین. ماوەیەك هاتە دەرەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ. ئەو کاتە من لە وێ بوم، هەر بە یەکەوە بووین. ئەو یەکێتی نەبوو. هەر پیاوێکی مارکسی بوو. دوای ماوەیەك لەگەڵ (فازیلی مەلا مەحمود) چووە دەرەوە. لە ساڵی ۱۹۷۷دا، ئەو ماوەیەی بە سەردا تێپەڕیبوو. زۆر خۆش بوو، کە گوێم لە دەنگی بۆوە. پێی وتم:
" -زۆر دەمێکە بە دولتا ئەگەڕێم، کەس پێی نەئەوتم تۆ لە سەقزیت. هەتا شەماڵ پێی وتم."
شەماڵ پێشمەرگەیەك بوو لای کاك نەوشیروان شۆفێر بوو. خزمی خێزانەکەی بوو. ئەو پێی وتبوو من لە کوێم. وتی:
" -کاکە گیان دیارییەکی بچووکم داناوە بۆ منداڵەکانت، ئەمەوێت بۆیان بنێرم، بەڵام چۆن بینێرم. ژمارەی حسابی برادەرێکم بۆ بنێرە، بۆ ئەوەی رەوانەی بکەم بۆیان."
منیش بە راستی پێم وت:
" -کاك عەبدولڕەحمان وەزعمان زۆر باشە، سوپاس ئەو ئەحواڵ پرسینەت بۆ من گەورە ترین دیاری یە."
وتی:
" -کاکە گیان من بۆ تۆی نانێرم. بۆ برازاکانی خۆمی ئەنێرم. کەمیشە."
(۱۵۰۰) دۆلار بوو. قەت ئەو پیاوەتیەم لە یاد ناچێ. ئەوە ئومێدێکی داینێ بۆ سەفەرەکەمان. کاك سامانی گەرمیان ئەو کاتە لە سوید بوو، ئەویش گەڕایەوە بۆ سەقز بە سەردان. دەوری (۲۰۰۰) دۆلاری بۆ هێنابووم. بە خۆیو وەهابو ئەبو شەهاب. دەوری (٦۰۰۰) دۆلار بوو. برادەرێکی تریش هەزاری بۆ ناردم باش بوو. زۆر سوپاسیان دەکەم. گەورە ترین یارمەتی بوو بۆ من لەو رۆژەدا. من قەد ئەوەم لە یاد ناچێتەوە. زەینەبیش ئەو کاتە لە سلێمانییەوە هاتەوە (٤۰۰۰) دیناری هێنابۆوە، زۆر باش بوو. بە (سەرهەنگی ئیسماعیل بەگ)م وت:
" -بەڵکو ئەو موعامەلەیەم بۆ تەواو بکەیت."
هیوام پەیدلکردبوو، چونکە پارەی سەفەرەکەمان دابین کردبوو، بەڵام هەر کەم بوو بۆ سەفەری هەموومان. زۆری پێ نەچوو، سەرهەنگ لە تاران جوابی بۆ ناردم وتی:

" –معامەلەکەم بۆ تەواو کردویت. "
ئەو کاتە سەرهەنگ لە پەیوەندیەکان بوو لە تاران، کە چووم وتی:
" –ئەوە موعامەلەکەت لای من تەواو بووە. بچۆ بە (بەکر فەتاح) بڵێ، ئەویش ڤیزەی سوریات بۆ وەربگرێت. "
بەکر فەتاحیش مەسئولی ئەو ئیشانەبوو، لەگەڵ سەفارەتەکان. ئەویش ڤیزەکەی بۆ وەرگرتم. سەرهەنگ پێی وتم:
" –کاک ئاوات ئەگەر پەلە نەکەیت، بزانم شتێکت بۆ ناکەم. جار جار ئێران خەڵکمان بۆ ئەنێرێت بۆ سوریا لە سەر حسابی دەوڵەت، بە ناوی میوانەوە. ئەگەر پەلە نەکەیت بەڵکو ئێوەش بنێرن. "
وتم:
" –زۆر باشە هیچ پەلەم نیە. کەی بوو، جوابم بۆ بنێرە، ئەو کاتە دێمەوە. "
گەڕامەوە بۆ سەقز بۆ ماڵەوە. ئیتر گوێم نەدایە. ئەو کاتە مام ڕۆستەم لە گەرمیان گەڕابۆوە. ماڵەکەی لە (سەبە تولە) بوو. گوندێك بوو لە نێوان سەقزو بانەدا بوو. لە بانەوە زۆر نزیك بوو. چووم بۆ سەردانی، لە ماڵەوە نەبوو. نازانم لە کوێ بوو. ئەو شەوە لە وێ بووم. بۆ بەیانی دانیشتبووم، تەلەفزیۆنەکەم کردەوە، سەیردەکەم، کەناڵی عێراق ڕاگەیاندنیان هەر نەشید وتنە. دیار بوو شتێ ڕوویدابوو. وتم دەبێ چی بووبێ!؟، چونکە شەڕی ئێران و عێراق نەمابوو. کە گوێمان گرت، باسی گرتنی کوێت دەکا. سەرگوڵی خێزانی مام ڕۆستەم لە چێشت خانەکەبوو، خەریکی ئیش بوو. بانگم کرد وتم:
" –سەرگوڵ خان وەرە گوێ بگرە، عێراق پەلاماری کوێتی داوە داگیری کردووە. "
زۆرمان پێ خۆش بوو. خۆ لەبەر داگیرکردنی کوێت نەبوو، بەڵکو خۆشی ئێمە بۆ ئەوەبوو، حکوومەتی عێراق خۆی تووشی کێشەیەکی گەورە کردبوو، هەر وا بە ئاسانی لە دەستی دەرنەدەچوو. ئەوە هیوایەکی تری پێ داینەوە. ئەو ماوەیە سەرقاڵ بووین بە دەنگو باسی عێراق و کوێتەوە، تا بزانین ئەنجامەکەی بە کوێ دەگا. ئێمە هەر دوعای ئەوەمان دەکرد، کە عێراق پاشەکشە نەکات لە وڵاتی (کوێت)دا. دەمانزانی ئەگەر نەگەڕێتەوە، توشی کێشەیەکی گەورە دەبێ. ئەوەبوو، کە بینیمان. هەتا ئێستاش هەر پێوەی دەناڵێنێت. هاوپەیمانان شەڕیان دژی عێراق هەڵگیرساند. ئەنجام عێراقیش پاشەکشەی کردەوە. لە کوردستانیش ڕاپەڕین بەرپابوو. وەك ئەوە وابوو مردوو لە گۆڕ زیندو بێتەوە. مەسەلەی کوردیش وای لێ هاتبوو. هەر بە ناو مابوین. وەك ئەو پەندە کوردیەی دەڵێ: "کوێر تا دەمرێت هەر بە تەمای چاوە." ئێمەش وا بووین. ئێمە تازە نەمابووین. نەماندەتوانی لەگەڵ ڕژێمی بەعس بژین.

دوای دووسێ مانگ، ڕۆژێك سەرهەنگ جوابی بۆ ناردم وتی:

" -کاك ئاوات ئەم هەینی یە ئامادە بە. سەفەر ئەکەن بەرەو سوریا، لە سەرحسابی دەوڵەتی ئێران. "

زۆر باش بوو. هەر نەفەرەی بە (٣٠٠) دۆلار بوو. ئێمەش (٥) نەفەر بووین. دەبوایە (١٥٠٠) دۆلارم بدایە هەتا سوریا. چووم بۆ خواحافیزی لەو برادەرانەی ناو شارەکان. نەمدەتوانی بچم بۆ قاسمەرەش، چونکە لەو کاتەدا وەرەقەی هاتوو چۆم نەبوو. وەرەقەش بە لایەنی کەمەوە، هەفتەیەکی پێ دەچوو. ماوەشم نەبوو داوای وەرەقە بکەم. منیش دەبوایە پێش ڕۆژی هەینی لە تاران ئامادە بم. چوار پێنج ڕۆژی مابوو، ئەگەر نەچوومایە، سەرەکەم دەفەوتا. جارێکی تر سەرەیان بۆ دانابووم، فریا نەکەوتم بچم. بە پێشمەرگەیەکدا نامەیەکم بۆ کاك نەوشیروان نارد، تیایدا خواحافیزیم لە هەموو برادەران کردو داوای لێ بوردنم لێکردن، کە ناتوانم بچم بۆ قاسمەرەش بۆ خواحافیزی لێیان. ئەو پێشمەرگانەی، کە لای خۆم بوون و مقەڕەکەشم تەسلیم بە کاك ڕۆستەم کردەوە. مەفرەزەکەو ئەو چەکانەی لام بوو، لە بی کەی سیو قەناسەو جیهازو هەموو ئەو شتانەی لام بوو، دامەدەست مام ڕۆستەم. ئەو کاتە مام ڕۆستەم چووە مقەڕەکەی من لە (بلەکێ) ئیتر خۆم ئامادە کرد بۆ ئەوەی بڕۆین بەرەو تاران. ئەو پێشمەرگەیەی، کە ناردبووم بۆ قاسمەرەش بۆ لای کاك نەوشیروان، هاتەوە. نامەیەکی پێ بوو، دای پێم (١٠٠٠) دیناری عێراقی تیابوو. لە پێشمەرگەکەم پرسی:

" -ئەمە چیە هێناوتە. ؟"

وتی:

"-نازانم، ئەو نامەیەی خۆت دات پێم بۆ کاك نەوشیروان، دام بە خۆی. ئەویش نامەیەکی بۆ نوسیم بۆ دارایی. لە داراییش ئەم نامەیەیان داوە پێم بۆت. ئیتر من چوزانم تۆ چیت بۆ کاك نەوشیروان نوسیوە، یان کاك نەوشیروان چی بۆ دارایی نوسیوە. ؟"

وتم:

" -من هەر ئەوەندەم بۆ کاك نەوشیروان نوسیبوو، دوای خواحافیزی بیرم خستەوە بۆ سەفەرەکەم، لە سەر وەعدەکەی خۆت چیم بۆ ئەکەن، ماڵتان ئاوا بێت. "

ئەویش (١٠٠٠) هەزار دیناری بۆ ناردبووم، سەفەری ئەورووپای پێ بکەم. منیش هەر هەمان ڕۆژ بە پێشمەرگەکەدا بۆم ناردەوە بە سوپاسەوە، بۆ ئەو یارمەتیەی، کە بۆت نارد بووم. بۆ بەیانی سەفەرم دەکرد بۆ تاران. شەوەکەی سەیرمکرد، کاك دلێری سەید مەجید لە دەرگایدا. ئەو کاتە ماڵەکەم لە سەقز لە گەڕەکی (بەرد بەڕان) بوو. شوێنێکی زۆر بەرزو خۆش بوو. دوای ڕۆشتنی خۆم، دام بە کاك دلێری سەید مەجید. ئەو چووە ناوی. کاك دلێر، کە لە دەرگایدا، چووم وتم:

" —فەرموو کاك دلێر."

وتی:

" —کاك نەوشیروانو کاك ملازم عومەرم لەگەڵە. ماڵەکەم لێ تێك چوو بوو."

هاتن دانیشتن. ئێمەش لە سەر سەفەر بووین، دەبوو بەیانی بڕۆین. وتیان:

" —هاتوین خواحافیزیت لێ بکەین."

منیش وتم:

" —زۆر سوپاستان دەکەم. من داوای لێ بوردن ئەکەم، کە نەمتوانی بێم بۆ قاسمەرەش بۆ خواحافیزی."

کاك نەوشیروان وتی:

" —دیارە زویر بوویت، بۆیە ئەو پارەیەت ناردبۆوە."

منیش وتم:

" —کاك نەوشیروان جا ئەوە پارەبوو بۆ منتان ناردبوو."

وتی:

" —باش بوو کەلەبەرێکی ئەگرت."

وتم:

" —کەلەبەری چی بۆ من ئەگرت. ئەو هەزار دینارە بەشی یەك شەوی ئوتێلی نەئەکرد."

وتی:

" —روی نەبوونی رەش بێت."

منیش وتم:

" —گوێ مەدەرێ."

وتی:

" —ئاخر نابێت زویر بیت."

وتم:

" —هیچ زویر نەبووم."

من خۆم بەتەما بووم، کە چوومە دەرەوە، زۆر نەمێنمەوە لە دەرەوە. منداڵەکانم دابمەزرێنمو خۆشم هەندێك عیلاج بکەمو بگەڕێمەوە. ئیتر کاك ملازم عومەر وتی:

" —ئەم جارە دڵمان خۆشە ئێران ناردویەتی بە دواماندا. لەوانەیە لە جاری پێشو باشتر بێت. ئەم جارە عێراق وەزعی خراپە، لەوانەیە موجامەلەمان بکەن. جاری پێشو ناردبوویان بە دواماندا ئینزاری کردین، کە ئیتر نایەڵن لە سەر سنور بمێننەوە، لە بەر ئەوەی لەگەڵ عێراقدا رێك کەوتبوون. رەنگە بمانبەنە ناوەوەی ئێران. ئەم جارەیان لەوانەیە دڵخۆشیمان بدەنەوە، چونکە پێ ئەچێت ئیشیان پێمان بێت."

دوایی کاك ملازم عومەر وتی:

" –برۆ، ئەگەر بارودۆخ گۆڕا، تۆ وەرەوە بۆ لای ئێمە. ئەگەر خراپتریش بوو، ئێمەش هەر دێین بۆ لای ئێوە."

منیش وتم:

" –هیوادارم من بێمەوە بۆ لای ئێوە، نەك ئێوەش بێن بۆلامان."

ئیتر خواحافیزیان لێکردمو ڕۆشتن.

بۆ بەیانی بلیتمان بڕی، کە بۆ دوای نیوەڕۆ بە پاس بەرەو تاران بڕۆین. چووینە تەرمینالّی سەقز–تاران، کە چووین سەیرمانکرد، هەموو برادەران لە تەرمینالّ بوون. کاك بەکری حاجی سەفەریش هاتبوو. ئەو کاتە لە سەقزبوو. ئیتر نازانم یەك برادەر نەمابوو، هەموو هاتبوون بۆ خواحافیزیمان. بە لای منەوە ناخۆشترین ڕۆژ بوو، چونکە ئەو هەموو هاوڕێ خۆشەویستانەم بە جێ دەهێشت، مالّئاوایم لێ دەکردن. ئێمە هەموو پێکەوە شۆڕشمان دەکرد، لە پێناوی یەك ئامانجدا، کە ئەویش ڕزگار کردنی کوردستان بوو. کە چی لەو کاتانەدا بە ناچاری، هەر ڕۆژەی چەند برادەرێك سەفەری دەکردو مالّئاوایمان لە یەکتر دەکرد. هەموو یەکتریمان بە جێ دەهێشت. وەزعەکەم زۆر بە لاوە ناخۆش بوو. زۆر گریام. هەر بە گریان سواری پاس بووین، بەرەو تاران کەوتینە ڕێ. ئەوندە ناخۆش بوو، ئەوەندە خەمبار بووم، هەر نەمزانی چۆن ڕۆیشتین.

کە چووینە تاران، چوار شەممە بوو. ئێمە ڕۆژی هەینی سەفەرمان دەکرد. دوو ڕۆژ لە تاران ماینەوە. دوای نیوەڕۆ لەگەلّ ئەو برادەرانەی لە وێ بوون، چووین بۆ فڕۆکە خانە. کاك کۆسرەت سەفەری دەکرد بۆ سوریا. دەچوو بۆ لای مام جەلال. هەردووکمان میوانی دەولّەت بووین. ئێمە بلیتیشمان پێ نەبوو. بە سەرهەنگیان وتبوو: برادەرێك دێت بۆ لاتان بلیتەکانی پێیە. ئەو سواریان ئەکات. بچن لە بەردەمی ئەو جێگایەدا بوەستن، کە خەلّکی لێ ئەچێتە ژورەوە."

ئێمەش تەکسیەکمان گرتو چووینە بەردەمی فڕۆکە خانەکە وەستاین. زۆری نەمابوو تەیارەکە بڕوات. کەس نەمابوو. ئەوەی لەگەلّ ئێمەبوو، ڕۆشتبوون. هەر ئێمە مابووین. نەشچووبووینە ناوەوە. بە خۆمانو جانتاکانمانەوە، هەر لە دەرەوەی فڕۆکەخانەکە بووین. ئیتر برادەران گالّتەیان بە سەرهەنگ دەکرد. زۆر بێزار بووم وتم:

" –سەرهەنگ ئەم پەلە پەلەی لێ کردم. لە وانەیە نەشڕۆین."

ئەگەر ئەو ڕۆژە نەڕۆشتینایە، دەبوو بگەڕاینایەتەوە بۆ ئوتێلەکە. ئەوسا خوا دەیزانی کەی بە ڕێیان دەکردین. من هەر ئەوەم لێك دەدایەوە. ئوتێلیش زۆر گرانبوو، بماینایەتەوە، پارە بەشی نەدەکردین. من بەتەما نەبووم، کاتێکمزانی نەفەرێك هات. جیهازێکی پێ بوو، هاتە پێشەوە لە منی پرسی:

" –کوا سەرهەنگ.؟"

بلیتەکانی بە دەستەوە بوو. بە پەلە چوومەوە بۆ لای سەرهەنگ وتم:

" –وەرە ئەوە برادەرەکەیە."

وتی:
" -کوا.؟"
هەر بۆ خۆشی پەلاماری جانتاکانی دا بۆ ژوورەوە، خۆشی دەستی گرتین یەکسەر بۆ ناو تەیارەکە. خواحافیزی لێ کردین، ئەوجا گەڕایەوە. زۆر پیاوانە سواری تەیارەکەی کردین. میوانی دەوڵەت بووین. بە ڕاستی میوانداریەکی زۆر باشیان لێ کردین.

٩١

لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٩٠ لە ئێرانەوە دەرچووین. پێم وایە بە سێ سەعات، لەگەڵ کاک کۆسرەت گەیشتینە فڕۆکەخانەی سوریا. دکتۆر کەمال خۆشناو ئەو کاتە لێپرسراوی پەیوەندیەکان بوو لە سوریا. هاتبوون بۆ فڕۆکەخانە چاوەڕێیان دەکردین. کە چووینە دەرەوە، سەیرمکرد برادەران هەموو چاوەڕێیان دەکرد. کاک مەحمود کۆمەڵە (خولە کۆمەڵە)و کاک حەمە جەزاو کاک بەهائین مەجید. زۆر بوون. ئەو کاتەش سوریا برادەرانی زۆری لێ بوو. هەموو هاتبوون لە وێوە بڕۆن، بەڵام هێشتا نەیانتوانیبوو سەفەر بکەن. لە وێ خانوویان گرتبوو. وتیان:
" -مام جەلال لێرەیە."
لەگەڵ کاک کۆسرەت زۆر وەستاین، هەر نەهات. ئیتر کاک محمود کۆمەڵەو برادەران وتیان:
" -با بڕۆین. خوا ئەزانێت مام جەلال کەی دێتە دەرەوە. دوایی ئەتوانین بیبینین."
بە کاک کۆسرەتم وت:
" -من لەگەڵ برادەران ئەڕۆم. دوایی یەك ئەبینینەوە."
وتی:
" -باشە، من بە مام جەلال ئەڵێم ئاواتیش هاتووە."
ئەو شەوە لە ماڵی کاک مەحمود کۆمەڵە بووین. بۆ بەیانی چووین خانوومان بە کرێ گرت. ماوەی یەك هەفتە لە وێ بووین. شەوێ مەحمود کۆمەڵەو حەمە جەزا هاتن، وتیان:
" -هاتوین پێت بڵێین ئێمە ئەمانەوێت بچین بۆ وڵاتی (بەریتانیا) ئەگەر تۆش دێیت، با بزانین. ئەگەر زۆر بین لەوانەیە تەیارەیەك بە تایبەتی بگرین هەتا بەریتانیا."
پێم وتن:
" -حەز ئەکەن بچن بۆ جەهەنەم، من لەگەڵ خۆتان حساب بکەن."
وتیان:
" -باشە."
زەینەب دەستی کرد بە بۆڵە بۆڵ وتی:

" —ناچین بۆ لەندەن، ئەڵێن لە وێ خەڵك ناژی. ئێمە خوا بۆی بڕیوینەتەوە بچین بۆ ئەورووپاش هەر وەك پێشمەرگایەتی بە رەزالەت بژین. من نایەم ئەگەڕێمەوە بۆ ئێران."
ئەوەندەیان بۆ باسکردبوو لەندەن گرانیە خەڵك ناژی لە وێ، وای دەزانی راستە. منداڵەکانیش، بە تایبەتی هیوا دەیانوت:
" —ئەگەر لەبەر ئێمە هاتون ئەچن بۆ ئەورووپا، ئێمە ئەچین بۆ لەندەن. بۆ خوێندن ئەوێ باشە."
من بۆ خۆم بە لامەوە کێشە نەبوو کوێ بێ. گرنگ ئەوە بوو بە ئاسانی دەربچین لە سوریا بگەینە ولاتێکی ئەورووپا. چونکە سوریا زۆر گرانی بوو. ئەگەر بماینایەتەوە، پارە بەشی نەدەکردین. پارەی تر لە کوێ قەرز بکەین؟ خوا خوام بوو بڕۆین. دوای ماوەیەك وتیان:
" —ئەمشەو خۆتان حازر بکەن. سەفەر ئەکەین."
هەموو چووین بۆ فڕۆکەخانەکە، تا بڕۆین. زۆر بووین، کە چووینە ئەوێ وتیان:
" —جارێ با ئەوەی پاسپۆرتی عێراقی پێیە، نەچێتە پێشەوە."
ئێمەش پاسپۆرتی عێراقیمان پێبوو. بۆ خۆمان دانیشتین، هەتا ئەوان رۆیشتن. ئەوە ئێمەش ئاگامان لەوە نییە (مانیجەر)ی تەیارەکە وتوویەتی:
" —ئەوەی عێراقی بێت، من سواری ناکەم."
ئەوانیش وتبوویان بەڵکو هەر هیچ نەبێ نیوەشیان بڕۆن هەر باشە. ئێمە نەمانزانیبوو، کە ئەو تەیارەیەیان بە قاچاخ گرتبوو. کابرای مانیجەری تەیارەکە ئاگادار نییە. کاك عومەری سەید عەلی گرتبووی لە (ختوت)ەکە، رێکەوتووە لەگەڵیان، ئەوەندە نەفەری بۆ پەیدا بکا تەیارەکە پڕ بکا، پارەی زیادی بداتێ. شەریکەکەو مانیجەری تەیارەکەی ئاگادار نەکردبوو. کابرا پێی زانیبوو وەزعەکە ئاسایی نیە، یەکسەر ئاگاداری ختوتی بەریتانیای کردبوو، کە شتێکی وا هەیە. پێیان وتبوو، بگەڕێنەوە کەس سوار مەکەن. ئەوانەشی سوار بووبوون، دای بەزاندنەوە. تەیارەکە بە خاڵی گەڕایەوە بۆ بەریتانیا. هەموو هاتینەوە بۆ دواوە. زۆر ناخۆش بوو گەڕاینەوە. ئەو کابرایەی خانوەکەمان لێ گرتبوو، چووینەوە لە دەرگاماندا داوای کلیلەکانمان لێ کرد، نەیدلینەوە. بۆ یەك مانگیش لێمان گرتبوو. پارەی مانگەکەشی وەرگرتبوو. تەنها یەك هەفتە تیای بووین. هەرچی هاوارمانکرد، نەیدایەوە. ئیتر چار نەبوو. چووین بۆ ماڵی حەمە جەزا. ئەو نەهاتبوو لەگەڵ ئێمە. پەشیمان بۆوە لەوەی بەو تەیارەیە بڕوا، کە کاك عومەر گرتبووی. لەو کاتەدا برایەکی عوسمانی قادر منەوەر هاتبوو بۆ لای لە سۆڤیەتەوە. ئەو ڤیزەی سۆڤیەتی بۆ وەرگرتبوو بچێ بۆ سۆڤیەت. ئەو داوای کردبوو، لە وێوە دوایی کوێی دەوێ بڕوا. شەو لە ماڵی حەمە جەزا بووین، بۆ بەیانی چووینەوە بۆ ئەو نوسینگەیەی، کە خانوەکەمان لێگرتبوو وتمان:
" —ئێمە پارەی یەك مانگمان داوە، کابرای خاوەن ماڵ ناماندلەتەوە."

باشبوو چوو لێی سەندەوە بۆمان. چووینەوە ناوی. ئەوجا بۆڵە بۆڵ. دەیانوت:

" -پارەکەمان ڕۆیشت. چۆن سەفەر بکەین.؟"

من لە لایەکیشەوە بەزەیم بە کاک عومەردا دەهاتەوە، لە لایەکیشەوە دەموت باشە کاک عومەر چۆن لە خۆیەوە ئەمەی کردووە. چۆن تەیارەیەك بە قاچاخ دەگرێت؟ ئەو خۆشی تەندروستی باش نەبوو. بەو حاڵەشەوە دەیویست پێشمەرگە بریندارەکان هەموو دەرباز بکات بۆ ئەورووپا. هەمووشیانی نارد. گەورەترین خزمەتی ئەو پێشمەرگە کەم ئەندامانەی کرد. شەوو ڕۆژ بە دوای ئیشی ئەوانەوە بوو. ماڵی ئاوابێت. بۆ جاری دووەم ئێمەشی لەگەڵ ئەوان ڕزگار کرد. هەموومانی بە فڕۆکەیەك دەرکرد هەتا لەندەن.

٩٢

لە سوریا یەك مانگ ماینەوە. لە ٢/١٠/١٩٩٠ گەیشتینە لەندەن. کە گەیشتینە لەندن، لە فڕۆکە خانەی (گاتویك Gatwic) نیشتینەوە. کە دابەزین، هەموومانیان کرد بە هۆڵێکدا، (١٦٥) نەفەر بووین. هەندێ مرۆڤی عەرەبمان لەگەڵدا بوو، ئەوانی تر هەموو پێشمەرگەی یەکێتی بووین. وتیان:

" -هەرچیەکیان لێپرسین، کەس وەڵام نەداتەوە."

دەترساین بمانگێڕنەوە، چونکە ئاشکرا بوو بووین، کە لە سوریاوە هاتووین. هاتن وتیان:

" -پەساپۆرتەکانتان."

کەس وەڵامی نەدایەوە. سەیر بوو بە لایانەوە! چوون کارمەندی ناو فڕۆکەکەیان هینا. هاتن، ئەوان بە عەرەبی وتیان:

" -پەساپۆرتەکانتان."

کەس وەڵامی ئەوانیشی نەدایەوە. پێیان سەیر بوو! وتیان:

" -بابە ئێوە لە سوریاوە هەموو بە عەرەبی قسەتان ئەکرد. ئێستا بۆ قسە ناکەن؟ هەموو پاسپۆرتتان پێ بوو، ئەی چیتان لێ کرد.!؟"

هەموو لە تەیارەکەدا دڕاندبوومان، کردبوومان بە ناو کورسیەکاندا. دوایی وتمان:

" -باشە خۆ نابێت هەر قسە نەکەین. با پێیان بڵێین ئێمە کوردینو لە عێراقەوە هاتووین."

ئەو کاتە بارودۆخی عێراق زۆر خراپبوو. کوێتی داگیر کردبوو. دکتۆر زریانمان نارد وتمان:

" -بچۆ بڵێ ئێمە کوردین، لە تاو (صەدام) رامانکردووە."

هەندێکیشمان وەرەقەی یەکێتیمان پێ بوو، لە سوریا بۆیانکردبووین. بە زمانی ئینگلیزی نوسرابوو. ئەوانەشمان دا بە دکتۆر زریان. هەر بۆ زانیاری بۆ ئەوەی بڕوا بکەن، کە ئێمە کوردین و لە عێراقەوە هاتووین. زۆری پێ نەچوو، دکتۆر زریان هاتەوە بە خۆشیەوە. پێیان وتبوو:

" -ئێ بۆ قسە ناکەن."

کە زانیان، زۆر ڕێزیان لێ گرتین. خواردنی زۆریان بۆ هێناین لە هۆڵەکەدا هەڵیانڕشت. ژن و منداڵ هەموو تێی بەربوون. پێ یان وتبوو:

" -ئێمە ناتوانین بڕیاری وەرگرتنتان بدەین، چونکە ئێوە زۆرن. ئەبێت وەزارەتی ناو خۆ بڕیار بدات، بەڵام دڵنیا بن وەرتان ئەگرن."

لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە هەر دەترساین. ئەو شەوە لە وێ ماینەوە، هەتا ڕۆژی دوایی. بۆ شەوەکەی هاتن پێیان وتین:

" -ئێوە بۆ ماوەیەکی کاتی وەرگیراون."

ئیتر لە خۆشیدا هەموو کردیان بە چەپڵە ڕێزان. هەر ئەو شەوە هەموومانیان دابەشکرد. هەر چوار پێنج کەس و بۆ جێگایەك. خۆ نەمان دەزانی بۆ کوێیە. ئیتر هەموو رادیۆکانی جیهان باسی ئەو تەیارەیەیان کرد. تومەس کاك عومەر هەر چاوەڕێی ئەوەیە بزانێت چیمان بە سەر هاتووە، کە بە رادیۆ گوێی لێبوو باسی ئەو تەیارەیەی کردبوو، دڵی خۆش بووبوو. ئەویش ڕزگاری بوو. بردینیانە ئوتێلێکی زۆر گەورە لەگەڵ چوار پێنج برادەری تردا. لەوانە دکتۆر زریان بوو، حەمە عەلی لای کاك نەوشیروان بوو. ئەو کاتە کوردی کەم لێبوو. چوار پێنج برادەری خۆمانی لێ بوو، ئەوانیش کاك شەوکەتی حاجی موشیر و شێخ محەمەد سەرگەڵوییی و کاك وەهاب تازە چوو بوو. مامۆستا کامەرانی بەهجەتی عەونی لەوێ بوو. کوردی تری لێبوو، بەڵام من زیاتر ئەمانە برادەرم بوون. یەك هەفتە لە ئوتێل بووین. ڕۆژێ شێخ محەمەد و کاك شەوکەت و مامۆستا کامەران هاتن بۆ ئوتێلەکە. هەر ئێمە مابووین لە وێ. برادەرەکانی تر نازانم بۆ کوێیان بردبوون، چونکە ئەو جێگایەی ئێمەیان لێ دانابوو، کاتی بوو. ئێمەش نەشارەزا بووین، نەمان دەزانی چی بکەین. کە ئەوانی لێ نەما، زۆر ناخۆش بوو. هیچیشمان نەدەزانی. باش بوو دکتۆر زریان لە وێ بوو. ئەو زمانی دەزانی. منداڵەکانم زۆر بێزار بوون دەیانوت:

" -ئەوان جێگایان دراوەتێ هەر ئێمە ماوین."

جێگەکەشمان زۆر خۆش بوو. سێ ژووری نوستنیان دابوویني و چێشتخانەیەکیش. وەك چۆن ئەڵێیت ئوتێل بەلاش. ئەوەی ئێمە ئاوا بوو. ئیتر شێخ محەمەد چووە خوارەوە بۆ (رستێپشن)ەکە، بە کارمەندی ئوتێلەکەی وتبوو:

" -ناوی ئەم خێزانە بکوژێنەوە، من ئەیان بەمە دەرەوە."

هاتەوە وتی:

" –خۆتان کۆبکەنەوە جانتاکانتان هەڵگرن با برۆین بۆ ماڵی خۆمان."
پێمان وت:
" –کاك شێخ محەمەد با لێرەبین، نەوەك رۆشتنمان خراپ بێت."
وتی:
" –خراپ نیە من ئەزانم، شارەزام. با برۆین."
پێشمان خۆش بوو، چونکە تەنیایی زۆر ناخۆش بوو. من بۆ خۆم گوێم نەدەدایە، بەلام منداڵەکانم زۆر بێزار بوون. لەگەڵ شێخ محەمەدو کاك شەوکەتو مامۆستا کامەران رۆشتین. جێگای هەموومان نەبۆوە. کاك شەوکەتو مامۆستا کامەران بەجێمان. ئێمەش سواری سەیارەکەی شێخ محەمەد بووین، چووین بۆ ماڵی خۆیان. دوایی چووینە ماڵی کاك شەوکەتی حاجی موشیر. یەك هەفتە لەوێ بووین، ئەوسا خانویەکی زۆر خۆشیان داینێ. لە سەرەتاوە هەموو ئیشەکان کاك شێخ محەمەد سەرگەڵویی‌و کاك شەوکەتی حاجی موشیرو مامۆستا کامەرانی بەهجەتی عەونی بۆیاندەکردین. بەراستی ئەو سێ برادەرە زۆر یارمەتیان داین. من قەت لە یادم ناچێ. راستە ئێمە هاورێی رۆژانی خەبات بووین، بەلام زەحمەتیان زۆر کێشا لەگەڵماندا تا دامەزراین. ماوەیەکی پێ چوو، منداڵەکانیش چوونە قوتابخانە. هیوایان وەرنەگرت، چونکە تەمەنی (١٨) ساڵ بوو. بە پێی یاسای ئەوێ، دەبێت هەژدە ساڵ بچێتە کۆلێژ. ئەو چووە کۆلێژی زمان. نیوەی ساڵ بوو، کە گەیشتینە ئەوێ. یەك مانگ بوو قوتابخانە دەستی پێ کردبوو. زۆری پێ نەچوو، جەنگی عێراق‌و هاوپەیمانان لە کوێت دەستی پێ کرد. زۆرمان پێ خۆش بوو، چونکە تاکە هیوای ئێمە ئەوە بوو، کە رژێمی عێراقی لەو جەنگەدا بروخێ. ئێمەش وەك گەلی کورد بتوانین سود لەو هەلومەرجە وەربگرین. شۆرش بەردەوام بوو. دێهاتەکانمان نەما. لە سەر سنورەکان بووین، هێزەکانمان ئامادە بوون. بە شەو و رۆژ چاوەرێی ئەنجامی ئەو جەنگە بووین. جەنگ چەند رۆژێك بەردەوام بوو. هاتە سەر ئەوەی رژێمی عێراقی بروخێ، جەنگ وەستا. زۆرمان پێ ناخۆش بوو، چونکە دیار بوو نەیان دەویست رژێمی عێراق بروخێ. ئەمەریکاش رایگەیاند ئێمە ئالیاتی عێراقمان نابووت کردووە. با خەڵکی عێراق خۆیان راپەرن رژێم بروخێنن.
ساڵی ١٩٩١ راپەرین لە کوردستان‌و خوارو ناوەراستی عێراق بەرپابوو. بە ماوەیەکی کەم کوردستان ئازادکرا. هەموو شارەکانی کوردستان لە داموو دەزگا سەرکوت کەرو جەللادەکانی رژێمی بەعس پاك کرایەوە. کەرکوك گەورەترین شاری کوردستان بوو، ئازاد کراو پاك کرایەوە. لە خواروش راپەرینی زۆر گەورە بەرپابوو. زۆربەی زۆری شارەکان لە لایەن خەڵکەوە ئازادکرا. رژێمی عێراق لە روخاندا بوو. ئێمەش بە تەواوی دڵخۆش بووین. شەوو رۆژ سەیری تەلەفزیۆنمان دەکرد، چاوەرێی هەواڵی نوێ‌و گۆرنکاریەکان بووین. کە بە چاوی خۆم کەرکوکی داگیرکراوم بینی لە لایەن هێزەکانی

پێشمەرگەو خەڵکی کوردستانەوە رزگار کرابوو، بڕوام نە دەکرد. وەك خەونێك وابوو بە لامەوە. لە خۆشیاندا نەمدەزانی چی بکەم؟ دەموت ئەوە خەوە یان راستیە. کوردستان زۆر خۆش بووبوو، بەلام ئەو خۆشیە زۆری نەخایاند، دیسانەوە خۆشی گۆڕا بە ناخۆشی. زۆر بە خراپی شکایەوە. رێگا درایەوە بە رژێمی بەعس بە ئارەزوی خۆی بەربێتەوە گیانی کۆمەلانی خەڵکی عێراق بە هەموو تواناکانی خۆی، هەتا راپەڕین سەرکوت بکا. ئەم جارە هەموو خەڵکی کوردستان بۆ جارێکی تر ئاوارە بوەوە. بەرەو سنورەکانی ئێران‌و تورکیاو شاخەکان. دیسانەوە خۆشی شکایەوە بە ناخۆشی. شەوو رۆژ خەفەتمان دەخوارد بۆ ئەو بارودۆخە ناخۆشەی، کە بە سەر گەلی کورددا هات. نەماندەزانی کێ ماوەو کێ نەماوە. کە ئەو هەموو هاوڕێ‌و کەس‌و میللەتەمان بینی کۆچ وڕەو دەکەن بەرەو سنورەکان. بۆ ئێمەی ئاوارە، لە هەموو کەس ناخۆش تر بوو. هیچیشمان پێ نەدەکرا، چونکە من نەمدەتوانی بگەڕێمەوە. مافی پەنابەرێتیم پێ نەدرابوو هەتا بتوانم بگەڕێمەوە بۆ لای هاوڕێکانم. هەر خەفەتمان دەخوارد. هەر رۆژەی هەواڵێکی ناخۆش روی تێ دەکردین. چەندین هاوڕێی خۆشەویستمان لەو راپەڕینەدا شەهیدبوو. ئەو کاتەش نەماندەتوانی هیچ پەیوەندیەك بکەین بە وڵاتەوە. تەلەفۆنی عێراق بە گشتی‌و کوردستان بە تایبەتی بڕابوو. مەگەر چاوەڕێی ئەوە بووینایە، لە ئێرانەوە ئەگەر برادەرێك تەلەفۆن بکات بۆمان، هەواڵمان پێ رابگەیەنێت. لە دەنگو باسی برادەرو کەسوکار ئاگادارمان بکا. لەبەر ئەوە ناخۆشترین کاتمان بە سەر دەبرد. دوای ماوەیەك، تەلەفزیۆنی عێراق مام جەلالی پیشاندا لە بەغدادبوو. چوو بوو بۆ گفتوگۆ لەگەڵ رژێمی عێراق دا. دوای ئەوە هەموو خەڵك گەڕایەوە بۆ ناو شارەکان. تۆزێك باش بوو. ئیتر هاتوو چۆ دەستی پێ کرد لە دەرەوە بۆ ناوەوەی وڵات. خۆش بوو. جار جار نامەیەکمان بۆ دەهات. هەر باش بوو.
بەلام زۆر کێشەی ئەوەم هەبوو، کە چۆن بتوانم ئەو هەموو قەرزە بدەمەوە؟ ئەو کاتە هەر هیوا دەیتوانی ئیش بکا. دوانەکەی ترم منداڵ بوون. من بۆ خۆشم نەمدەزانی چی بکەم؟ بە هەر برادەرێکمان دەوت بۆ ئیش، دەیانوت:
" –کوا ئیش لێرە دەست ئەکەوێت؟ خەڵکی ئێرە خۆیان بی ئیشن."
هیواش دەیوت:
" –بابە من ئەچم ئیشێك ئەدۆزمەوە، بۆ ئەوەی بتوانین ئەو قەرزانە بدەینەوە."
هیواش لە قوتابخانە بوو. زۆرم پێ ناخۆش بوو واز لە خوێندن بهێنێ، بچێ ئیش بکا. من بۆ ئەوە قەرزم کردبوو، کە ئەوان بتوانن بخوێنن. بۆ خۆیان دوارۆژێکی باش دروست بکەن. پێم وت:
" –هیوا ئەگەر تۆ ئەتوانیت خوێندن تەواو بکەیت، بچۆ بخوێنە. من ئیشی تۆم ناوێت. من قەرزارم نەك تۆ. ئەوان داوا لە من ئەکەن. تۆ بچۆ خوێندن تەواو بکە، ئەوەش بۆ

من دڵخۆشیە. من لەبەر ئێوە خۆم دەربەدەر کردوە، تا ئێوە بتوانن من شەرمەزار نەکەن، پەشیمانبم لەوەی کردم. من لەوە زیاتر هیچم لە ئێوە ناوێت."

وتی:

" -بابە من گرنتیت ئەدەمێ، کە خوێندن تەواو بکەم بە دڵی تۆ، بەلام داوای پارە لە تۆ ئەکەن چی ئەکەیت. ؟"

وتم:

" -تۆ حەقت نەبێت."

زۆری پێ نەچوو، کاك نەوشیروان دەعوەتێکی بۆ کردین لە پارکێکی لەندەن. چەند برادەرێ بووین، مامۆستا کامەرانی بەهجەتی عەنیشی لێبوو. وتم:

" -مامۆستا کامەران بزانە ئیشێکم بۆ نادۆزیتەوە، وەزعم زۆر خراپە. پارەیەکی زۆر قەرزارم، نازانم چی بکەم. ؟"

وتی:

" -کاك ئاوات لەوانەیە ماوەیەکی تر ئیشێك هەبێت، بەلام بۆ تۆ نابێ ناخۆشە."

پێم وت:

" -مامۆستا کامەران لە دنیا چ ئیشێك زۆر قورسو ناخۆشە، من ئامادەم بیکەم. بە مەرجێك بتوانم ئەو قەرزانەم بدەمەوە."

پێم وت:

" -لە حەماڵی قورستر نیە، من ئامادەم بیکەم."

وتی:

" -وەلا قورس نیە، بەلام بۆ تۆ ناخۆشە. ئیشەکە حەرەسیە."

وتم:

" -جا چی لەوە خۆشترە؟ وا ئەزانم پێشمەرگایەتی یە. ئەمە ترسیشی نیە. باشترین ئیشە زمانیشی ناوێت. زۆر سوپاست ئەکەم ئەوەم بۆ بکەیت."

وتی:

" -بە سەر چاو، بەلام ماوەیەکی تری پێ ئەچێت."

کاك نەوشیروانیش وتی:

" -مامۆستا کامەران من کەفیلی کاك ئاوات دەکەم بۆ ئەو ئیشە. دە ساڵ نەچێتەوە بۆ ماڵەوە، تەحەمول ئەکات."

وتی:

" -منیش سوپاست دەکەم ئەو ئیشە بۆ کاك ئاوات بدۆزیتەوە."

زۆر دڵم خۆش بوو. ئێوارە هاتمەوە بۆ ماڵەوە پێم وتن:

" -ئیشێکم دۆزیوەتەوە، بەلام جاری قسە مەکەن."

هەموو زۆر دڵ خۆش بوون. ماوەیەك هەر چاوەڕوانم کرد، دەنگی نەبوو. بە تەما نەمام. ڕووشم نەدەهات بە مامۆستا کامەران بڵێم ئیشەکە چی بوو. وتم وا دیارە سەری نەگرتووە تەواو. ئەو هیوایەم نەمابوو، چونکە زۆری پێ چوو. ڕۆژێ مامۆستا کامەران تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی:

" -لە ماڵ بە، دێم بە دواتا ئەچین بۆ سەر ئیشەکە. تەواو بووە، ئیتر دەوام ئەکەیت لە وێ."

بە لامەوە وەك ئەوە وا بوو چۆن خۆت ئاگات لێ نەبێت بڵێن بیتاقەت بۆ دەرچووە، چەند خۆشە، ئاوا بوو بە لامەوە، چونکە بە تەما نەمابووم. کە چووین لە دەرەوەی شاری لەندەن بوو. خانوویەکی زۆر گەورە بوو. زۆر خۆش بوو، وتی:

" -ئەم خانووەیە. من بۆ کابرایەکی عەرەبم کڕیوە، زۆر پیاوێکی باشە. چەند ساڵە دۆستی منە. خۆی لێرە نیە. لە وانەیە ساڵی جارێك بێت، بۆ چەند ڕۆژێك بمێنێتەوە، بەڵام تۆ ئەبێت شەو لێرە بیت ئاگات لێ بێت وەك ماڵی خۆت."

وتم:

" -کاك کامەران زۆر سوپاس. من وەك خۆی ئەی پارێزم، خەمت نەبێت."

پێشی وتم مانگی بە چەند. پارەکەی کەم بوو، بەڵام بۆ من زۆر زۆر بوو. لەوەش کەمتر بوایە، هەر ئامادە بووم بیکەم. زۆر پێویستیم بە پارەکە بوو. ماوەیەکی زۆر لەوێ بووم. نزیکی ساڵێکم تەواو کرد، پارەم وەرنەگرت، چونکە خاوەنەکەی نەهات بۆ لەندەن. دیار بوو مامۆستا کامەرانیش پارەی لا نەبوو. ئیتر زۆر برادەر لێیان دەپرسیم:

" -لە ئیشەکەت چەند وەردەگریت.؟"

منیش دەموت:

" -بە خوا جارێ هیچم وەرنەگرتووە."

بڕوایان نەدەکرد، دەیانوت:

" -چۆن پارەت وەرنەگرتووە.؟"

دەموت:

" -خاوەن ئیشەکە نەهاتووە."

دەیانوت:

تۆ شێت بوویت، بە بێ پارە شەوو ڕۆژ ماڵو منداڵی خۆت بە جێ هێشتووە بۆ خەڵك. خەڵکی هەفتانە پارە وەردەگرێت، تۆ مانگانە وەری بگرە. وا خەریکە ئەبێتە یەك ساڵ تۆ هەر ئەڵێیت هێشتا هیچم وەرنەگرتووە. چۆن شتی وا ئەبێت.؟"

منیش گوێم نەدەدایە، چونکە بڕوام بە مامۆستا کامەران هەبوو. من خاوەن ماڵم نەدی بوو. بۆ مامۆستا کامەران ئیشم دەکرد. خۆ خەڵکیش ڕاستیان دەکرد. لە لەندەن پارە بە هەفتانە وەردەگیرێ، نەك بە مانگانە. من دەمزانی خاوەن ئیشەکە نەهاتووە. دوای

ده مانگ، خاوەن ئیش هات. بۆ ماوەی یەك مانگ مایەوە. هەموو پارەکەی دامێ بە سەر یەکەوە. زۆر خۆش بوو بە لامەوە (٤٠٠٠) هەزار پاوەن بوو. ئەو کاتەش یەك پاوەن دوو دۆلار بوو. هەر وەرم گرت، چووم گۆڕیمەوە (٨٠٠٠) هەزار دۆلار بوو. ناردمەوە بۆ ئەو برادەرانەی، کە قەرزیان لام بوو. زۆر خۆش بوو. ئیتر وامدەزانی هەموو دنیا هینی خۆمە، چونکە لە مۆتەکەی قەرزاری رزگارم بوو. زۆر خۆم بە سەر بەرز دەزانی، کە قەرزار نیم. بە راستی هیچ بە قەد ئەوە ناخۆش نیە، کە مرۆڤ قەرزار بێتو نەشی بێت بی داتەوە. من زۆر سوپاسی مامۆستا کامەرانی بەهجەتی عەونی دەکەم. لەو کاتەدا ئەو ئیشەی بۆ دۆزیمەوە. بە راستی من بۆ خۆم ئیشم کردووە، بەڵام نەمدەتوانی ئیش بدۆزمەوە. ماڵی ئاوا بێت. باش بوو منداڵەکانیش زۆر رێکوپێك بوون. هیوا خوێندنی زانکۆی تەواو کرد زۆر بە باشی. بەوە زۆر دڵ خۆش بووم. دوو منداڵەکەی تریشم مابوو خوێندن تەولو بکەن. ئیتر من قەرزاری ئەوان نیم وەك باوك. ئەوەی ئەرکی باوکێکی دڵسۆز بێت، من جێ بەجێم کردووە بۆیان. ئەوەی منیش لەوان داواکارم ئەوەیە، لە خۆیان نەگۆڕێن. داب ونەریتی کوردەواری خۆیان ون نەکەن. دڵسۆز بن بۆ نەتەوەکەیان. ئەوەی لە توانایاندا هەیە بۆ خزمەتی کوردو نەتەوەکەیان پێشکەشی بکەن. زۆر رێز لە خەڵك بگرن. خۆیان بە دڵسۆزی هەموو خەڵك بزانن.

٩٣

لەو ساڵانەی، کە لە لەندەن بووم، زۆر هەواڵی ناخۆشم بۆ دەهات. لەو هەواڵە ناخۆشانەی، کە پێمگەیشت، هەواڵی مردنی دایکمو هینی کەسو کارم بوو. شەهیدبوونی زۆر لە هاوڕێو خۆشەویستانی خۆم بوون. بەڵام لە هەموویان ناخۆشتر، کە هەرگیز لە دڵم دەرناچێ، شەهید بوونی (سەلاح) بوو. شەهید سەلاح هەر لە منداڵیەوە زۆر حەزی لە پێشمەرگایەتی بوو. سەرەتا چەند جار هات بۆ پێشمەرگایەتی. لە بەر ئەوەی زۆر منداڵ بوو، دەماننارد‌ەوە. شەوان لەگەڵ مەفرەزەی پێشمەرگە دەچوو بۆ سلێمانی بۆ چالاکی. پێشیان دەکەوت بۆ تاقی کردنەوە، ئەوجا بە پێشمەرگەکانی دەوت وەرن. زۆر گەنجێکی ئازاو چاو نەترس بوو. لە ساڵی ١٩٨٤ هات بۆ لام بۆ تیپی ٤٧ وتی:

" –نارۆمەوە."

منیش پێم وت:

" –باشە مەڕۆرەوە."

ئیتر هەر لەگەڵ خۆم مایەوە. لە ماوەیەکی کەمدا، بوو بە خۆشەویستی هەموو پێشمەرگەکان، چونکە زۆر ئازاو رۆح سوك بوو. زۆر روو خۆش بوو. من زۆرم خۆش دەویست. هەروەك کوڕە گەورەی خۆم زیاتریش حسابم بۆ دەکرد. ئەویش لە کوڕی

خۆم دڵسۆز تربوو. زۆر دەست پاکو داوێن پاك بوو. بە وەفا بوو. یەکێك بوو لە پێشمەرگە هەرە ئازاکانی مەفرەزەکەی خۆم. ئەگەر ئاگام لێ نەبووایە، هەر زوو شەهید دەبوو، چونکە زۆر سەرەڕۆ بوو لە شەڕدا. دایم شەڕم بوو لەگەڵیدا. زۆر ئامۆژگاریم دەکرد لە شەڕدا. زۆر شەرمی لێ دەکردم. خزمی خۆم بوو، بەڵام هەر حسابی هیوای کوڕم بۆ دەکرد. ئەوم زیاتر خۆش دەویست. وای لێ هاتبوو، خەڵك وایدەزانی سەلاح کوڕی خۆمانە. پێش ئەوەی سەفەر بکەین لە ئێرانەوە بۆ دەرەوەی وڵات، دەمویست لەگەڵ خۆمدا بیبەم. خۆی پێی خۆش نەبوو. هەر حەزی دەکرد لەگەڵ پێشمەرگەکاندا بمێنێتەوە. سێو چوار پێشمەرگەم لەگەڵدا بوون، زۆر کوڕی چاکو دڵسۆز بوون. لەوانە مەلا ستار، ئەویش هەر لەگەڵ سەلاح بوو. لە رۆژی پێشمەرگایەتیەوە هەر لەگەڵ خۆمدا بوو. جارێك ئەویش بریندار بوو. هەر لەو کاتەی دەمویست سەفەر بکەم، مەفرەزەکەمو مقەڕەکەم سپارد بە مام رۆستەم. ئەو کاتە شەهید سەلاح لێپرسراوی مەفرەزەو مقەڕ بوو. بە مام رۆستەمم وت:

" –من هیچم لە تۆ ناوێت، تەنها ئاگات لە سەلاح بێت، لە خۆتی دور نەخەیتەوە."

وتی:

" –وەعد بێت لە خۆت زیاتر ئاگام لێی ئەبێت، تا خۆت دێیتەوە."

هەر لە دوای من سەلاح چووبووە خوارەوە بۆ بازیان، هەتا راپەڕین. پێش راپەڕین چووبووە ناو شاری سلێمانی. لەگەڵ دەست پێکردنی راپەڕین دا، سەلاح لە ناو شار لەگەڵ مەفرەزەکانی ناو شاردا پەلاماری دامو دەستگاکانی رژێمی دابوو لەگەڵ هاوڕێکانیدا. لە شەڕی کفری دا بە خەستی بریندار بووبوو. هەر بە رێکەوت نەمرد. منیان ئاگادار نەکردبوەوە هەتا تۆزێك باش بووبوو، ئەوجا پێیان وتم. زۆرم پێ ناخۆش بوو. هەموو ئاواتم ئەوە بوو جارێکی تر سەلاح ببینمەوە. زۆرم بیر دەکرد. یەکجار هات بۆ ئێران بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردین، زۆرمان پێ خۆش بوو. هەر پێم دەوت:

" –سەلاح ئاگات لە خۆت بێت."

دەیوت:

" –خەمت نەبێت."

بەڵام بە داخەوە، هەر نەمان بینیەوە. بۆ دواجار بوو گوێمان لە دەنگی بوو. لە کاتی برینداریەکەیدا نامەیەکی بۆ ناردم وتی:

" –مام رۆستەم بە مام جەلالی وتووە بمنێرن بۆ دەرەوە بۆ عیلاج."

منیش وەڵامم بۆ ناردەوە وتم:

" –زۆر باشە، پێیان بڵێ بەڵکو بتنێرن بۆ لای خۆم بۆ لەندەن."

ئیتر هەر وەڵامی نەبوو. دیار بوو بۆیان نەکردبوو. ماوەیەکی پێ چوو وتیان:

" –حیزبی سۆشیالیستو پارتی دیموکراتی کوردستان پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا تێك چووە، کەمینیان بۆ شێخ جەعفەر داناوە خۆی تیا نەبووە، بەڵام مەفەرزەکەی هەموو

شەهید بوون. زۆر ناخۆش بوو. نەمان دەزانی ئەو پێشمەرگانەی شەهیدبوون کێن. ئەو کاتە دارای حاجی ئیبراهیم لە سلێمانی بوو. دوای ماوەیەك دارا هاتەوە. چووم بۆ لای لێم پرسی:

" -ئەو ڕووداوەی شێخ جەعفەر چۆن بووە.؟"

باسیکرد بۆم وتی:

" -لەوانەی شەهید بوون، سەلاحی خزمی تۆ بوو، کە هەر دایم لەگەڵ خۆتبوو."

زۆرم پێ سەیر بوو! وتم:

" -تۆ دڵنیایت ئەوە.!؟"

وتی:

" -بەڵێ من خۆم ئەمناسی هەر لەگەڵ خۆتبوو. بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە لەگەڵ ئەوانبووە."

هەتا وتی کرابوو بە نەقیب. ئەو جا زانیم ڕاستە ئەوە شەهید بووە. ئیتر نەم دەزانی چی بکەم. زوو هەستام چوومەوە بۆ ماڵەوە. بە ماڵەوەم وت، کە سەلاح شەهید بووە. هەر بڕوایان نەدەکرد، هەتا وتم:

" -بە خوا ڕاستە شەهید بووە."

ئەو ڕۆژە ناخۆش ترین ڕۆژ بوو لە ماڵی ئێمەدا. خۆ چار چییە؟ تازە ڕۆیشت، بەڵام هەر لە دڵی ئێمەدا زیندووە. قەت لە یادمان ناچێتەوە ئەو هەموو خۆشەویستیە، هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی.

٩٤

ناخۆشترین ساتەکانی ژیان، ژیانی دوورییە لە نیشتمانی خۆت. من بۆ خۆم ژیانم ناخۆش نەبووە لە ڕووی ئیسراحەتو ژیانی ڕۆژانە، بەڵام هەمیشە دڵم لای هاوڕێکانمو کەسوکارو وڵات بووە. هەرگیز بۆ ڕۆژێکیش نەمتوانیوە ئەوان لە بیر بکەم. خۆشترین ژیان بە لامەوە ژیانی پێشمەرگایەتیم بووە، کە لەگەڵ هاوڕێکانم دەمبردە سەر. ئەو سەردەمانە خاوەنی هیچ سەرمایەیەك نەبووین، بەڵام خۆمان بە سەر بەرز دەزانی. لەگەڵ خۆشیو ناخۆشی میللەتەکەی خۆماندا دەژیاین. کە دەچووینە ماڵێك، نانو چایەکی بە ڕوویەکی خۆشەوە دەدا پێمان، وامان دەزانی هەموو دونیا هیی خۆمانە. زۆر خۆش بوو. سەد خۆزگەم دەخواست بەو ڕۆژانەی، کە دەچووم بۆ گەرمیان. خەڵکی گوندەکان دەهاتن بەرەو پیرمان، زۆریان لێ دەکردین دەیانوت:

" -هەر ئەبێت لادەن."

من هەر بە هیوام بگەڕێمەوە بۆ نیشتمانەکەی خۆم، کە وڵاتی کوردستانە .... هەر بە هیوام.

## تێبینی یەك لە سەر كتێبەكەی كاك مەحمود سەنگاوی دەربارەی گەرمیانو مەفرەزەی سەرمتایی

كاك مەحمود لە كتێبەكەیدا بە ناوی (بیرەوەرییەكانی سەنگاوی) لە لاپەڕە (٢١ تا ٢٥)دا دەڵێ شەهید سەركەوت یەكەم ئامر مەفرەزەی گەرمیان بووە. لە راستیدا بەو شێوەیە نییە، چونكە من لەو كاتەدا خۆم لێپرسراوی هەموو ناوچەكانی سنووری هەرێمی پێنجی ئەو سەردەمە بووم. من نازانم كاك مەحمود چۆن دەڵێت لە ساڵی ١٩٧٧ بووم بە پێشمەرگە لە ناوچەی گەرمیان، چونكە من بۆ خۆم لە ساڵی ١٩٧٦ لێپرسراوی عەسكەریو سیاسی بووم لەو ناوچانە، هەتا ١٩٧٨/٣/٢٠. لە بەهاری مانگی نیسانی ١٩٧٧ تەشكیلاتی مەفرەزەكانمان كرد بۆ ناوچەی گەرمیانو قەرەداغو بازیان. ئەو كاتە هەموو هێزەكەمان دەگەشتە (٥٠) پێشمەرگە. من بۆ خۆم سەرپەرشتیم دەكردن. شەهید مامۆستا محمد ئەمین پۆڵا ناسراو بە (شەماڵ) رابەر سیاسی بوو. ئەو كاتە شەهید ئارام لەگەڵ ملازم عومەر، لەگەڵ هێزێكی پێشمەرگە پەڕیبوونەوە بۆ لای ئێمە. لە بەری (شاربازێڕ)ەوە رژێم هێرشێكی بەربڵاوی بۆ ناوچەكە كردبوو. كە هاتنە لای ئێمە، ماوەیەك لە ناوچەی قەرەداغ پێكەوە جەولەمان كرد. دوا جار شەهید ئارام داوای كرد تەشكیلاتی هێزەكان بكەین بە چەند مەفرەزەیەك بۆ دابەشكردن بە سەر ناوچەكاندا. منیش پێم وت:

" -كاك ئارام ئێستا باشترە."

بەڵام ئەوان رایان وابوو، تەشكیلاتی هێزەكە بكرێ بە سێ مەفرەزە باشترە. یەكەم مەفرەزە، كە دامانناا بۆ ناوچەی گەرمیان، شەهید سیروان تاڵەبانی بوو. لە مانگی نیسانی ١٩٧٧ بەو شێوەیەی، كە پێشتر بە روونی باسم لێوە كردووە. ئەو كاتە شەهید سەركەوت لە سەرەتاوە هات بۆ لای ئێمە بۆ پێشمەرگایەتی، ئێمە نەمانكرد بە پێشمەرگە. لە بەر ئەوەی ئەو لە سەر كێشەیەكی خێزانی خۆی لە حكومەتی عێراقی قاچاخ بوو، چونكە ئەو كاتە ئێمە لە رێگای رێكخستنەكانی كۆمەڵە، یان یەكێتی نیشتمانی یەوە نەبووایە، وەرمان نەدەگرتن. كە ئێمە وەرمان نەگرت، چووە لای تەحسین شاوەیس. ئەو كاتە بە ناوی پارتی یەوە هاتبوونە ناوچەكە. دوای ئەوەی، كە تەحسین شاوەیس خیانەتی كرد، حەمە غەفووری شەهید كرد، كە ناسراو بوو بە (غەفور ئاغجەلەری). كە فەرماندەی مەفرەزەیەكی یەكێتــی بوو. سەركەوتیان لەگەڵ نەبوو. تا ١٩٧٨/٣/٢٠، كە من لە وێ بووم، شەهید سەركەوت پێشمەرگە نەبوو لای ئێمە. هەتا كاك مەحمود خۆشی نەهاتبووە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی.

من رێزم هەیە بۆ شەهید سەركەوت، كە پیاوێكی قارەمان بوو. دوای من ئەو لە ریزەكانی پێشمەرگەی یەكێتی دا وەرگیراوە. یەكێك بوو لە پێشمەرگە قارەمانەكان. تەنها مەبەستم. روونكردنەوەیەك بوو لە سەر نووسینەكەی كاك مەحمود سەنگاوی بۆ

راستکردنەوەی مێژوویی، کە دەڵێ شەهید سەرکەوت یەکەم مەفرەزەی گەرمیان بووە.
بۆ ئەوەی راستیەکان ون نەبن و وەك خۆیان تۆمار بکرێن.

**تێبینیی نووسەر لە چەند دێڕێکدا:**

من لێرەدا داوای لێبوردن لە کەس و کاری شەهیدان دەکەم، ئەگەر ناوی شەهیدەکەیانم نەهێناوە لە کتێبەکەمدا، چونکە بە راستی ئەوەندە هاوڕێی خۆشەویستم شەهید بووە، لە بەر زۆرییان ناوی هەموویانم نایێتەوە یاد. لە هەمان کاتدا، داوای لێبوردن لە هاوڕێ پێشمەرگەکانم دەکەم، ئەوەی لە یادم نەمابن، باسم نەکردوون یان ناویانم نەهێنابێ، چونکە بە راستی ئەو تەمەنە مێژوویەکی پڕ لە کارەساتی گەورە بوو. هیوادارم کەس لێم زویر نەبێ. من بە پێی توانای خۆم، هەوڵم داوە ئەوەی لەگەڵ ئەو یادەوەرییانەمدا بووبێ، ناوی بێنم بە پێی بەشداریکردنی لەو رووداوانەدا، بەڵام بە دڵنیاییەوە هەر کەم و کورتیی تیادا دەبێ. هیوادارم توانیبێتم کەلێنێکی کەمی مێژووی شۆڕشی نوێی گەلەکەم پڕکردبێتەوە بۆ پاشەڕۆژی نەوەکانی ئەم میللەتە، بۆ ئەوەی بتوانن کەمێك بە راستی لە رووداوەکان ئاشنا بن. داواکارم لە هەموو هەڤاڵان و پێشمەرگە قارەمانەکان بە پێی بەشداربوونی خۆیان لە رووداوەکان مێژووی خەباتی خۆیان بە ئەمانەتەوە وەك خۆی بگێڕنەوە. بۆ ئەوەی راستیەکان ون نەبن و بە شاراوەیی نەمێننەوە. هەروەها داوای لێبوردن لەو هاوڕێ و هەڤاڵە خۆشەویستانە دەکەم، کە رەخنەم لێگرتوون، یان گلەییم لێکردوون. خۆشم بەرپرسیارم لە نووسینەکانم.



شاربـاژێر - زستانی (١٩٧٩)، ئاوات قارەمانی



بانه – سەردەشت (١٩٧٩)، ئاوات قارەمانی



ئاوزەنگ (١٩٧٩)، ئاوات قارەمانی



شەهید ئارام



شاخی توژەڵە - هاوینی (١٩٧٩)، ئاوات قارەمانی



مەلابەختیار - ئاوات قارەمانی ، ئاوزەنگ (١٩٧٩)



١- ئەحمەدی زەرەنگەر. ٢- شەهید ئازاد هەورامی ٣- فەرەیدون عەبدولقادر
( خری ئاوزەنگ ١٩٨٢ )



کۆنفرانس - ١٩٨٢/٢



لەڕاستەوە: مامۆستا جەعفەر-ملازم جەمال-ناواتقارەمانی- مەلا بەختیار، شێنێ-١١-١٩٧٨



لەراستەوە: ملازم محەمەد، ئاوات قارەمانی، کاک حەمە سەعید،
ئەبوشەهاب، دلێری سەید مجید، مەلا بەختیار



نەوشیروان مستەفا - شەهید سەید کەریم - ئاوات ئاوات قارەمانی- مامۆستا جەعفەر،
شێنێ، ١٠-١٩٧٨



لەچەپەوە دانیشتون : شەهید مامۆستا نوری - ئاوات قارەمانی - ئازادی سەرگرمە-مام عەلی
- حەمە سوور- دکتۆر ئاسۆ



ئاوات قارەمانی - ملازم عومەر ، ناوزەنگ (١٩٧٩)



ئاوات قارەمانی – نەوشیروان مستەفا ، شێنێ ١٩٧٨/١١



ناوزەنگ، هاوینی ( ١٩٧٨ )
لە ڕاستەوە بەدانیشتنانەوە: ئازاد حەمە غەریب، کاک جەبار،
بە پێوە: هاوڕێ جەبار، ئاوات قارەمانی ، مام عەلی



ئاوزەنگ ۱۹۷۹، ئاوات قارەمانی و هەندێ پێشمەرگە



لەچەپەوە ئاوات قارەمانی / دکتۆر هەژار - شارباژێر ساڵی ۱۹۸۰



حەمە تۆفیق - ئاوات قارەمانی ، ئاوزەنگ (١٩٧٩)



شێنێ ١٩٧٨
لە ڕاستەوە بە پێوە: دووەم کەس(شەهیدرێباز) - مەلابەختیار-ئاوات قارەمانی-هەندێ کادرانی کۆمەڵە.



ئاوات قارەمانی - شازاد صائیب ، ئاوزەنگ ( ١٩٧٩ )



شێنێ ،زستانی ( ١٩٧٨/١١ )
دلێری سەید مەجید ( نان ئەخوات )، ئەبوشەهاب، ئازادی سەگرمە، باقی هاوڕێیانی کۆمەڵە .



تووژەڵە ١٩٧٩ ، ئاوات قارەمانی



ساڵی ١٩٧٨-نۆکان

لە ڕاستەوە بە پێوە/ کاک مستەفا چاوڕەش، کاک محەمەد حاجی مەحمود، شەهید جەمال عەلی باپیر

لە ڕاستەوە بەدانیشتنانەوە/ کاک خالد، کاک بەکری حاجی سەفەر، ئاوات قارەمانی



ئاوات قارەمانی ، شەهید عەلی ئامە خان، کاک نەوشیروان مستەفا شێنێ، ١٩٧٨



کاک وەهاب ، ئاوات قارەمانی ، شەهید مامۆستا جەمال
شارباژێر - ١٩٧٩



ئاوات قارەمانی - ئاوزەنگ، ١٩٧٩



شەهید بەختیار ی باخی سەرو ، ئاوات قارەمانی
مەیدانی چوارچرای مەهاباد - ١٩٨٠



ئاوات قارەمانی
جنوبی لوبنان - ١٩٨٠



راوەستاوەکان لای ڕاستەوە/ کاک عبدالرحمن سیتەکی، ئاوات قارەمانی، کاک محمد محمود، کاک فەتاح.
دانیشتوەکان لای ڕاستەوە/ شەهید فەریق کاک محمود کۆمەڵە، مامۆستا عەلی کەمال
(دۆڵە ڕووت - ١٩٨٤)



ئاوات قارەمانی ، مام جەلال، کاك دلێری سەید مەجید
ئاوزەنگ - ١٩٧٩



ئاوات قارەمانی ، دوو برادەری بانەیی مەنسور ( ئەوەی دانیشتووە )
تۆژەڵە-هاوینی-١٩٧٩



**ناوات قارەمانی - شەهید شازاد صائب**
**ناوزەنگ- ١٩٧٩**



لەڕاستەوە/ سۆران، ئاوات قارەمانی، شەهید سالاری حاجی دەروێش، کاک وەهاب، کاک شۆڕش ئیسماعیل، مامۆستا عەلی کەمال، عەلی سەقزی



کاک ملازم عومەر، ئاوات قارەمانی، مام جەلال، کاک نەوشیروان مستەفا
ناوزەنگ- زستانی ١٩٧٨



لەچەپەوە/ کاک مەحمود کۆمەڵە ، ئاوات قارەمانی
دۆڵە ڕووت - ١٩٨٤



ئاوات قارەمانی - کاک شۆرش ئیسماعیل
شارباژێر - ١٩٧٩



راوەستاوەکان لای راستەوە/ مامۆستا سەیوان، کاک جەبار عوسمان، کاک ئازاد ٥٧
دانیشتوەکان/ شەهید مامۆستا سەیفەدین، ئاوات قارەمانی
ناوزەنگ - زستانی ١٩٧٩



لای ڕاستەوە/ کاک حەمەعەلی حاجی مەحمود، ئاوات قارەمانی، کاک محەمەد مەحمود
قارەمانی، شەهید تۆفیق، شەهید حەمە عەلی عوسمان مەلا.
(دۆڵە ڕووت - ١٩٨٤)




١-شەهید مام هێرش، ٢- ئاوات قارەمانی، ٣-زیرۆ عەبدوڵلا ڕێوی،
٤-هاوڕێ جەبار، ٥- شەهید پێشڕەو
(ئاوزەنگ ، زستانی ١٩٧٩)



لای ڕاستەوە/ ئاوات قارەمانی، شەهید شازاد صائب، کاک سالار عەزیز(لە پشتەوەیە ) ، کاک فەرەیدون عەبدولقادر
(ئاوزەنگ - زستانی ١٩٧٩)



ئاوات قارەمانی ، کاک وەهاب
(شارباژێر ، پاڕەزان ١٩٧٩)



لای ڕاستەوە: کاک ئەرسەلان بایز ، عەلی بچکۆڵ ، ئاوات قارەمانی
ئەندامانی کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە
(مالی مۆس – ١٩٨١)



لەڕاستەوە بە پێوە/ شەهید شێرکۆ عەبدوڵلا - کاک حەمە تۆفیق -
ئاوات قارەمانی - کاک جەبار عوسمان.
لە ڕاستەوە بە دانیشتنانەوە/ کاک دانا ئەحمەد مەجید، کاک عەلی بچکۆل ،
کاک شۆڕش ئیسماعیل ، کاک ئازادی ٥٧.
(ئاوزەنگ -١٩٧٩)



سێیەم لای ڕاستەوە / کاک وەهاب، ئاوات قارەمانی، کاک شۆڕش ئیسماعیل، خولەی حەمە
تاتە ، باقی پێشمەرگەکانی کەرتی سێ ی شارباژێڕ.
(شارباژێر - ١٩٧٩)



لەڕاستەوە بە پێوە/ کاك ئازادی ٥٧، کاك حمە سەعید، مام عەلی ئالیاوایی، د.ئاسۆ
لە ڕاستەوە بە دانیشتنانەوە/ ئاوات قارەمانی ، هاوڕێ جەبار
(توژەڵە-١٩٧٩)



سوریا ( هاوڕێیانی دەورەی لوبنان )- ١٩٨٠



لای ڕاستەوە / کاک ئازادی ٥٧، ئاوات قارەمانی، کاک ملازم جەمال
ئاوزەنگ – ١٩٧٩ )



ئاوات قارەمانی
مێرگە پان-١٩٨٤



لە ڕاستەوە: کاک وەهاب ، کاک جەمال، مەلا بەختیار، ملازم جەمال، ئاوات قارەمانی، ماموستا سەرکەوت.
لە پشتەوە: شێخ تالیب و کاک شۆڕش ئیسماعیل.
شێنێ ، کۆبونەوەی کادرانی کۆمەڵە / ١٩٧٩



دانیشتوەکان لای ڕاستەوە/ ماموستا عومەر، شەهید سەید کەریم، ماموستا رەئووف حاجی سعید، ئاوات قارەمانی، ماموستا عەلی کەمال.
راوەستاوەکان لای ڕاستەوە / کاک بەکر پیرۆت ، عبدالرحمن سیتەکی
(کارێزە - ١٩٨٤)



**لە ڕاستەوە ڕاوەستاوەکان: ١- شەهید مەحمودی حەمە تاتە، ٢-کاک وەهاب، ٣-ئاوات قارەمانی، ٤- شەهید مامۆستا جەمال، ٦-کاک ئیسماعیل مەلا عەبدول.**
**شارباژێر / ١٩٧٩**



**دانیشتوەکان لای ڕاستەوە/ کاک عبدالرحمن سیتەکی، شەهید سەید کەریم، مامۆستا ڕەئووف حاجی سەعید، مامۆستا عومەر ژاژڵەیی.**
**ڕاوەستاوەکان لای ڕاستەوە /مامۆستا عەلی کەمال، ئاوات قارەمانی، کاک صەلاح چاوشین، شەهید مامۆستا کەریم.**
**(کارێزە - ١٩٨٤)**




لە ڕاستەوە ڕاوەستاوەکان: ١- شەهید عوسمانی قادر منەوەر، ٢- ئاوات قارەمانی، ٣- شەهید شەوکەتی حاجی موشیر
نۆکان - ١٩٧٨



ڕاوەستاوەکان لای ڕاستەوە دووەم کەس/شەهید ڕێباز، مەلا بەختیار، ئاوات قارەمانی و هەڤالانی پێشمەرگە.
(شێنێ - ١٩٧٩)



له ڕاسته‌وه: كاك وه‌هاب، مامۆستا سه‌ركه‌وت، كاك نه‌به‌ز، ملازم جه‌مال، كاك دلێری سه‌ید جه‌مال، ئاوات قارەمانی، كاك شۆڕش ئیسماعیل
(شێنێ - ۱۹۷۸)



ئاوات قارەمانی - مامۆستا جه‌عفه‌ر- كاك ئازادی ٥٧- كاك دلێری سه‌ید مه‌جید
(ئاوزەنگ - ۱۹۷۹)



ئاوات قارەمانی – مام جەلال – کاك عادل موراد
(ناوزەنگ – ١٩٧٩)



ڕاوەستاوەکان لە ڕاستەوە: شەهید جەلال، لوقمان شاسوار، ئاوات قارەمانی
دانیشتوەکان لە ڕاستەوە: هیوای ئاوات قارەمانی –کاك حەمەی حمە سەعید
(گوندی دوکانی قەرەداغ – ١٩٨٧)



ئاوات قارەمانی
جنوبی لوبنان - ١٩٨٠



لەڕاستەوە: کاك عومەر شێخ موس، ئاوات قارەمانی ، مام جەلال
(ناوزەنگ - ١٩٧٩)



لەڕاستەوە: شێخ محەمەد باخ (ناسراو بەشەهید شەماڵ)، کاک بەکری حاجی سەفەر، حسێن ناسراو بە (شەهید شێرکۆ)، ئاوات قارەمانی
(نۆکان - ١٩٧٨/٤)



ئاوات قارەمانی ، کاک شۆڕش ئیسماعیل
جنوبی لوبنان - ١٩٨٠



ئاوات قارەمانی
جنوبی لوبنان - ١٩٨٠



لە ڕاستەوە: ئاشتی - هیوا - زەینەب خان- پێشڕەو (ئاوزەنگ - ١٩٨٠)



ئاوات قارەمانی جنوبی لوبنان - ١٩٨٠



پێشمەرگەکانی سەرەتای دروستبوونەوەی شۆڕشی نوێ (یەکەم پێشمەرگە)

# NARROW WAYS

## The Novele Biography of Awat Qaramani

ابو علي الكردي

